٥٨
سەردەم
سالّی یانزەهەم
بەهاری
٢٠٠٩
گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات



-سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێرانی کولتوری بیانی لەبواری فەلسەفە و ڕەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.

-داوا لەو بەرێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، هاوپێچ ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێر، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بەچاپ و بلاّوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێردراو بنێرن.

-ئەو بەرێزانەی بە نوسین و ئامادەکردن بەشداریدەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمیەکان، لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە، پێرەوبکەن.

-باشتروایە بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کرابن، هاوپێچ لەگەڵ سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێردا.

-ئەو بەرێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێرن پێویستە هاوپێچ ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و رۆژی بلاّوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.

-بەرهەمەکان گەر بلاّوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.

-پەیوەندییەکان لە رێگای سەرنووسەرەوە ئەنجام دەدرێن.

# ناوەڕۆکی:
## سەردەم - ژمارە ٥٨

### سەرەتا



### فیکر و فەلسەفە



### ئەدەب



### گفتوگۆ



### فایلی ژمارە - ڕۆشنگەری

## وێستگەکانی سەردەم



---

**ناونیشان:**

**سلێمانی - شەقامی سالم**
**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**
**تەلەفۆن: سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩**

**دەزگای سەردەم ٣١٢٩٦٠٩**

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**
Tel _ Fax: 00447543129839

**ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی**
**ژمارە (615/ 14665 و 616/ 14665) تاران**

**لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:**
govarysardam@yahoo.com

www.sardam.enf
www.sardam.net
www.sardam.org

**نرخی (١٢٥٠) دینار**



# ئەکرەم قەرەداخی

## هاوڕێ بەخشندەکەی دەزگای سەردەم

بە خەمێکی زۆر و حەسرەتێکی قووڵەوە، هاوڕێ و هاوکار و ئەندامی ئەنجومەنی دەزگای سەردەم و سەرنووسەری گۆڤاری (زانستی سەردەم) مامۆستا و نووسەری هێژامان، کاک ئەکرەم قەرەداخی ڕۆژی هەشتی ئازار دڵە گەورەکەی وەستاو دواماڵئاوایی لێ کردین. کۆچێکی ناوادەی کسپە ئاسا، لە گەرمەی تواناو بەجێگەیاندنی ئەرکی پیرۆزدا، کە بە ئاسانی زامەکەی سارێژنابێت و هەر بەسوێوە دەمێنێتەوە. جێگای ئەو هاوڕێ ئازیزە، کە لە کاروانی ئەدەبی و ڕووناکبیری و زانستیدا قەڵەمێکی بەتواناو، لە چالاکی و بەرەوپێش بردنی دەزگای سەردەمدا لە پێشەنگەکان بوو، بۆ ئێمە پڕناکرێتەوە. ئەو مرۆڤە خۆنەویست و دڵسۆزە، خۆشەویستیەکی هێند درەوشاوەی لە دڵی هاوەڵ و هاوکارانیدا جێ هێشتووە کە هەمیشە لە یادەوەریدایەو نوێ دەبێتەوە. کاکە ئەکرەم مامۆستایەکی بەتوانا بوو، بۆ ماوەی زیاد لە ٣٠ ساڵ لە دواناوەندیەکانی سلێمانی و هەڵەبجەدا وانەی بایالۆژی وتۆتەوە و چەند ساڵێکیش سەرپەرشتیاری پەروەردەیی پسپۆڕی بووە. لە بواری ئەدەبیدا ڕەخنەگرێکی بەسەلیقە بوو کە لە کۆڕو میهرەجانە ئەدەبیەکاندا ئامادەگیەکی بەرچاوی هەبوو. لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی پێشوودا چەند جارێك بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری یەکیەتی نووسەرانی کوردی لقی سلێمانی هەڵبژێراوە. هەروەها ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان بوو. خاوەنی چەندان کتێبە لە بواری پسپۆڕیەکەی خۆیدا. مەرگی کاکە ئەکرەم خەسارەتێکی گەورەبوو بۆ دەزگاکەمان و سەرجەم بزوتنەوە و چالاکیی فیکری و ڕووناکبیریمان.

ئێمە وەك دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سوپاسی بێ ئەندازەی خۆمان پێشکەش بەو هاوڕێ و دۆست و لایەن و کەسایەتیانە دەکەین کە لەو بۆنەیەدا بە ئەرك کێشان، یان بەنامەو تەلەفوون سەرخۆشیان لێ کردووین و بەشداریی خەممان بوون. ستایش لە خێزان و بنەماڵە بەڕێزەکەی دەکەین کە هاندەر و پاڵپشتی چالاکییەکانی ئەو مامۆستا جوامێرەبوون لە بەرهەمهێنان و پەروەردەکردنی نەوەی نوێدا بۆ ئەوەی بە گیانێکی زانستیانەی هاوچەرخەوە پێ بگەن و خزمەت بەگەل و وڵاتەکەیان بکەن. یادی ئەو هاوڕێ خۆشەویستەمان هەمیشە هەر نەمرو درەوشاوە بێت.

**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**
**٢٠٠٩/٣/١٠**

کارن گلۆی
لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

# مارتین هایدێگەر
# ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی لە ناوەڕۆك و لێرەبوون

کاتێك هوسەرل ڕێگەی فۆرمالیزم هەڵدەبژێرێ و لێرەشدا بۆ بەدیهێنانە بونیادییەکانی سەبژێکت دەگەڕێتەوە، ئینجا بەم ڕێیەوە بە فەلسەفەی ترانسێندێنتال دەگات. واتا بە فەلسەفەیەك دەگات کە بریتییە لە شرۆڤەی مەرجە فۆرمالەکانی شیمانەی ئەزموون، ئەوا هایدێگەر بە پێچەوانەوە ڕێگەی رووەو ئەکزیستێنس (لێرەبوون)، بەڵام بەتایبەتی رووەو لێرەبوونی مرۆڤ، هەڵدەبژێرێ و لێرەشەوە گۆڕان بە فەلسەفەکەی خۆی دەدات کە بریتییە لە شرۆڤەی لێرەبوون یان لە ئۆنتۆلۆژیی فوندامێنتال (بناغەیی). بەڵام پێش ئەوەی روو بکەینە «بوون و کات» (١٩٢٧)ی هایدێگەر، چاکترە شتێك بەگشتی لەبارەی فەلسەفەی ئەکزیستێنسیالیزم (لێرەبوونگەرایی) بڵێین، واتا روو بکەینە ئەو جەرەیانە فەلسەفییە کە نەك تەنها هایدێگەر خۆی تێدا دەبینێتەوە، بەڵکو هەروەها سوێرن کیرکەگۆر، کارل یاسپەرس، ژۆن پۆل سارتر، ئالبێر کامیو - بێگومان بەبێ ئەوەی لێرەدا روو لەم فەیلەسوفانە بکەین.

زەمینەی واژەی «ئەکزیستێنسیالیزم» یان «فەلسەفەی ئەکزیستێنس»، بریتییە لە وشەی «ئەکزیستێنس». ئێمە دەتوانین لە بەرەگەراییەکەی جووتە تێگەی «لێرەبوون» (ئەکزیستێنسیا) و «ناوەڕۆك» (ئێسێنسیا)وە، بگەین بە یەکەم دەروازە بۆ نێو ئەم واژەیەی ئەکزیستێنس، ئەم دوو تێگەیەش لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ فەلسەفەی سکۆلایزم. سەرەتا گەرەکە بڵێین کە سەرجەم فەلسەفەی سەدەی بیستەم و بیست ویەکەم، هیچی دیکە نییە جگە لە رەفزکردنی فەلسەفەی ترادیسیۆنی: فێنۆمێنۆلۆژی بە دروشمی «گەڕانەوە بۆ لای خودی شتەکان» لە ئۆپۆزیسیۆندایە

دژی هەڵبەستنە مەزەنییە ئیدیالیستییەکان، فەلسەفەی زمانشرۆڤەیی رەخنەی فەلسەفیانەی زمان لە تیۆرییە کلاسیکییەکانی زمان دەگرێ، فەلسەفەی پۆستمۆدێرن وەك فەلسەفەی کۆگەرایی (پلورالێتی) و جیاوازی (دیفەرێنس) دژی هزری ترادیسیۆنیانەی یەکایەتی و ئیدێنتیتێ دەوەستێتەوە و ئەم جۆرە هزرە ناو دەنێ «لۆگۆسەنتریزم»ی خۆرئاوا (دێریدا، گراماتۆلۆژی، لا ١١). هەروەها ئادۆرنۆ لە فەلسەفەکەی خۆی، واتا لە دیالێکتیکی نێگەتیڤ، فەلسەفەیەکی دژ بە بناغەکان تێدەگات و لە ئۆپۆزیسیۆندایە دژی هزری دارێژەری دوایەمین بناغەکان — بێگومان دەتوانین نموونەی زیاتر بهێنینەوە. بەلام بە هەمان شێوە فەلسەفەی ئەکزیستێنیس لە ئۆپۆزیسیۆندایە دژی فەلسەفەی ناوەرۆك کە لە مێتافیزیکی کلاسیکیدا نوێنەرایەتی دەکرێ. بەڵام سەرەتا پێویستە پێش روونکردنەوەی ئەم ئۆپۆزیسیۆنە فەلسەفییە نوێیە، دیدێك ئاراستەی فەلسەفەی ترادیسیۆنیانەی ناوەرۆك بکەین.

مێژووی فەلسەفەی ناوەرۆك لە ئەنتیکەدا لەتەك پلاتۆن و ئەریستۆتێلیسدا سەرچاوە دەگرێ. بێگومان ناونیشانی مێتافیزیك کە لەژێریدا فەلسەفەی ناوەرۆك دیاری دەکرێ، لە لایەن پلاتۆن و ئەریستۆتێلیسەوە بەکارنەهێنراوە، بەڵکو ئەم ناونیشانە دەگەرێتەوە بۆ کاتی پاش ئەریستۆتێلیس. ئەندرۆنیکۆس ی رۆدۆسی کە ئیشەکانی ئەریستۆتێلیسی رێکخست، چواردە کتێبی نێو سەرجەم ئیشەکەی ئەریستۆتێلیسی ناو نا مێتافیزیك (پاش فیزیك)، چونکە بەپێی ریزی نووسینەکان «پاش نووسینە فیزیکییەکان»ی ئەو دەهاتن و لە رووی ناوەرۆکەوە لەتەك کێشەی هۆکار و بناغەکانی بوونەوەردا خەریك بوون. کەواتە گەر لێرەوە لە کێشەکە بڕوانین، ئەوا دەبینین کە لەو دەمەدا مێتافیزیك ناوێك بوو بۆ «یەکەم فەلسەفە» (پریما فیلۆسۆفییا).

کێشەی مێتافیزیك روو دەکاتە لێتوێژینەوەی بوونەوەر وەك خودی بوونەوەر. ئەم بوونەوەرە وەك ناوەرۆکی یان وەك سروشتی تاکە بوونەوەر دیاری دەکرێ، ئینجا وەك گشتێتی و نەگۆڕ، دروستنەکراو و نەشیاوی لەناوچوون، دەکرێ بە بناغەی بوونەوەری تاك و بگۆڕ و دروستبوو و تایبەتمەند بە لەناوچوون. هەروەها لەبەر ئەوەی بوونەوەر وەك ناوەرۆك سەربەخۆیە لە سەرجەم سێنسێتی، ئەوا مرۆڤ تەنها بەرێی هۆشەوە (GEIST) دەتوانێ بە بوونەوەر بگات. ئیدی لەو دەمەوە بزووتنەوە بناغەییەکەی مێتافیزیك، بریتی بووە لە بەرزبوونەوەی هزر بەسەر شتەکانی جیهانی ئەمپیریدا کە تەنها بە دەرککردن تایبەتمەندن، یان بریتی بووە لە بەرزبوونەوەی هزر رووەو گشتێتی، رووەو ئەو شتە کە نەگۆڕە.

شیمانەی ئەم بەرزبوونەوەیە لەرێی ئەو جیاوازیکردنەوە هێنرایە گۆڕێ کە پلاتۆن لە نێوان جیهانی بگۆڕی ئەمپیری و جیهانی نەگۆڕ و ئەزەلیی ئیدێدا ئەنجامیدا. گشتێتی بۆ پلاتۆن بریتی بوو لە ئایدۆس، ئەمەش لە واتای «شێوە»دا، یان وەك ئیدێ لە واتای «خۆ-پیشاندان»دا، لە واتای وێنەی بینیندا. ئایدۆس بریتییە لەو وێنەیە کە بوونەوەرێك دەیخاتەوە، ئەمەش بێگومان گەر هاتوو بوونەوەرەکە بناسرێ (بزانرێ)، ئینجا ئەو وێنەیە کە بوونەوەرەکە خستوویەتیەوە، وێنەیەکە کە نەشیاوە بە سێنسەکان دەرکی پێبکرێ، بەڵکو تەنها بە چاوی هۆشەکی دەگیرێ (لێی دەڕوانرێ)، بەکورتی ئەو وێنەیە بریتییە لە: شێوەکە، فیگورەکە، سترۆکتۆرەکە. سەرجەم فەلسەفەی ترادیسیۆنی کە لە ئاراستەیدا بەرەو رابوردوو هەتا ئەنتیکە و تەنانەت هەتا خودی پارمێنیدێس بڕ دەکات، بریتییە لە هەوڵدان بۆ گرتنی ناوەرۆکی نەگۆڕ و گشتیی شتەکان، ئەم گرتنەش بێگومان بەرێی وەرچەرخانەوە لە جیهانی ئەزموون و رووکردنە ناوەرۆکە گشتی و نەگۆڕەکان رووی دەدا و هاوکات تەنها لەرێی توانستی تێگەییەوە بناغەی دەرێژرا. بەڵام مرۆڤ لەم هەوڵەدا لە لایەك شتاندنی (VERDINGLICHUNG) گشتێتیی دەخستەوە، لە لایەکی دی تایبەتێتی و مێژووی دەسڕییەوە و لەکەداری دەکرد. بەم پێیە لە مێتافیزیکی ترادیسیۆنیدا دژبەرییەك دەهێنرایە ئاراوە: گشتێتی

بەرانبەر تایبەتێتی، رەها (المطلق) بەرانبەر دوایەکێتی، سەرمەدی بەرانبەر کاتێتی، هۆشەکێتی بەرانبەر سێنسێتی. ئینجا گەر مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی دوایەکیی هزرڤان بیویستایە ئەم گشتێتییە بناسێ / بزانێ، ئەوا دەبوو رووەو ئەو گشتێتییە بەرزببێتەوە ، ئەمە لە بنەڕەتدا ئەرکی فەلسەفەی هۆشە و بە ریشەییترین شێوە لەلای هێگل دەردەکەوێ.

بەڵام لەتەك فەلسەفەی ئەکزیستێنس و رووکردنە تاکێتی (سینگولێر) و مێژوو، گەڕانەوەیەکی ریشەیی لەو شێوازە هزرینە مێتافیزیکییە رووی دا: گەڕانەوە رووەو تاك نەك رووکردنە گشتێتی، گەڕانەوە رووەو نا-ناوەڕۆك نەك رووکردنە ناوەڕۆك. لە کرۆکی ئەم شێوازە هزرینەدا ئەوە خۆی دەبینێتەوە کە «ئەکزیستێنس دەکات» (EXISTIERT)، واتا وەك ڤێهەیە یان لێرەبوون لە ئارادایە، لێرەشدا بەتایبەتی مرۆڤ وەك سەنتەری هزرین وەردەگیرێ.

لە ترادیسیۆندا دژبەرییەکەی نێوان ناوەڕۆك و لێرەبوون، بە چەشنێك دیاری دەکرا کە مرۆڤ لێرەبوونی وەك ریالیزەبوونی ناوەڕۆك دادەنا، بەکورتی وەك لێرە-بوون ی شتێك کە تەنها بە شێوەیەکی تێگەیی شیاوی دیاریکردن بوو. کاتێك ناوەڕۆك بریتی بوو لە کرۆکی ئەبستراکت، یان بریتی بوو لە ئەوها-بوون یان لە چی-بوونی شتەکە، ئەوا بە پێچەوانەوە لێرەبوون تەنها واتای بەهەقیقی-بوونی شتەکەی دەگەیاند.

بێگومان دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە مەبەستی تێگەی لێرەبوون، بریتی نییە لە هەبوونی شتێك یان حاڵەتێك کە بە شێوەیەکی ئۆبژێکتیڤی شیاوی دەرککردن بێ، هەروەها مەبەستی تێگەکە بریتی نییە لە هەستی سەبژێکتیڤیانەی هەڵگیراو لە لایەن بناغەیەکی ژیانەوە، بەڵکو واتای بوونی فاکتییانەی مرۆڤ دەگەیەنێ، ئەمەش لەم مەغزایەدا: من هەم نەك من نیم. هەر بەم پێیە لێرەبوون هاوواتا نییە بە کەس-بوون یان بە سەبژێکت-بوون، بەڵکو هاوواتایە بەو هەقیقەتە بێڤەید و شەرتە کە «من هەم». کاتێك لە فەلسەفەی کارتێسیدا (دێکاریتیدا) دەگۆترا: «من دەهزرێم کەواتە من هەم»، ئەوا ئێستا بە پێچەوانەوە لە فەلسەفەی لێرەبووندا دەگۆترێ: «من هەم کەواتە من دەهزرێم».

ئێمە ناتوانین بەڕێی هزرینەوە یان لەنێو هزریندا لە لێرەبوون تێبگەین، بەڵکو تەنها لەنێو شێوازی موئایەشە یان ئەزموونۆدا، بۆ نموونە ناکامی، هێڵنج، ترس، وەڕسی. ئەمانە بریتین لە شێوازەکانی یان لە دەرووەکانی گەیشتن بە لێرەبوون. لەنێو ئەم شێوازانەدا سەرجەم راڤەکانی جیهان و نرخاندنەکان هێزە مسۆگەرەکەیان دەدۆڕێنن، ئێستا هەموو چەسپاندنێك (هەموو دیاریکردنێکی مسۆگەرکراو) دەهیچێنرێ، بەڵێ تەنانەت خودی ئەو شوێنەوارە کە بە مرۆڤ ئاشنایە، نامۆ دەبێ و ئینجا لە کۆتاییدا مرۆڤ خۆیشی بە خۆی نامۆ دەبێ. مرۆڤ لە سەرەنجامی ئەم رووداوەدا چیدی ناتوانێ لەنێو سەرجەمێکدا لە خۆی تێبگات، سەرجەمێك کە ئەوی وەك مرۆڤ لەخۆ گرتبێ (جا با ئەو سەرجەمە راستییەکی ئەزەلیش بێ)، نەخێر، مرۆڤ ئێستا لەنێو تاکێتیی رەها و جێهێڵراویدا ئەزموونی خۆی دەکات.

## ژیان

مارتین هایدێگەر لە ١٨٨٩/٠٩/٢٦ لە مێسکیرش هاتە ژیانەوە. ئەو لە کۆنستانس و فرایبورگ (ی برایسگاو) «ئامادەیی هومانیستی»ی تەواو کرد. ساڵی ١٩٠٧ رووداوێکی گرنگ لە ژیانی ئەودا هاتە گۆڕێ: هایدێگەر لێکۆڵینەوەی دکتۆراکەی فرانتس برێنتانۆی ناسی کە لەژێر ئەم ناونیشانەدا نووسرا بوو: «لەبارەی واتای هەمەلایەنیی بوونەوەر». برێنتانۆ ئەم لێکۆڵینەوەیەی لەبارەی ئەریستۆتێلیس نووسی بوو و کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر هایدێگەر هەبوو؛ وەك ئەو خۆی گۆتبووی، ئەم نووسینەی برێنتانۆ ئەوی گەیاند بە هزری خۆی، گەیاندی بە پرسیار سەبارەت بە مەغزای بوون، ئەمەش پرسیارێك بوو کە هایدێگەر بەدرێژایی ژیانی

پێوەی خەریك بوو. دوای ئەوەی هایدێگەر ئامادەیی تەواو كرد، بۆ ماوەی چوار ساڵ لە زانكۆی هایدلبێرگ تیۆلۆژیی كاتۆلیكیی خوێند، بەڵام پاش ئەم ماوەیە بەشەكەی خۆی گۆڕی و هەنگاوی نایە نێو خوێندنی فەلسەفە و ماتماتیك و زانستی سروشتییەوە. هایدێگەر ساڵی ١٩١٣ بە نووسینی «زانیندنومای بڕیار لە پسیكۆلۆژیزم»دا دكتۆرای كرد، پاشان ساڵی ١٩١٦ لە لای هاینریش ریكەرت بە نووسینی «كاتیگۆرییەكان و زانیندنومای واتا لە لای دەنس سكۆتوس» هابیلیتاسیۆنی كرد. هایدێگەر لەم نووسینەیدا بە ئیشێكەوە خەریك بوو بوو كە هەتا ئەو دەمە وەك ئیشی دەنس سكۆتوس ناسرا بوو، بەڵام درەنگتر ئاشكرا بوو كە ئەو ئیشە هینی تۆماس فۆن ئێرفورت بووە نەك دەنس سكۆتوس. هایدێگەر ساڵی ١٩١٦/١٧ بوو بە وانەبێژی فەلسەفە بۆ تیۆلۆژیی كاتۆلیكی، بەڵام ماوەیەك دوای دەستبەكاربوونی لەلای دۆستێكی خۆی بە ناوی ئێنگلبێرت كرێبس، دركاندبووی كە پرسیار و تێڕوانینەكانی تیۆریی زانین گەیاندوویانە بەو هەڵوێستە كە چیدی كاتۆلیسیزم قبووڵ نەكات. ئەوە بوو هایدێگەر ساڵی ١٩١٩ بوو بە یاریدەدەری زانستیی هوسەرل، پاشان ١٩٢٢/٢٣ لە زانكۆی ماربورگ بوو بە پرۆفیسۆری یاریدەدەر. دەشێ ئەم كاتەی ماربورگ بۆ ژیانی هایدێگەر پڕ رووداوترین و لە رووی هزریشەوە بزوێنەرترین كات بووبێ. بە گوتەی هانا ئارنت ئەو دەمە هایدێگەر بە پاشای نهێنیی جیهانی هزر دادەنرا. ئینجا هایدێگەر ساڵی ١٩٢٧ ئیشە سەرەكییەكەی بە ناونیشانی «بوون و كات» بڵاوكردەوە، پاشان ساڵی ١٩٢٨ لە زانكۆی فرایبورگ جێگەكەی هوسەرلی پێدرا. بەڵام هێندەی نەخایاند لە نێوان هەردووكیاندا جیاوازیی هزری سەری هەڵدا و لە سەرەنجامدا پەیوەندییەكەیان كۆتایی پێهات؛ ئاخر هوسەرل هیوایەكی گەورەی بە هایدێگەر هەبوو تاكو درێژە بەو فێنۆمێنۆلۆژییە بدات كە هوسەرل خۆی بناغەی ڕشتبوو، بەڵام كاتێك هوسەرل بینی كە هایدێگەر بنەما فێنۆمێنۆلۆژییەكەی ئەوی وەرگۆڕیوە، ئیتر هیوای پێی نەما. هایدێگەر ساڵی ١٩٣٣ بوو بە سەرۆكی زانكۆی فرایبورگ و بەم بۆنەیەوە گوتارە بەناوبانگەكەی پێشكەش كرد: «خۆڕاگەیاندنی زانكۆی ئەڵمانی»، بەڵام ئەم گوتارەی لە مەغزای وەرچەرخانەكەی ناسیۆنالسۆسیالیزمدا نووسیبوو. هەرچۆنێك بێ هایدێگەر پاش ساڵێك وازی لەم پۆستە هێنا و بەدووی ئەمەشدا هەمیشە پتر تەنیا دەكەوت. پاشان درەنگتر هاوپەیمانەكان لە ساڵی ١٩٤٥ هەتا خانەنشینبوونی لە ساڵی ١٩٥٢ كاری وانەبێژییان لێ یاساغ كرد. بەڵام هایدێگەر بە نووسینی «نامەیەك لەبارەی هومانیزم» (١٩٥٢) كە بۆ دۆستێكی فەرەنسیی نووسی بوو، سەرلەنوێ هاتەوە نێوەندی دانوستانە هەنووكەییەكان و لێرەشەوە هێنرایە نێو دانوستاندنەكانەوە، لەبارەی ئەكزیستێنسیالیزمی فەرەنسی. ئەوە بۆ دووەم جار بوو كە هزری هایدێگەر كاریگەریی نواند، ئەمەش چ لەسەر كیشوەری ئەورووپا و چ لە ژاپۆن و ئەمەریكای باشوور. بەڵام كاتێك لە ناوەراستی شەستەكان بەدوواوە گرینگیدان بە هایدێگەر لە ئەڵمانیا كەم بۆوە، ئەوا هزری ئەو بە پێچەوانەوە لە دەوڵەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا پتر واتای پەیدا كرد. هایدێگەر لە ١٩٧٦/٥/٢٦ مرد و لە مێسكیرشی زێدی خۆی نێژرا. بەڵام دانوستاندنەكانی هایدێگەر پاش مردنیشی هەر ناتەبا مانەوە، پاشان كتێبەكەی ڤیكتۆر ڤاریاس بە ناونیشانی «هایدێگەر و ناسیۆنالسۆسیالیزم» كە هایدێگەری وەك لایەنگرێكی نازیزم دارشتبوو، سەرلەنوێ دانوستاندنی هایدێگەری گەرم كردەوە.

هایدێگەر كاریگەرییەكی گەورەی لەسەر ژیانی هۆشەكیی سەدەی بیستەم هەبوو، بەڵام ئەو كاریگەرییە تەنها لە بواری فەلسەفەدا نەبوو، بەڵكو هەروەها لەسەر تیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی، سایكۆلۆژی و زانستی ئەدەبیش بوو. هۆی ئەم كاریگەرییە دەگەڕێتەوە بۆ رەسەنێتیی ئەو ئاراستەیە كە هایدێگەر رووەو پرسیارە هەرە دێرینەكەی مێژووی خۆرئاوا وەری گرت: «بوون چییە؟»؛ «ئایا بوونەوەر لەنێو بووندا چییە؟». بەڵام هایدێگەر لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا ئاراستەیەك وەردەگرێ كە پێچەوانەی مێتافیزیكی ترادیسیۆنییە، واتا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە هەوڵ نادات كاتیگۆرییەكان وەربگرێ و بەرێیانەوە شرۆڤەی ناوەرۆك ئەنجام

بدات، بەڵکو دەست دەداتە شرۆڤەی ئەکزیستێنس و ئەم کارەش بە یاریدەی ئەکزیستێنسیال ئەنجام دەدات. بەڵام لەبەر ئەوەی شرۆڤەی ئەکزیستێنیس لە مەغزای بوون دەکۆڵێتەوە، ئەوا ئەو شرۆڤەیە هاوکات بریتییە لە ئۆنتۆلۆژییەکەی بناغەیی (فوندامێنتال). لە خوارەوە شوێن ئیشە سەرەکییەکەی هایدێگەر لە گرنگترین هەنگاوە ناوەرۆکییەکانیدا دەکەوین و هاوکات هەوڵ دەدەین تێگە ئەکزیستێنسیال-فەلسەفییەکان روون بکەینەوە.

## بوون و کات

«بوون و کات» بە سیتاتێکی پلاتۆن لە دیالۆگی «سۆفیستێس»دا (A 244) سەرچاوە دەگرێ:

«ئاخر کاتێك ئێوە واژەی "هەبوو" بەکاردەهێنن، ئەوا وەك دیارە ئێوە دەمێکە ئاشنان بەوە کە ئێوە خۆتان دەری دەبڕن، بەڵام ئێمە پێشتر باوەڕمان دەکرد لێی تێبگەین و ئێستاش پەشۆکاوین». بەڵام لەبەر ئەوەی هایدێگەر پرسیارەکە سەبارەت بەوە کە داخۆ وەڵامێکی شیاو بۆ کێشەی بوون هەبێ (کە بێگومان وەڵامەکەی نەرێنییە) ئاراستەی خودی خۆی دەکات، ئەوا دەبێ ئەو پرسیارە سەرلەنوێ بکرێتەوە.

مێتافیزیکی خۆرئاوایی وەڵامێکی ترادیسیۆنیانەی بۆ ئەو پرسیارە هەیە. لێرەدا بوونی بوونەوەر وەك ئامادەیی بەردەوامی ناوەرۆك دادەنێ، ناوەرۆکیش لە روانگەی ئەو مێتافیزیکەوە تەنها بە شێوەیەکی تێگەیی شیاوی گرتنە و مرۆڤ دەتوانێ بۆی بگەڕێتەوە. بەڵام بوونێك کە وەك ئامادەییەکی بەردەوام شیاوی تێگەیشتن بێ، تەنها روویەکی مەدالیاکەیە. ئەم رووە بریتییە لە هەنووکەیی شتێندراو (هیپۆستازکراو)، لێرەشدا بگۆڕی و مێژوویەتییەکەی بوونەوەر وەلاوە دەنرێ.

مێتافیزیکی خۆرئاوایی پنتێکی بنەمایی بۆ دەرچوون چەسپاندووە، ئینجا کاتێك هەوڵی داوە لەم پنتە چەسپێنراوەوە بوون دیاری بکات، ئەوا لە رەوتی ئەم کارەیدا کاتێتیی (ZEITLICHKEIT) راستەقینەی چەپاندووە و بۆیە هەر لە سەرەتاوە خزاوەتە نێو لەیادچوونەوەی بوون. ئێستاش هایدێگەر دەیەوێ لە «بوون و کات»دا ئەم لەیادچوونەوەیەی بوون کە فەلسەفەی خۆرئاوایی تێیکەوتووە، نەك تەنها رەخنەییانە دەربخات، بەڵکو تەنانەت دەیەوێ قبووڵی نەکات. لە روانگەی هایدێگەر نەك تەنها مەغزای بوون، بەڵکو تەنانەت خودی پرسیارەکەش لەبارەی مەغزای بوون لەبیرچۆتەوە، واتا مرۆڤ لەبیری چۆتەوە کە ئەو پرسیارەی لەبیرچۆتەوە. لەبەر ئەم هۆیە دەبێ جارێ تێگەیشتن بۆ مەغزای ئەم پرسیارە سەرلەنوێ بێداربکرێتەوە. بۆیە هایدێگەر لە «پێشگۆتن»ی لێکۆڵینەوەی «بوون و کات»دا رایدەگەیەنێ کە: «کارکردنی کۆنکرێت لە پرسیاری مەغزای "بوون"دا بریتییە لە مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوەیە، راڤەکردنی کات وەك هۆریزۆنتی (ئاسۆی) شیاوی هەر تێگەیشتنێکی بوون بریتییە لە ئامانجە کاتییەکەی». بەڵام لەتەك ئەم پرسیارەدا دەبێ هاوکات ئەو پرسیارەش بکرێ کە داخۆ ئەم جۆرە سەرەتاگرییەی هایدێگەر کە بریتییە لە شرۆڤەی لێرەبوون نەك مێتافیزیکی ناوەرۆك، واتای تەکمیلەکردنی مێتافیزیکی ترادیسیۆنی یان هیچاندنی ئەو مێتافیزیکە بگەیەنێ.

هایدێگەر سەرەتا سێ پێشبڕیار پەیوەست بە تێگەیشتنی بوونەوە دیاری دەکات:

١)بوون لە روانگەی بۆچوونی ترادیسیۆنییەوە، بریتییە لە «گشتیترین» تێگە و دەکەوێتە سەرووی سەرجەم تێگەکانی دیکەوە، بەڵێ تەنانەت گشتیترە لە گشتێتیی ئەو تێگە رەگەزییانە کە جۆرە تایبەتییەکانی بوون لەخۆ دەگرن. بەڵام واتای ئەم گشتێتییە لە سەرجەمی ترادیسیۆنی فەلسەفیدا، ئەمەش هەر لە پلاتۆنەوە هەتا هێگل بە نارۆشنی دەمێنێتەوە. تێگەیەك کە گوایە لە خۆیدا روونترینە، لە بنەڕەتدا بریتییە لە تاریکترین تێگە. بەڵام گەر ئەمە ئاوها بێ، ئەوسا ئیتر مرۆڤ نابێ لەنێو رەگەزدا بۆ

گشتێتی بگەرێ - گشتێتی کە تەنها جۆرە تایبەتییەکانی بوونەوەر لەژێر خۆیدا رێکدەخات. واتا مرۆڤ نابێ لەنێو بالاٌتریندا بۆ گشتێتی بگەرێ، بەڵکو لەنێو نزمتریندا.

٢)مرۆڤ لە ترادیسیۆنی فەلسەفیدا دەبێژێ: بوون بەهۆی گشتێتییەکەیەوە کە بەرەهایی سادەیە، نەشیاوی پێناسەکردنە. بوون نە لە تێگە بالاٌترینەکانەوە شیاوی دەرئەنجاماندنە و نە لە تێگە نزمترینەکانەوە شیاوی روونکردنەوەیە. بەلاٌم لە روانگەی هایدێگەر، ناشێ لەمەوە ئەو دەرەنجامە ببرێتەوە کە مرۆڤ گوایە ئیتر لە پرسیارەکە سەبارەت بە مەغزای بوون قوتاری بووە.

٣)سێیەم پێشبریار لەوەدایە کە گوایە بوون تێگەیەکی تەواو رۆشنە و هەموو یەکێك دەتوانێ بەبێ کێشە لێی تێبگات. بەم پێیە هەموو یەکێك لە هەموو جۆرە دەربرینێك (بریارێك) تێدەگات: «ئاسمان شینە»، «من شادمانم» و هتد. بەلاٌم هایدێگەر لاریی لەمە هەیە و دەبێژێ: لەبەر ئەوەی هەر یەکێك لە ئێمە لەنێو تێگەیشتنێکی تایبەتمەندی بووندا دەژی، ئەوا مەغزای بوون بە تاریکی تەنراوە و لێرەشەوە ئیتر پێداویستیەك بۆ ئەوە سەرهەڵدەدات کە پرسیارەکە سەبارەت بە مەغزای بوون سەرلەنوێ بێدار بکرێتەوە.

لاپەرەکانی سەرەتای «بوون و کات» ئاراستەی کۆنسەپسیۆنەکەی هایدێگەر بۆ فەلسەفە پیشان دەدەن: فەلسەفە گەرەکە سەرلەنوێ پرسیارەکە سەبارەت بە مەغزای بوون بکاتەوە و بەم پرسیارەش هاوکات پرسیار سەبارەت بە سەرچاوەی زانینی بوون لە لایەن ئێمە بکات. بەلاٌم لێرەدا وەلاٌمەکە روو ناکاتە زانینێکی «تیۆرییانە»، بەڵکو روو دەکاتە تێگەیشتنێکی «پێشتیۆرییانە»، واتا تێگەیشتنێکی پرێرێفلەکسیڤ (نەپەرچاوە) کە هەمیشە پێکەوە لەتەك «لێرەبوون»دا دراوە. ئێستاش گەرەکە مرۆڤ بەم تێگەیشتنە راستەوخۆیەی بوون بزانێ. مەبەستی هایدێگەر بریتییە لە «رادیکالیزەکردن (...) ی تێگەیشتنی پێش-ئۆنتۆلۆژییانەی بوون»، لێرەشدا ئامانجەکەی بریتییە لە «ئۆنتۆلۆژییەکی بناغەیی».

شێوازی بوونی مرۆڤ بریتییە لە لێرەبوون، ناوەرۆکی ئەم لێرەبوونەش بریتییە لە ئەکزیستێنس. بێگومان واژەی «ناوەرۆك» لێرەدا واتای ناوەرۆکی رەگەز یان گشتێتی بە پێچەوانەی تایبەتێتییەکەی هەر ئیندیڤیدێك ناگەیەنێ، بەڵکو ناوەرۆك وەك بوونی راستەقینە لەتەك ئەکزیستێنسدا یەکدەگرێتەوە، ئەمەش بێگومان لە واتای کرداری (VERB)ی «ئەکزیستێنسکردندا» (EXISTIEREN). کێشەکە روو دەکاتە جۆر و شێوازی «ڤێهەیە»ی کەسێك و هایدێگەر دەیەوێ بە شرۆڤەیەکی لێرەبوون (ئەکزیستێنس) پەچەی لەسەر هەڵماڵێ. کاتێك فەلسەفەی ترادیسیۆنی دەپرسێ: «مرۆڤ چییە؟»، ئەم پرسیارەش بە هەمان شێوەی پرسیاری «درەختێك چییە؟» یان «بەردێك چییە؟» دەکات و لێرەدا مەبەستەکەی روو دەکاتە جەوهەری گشتیی رەگەزەکە، پاشان مرۆڤ لەژێر تێگەی «زیندەوەر»دا دادەنێ، ئەوا راڤەی لێرەبوون بە پێچەوانەوە لەم پرسیارەی «مرۆڤ چییە؟»دا روو دەکاتە «ـە»یەکە (IST / IS). بەلاٌم ئەم «ـە»یەی مرۆڤ لە کرۆکەوە جیاوازە لە «ـە»ی بابەتەکان، ئەویش لەبەرئەوەی مرۆڤ بە پێچەوانەی بابەتەکانی دیکەوە، دەتوانێ سەبارەت بە خودی خۆی و مەغزای بوون بپرسێ. شێوازی بوونی مرۆڤ هەمیشە پێکەوە لەتەك تێگەیشتنێکی بووندا دراوە، بەلاٌم ئەم تێگەیشتنە تێگەیشتنێکی زانستییانەی یان مێتافیزیکییانەی لێرەبوونی شتەکان و سەبژێکتەکان نییە و لەژێر کاتیگۆریی ئامادەییدا (ANWESENHEIT) دیاری کرابێ، بەڵکو پێشتێگەیشتنێکە کە مەرجی پێشبینی و دەربرینە دەرئەنجامێنراوە زانستی و مێتافیزیکییەکانە و هاوکات شێوەیەکی حەشارنەدراویی بوون پیشان دەدات، بێگومان حەشارنەدراوییەك کە دەشێ بەرانبەر وشەی «راستی» لای گریکەکان دابنرێ، ئەم وشەیەش لە کرۆکدا واتای «حەشارنەدراوی»، «دانەپۆشراوی» دەگەیەنێ.

بەم پێیە مێتۆدی شرۆڤەی لێرەبوونمان لەلایەن هایدێگەر بۆ روون بۆوە: هایدێگەر بەرێی

فێنۆمێنۆلۆژییەوە پابەندە بە هوسەرلەوە، بەڵام هاوکات خۆی لێ جیادەکاتەوە. کاتێك کێشەکەی هوسەرل ئاراستەی فێنۆمێنۆلۆژییەکی ترانسێندێنتال دەبێتەوە و ئامانجی ئەم فێنۆمێنۆلۆژییەش بریتییە لە زانینی یان لێڕوانینی جەوهەر کە هوسەرل بە مێتۆدی پوختاندنی (ڕێدوکسیۆنی) فێنۆمێنۆلۆژییانە، واتا بەڕێی دەرکەوانەخستنی لێرەبوونی فاکتییەوە یان مێژووییەوە ئاوەڵای دەکات و لێرەشەوە ئینجا بە منێکی ترانسێندێنتال دەگات، ئەوا کێشەکەی هایدێگەر بە پێچەوانەوە بریتییە لە تێگەیشتنی لێرەبوونی فاکتی لەنێو ژینجیهان و مێژووی ژیانییدا، ئەمەش ئەو واتایە دەگەیەنێ کە کێشەی هایدێگەر ڕوو دەکاتە دازاین وەك ئەو بوونەوەرە کە لەنێو بوونیدا لە خۆی تێدەگات و خۆی ڕاڤە دەکات، کەواتە کێشەکەی هایدێگەر کێشەیەکی هێرمینیۆتیکییە.

لەبەر ئەوەی مرۆڤ وەك ئەو بوونەوەرە دەردەکەوێ کە کێشەکەی لەنێو بوونی خۆیدا ڕوو لە خودی ئەم بوونەی دەکات، ئەم بوونەش هەر لە سەرەتاوە لەنێو و لەتەك ئەکزیستێنسکردنەکەی ئەو خۆیدا بە ئەو ئاشنایە و بۆی کراوەیە، ئەمەش بێگومان پێش ئەوەی تێگەیشتنی تیۆرییانەی فەلسەفی بەسەریدا بەکار ببرێ، ئەوا گەرەکە ئەم تێگەیشتنە سەرچاوەییەی بوون هەڵبدرێتەوە. بەڵام ئەم هەڵدانەوەیە بە یاریدەی کاتیگۆری ئەنجام نادرێ، واتا بە یاریدەی تایبەتمەندییەکانی ناوەرۆك ئەنجام نادرێ، بەڵکو تەنها بەڕێی ئەکزیستێنسیالەوە شیاوی ئەنجامدانە، لێرەشدا سێ دانەیان ڕوواتان. ئەم سێ ئەکزیستێنسیالە لە پێکهاتە بناغەییەکەی دازاینەوە، واتا لە لە-نێو-جیهان-بوونەوە دەکەونەوە و بریتین لە: ١) جیهانێتی؛ ٢) لەتەك-بوون و خۆبوون؛ ٣) لەنێو-بوون (IN-SEIN)، ئەمیش بەتایبەتی وەك دۆخ (BEFINDLICHKEIT) و تێگەیشتن، ئینجا ئەم سێ ئەکزیستێنسیالە لەنێو تێگەی زۆرگە (SORGE)دا خۆیان دەبیننەوە.

## 1-لە-نێو-جیهان-بوونی دازاین

هایدێگەر بونیادە بناغەییەکەی دازاین وەك لە-نێو-جیهان-بوون دیاری دەکات. بەڵام پێدەچێ ئەم ناونیشانە بە هەڵەتێگەیشتنێکی دوولایەنە بخاتەوە: ڕەنگە مرۆڤ لە حاڵەتی یەکێکیاندا وای بۆ بچێ کە هەروەك مەبەستی هایدێگەر لە لە-نێو-بوون بریتی بێ لە شێوەیەکی «تێدابوون»، واتا مرۆڤ شوێنەکییانە لە جیهاندا بێ؛ گەر ئەم جۆرە لێتێگەیشتنە وەربگرین، ئەوسا مرۆڤ سەر بە سەرجەمی بوونەوەرەکان دەبێ، ئەم سەرجەمەش وەك باوە ناو دەنرێ «جیهان» و مرۆڤیش بە هەمان شێوەی شتەکانی دیکە لە نێویدا دەبێ. بەڵام مەبەستی هایدێگەر بە هیچ شێوەیەك ئەمە نییە. تێگەیشتنێکی دیکە لە لە-نێو-بوون دەشێ بە چەشنێك بێ، هەروەك مەبەستی هایدێگەر بریتی بێ لە سەبژێکتێکی سەرچاوەیی بێجیهان و ناچار بێ بۆ پەیوەندیکردن بە ئۆبژێکتەکانی جیهانی دەرەوەی خۆی و لە کایە ناخەکییەکەی خۆی بچێتە دەرەوە. بەڵام مەبەستی هایدێگەر ئەمەش نییە.

لە-نێو-بوون، وەك ئەکزیستێنسیال، بەڕێی ناسینی ئۆبژێکتیڤییانەی جیهانەوە نایەتە گۆڕێ، بەڵکو لە-نێو-بوون خۆی مەرجی ئەو ناسینە ئۆبژێکتیڤییە پێکدەهێنێ و واتای «ئاشنایی لەتەك»، «لە نزیکەوە بوونی»، «قەرارگرتن لە دەڤ جیهان» دەگەیەنێ. هایدێگەر ئەم «هەمیشە-لە-لا-ی-شتێك-بوون»ـە لە ڕووی ئێتیمۆلۆژییەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ وشەی «ئیننان» (INNAN) کە وشەیەکی ئەڵمانیی کۆنی باڵایە و واتای «گوزەران-تێدا-کردن» (بە ئەرەبی: سکن) دەگەیەنێ، یان هایدێگەر دەیگەڕێنێتەوە بۆ هابیتارە (HABITARE)، واتا «نیشتەجێبوون لە نێو ...». هەروەها جیهان لە لای هایدێگەر واتای جیهانی بابەتی ناگەیەنێ، کەواتە ئەو جیهانە بابەتییە نییە کە بێلایەن و بێپەیوەندی بەرانبەر مرۆڤ وەستابێتەوە و لە لایەنی خۆیەوە پرسیارێکی ئەوتۆ سەبارەت بەوە بخاتەوە کە داخۆ چۆن مرۆڤ وەك سەبژێکت بە

ئۆبژێکتەکان بگات. ئەم جۆرە پرسیارانەی فەلسەفەی ترادیسیۆنی هیچ ئاشناییەکیان لەتەک شێوازی بوونی دازایندا نییە، واتا لەتەک ئەو دازاینەدا کە هەمیشە لە لای شتەکان و جیهانێکە. بابەتە دەرەکییەکان هەمیشە بە ئاشناییەکی کەم یان زۆر بە مرۆڤ دەگەن و بۆ مرۆڤ واتای شتێك دەگەیەنن، واتا ئاماژە بۆ شتێك دەکەن، یان داوای شتێکی لێدەکەن، یان لەبەردەستیدان، بۆ نموونە وەك ئەو بوونەوەرە کە هایدێگەر ناوی دەنێ «تسۆیگ» (ZEUG = ئامراز). مۆرکی ئامراز بریتییە لە شیمانەی سانای بەکارهێنان و لە خزمەتدابوونەکەی، هەروەها خۆی هەمیشە لەنێو پەیوەندییەکی ئاماژە و کاراییدا دەبینێتەوە و ئەم پەیوەندییەش لەنێو بۆ-خاتریی (UM-WILLEN) دازایندایە. گەر کەسێك بڵێ کە مرۆڤ لەنێو شێوازی لە-نێو-جیهان-بووندا ئەکزیستێنیس دەکات (EXISTIERT)، ئەوا لێرەدا مەبەستی لەوەیە کە ئەم جیهانە هەر لە سەرەتاوە بۆ مرۆڤ (ـەکە) ئاوەڵایە (ERSCHLOSSEN)، ئەمەش بە چەشنێك کە ئیتر پێویست ناکات مرۆڤەکە پردێك رووەو جیهان رابکێشێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە جیهان لەسەر شێوازێکی زۆر رەسەن هەمیشە هەر لە ئێرەیە. ئێمە دەتوانین لە لە-نێو-جیهان-بوون وەك سەرهەڵدانی مرۆڤ لەنێو پەیوەندیی واتادا تێبگەین.

## 2-جیهانێتی

لەنێو رۆژانەوە شیمانە بۆ پیشاندانی ئاشنایەتییەکەی دازاین بە بابەتەکانەوە دەرەخسێ. ئەو جیهانە کە سەرەتا بە ئێمە دەگات، جیهانی دەورمانە (UMWELT = شوێنەوار)، هەروەها ئەو بوونەوەرە کە ئێمە رۆژانە لەتەکیدا مامەڵە دەکەین، بریتی نییە لە شتێکی تەنها هەبوو / لەگۆڕێدابوو (VORHANDENES). واتا ئەو بوونەوەرە ئۆبژێکت نییە لە واتای ئۆبیسەرەی لاتینیدا (OBICERE = لە-بەردەم-خۆ-دانان، «بەرانبەر-خۆ-دانان)، بەڵکو «بەردەستێکە» (ZUHANDENES)، واتا شتێکە لە بەردەستی کەسێکدا کەوتووە، لە بەردەستدایە، خۆی بە دەستەوە دەدات، بەڵام هەروەها دەشێ ئەو شتە لەسەر رێگە کەوتبێ. ئەو شتە لە واتایەکی پراکتیکیدا بریتییە لە «تسۆیگ» (ئامراز). پیشاندانی ئەم جیاوازییە لە نێوان هەبوون و بەردەستیدا یەکێکە لە گرنگترین و رەسەنترین کار لە فەلسەفەکەی هایدێگەردا و ئەنجامدانی بەبێ شرۆڤەی لێرەبوونییانە نەشیاو دەبوو. گەر لە رووی ترادیسیۆنییەوە بروانین، دەبینین کە ئۆبژێکت وەك هەبوو / لەگۆڕێدابوو لێدەروانرا، وەك بابەتی پەرچاندنی تیۆرییانە، وەك بابەتی زانست، واتا وەك بابەتی لێروانینی میانەگرتوو دادەنرا. بەڵام بەردەستی بە پێچەوانەوە تێگەیەکە کە شتەکان لە نزیکترین مامەڵەکردندا دیاری دەکات: واتا وەك مامەڵەکردنی پراکتیکی. پێش ئەوەی شتەکان لە لێروانینی میانەگرتووی تیۆرییانەدا بەر دیدمان بکەون، پراکتیکییانە پێمان دەگەن. مۆرکی هەڵوێستی پراکتیکی بەرانبەر بە شتەکان بریتییە لە «ئاگالێبوون» (UMSICHT)، بەڵام مۆرکی هەڵوێستی تیۆرییانە بەرانبەر بە شتەکان بریتییە لە «لێروانین» (HINSICHT). هەڵوێستی پراکتیکی واتای تێگەیشتن و دەرکەوتن لەنێو پەیوەندیی ئاماژە و بناغەدا دەگەیەنێ و گەر ئێمە ئەم ئاگالێبوونە نەهێڵین (AUFHEBEN = هەڵگرتن) یان هەڵبگرین، ئەوسا ئێمە لە ئاشنایەتیی بابەتەکان دوور دەکەوینەوە و دەستبەرداری جیهان دەبین. گەر تیۆرییەکی زانین روو بکاتە جیهان یان سروشت و تەنها وەك هەبوو / لەگۆڕێدابوو دایبنێ، وەك چۆن زانستەکان پێیهەڵدەستن، ئەوسا ئەو تیۆرییەی زانین کارەکتەری لەجیهانخستنی (ENTWELTLICHUNG) جیهان وەردەگرێ.

هایدێگەر بە نموونەی ئامراز (تسۆیگ) پیشانی دەدات کە چۆن هەمیشە پەیوەندییەکانی ئاماژە هەر لە سەرەتاوە ئاشکرا کراون. هەرگیز ئامرازێك خۆی لەنێو سەربەخۆیی و دابراویی تەواودا نابینێتەوە، بەڵکو ئەو ئامرازە شتێکی بەکارهێنانە و ئەم شتەیش ئاماژە بۆ شتێکی دیکە دەدات، جا ئەمە «بۆچی»ی

بەکارهێنانەکەی بێ، «لەکوێوە»ی دروستبوونەکەی یان «لەچییەوە»ی کەرەسەکەی و هتد بێ. ئێمە دەتوانین ئەم کێشەیە بە نموونە بەناوبانگەکەی هایدێگەر لەسەر چەکوش روون بکەینەوە. چەکوش بۆ ئەوە لێرەیە تاکو بزمار دابکوتێ، بزمار بۆ ئەوە لێرەیە تاکو کۆڵەکە بچەسپێنرێ، کۆڵەکە بۆیە لێرەیە تاکو خانوویەك دروست بکرێ، خانوویەك بۆیە لێرەیە تاکو مرۆڤ لە کەشی نالەبار بپارێزێ و هتد. هەموو ئامرازێك، جا ئامرازی دوورین یان نووسین بێ، ئامرازی پێڵاو یان فڕین یان ئاژووتن بێ، یان ئەو ئامرازە بێ کە مرۆڤ لەبەری دەکات و ناوی پۆشاکی لێدەنێ، خۆی لەنێو پەیوەندییەکی ئاماژەداندا دەبینێتەوە، ئینجا تەنها کارابوونی ئاسایی شتەکانی بەکارهێنان سەرهەڵدەدات. لەبەر ئەوە کە پەیوەندییەکی ئاماژەدانی بەم چەشنە هەمیشە لەنێو بوونەوەرەکەدا ئاشکرا کراوە، ئەوا کاتێك مرۆڤ مامەڵەیەکی پراکتیکی لەتەك ئامرازدا دەکات، ئەوا بەردەستییەکە نابێ بە کێشە، بەڵکو بەردەستییەکە شتێکی ئاساییە و کەسی کردارنوێنیش هیچ پەرچاندنێك لەبارەی ئەنجام نادات. بەڵام دوای ئەوە کە ئامرازەکە چیدی کارا نابێ (واتا فونکسیۆن ناکات)، ئیتر ئەو ئامرازە لەنێو پاسیڤێتییەکەی خۆیەوە دێتە دەرەوە و هاوکات مرۆڤیش لە کارایییەکەی پێشینی ئەو ئامرازە بەئاگا دێتەوە. ئێستا ئەو ئامرازە چیدی بەردەستی نییە و مرۆڤیش ناچارە بەهۆی بەرچاوکەوتووییەکەیەوە رەچاوێك ئاراستەی بکات، بەم شێوەیە ئەو ئامرازە دەبێ بە تەنها هەبوویەك / لەگۆڕێدابوویەك.

هایدێگەر لە حاڵەتی لە کارکەوتندا سێ پلە دیاری دەکات: ١) بەرچاوکەوتوویی (AUFFÄLLIGKEIT)؛ ٢) سەغڵەتکەری (AUFDRINGLICHKEIT)، ٣) گیریی (AUFSÄSSIGKEIT). پلەی یەکەم بریتییە لە زیانپێکەوتوویی، واتا ئامرازەکە چیدی کارا نییە، ئەم حاڵەتەش کاتێك دێتە ئاراوە، گەر ئامرازەکە چیدی شیاوی بەکارهێنان نەبێ، جا هۆی ئەمە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە کەرەسەکەی چیدی گونجاو نییە، یان لەنێو خودی ئامرازەکەدا خەلەلێك هاتبێتە ئاراوە. سەغڵەتکەری واتای پلەیەکی بەرزتری نابەردەستی دەگەیەنێ. چیدی-لەبەر-دەستدا-نەبوون کاتێك دێتە ئاراوە، گەر مرۆ هەست بە دیارنەمانی شتێك بکات، گەر شتەکە لەبەردەستدا نەبێ. گیری ئەو حاڵەتەیە کە تێیدا شتێك لەسەر رێ کەوتووە، لەم لا و لا کەوتووە، یان مامەڵەکردنی پراکتیکی تێکدەدات، یان رێ بە کەسێك دەگرێ.

### ٣-لەتەکبوون ( DAS MITSEIN )

دازاین تەنها لە-نێو-جیهان-بوون نییە و ئامراز بخاتەوە، بەڵکو هاوکات لە-نێو-جیهان-بوون-ێکی ئەوتۆیشە کە لەتەك-لێرەبوون ی ئەوانی دی دەخاتەوە. ئەوانی دی بە یەکدەگەن، بێگومان ئەوان بە شێوەیەکی مشورخۆرانە بەیەك دەگەن، بۆ نموونە لەو شێوەیەدا کە چەکوشەکە لەلای کەسێك کڕراوە، سەعاتەکە لە لایەن فلان جەناب یان فلان خانمەوە بەدیاری هێنراوە. ئەوانی دی لەنێو ئەم جۆرە کۆنتێکستانەدا وەك دروستکەر، نێرەر، کڕیار، دیاری پێبەخشراو و هتد دەردەکەون.

بەڵام لێرەش دەبێ رێ لە بەهەڵەتێگەیشتن بگرین. لەتەکبوون نە واتای هەبوونی سەبژێکتانی دی لە دەرەوەی هەبوونی خۆ دەگەیەنێ و لێیان ئەم هەبوونەی خۆ جیابوویبێتەوە، نە واتای هەبوونی بەردەوامی پەیوەندی لەتەك مرۆڤانی دیکەدا دەگەیەنێ. بە پێچەوانەوە، لەتەکبوون، وەك ئەکزیستێنسیال، مەرجی بەیەکگەیشتنە لەتەك ئەوی دی یان ئەوانی دی، مەرجە بۆ هەبوونی داڵدە یان تەنیایی. هەروەها کراوەیی دازاین بۆ ئەوانیدی پێشمەرجێکە چ بۆ هەر خۆدەربڕین و خۆدرکاندنێك و چ بۆ هەر خۆداخستن و نامۆبوونێك.

بێگومان ئەوانی دی وەك ئامراز پەیداناکرێن (BESORGT)، بەڵکو ئێمە بۆ ئەوان مشوورمان (FÜRSORGE) هەیە، ئەمەش نەك لە واتایەکی کۆمەڵایەتی-ئێتیکیدا، بەڵکو لە واتایەکی

ئەکزیستێنسیالیستیدا. شێوازەکانی مشوور بریتین لە خۆشەویستی، ئاگاداری، رێز، گرنگیپێدان، بەلای یەکتریتێپەڕبوون.

بەڵام لە کایەی لەتەکبووندا پرسیارێك سەبارەت بە «کێ»ی دازاین و لەتەکبوون سەرهەڵدەدات. وەڵامەکەی هایدێگەر سەیرە: کێی دازاین نە ئۆنتۆلۆژییانە ناوەڕۆکە و نە رێزمانییانە سەبژێکتە، واتا بریتی نییە لە منی رستە، بەڵکو بریتیە لە داس مان (DAS MAN): مەردوم. خود سەرەتا و بەزۆریی وەك مەردوم بە ئێمە دەگات. مەردوم بریتییە لە شێوازی لێرەبوونی ناخۆیی (UNEIGENTLICH)[1] و لێرەدا جاریێ دازاین شیمانە خۆییەکانی بەدەست نەهێناوە، بەڵکو دەرفەت دەدات لە لایەن ئەوانی دییەوە رابەری بکرێ و پێیانەوە پابەند بێ. گەر بە پوختی واتای «مەردوم» بگرین، ئەوا دەبینین کە «مەردوم» بریتی نییە لە خۆیەتی، بەڵکو واتای هەڵاتن لە توانین بۆ بوونی خۆیی (SEIN-KÖNNEN) دەگەیەنێ، ئەمەش هەڵاتنە رووەو ئەوە کە ئەوانیدی بۆچوونیان لەسەری هەیە، کە ئەوانیدی دەیبێژن، دەیانەوێ، دەیکەن. هایدێگەر پەیوەست بەمەوە دەبێژێ:

«ئێمە چێژ و شادی دەبینین، وەك چۆن مەردوم چێژ دەبینێ؛ ئێمە دەخوێنینەوە و دەبینین، بریار بەسەر ئەدەب و هونەردا دەدەین، وەك چۆن مەردوم دەبینێ و بریار دەدات؛ بەڵام ئێمە هەروەها لە "ئاپۆرە" (NDAS GROSSE HAUFE) دوور دەکەوینەوە، وەك چۆن مەردوم دوور دەکەوێتەوە؛ ئێمە ئەو شتە وەك مایەی "توورەبوون" دەبینین، کە مەردوم وەك مایەی توورەبوون دەیبینێ» (SEIN UND ZEIT, S. 126 F.).

لەبەرئەوەی مەردوم دیاریکراو نییە، بەڵکو گشتێتییە، ئەوا مۆرکەکەی بریتییە لە مامناوەندێتی و تەختکردنی سەرجەم شیمانەکانی بوون. ئەم مەردومە بریتی نییە لەم یان لەو دیاریکراوە، هەروەها کۆی هەمووانیش نییە، بەڵکو نیوترومە (جەمادە)، بریتییە لە نادیاری (ئانۆنیومێتی). کەچی ئێمە لە بنەرەتدا دەمانەوێ مەردوم بین، ئەویش چونکە باری بوون لەسەرمان سووك دەکات. ئەمە بۆ نموونە لە حاڵەتی تاوان و بەرپرسیاریدا دەردەکەوێ: هەموو لە تاوانەکەدا بەشدار بوون و هیچ کامێکیان ئەو تاوانەی ئەنجام نەداوە. هەموو تاکێك دەتوانێ خۆی لە پشتی گشتێتییەوە حەشار بدات.

هایدێگەر ئەکزیستێنسی ناخۆیی/نارەسەن (UNEIGENTLICH) و خۆیی/رەسەن (EIGENTLICH) لە یەك جیا دەکاتەوە. لە حاڵەتی ئەکزیستێنسی ناخۆییدا، واتا لە حاڵەتی "مەردوم"دا، شیمانەکانی بوون داپۆشراون و تەنها بەرێی هەڵدانەوەیانەوە شیاوی بردنەوەن.

## 4-دۆخ و تێگەیشتن

دۆخ لای هایدێگەر واتای دۆخی هەستەکی (STIMMUNG) دەگەیەنێ. لە دۆخدا حاڵی هەستەکییانەی کەسێك یان خودی جیهان دەردەکەوێ. بەڵام ئەمە واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێ کە جیهان لەنێو دۆخدا پێش هەر زانینێکی هزرڤانانە و تیۆرییانە ئاشکراکراوە (لەبارەی زانراوە)، جا ئەمە لە حاڵەتی ترسدا بێ وەك مەترسی یان پەخشاندنی ترس، یان لە حاڵەتی شادمانیدا بێ وەك ساکارێتی و جۆشداری کە تێیدا هەموو شتێك لە رەنگی ئاڵوواڵادا دەردەکەوێ. بێگومان نابێ ئێمە لەمە ئاوها تێبگەین کە هەروەك جیهان پێش دۆخی هەستەکی و سەربەخۆ لەو هەستە درابێ و تەنها لە هەستپێکردندا بە شێوەیەکی سەبژێکتیڤی رەنگین ببێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە دۆخی هەستەکیدا جیهان لەنێو ئاوها-بوون-یدا ئاشکرا کراوە.

ئەم ئەکزیستێنسیالەش پیشانی دەدات کە ئەوە هزر نییە، یان توانستی رووکردووە ناوەڕۆك نییە کە رۆڵی سەروەر دەنوێنێ، وەك چۆن ئەمە لە فەلسەفەی ترادیسیۆنیدا نوێنەرایەتی دەکرا، بەڵکو ئەوە دۆخی

هەستەكییە، ئەوە هەستە یان دۆخی جەستەییە كە لە ئاشكراكردنی شێوازی ئەكزیستێنسی جیهاندا، یان پوختتر ببێژین، لە شێوازی لە-نێو-جیهان-بووندا، كاریگەرە.

دووەم لایەنی بناغەیی لە ئاشكراكردنی جیهاندا بریتییە لە تێگەیشتن. بەڵام رەنگە مرۆڤ بەهۆی بەرانبەریەكدانانی شێوازی تێگەیشتنی پێشزانستی و زانستییەوە وای بۆ بچێ كە هەروەك تێگەیشتن لای هایدێگەر وەك دژبەری روونكردنەوە دابنرێ، بەڵام ئەمە راست نییە. هەروەها تێگەیشتن لای هایدێگەر بەرانبەر بناغەرشتن دانەنراوە، بەڵكو لە واتای «توانین بۆ بوون»دا دایناوە. ئەم جۆرە تێگەیشتنە پشت بە شێوازی ئۆنتییانەی ئاخافتن دەبەستێ، واتا «شتێك بتوانرێ»، «دەرەقەتی شتێك هاتن»، «پەیبردنی خۆ بە شتێك». مەبەستی ئەمەش لە رووی ئەكزیستێنسیالیستییەوە ئەوەیە كە دازاین بە شێوەیەكی زانینمەندانە (كۆگنیتیڤ) لە خودی خۆی و شتەكان تێناگات، بەڵكو پێشزانینمەندانە لەبارەیان دەزانێ. ئەمەش بەتەواوی بریتییە لە هەڵگێڕانەوەی رستە دێكارتییەكەی «من دەهزرێم، كەواتە من هەم» بۆ رستەی «من هەم، كەواتە من دەهزرێم».

ئەم تێگەیشتنە لەو شێوەیەدا نییە كە هەروەك دازاین بریتی بێ لە رەچاوكەرێكی بێلایەنی خۆی و جیهان، یان سایكۆلۆژییانە، واتا ئاراستەوەرگرتوو رووەو روانینی ناخی خۆی، هەڵوێست رووەو خودی خۆی وەربگرێ، بەڵكو تێگەیشتن بۆ هایدێگەر واتای پرۆژەیاندن (ENTWERFEN) دەگەیەنێ. لەم روانگەیەوە دازاین پرۆژەی توانا بۆ بوونی خۆیی (رەسەن) یان ناخۆیی (نارەسەن) پەیوەست بە شیمانەكانی خۆیەوە دادەنێ و بەم رێیەشەوە ئاشكرا دەكات. دازاین كە بۆ نێو لێرەبوون، بۆ نێو فاكتیسیتێ فڕێدراوە، هاوكات پرۆژەی (ENTWURF) شیمانە خۆییەكانێتی.

## 5-دازاین وەك زۆرگە

كێشەكە هەتا ئێستا بریتی بوو لە دیاریكردنی لایەنە بناغەییەكانی دازاین: دازاین وەك لە-نێو-جیهان-بوون. بەدووی ئەمەدا گەرەكە روو بكەینە یەكێتیی ئەم لایەنانە، واتا روو بكەینە سەرجەمێتییەكەی دازاین. بێگومان پێویستە لێرەدا سەرەتا جەخت لەوە بكەین كە كێشەكە لە حاڵەتی ئەم سەرجەمێتییەدا واتای پێكەوەلكاندنێك یان ئاوێتگەراییەك ناگەیەنێ، بەڵكو كێشەكە بەندە بە یەكێتییەكی سەرچاوەییەوە. لە پاشخانی ئەم كێشەیەدا تێزەكەی تیۆریی گێشتالت خۆی دەبینێتەوە كە دەڵێ سەرجەم لە كۆی كەرتەكان گەورەترە و تەنانەت شێوە و دەركەوتنی كەرتەكانیش دیاری دەكات. ئەم یەكێتی و سەرجەمێتییەش بۆ هایدێگەر بریتییە لە تێگەی «زۆرگە» (SORGE).

بەڵام گەرەكە لەم حاڵەتەشدا رێ لە بەهەڵەتێگەیشتن بگرین. مەبەستی هایدێگەر لە زۆرگە بریتی نییە لە خەمخۆری (BESORGNIS)، بەتەنگەوەهاتن (KÜMMERNIS)، دا-ماوی (NIEDERGESCHLAGENHEIT)، ئینجا لێرەوە سەرهەڵدانی خۆزگاندن (WÜNSCHEN) و ویستن (WOLLEN) – ئاخر ئەمانە تایبەتمەندیی ئۆنتین (بوونمەندین). بە پێچەوانەوە هایدێگەر لە مەغزایەكی فوندامێنتال-ئۆنتۆلۆژییانەی ئەكزیستێنسیالیستیدا تێگەی زۆرگە دیاری دەكات، واتا مەبەستی هایدێگەر بریتییە لە بوونی دازاین كە لە فۆرمولێكی سیانەتیی ئاڵۆزدا پێناسەی دەكات وەك: «خۆ-هەر-لە-سەرەتاوە (پرۆژە) -پێشتر-هەبێ-لە-نێو-جیهاندا (فڕێدراوی) وەك بوون-لای-بوونەوەری-لە جیهاندا-پێگەیەر (داوەشان)».

هایدێگەر تێگەی زۆرگە پەیوەست بە پێكهاتە ناسراوەكەی مرۆڤەوە وەك لەش و دەروون یان وەك ئەرد و هۆش روون دەكاتەوە. سەرچاوەی بوونی مرۆڤ بریتییە لە زۆرگە و هەتا ئەو بژی، لەژێر ركێفی ئەم

سەرچاوەیەدایە. بەم پێیە لە-نێو-جیهان-بوون، گەر بوونمەندییانە بیگرین، شەقڵی زۆرگەی وەرگرتووە.

ئەم فۆرمولە سەیرەی زۆرگە وەك «هەر-لە سەرەتاوە-هەبێ-لە-نێو-جیهاندا وەك بوون-لای-بوونەوەری-لە جیهاندا-پێگەیەر» مەبەستی لەمەیە: دازاین هەمیشە لەنێو جیهاندایە، بەڵام لەنێو جیهانێکی تایبەتیدایە و بەڕێی رەچەڵەك و زایینەوە، پەروەردە و پێگەیاندنی فێرگەییەوە، زمان و کۆمەڵگەیەکەوە، شەقڵی پێدراوە. دازاین بریتییە لە فاکتیسیتێ، لە فڕێدراوی (GEWORFENHEIT)، بەڵام کاتێك دازاین لە لایەکی دیکەوە بونیادی پرۆژە لە خۆ دەگرێ، ئەوا ئەو خۆی روونکردنەوەی مەغزا و تێگەیشتنی شیمانەکانییەتی، هەروەها ئەو (لە حاڵەتی سێیەمدا) وەك مۆدوسی (شێوازی) داوەشاوی لە لای بوونەوەری لەنێو جیهان پێگەیەردا دەردەکەوێ و دەبێ بەناچاری خۆی لەو بوونەوەرە رابپسکێنێ. بەڵام بۆ هەڵبژاردن (ئیختیار)، بۆ بڕیاردان بۆ خۆیەتیی یان ناخۆیەتیی دازاین، پێوەرێك گەرەکە، لێرەشدا پرسیارەکە ئەوەیە کە داخۆ ئەم پێوەرە لە کوێوە بێ، یان: ئایا دازاین لە کوێوە دەزانێ ئەو پێویستە چی بکات و خۆیەتییەکەی لە چیدایە؟ ئایا کریتێرێك هەیە کە ئەم خۆیەتییە پیشانی دازاین بدات؟ هایدێگەر ئەم پێوەرە لە دەنگی ویژداندا دەبینێتەوە. دازاین لەنێو دەنگی ویژداندا بانگی خۆی لە «مەردوم»ـەوە، لە دازاینی ناخۆییەوە / نارەسەنەوە رووەو خۆییترین توانا-بۆ-خۆ-بوون دەکات. بەڵام لێرەش دەبێ رێ لە بەهەڵەتێگەیشتن بگرین. بانگی ویژدان نە هاوشێوەی دەنگی خودایە و نە لە خزمەتی بەدیهێنانی نۆرمێکدا روو دەدات. کەواتە بانگی ویژدان دازاین ناخاتە بەردەم رێکخراوێکی بەهاییانەی مێتافیزیکی و ئەویش خۆی بەو رێکخراوە بەهاییە بپێوێ. لەم روانگەیەوە بەو بانگە هیچ شتێکی تایبەتی ناخرێتە بەردەم دازاین، بۆ نموونە وەك «تۆ گەرەکە ئەمە و ئەمە بکەیت، بەڵام ئەوە نەکەیت!». بانگی ویژدان بە پێچەوانەوە دازاین دەخاتە بەردەم خودی ئەو خۆی، بەردەم فڕێدراوییەکەی، فاکتیسێتییەکەی، دوایەکێتییەکەی.

بانگی ویژدان لە دازاین دەگەیەنێ کە ئەو خەتابارە / گوناهبارە، مەبەستی ئەمەش نە خەتاباربوونێکی چالاکە ونە پشتگوێخستنێکی پاسیڤی چاکەیە. هەروەها گوناهی رەچەڵەکییانەی مرۆڤیش نییە و تیۆلۆژییانە دیاری کرا بێ، بەڵکو ئەوە تەنها هیچێتییە کرۆکییەکەی دازاینە. ئەم هیچێتییە خۆی لە دوایەکێتییەکەی دازایندا دەبینێتەوە. بەڵام مرۆڤ بەڕێی هەڵبژاردنی خۆیەوە بە خودی خۆی دەگات و بناغەی خۆبوونەکەی دەڕێژێ، لێرەشدا ئەم بناغەیە لە مەغزایەکی جووتەنیدا وەك هیچ (NICHTIG) دەردەکەوێ: هەڵبژاردنەکە لە لایەك خۆی وەك فڕێدراوی بۆ نێو هەر شیمانەیەکی هەبووی لەنێو دۆخدا دەستگیرکراو دەبینێتەوە و هەرگیز بەتەواوی شیاوی کۆنترۆلکردن نییە — ئەمە لە بنەڕەتدا کرۆکی کارەکتەری فڕێدراوی پێکدەهێنێ؛ بەڵام لە لایەکی دی هەڵبژاردنەکە هەمیشە و لە هەموو جێیەك وەك هیچ (NICHTIG) دەردەکەوێ، ئەویش چونکە ریالیزەکردنەکەی هەردەم واتای بڕیاردان بۆ شیمانەیەکی تایبەتی دەگەیەنێ و لێرەدا شیمانەگەلی دیکە کە هەڵنابژێررێن، بەدەر دەکرێن.

ئەم شرۆڤانە کە هەتا ئێستا ئەنجامامان دان، پیشانی دەدەن کە تێڕوانینە ئەکزیستێنس-فەلسەفییەکانی هایدێگەر نزیکییان لە پێشبینییە ئایینی و تیۆلۆژییەکان هەیە، ئەمەش نەك تەنها لەوەدا دەردەکەوێ کە هایدێگەر لێرەبوونی بوون وەك زۆرگە دیاری دەکات و بەمەش ئاماژە بۆ زۆرگە (مشوور، خەم)، بۆ رزگاربوونی (خلاص) ئەبەدی دەدات، بەڵکو ئاشکراتریش لەمە ئەوەیە کە هایدێگەر لە ویژدان و گوناه (خەتا) دەدوێ و بەمەش تێگەی تایبەتیی کریستیانی بەکاردەهێنێ.

### ٦-دازاین وەك بوون بەرەو مەرگ ( SEIN ZUM TODE )

دوایەکێتییەکەی دازاین لایەنە بناغەییە دروستکەرەکەی ئەوە. بەڵام نابێ ئێمە لەم تێڕوانینەی هایدێگەر

سەبارەت بە کۆتایی دازاین وا تێبگەین کە هەروەك مەرگ بە دازاینەوە هەڵواسرابێ و لە لەناوچوونی ئەو بەرپرسیار بێ، جا ئەمە کوژاندنەوەی هێڵێکی ژیان بێ یان لەکارکەوتن بێ لە مەغزای کۆتاییهاتنی کاراییە بیۆلۆژی و فیزیۆلۆژییەکاندا. ئەم جۆرە دیاریکردنانە پزیشکین و بریتین لە دەرئەنجاماندن، بەڵام مەرگ لە رووی ئەکزیستێنسیالیستییەوە پێشمەرجیانە.

ئەو کۆتاییە کە بە وشەی مەرگ دەردەبڕرێ، بۆ دازاین واتای تەواو-بوون ناگەیەنێ، بەڵکو ئەو کۆتاییە بوونێکە رووەو کۆتایی، ئەمەش لەو واتایەدا کە دازاین هەمیشە کۆتاییەکەی خۆی لە خۆ گرتووە، هەر بۆیە دازاین خۆی هەمیشە پەیوەندییەکە بە مەرگەوە و ئەمەش مۆرکی مرۆڤە: تەنها مرۆڤ دەمرێ، بەڵام ئاژەڵ بە پێچەوانەوە کۆتایی پێدێ (VERENDET).

ئایا چۆن ئێمە لەم پەیوەندییەی دازاین بە مەرگەوە تێبگەین؟ سەرەتا گەرەکە لەم حاڵەتەشدا رێ لە بەهەڵەتێگەیشتن بگرین. بوون رووەو مەرگ، یان رەوتگرتن رووەو مەرگ، واتای چاوەڕوانی یان هێنانی مەرگ ناگەیەنێ، هەروەها واتای خەریکبوونی بەردەوام بە مەرگەوە یان بیرکردنەوە لێی ناگەیەنێ (وەك چۆن لە چەرخی ناڤیندا دەگۆترا: «بزانە کە تۆ بمریت!»). هەروەها ئەو واتایەش ناگەیەنێ کە مرۆڤ لە چاوەڕوانیی مەرگدا واز لە بەهای بوون بهێنێ. مەبەست لە بوون رووەو مەرگ بریتییە لە رەوتگرتنێك رووەو خۆییترین شیمانەی دازاین خۆی، رەوتگرتنیش واتای شێوازێکی ئاشکراکردن یان نزیککەوتنەوەیەکی لێتێگەییو دەگەیەنێ. خودی ئەم نزیککەوتنەوەیە مەرگ دەناسێ وەك خۆییترین شیمانەی دازاین، بەڵام بێگومان شیمانەیەکی جەخت و هەرگیز دیاری نەکراو، ئەمەش لە خۆئاوەڵاکردن و خۆئاوەڵاهێشتنەوەدا بۆ ئەو کۆتاییە روو دەدات کە هەمیشە هەرەشە لە دازاین دەکات. ئەمە لەنێو دۆخی ترسدا دەردەکەوێ. مسۆگەریی مەرگ وەك مەترسییەکی نەشیاوی خۆلێلادان لەسەر بناغەی تێگەیشتنێك دەردەکەوێ کە لە لایەن ترسەوە دیاریکراوە. هەر بۆیە دروشمەکەی هایدێگەر دەڵێ: «غیرەتت بۆ ترس هەبێ».

### 7-کاتێتی وەك مەغزای زۆرگە

ئێمە لە سەرەوە بینیمان کە هایدێگەر پێناسەی دازاین وەك زۆرگە (مشور / خەم) بۆ خودی خۆ دەکات. دازاین بەردەوام لە خەمی بوونی خۆیدایە، بەڵام ئەم پێناسەیە واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێ کە دازاین لە بەردەم ئەلتەرناتیڤێکدایە: ئەو پرۆژەی خودی خۆی یان رووەو خۆییترین شیمانەکانی بەگەڕ دەخات یان رووەو شیمانەی ناخۆیەتی پابەند بە «مەردوم»-ەوە. پرۆژە بۆ خۆیەتی (رەسەنێتی) لە لایەك رەوتبەستنێکە رووەو مەرگ، بەمەش واتای رەوتبەستنێك رووەو ئاییندە دەگەیەنێ، کەواتە هەمیشە لایەنی ئاییندە لە خۆ دەگرێ و هایدێگەر بە تێگەی «خۆ-لە سەرەتاوە-بوون» (SICH-VORWEG-SEIN) ی دازاین دیاریی دەکات، بەڵام دازاین لە لایەکی دیکەوە بۆ ئەکزیستێنسە فاکتییەکەی فڕێدراوە، واتا بۆ نێو ئەوە فڕێدراوە کە ئەو لە پێش خۆیدا دەیبینێتەوە و هەروەها چۆن ئەو لە پێش خۆیدا دەیبینێتەوە. لەم مەغزایەدا هەموو یەکێك لە ئێمە بۆ نێو جەستەیەکی تایبەتیی بیۆلۆژییانە، بۆ نێو پێکهاتەیەکی هۆشەکی، بۆ نێو زمانێك و کولتوورێك و هتد فڕێدراوە و دیاریکردنیان لە توانای ئەودا نییە. هەر بۆیە دازاین ئێستا رابوردوویش دەهێنێتە نێوانەوە. هایدێگەر بۆ ئەم رابوردووە واژەی «هەبوویی» (GEWESENHEIT) بەکاردەهێنێ. پاشان لەبەر ئەوەی «لێرەکە» (DAS DA) ی هەنووکەیی خۆی لەنێو ئەم پرۆژە پێشینەییەدا بۆ ئاییندە و هەروەها لە گەڕانەوەدا رووەو «هەبوویی» (رابوردوو) دەبینێتەوە، ئەوا مەغزای کاتییانەی ئەم دازاینە بەڕێی یەکێتیی سێ رەهەندەکەی (ئێکستازەکەی / EKSTASE) ئاییندە و هەبوویی و هەنووکەوە دیاری دەکرێ.

هایدێگەر بەم جۆرە دیاریکردنەی بوونی مرۆڤ وەك کاتێتی (ZEITLICHKEIT) زۆر ریشەییانە شێوازی هزرینی مێتافیزیکی دەهیچێنێ. ئاخر ئەم ترادیسیۆنە مرۆڤی سەربەخۆ لە کات، لە مێژوو و دۆخگۆڕی، دیاری دەکرد: لەنێو ئەزەلییەتی سەرمەدیدا، لەنێو ناوەرۆکدا بە ناوکێکی کەسێتییەوە دای دەنا، جا ئەم ناوکە دەروون بووبێ، بوونەوەری هۆشەکی یان ئاوەزدار بووبێ. بەڵام ئەو جۆرە کۆنسەپسیۆنە مێتافیزیکییە دەرەقەتی دوایەکێتی و کاتێتی نەدەهات، ئەویش چونکە بە شێوەیەکی ئۆبژێکتیڤی لە ژیان تێدەگەیشت: ژیان کە لە شێوەی لەئارادابوویەکدا (VORHANDENES) لەنێو کاتێکی بناغەییدا رەت دەبوو، یان بە شێوەیەکی سەبژێکتیڤی لێی تێدەگەیشت وەك زنجیرەیەکی موئایەشەکردنی بهات و برۆ، واتا موئایەشەکردنێك بوو کە سەری ریزەکەی بە زایین سەرچاوەی دەگرت و بە مەرگ کۆتایی دەهات.

لە بنەڕەتدا مەرجی ئەم جۆرە تێگەیشتنە بریتی بوو لە تێگەیشتنێکی پنتییانەی (نوقتەیی) کات بە ئاڕاستەیەکی سەهمئاساوە. گەر ئێمە لەم جۆرە کۆنسەپسیۆنە مێتافیزیکییەوە دازاین بگرین، ئەوسا دازاین تەنها لە پنت-کاتێکی هەنووکەییدا هەقیقی دەبوو و ئینجا وەك ناهەقیقی لە سەرجەم ئەوانی دی، بەڵێ تەنانەت لە زایین و مەرگیش، دابڕاو دەبوو. بەڵام کارەکتەری ئێکستازییانەی ئاییندە و هەبوویی و هەنووکە، کە کۆنسەپسیۆنی دازاین لە لای هایدێگەر وەك «خۆ-لە سەرەتاوە-بوون»، وەك رەوتبەستن رووەو مەرگ، هەروەها وەك گەڕانەوە بۆ لای خودی خۆ، داوای دەکات، لەنێو ئەو کۆنسەپسیۆنە مێتافیزیکییەدا جێی نابێتەوە. ئەم کارەکتەرە ئێکستازییەی کات لەنێو ئێستا-زنجیرەی بێسەرەتا و بێکۆتاییدا، واتا لەو شێوەیەدا وەك چۆن ئێمە لە کاتی باوی جیهانی تێدەگەین و لە زانستە سروشتییەکاندا بەکاری دەهێنین، بزر بووە. لەنێو کاتی ئۆبژێکتیڤەکراودا (واتا کاتی بێدوایەکی و هۆمۆگێن و بەردەوام) رابوردوو و ئامادە و ئاییندە بریتین لە کەرتی بەردەوامییەك، بەڵام بە پێچەوانەوە لەنێو تێڕوانینی ئەکزیستێنسیالیستیدا بریتین لە رەهەندی یان ئێکستازی روودانەکەی پرۆژە.

هایدێگەر پەیوەست بەم کێشەیەوە دەبێژێ: «کاتێتی خۆی لە هەر ئێکستازێکدا دەکاتێنێ (ZEITIGT)، ئەمە بەواتای لەنێو یەکێتیی ئێکستازییانەی هەر کاتاندنێکی تەواوی کاتێتیدا، سەرجەمێتیی سەرجەمە بونیادی ئەکزیستێنس و فاکتیسیتێ و نشوستیهێنان (سەرنەگرتن — و) خۆی دەبینێتەوە، ئەمەش بریتییە لە یەکێتیی بونیادی زۆرگە.

کاتاندن (ZEITIGUNG) واتای بەدوویەکداهاتنی ئێسکتازەکان ناگەیەنێ. ئاییندە درەنگتر نییە لە هەبوویی و ئەمیش زووتر نییە لە ئامادە. کاتێتی خۆی وەك ئاییندەی هەبوویی-هەنووکەیی دەکاتێنێ» (SEIN UND ZEIT, S. 350). ئەم نموونەیەی خوارەوە پیشانی دەدات کە ئاییندە و هەبوویی لە دەرەوەی دازاین نین، بەڵکو لایەنی (مۆمێنتی) دازاینن، هەروەها ئەوەش پیشان دەدات کە دازاین ئاییندە و هەبوویيەکەی خۆیەتی: گەر دازاین لە حاڵەتی خەمباری، داهێزراوی و خەمۆکیدا بگەڕێتەوە بۆ هەبوویی-بوونی (GEWESENSEIN) خودی خۆی و هاوکات ئاییندە بکوژێنێتەوە، ئەوا ئەم ئاییندەیە درەنگتر نییە (نایەت - و) لە هەبوویی-بوونەکە، بەڵکو یەکسەر لە سەرچاوەوە پێکەوە لەتەك ئەودا دێ. یان گەر دازاین هەڵاتبێ و خۆی لەنێو هەبووییدا مەڵاس دابێ، ئەوسا ئاییندە دەچێتە دۆخی بێهیواییيەوە و سەرباری ئەمە هێشتا هەر هەیە. یان نموونەیەکی دی: گەر دازاین بخزێتە نێو پرۆژەی ئەندێشەییانەی ئاییندەوە و نکۆڵی لە هەبووییەکەی خۆی بکات، یان لە هەبووییەکەی خۆی را بکات، ئەوا ئەو هەبووییە نکۆڵیلێکراوە هێشتا هەر ئامادەیە، بەڵێ بەتایبەتی لە هەڵاتندا ئامادەیە، یان بە واتایەکی دیکە ببێژین: دازاین وەك هەڵاتن بریتییە لە هەبوویی نکۆڵیلێکراو.

لێرەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە دازاینی کاتییانەی ناخۆیی و خۆیی لای هایدێگەر چ واتایەك دەگەیەنێ.

ئاییندە لەنێو مۆدوسی (شێوازی) کاتاندنی (ZEITIGUNG) ناخۆییدا نابێ بە شیمانەیەکی بەرچاوی ئەکزیستێنس، بەڵکو ئاییندە تەنها ئۆبژێکتی فزوولییەتە. فزوولییەت دەخوازێ ئاییندە ببینێ و موئایەشەی بکات. بە هەمان شێوە رووکردنە هەبوویی بریتی نییە لە هێنانێك بۆ نێو ئەکزیستێنس، بەڵکو لەیادکردنێکە. هەروەها هەنووکەیی-بوونێکی ناخۆیی تەنها پەرتەوازەیی و قاڵبوونە لەنێو ساتدا (مۆمێنتاندا). بەڵام بە پێچەوانەوە سێ ئێکستازەکەی کاتێتی لەنێو مۆدوسی خۆییانەی کاتاندندا روون و ئاشکران (ئێڤیدێنتن): دازاین ئاییندەیە لەنێو رەوتبەستنی حاسمدا رووەو مەرگ، هەروەها دازاین هەبوویییە، ئەویش کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ ئەکزیستێنسە فاکتییەکەی، بۆ فرێدراوییەکەی و هەبوویییەکەی، بەڵام دازاین هەروەها هەنووکەیییە، ئەویش کاتێك سەرجەمی ئەمە بە شێوەیەکی هەنووکەیی لەنێو دۆخی ساتییانەی ئێرەدا (DES DA) روو دەدات. بێگومان سات بریتی نییە لە ئێستا-پنت (نوقتە) و تێیدا شتێك روو بدات، هەروەها بە هیچ شێوەیەك پنتە ئەبستراکتەکەی ماتماتیك نییە وەك سنوور لە نێوان بەردەوامیدا، بەڵکو بریتییە لە ئامادەییە هەنووکەیییەکەی خودی دازاین.

ئەم کاتێتییە کە هایدێگەر لێی دەدوێ، هاوکات هەوڵێکی ئەوە بۆ بناغەڕشتنی مێژوویەتیی (GESCHICHTLICHKEIT) دازاین. بەڵام دەبێ لێرەشدا ئاماژە بۆ ئەوە بدەین کە مەبەستی هایدێگەر لە مێژوویەتی ئەوە نییە کە هەروەك مرۆڤ لەنێو پەیوەندییەکی مێژووییدا بێ لەتەك ئۆبژێکتان و مرۆڤانی دیکەدا، ئیتر هەروەك مرۆڤ لەنێو زنجیرەی موئایەشەدا دیاریکرابێ و ئەویش لە لایەنی خۆیەوە بە دیاریکردن هەستێ، نەخێر، مێژوویەتی واتای پێکهاتەی پێشینەیی ئەکزیستێنسییانەی دازاین دەگەیەنێ و ئینجا بەدووی ئەمەدا مێژووی ئۆبژێکتیڤییانەی جیهان خۆی لەسەر ئەم پێکهاتەیەی دازاین دەبینێتەوە.

بەڵام هەر لەم کۆنتێکستەدا کێشەیەکی تایبەتی دێتە ئاراوە: کێشەی سەرچاوەی ئەو شیمانانە کە لەنێو دۆخدا (زیتواسیۆندا) ئاشکرا کراون، ئینجا دازاین دەتوانێ پەیوەست پێیانەوە هەڵوێست وەربگرێ و خۆی رووەو خودی ئەوانیش بپرۆژەیێنێ. وەڵامی ئەم کێشەیە بەم چەشنەیە: شیمانەکان لە «بۆماوەیی»یەوە دێن، ئەوان شیمانەی بۆماوەن و هایدێگەر ناویان دەنێ «چارەنووس» (SCHICKSAL)، بەڵام لە پەیوەندی لەتەك ئەوانی دیکەدا ناویان دەنێ «قەدەر» (GESCHICK)[٢]. بێگومان پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بدەین کە مەرج نییە ئەم شیمانانە قبووڵ بکرێن، بە پێچەوانەوە، دازاین پێویستە هەڵوێستێکی رەخنەیی بەرانبەر شیمانە هەبوویییەکانی ئەکزیستێنسی خۆی وەربگرێ، تاکو رێ لە کاریگەرییەکانیان لەسەر ئەمڕۆ بگرێ یان هیچ نەبێ کەمیان بکاتەوە.

بەم پێیە دەتوانین بناغەکانی فەلسەفەی ئەکزیستێنسی هایدێگەر بەم چەشنە پوخت بکەینەوە:

١-دیاریکردنی مرۆڤ وەك بوونەوەرێك کە کێشەکەی بریتییە لە بوونی خۆی.

٢-خۆمییەکە (JEMEINIGKEIT)، یان گەڕانەوە بۆ هەر تاکە ئەکزیستێنسێك، واتای بەدەرکردن و هیچاندنی سەرجەمی یەکێتی دروستکەرە فیزیکی-کۆسمۆلۆژییەکان و بیۆلۆژییەکان، تیۆلۆژییەکان و ترانسێندێنتال-فەلسەفییەکان دەگەیەنێ، هەروەها واتای بەدەرکردن و هیچاندنی سەرجەم دانانەکانی مرۆڤ لەنێو سروشت و گەردووندا، لەنێو ئایین و تیۆلۆژیدا، دەگەیەنێ.

٣-جیهان لە شێوازێکی تایبەتیدا ئاشکرا دەکرێ، بەڵام ئەم شێوازە تیۆرییانە نییە، وەك چۆن لە فەلسەفەی ترادیسیۆنی و لە زانستەکاندا دەبینرێ، بەڵکو بریتییە لە «دۆخی هەستەکی» (STIMMUNG) ی پێشتیۆرییانە، لێرەشدا ئەوە ترسە کە رۆڵێکی سەنترالی دەگێڕێ، چونکە ترس کارەکتەری راستەقینەی

جیهان ئاشکرا دەکات، ترس بێلانەیی (UNHEIMLICHKEIT = مەترسی) ئاشکرا دەکات، بێلانەییەك / مەترسییەك کە لەنێو ئاشنایەتیی ڕۆژانەدا بە شتەکان داپۆشراوە.

٤-داوەشان ئاماژەیەکە بۆ ئەوە کە مرۆڤ لە زۆرترین حاڵەتدا بەهەقیقی خودی خۆی نییە، بەڵکو لەنێو شێوازی نارەسەنێتیدا (ناخۆیەتیدا) وەك «مەردوم» دەژی. مرۆڤ هەست دەکات، بیردەکاتەوە، کردار دەنوێنێ، چۆن ئەوانیدی هەست دەکەن، بیردەکەنەوە، کردار دەنوێنن. بەڵام بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ بە خۆیەتیی ئەکزیستێنس بگات، ئەوا پێویستی بە پەرینەوەیەکی لەسەرخۆ نییە لە دۆخێکەوە بۆ نێو دۆخێکی دیکە، بەڵکو پێویستیی بە بازدانێك یان بە وەرچەرخانێکی ریشەیی هەیە.

٥-بانگی ویژدان وا دەکات کە مرۆڤ لە نارەسەنێتیی لێرەبوونی ڕۆژانە بەئاگا بێتەوە، بانگی ویژدان مرۆڤ دەخاتە بەردەم ئەو ئەرکە کە ببێ بە خودی خۆی و هەروەها خودی خۆی بێ.

٦-دوایەکێتی بناغەی ئەکزیستێنسی مرۆڤە و بەرێی ڕوودانی مەرگەوە لە ئاییندە و ڕوودانی زایینەوە لە رابوردوودا، واتا بەرێی ڕوودانی فرێدراوییەوە، لێی بەئاگا دێ.

٧-فرێدراویی ئەکزیستێنس ئەو واتایە دەگەیەنێ کە هەموو یەکێك بەبێ ئەوەی پرسی پێکرابێ و هەروەها بەبێ ویستی خۆی لەنێو ئەم لەشەدا، لەنێو ئەم پسیکۆیەدا، لەنێو ئەم کولتوور و زمانەدا، لەنێو ئەم شوێنە مێژووییەدا، لەم جێگەیەی ئێرە لەنێو گەردووندا، دانراوە و بۆ خودی خۆی جێهێڵراوە. هاوکات رەوتبەستن ڕووەو مەرگ ئەو واتایە دەگەیەنێ کە هەموو یەکێك شیمانەی هەیە تاکو لەو سنوورە ناخەکییە تێبگات کە دوایەکێتییەکەی ئەوی دیاری کردووە.

٨-کاتێتی کە لە ئێکستازەکانی هەبوویی و ئامادە و ئاییندە پێکدێ، بریتییە لەو مۆرکە کە بە پوختی کارەکتەریزەی دازاینی دوایەکی دەکات، لایەنەکانیش (مۆمێنتەکانیش) بریتین لە هاوکاتی یان لە هاوسەرچاوەیی. ئەم لایەنانە شێوەیەکی دوایەکییانەی کات دروست دەکەن.

٩-بە تێگەی کاتێتی، مێژوویەتیی مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی چەندپاتکەرەوە دەچەسپێنرێ، بوونەوەرێك کە تەنها بەرێی دەستبەسەرداگرتنی بۆماوەییە مێژووییەکەی خۆیەوە دەتوانێ بە شیمانەکانی ئەکزیستێنسی خۆی بگات — بێگومان هاوکات زۆر دەشێ پێیان نەگات.

## فەرهەنگۆك

ئانۆنیومێتی: نەناسراوییی یان دیارینەکراوییی شوناسی کەس، وەك بۆ نموونە لە حاڵەتی غەریبێتیدا

بەئاگابوون: بە ئەڵمانی: BEWUSSTSEIN، بە عەرەبی: الوعی

بێدوایەکی: (اللامتناهی)

پراکسیس: بە ئەرەبی (عملی)

پسیکۆلۆژیزم: ڕێبازێکی فەلسەفی بوو کە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم لە ئێنگلاندەوە تەشەنەی کرد بۆ سەر کیشوەری ئەورووپا. ئەم ڕێبازە فەلسەفییە وای دادەنا کە سەرجەم تێگە و رستەکانی لۆگیکی پێوەرن بۆ هزرینی دروست و هاوکات بە شێوەیەکی پسیکۆلۆژییانە شیاوی لێتێگەیشتنن.

پێشبڕیار: لە لۆگیکدا بڕیار ( Das Urteil/ قضیة) هەیە کە هەنگاوتەری بابەتەکە یان حاڵەتەکەیە و لە زەینەوە دەدرێ. بەڵام پێشبڕیار لە بۆچوونەوە بەبێ بناغە، کەواتە بەبێ ناسینی بابەتەکە یان حاڵەتەکە، دەردەبڕرێ.

ترادیسیۆن: (بە ئەرەبی «تقلید»)، ئەوەیە کە لە ڕابوردووەوە گەیەنراوە و سەروەری هەیە.

تیۆریی زانین: لەپاڵ ئێتیك و لۆگیك و ئۆنتۆلۆژیدا یەکێکە لە لقەکانی فەلسەفە و لەتەك بونیادە بناغەییەکانی ناسینی / زانینی ریالێتی لە لایەن ئێمەوە خەریك دەبێ. پرسیارەکە ئەوەیە کە داخۆ چۆن بشێ زانینەکان وەك راست و متمانەپێکراو دابنرێن.

تیۆلۆژی: زانستی خوداناسی، کە لە هەبوون و مۆرکەکانی خودا دەکۆڵێتەوە.

دازاین: لێرەبوون

دوایەکی: (المتناهی)

دەرئەنجاماندن: دەرکێشانی یان بردنەوەی دەرئەنجام، بۆ نموونە لەم دوو بڕیارەوە: سۆکرات مرۆڤە، مرۆڤ بمرە، دەرئەنجامێك دەبڕێتەوە: سۆکرات بمرە.

رەگەز / جۆر: لە لۆگیکدا یەکەم توخمی هۆش بریتییە لە «تێگە»، بۆ نموونە «ئەسپ». لە تێگەکانەوە جۆر و رەگەز دەکەونەوە. ئەسپ جۆرێکە کە سەر بە رەگەزی ئاژەڵە.

ژینجیهان: (LEBENSWELT) تێگەیەکی تایبەتمەندی فێنۆمێنۆلۆژیی هوسەرلە و بەڕێی ئەویشەوە هاتۆتە نێو فەلسەفەوە. ژینجیهان ئەو جیهانەیە کە هەر تاکێك پێش هزرین تێیدا دەژی.

سکۆلاییزم: شێوازی هزرینی کریستیانی بوو لە کۆتایی چەرخی نێڤیندا، واتای هزرینی فێرگەیی (سکۆلایی) دەگەیەنێ کە هەمیشە پابەند بە سێ دەسەڵاتە گومانلێنەکراوەکەی بیبل، باوکانی کلێسە و ئەریستۆتێلیسەوە دەهزرا.

سەبژێکت: بکەری ئاگامەند، کە بە هەڵبەستنی یان بیناکردنی زانست هەڵدەستێ.

سەبژێکتیڤی: کارێکی هزری کە تەواو لە خۆیەکی بکەرییانەوە ئەنجام بدرێ.

سەرمەدی: سەرکاتی، نەگۆڕ

سێنس: واتای هەست (بۆ نموونە شەش هەستەکە) ناگەیەنێ. هەست دیاردەیەکی پسیکۆییە، بەڵام سێنس ئۆرگانییە و بریتییە لە تۆمارگریی فیزیۆلۆژیانە لەنێو مرۆڤ و ئاژەڵە پێشکەوتووەکاندا. سێنسەکان بریتین لە سێنسی بینین، بیستن، چێژتن، بۆنکردن، گرتن. لە عەرەبیشدا «حس» و «حواس» دوو تێگەی جیاوازن.

سیتات: (أقتباس)

شتاندن: بەشتکردن، واتا نامۆبوونی هزر.

کاتیگۆری: تێگەی بناغەیی.

کریتێر: مۆرك، سیما

کۆگنیسیۆن (ل): بەزۆری مەبەست لە هزرینە لە واتایەکی فراواندا. کۆگنیسیۆن توانستەکانی ئاگاداری، یادوەری، ئەندێشە، ویست و بڕوا، هەروەها فێربوون و پلاندانان و هتد لە خۆ دەگرێ.

کۆگنیتیڤ: زانینمەند

کۆنتێکست: (سیاق)

کۆنسەپسیۆن: پلانی تیۆرییانە، بناغەی پرۆژەی هزری یان هونەری

نۆرم: پێوەر (معیار)

نۆرماتیڤ: (معیاری)

ئۆبژێکت: بابەتی یان حاڵەتی یان کێشەی دانراو لە لایەن سەبژێکتی ئاگامەندەوە. بە کوردی بابەت بەکاردەهێنرێ کە ڕاست نییە، ئەویش چونکە مەرج نییە بابەتێك دانراوی (مەوزوعی) سەبژێکتێك بێ.

ئۆبژێکتیڤی: دیدی یان تێڕوانینی یان ڕوانگەی فەزلدەر بە دانراوەکەی (واتا بە مەوزوعەکەی) سەبژێکت.

ئۆنتۆلۆژی (گ): بوونناسی.

هابیلیتاسیۆن: پلەیەك لە دکتۆرا بەرزترە، لێکۆڵینەوەیەکە کە پاشان بە زانا پلەی پرۆفیسۆر دەدرێ

هیچاندن: (نێگاسیۆن، نەفیکردن)

هێرمینیوتیك: فەلسەفەی تێگەیشتن، بۆ نموونە فەلسەفەکەی گادامەر.

ئەبستراکت (ل): (مجرد)

ئەکزیستێنسیال: هایدێگەر تێگەکانی ناو دەنێ ئەکزیستێنسیال، بە پێچەوانەی کاتیگۆرییەوە

ئیدێنتیتێ (ل): هاوشێوەیی، شوناس

ئیندیڤید: تاك، تاکەکەس

گێشتالت: وشەیەکی ئەڵمانییە و یەکێکە لە ڕێبازەکانی پسیکۆلۆژی (بە ئەرەبی «جیشتالت») کە سەرجەم وەك گەورەتر لە کۆی کەرتەکان دادەنێ. بۆ نموونە خانوویەك کە فۆرمێکی تایبەتیی هەیە، وەك سەرجەم و بە حوکمی فۆرمەکەی گەورەترە لە کۆی کەرتەکانی (بەرد، چیمەنتۆ، دەرگا و پەنجەوە و هتد).

ئێتیمۆلۆژی: زانستی سەرچاوە و واتای سەرچاوەیی وشە

ناسیۆنالسۆسیالیزم: کورتکراوەتەوە بۆ نازیزم کە ئیدیۆلۆژییەکی فاشیستی بوو بە مۆرکە تایبەتمەندە ئەڵمانییەکەیەوە.

## پەراوێزەکان:

[1] ) واژەکە لە کرۆکدا واتای «نارەسەن» دەگەیەنێ، بەڵام پێویستە ئێمە لێرەدا بە وەرگێڕانی وشەییەوە پابەند بین، تاکو لە مەبەستەکەی هایدێگەر نزیکتر بکەوینەوە.

[2] ) هەردوو وشەکە بە کوردی یان بە عەرەبی واتای قەدەر دەگەیەنن، بەڵام وشەی «Schicksal" لە رووی کەسییەوە (persönlich) واتای چارەنوسیش دەگەیەنێ. وەك دەبینین، هایدێگەر جیاوازیی شیمانەکان لە رووی کەسی و نێوکەسییەوە دەکات، لەبەر ئەم هۆیە بۆ حاڵەتەکەی یەکەم واژەی چارەنووسمان دانا – ك.ج.

## تێبینی:

ئەم نوسینەی کارن گلۆی لە بارەی فەلسەفەی هایدێگەر لە میانەی لێکۆڵینەوەکەیدایە بە ناونیشانی "فەلسەفەی سەدەی بیستەم". ئەو بەشەی لەم وەرگێڕانەدا بە ناوی "ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی لە ناوەڕۆك و ئێرەبوون" دانراوە، لە کتێبەکەدا ڕێبەرییەکە بۆ فەلسەفەی ئەکزێستێنێس بە گشتی نەك بۆ هایدێگەر بە تایبەتی.

## سەرچاوە:

KAREN GLOY: GRUNDLAGEN DER GEGENWARTSPHILOSOPHIE. PADERBORN 2006

لە فارسییەوە: رزگار ئەمین نەژاد

# خۆکوژی،
# تابلۆیەک بۆ وێناکردنی ئازار

**بەرایی**

کاتێ بە بیستنی هەواڵێکی خۆکوژی لە ناکاو دڵمان ڕادەچڵەکێ، تۆ بڵێی لەو دەم و دەستەدا بیر لە چی بکەینەوە؟ ڕەنگە بەلای زۆربەمانەوە دیاردەی خۆکوژی لە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆدا لەمەڕ بڕیارێکی تاکەکەسی ڕاڤە بکرێ، واتە کەس یان کەسانێك هەڵدەستن بە بڕیاری کۆتایی هێنان بە ژیانی خۆیان. ئەم بابەتە ڕەنگە لە یەکەم سەرنجدا لە خانەی نموونەیەکی خۆپەرستییانەدا (EGOISTIC) ببیندرێتەوە، بەڵام کاتێك لە گۆشەنیگایەکی ستروکتورالیزمانەوە سەرنج بدەینە لایەنە بەهێزەکانی مێنتاڵیەتی کۆمەڵایەتی تاك، دەگەینە ئەنجامێك کە پێوەندی هەیە بە دینامیزمێکی شاراوە کە بە شێوەیەکی لاوەکی کاریگەری هەیە لەسەر هۆکاری دیاردەی خۆکوژی بەلای تاکەوە. ئەم ڕوانگەیە پێمان دەڵێت کە هەندێك پێکهاتەی کۆمەڵایەتی هەن کە بە ڕواڵەت نادیارن بەڵام کۆمەڵێك دیاردە و نیشانی کۆمەڵایەتی لە خۆیان جێدەهێڵن کە وەك حاڵەتە ڕۆتینییەکان لە مەجالی ژیانی ڕۆژانەدا هەستیان پێدەکەین. کارتێکەری ئەم فاکتە نادیارانە لە خۆیدا بیانویەکن بۆ بەدواداچوون لەهەمبەر شرۆڤەیەکی بابەتیانە بۆ زیاتر هاتنە ڕۆژەڤی ئەو هێزە شاراوانەی نێو کۆمەڵگا.

ڕۆژانە لە ڕێگای ڕاگەیاندنە گشتییەکانەوە لەمەڕ یەك یان چەندین حاڵەتی خۆکوژی ئاگادار دەکرێینەوە، ئەم حاڵەتانەیش لە سۆنگەی کۆمەڵێ هۆکاردا ڕاپۆرتە دەکرێن کە پێوەندی دەدرێنەوە بە هۆکارە دەرەکییەکان، بۆ نموونە لە زۆربەی ئەم

حاڵەتانەدا پرسی خۆکوژی لای ئافرەتان بەرزترین راژەی خۆکوژییە کە لە هەواڵەکاندا دێنە بەر باس (بە پێی لێکۆڵینەوەی رۆژنامەوانێکی بی بی سی بەلانی کەمەوە لە رۆژدا یەك ئافرەت دەست دەداتە کردەوەی خۆکوژی[1])،لەم پەیوەندییەدا ئاماژە دەدرێت بە هۆکارەگەلی وەك شکستهێنان لە پرسی خۆشەویستی، لە پێوەندی خێزانی، نامووس و هاوسەرگیری و هتد. یەکێك لە نموونەکانی دیکەی خۆکوژی کە لەسەر پیاوانی گەنج تۆمار دەکرێن و لە هەواڵەکاندا ئاماژەیان پێدەکرێت، پێوەندی دەدرێتەوە بە هۆکارەگەلی وەك سەرنەکەوتن لە خوێندندا، شکست لە ئەزموونی خۆشەویستیدا، زەبر و زەنگی بنەماڵە و پرسی بێکاری و نەبوونی مەجالی خۆ گونجاندن لە کۆمەڵگاکەیاندا. ئەمانەو کۆمەڵێك هۆکاری دیکە لە پێوەندی بەکردەوەی خۆکوژیدا دێنە بەر باس، بەڵام داخوا ئەم هۆکارانە رەهەندی سەرەکی خۆکوژین لە کۆمەڵگادا؟ ئەو شتەی کە لە هەواڵەکاندا رەنگدانەوەی هەیە بەشێکی راستیی و دروستی دیاردەی خۆکوژین کە لە پێوەندییەکی هۆکاریدا (CAUSAL) یاخود بنەماییدا (INTENTIONAL) تیشکی نەخراوەتە سەر. هەواڵەکان بە تەنیا لایەنی رووەکی روداوەکان دەخەنە بەر باس و، لایەنەکانی دیکەی روداوەکان لە گرەوەی لێکۆڵینەوەیەکی مێتۆدیکدا شرۆڤە دەکرێن کە لە خۆیدا پێویستی هەیە بە رەهەند لێدان بە نێو کۆنتێکستە سەرەکییەکانی ئەم دیاردەیە کە لە خۆیدا پاڵنەرێکی دەرەکی و لە هەمان کاتیشدا سەرەکی روودانی کردەوەی خۆکوژین. سەرنجدان بەو تراژدییەی کە کیژۆڵەیەك لە شوێنێکدا دەرگا لەسەر خۆی دادەخات کە کەس دەستی پێڕاناگات و، لە ناکاو گالۆنێك نەوت بەسەر جەستەی خۆیدا دەرێژێت و، بە چەخماخێك ئاگر لە جەستەی خۆی بەردەدات، لە خۆیدا پرسیارێکە کە بەبێ وەڵامدانەوە لە قوژبنە تەنگ و تاریکەکانی ئەرشیڤی راگەیاندندا بزر دەبن. تۆ بڵێی چ پەیامێك لەم دراما دڵتەزێنانەدا هەبێت کە بەم چەشنە خۆی بە ئێمە پیشان دەدات؟ بە واتایەکی دیکە، تۆ بڵێی ئەم کردەوەیە بە چەشنێك شێوازێ لە پرۆتێستۆ کردن بێت لەمەڕ دۆخی ئارایی ژیان کە بەم چەشنە کارەساتاوییە بەرز دەکرێتەوە؟ بێگومان ئەم هاوارە خنکاوانە هەر بە تەنیا لە پێوەندییەکی خۆپەرستانەدا نین، ئەم ئازارە رەنگدانەوەی تاوانێکە کە گەلێ لایەن تەواوکەری ئەم سیناریۆیەن و لە هەمبەریدا بەرپرسیارن.

مەبەست لەم وتارە گەڕان بەدوای چەندایەتی و چۆنایەتی ئەم هەواڵانەوە نییە، بەڵکو سەرنجی سەرەکی ئەم وتارە زیاتر لەسەر خوێندنەوەیەکی تیۆرێك چڕ دەکرێتەوە بە ناوی خۆکوژی. تیۆری خۆکوژی ئەفراندنێکی میتۆدیك بوو کە ئیمائیل دورکهایم کۆمەڵناسی فەرەنسی، بە پشت بەستن بە لێکۆڵینەوەیەکی رێژەیی تیشکی خستە سەر کۆمەڵێك لایەنی شاراوەی دیاردەی خۆکوژی کە ناڕاستەوخۆ دەلالەت دەکا لەسەر ئەم بڕیارە. سەرنجدان بە تیۆری خۆکوژی دورکهایم لە میتۆدی لێکۆڵینەوەکەیدا گرنگی خۆی وەردەگرێت کە بە فۆرمێکی شیکارانە (DESCRIPTIVE) هەوڵ دەدات شرۆڤەی هۆکارەکانی ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییە بکات. ئەو پاڵنەرانەی کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کاردانەوەیان هەیە لە هەمبەر هەڵوێستی خۆکوژی، بە قەناعەتی دورکهایم لە کۆنتێکستێکی کۆمەڵایەتیدا سەرهەڵدەدەن. دورکهایم وەك فۆنکشیۆنالیست سەرنجی خۆی زیاتر ئاراستەی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان دەکاتەوە، چونکە تاك وەك بەشێك لە گشتییەتی کۆمەڵگا دەبینێت. دورکهایم لەم تیۆرەدا لە هەوڵی ئەوەدا نییە کە شرۆڤەی ئەوە بکات کە لەبەرچی مرۆڤ بەدەستی خۆی کۆتایی بە ژیانی خۆی دێنێ، بەڵکو سەرنجی سەرەکی ئەو لە بەرامبەر ئەم پرسیارەدا وورد دەبێتەوە کە بۆچی راژەی خۆکوژی بە پێی زەمان و لە کۆمەڵگاکاندا هاوسەنگییەکی پاوەجێ و نەگۆڕیان هەیە. لە پرۆژەی لێکۆڵین و پشکنینێکی مەیدانی کە لە وڵاتانی بەریتانیا، فەرەنسا، دانمارك، ئیسپانیا، پروس و هتد... بە ئەنجامی گەیاند، بەم ئەنجامە دەگات کە فرەچەشنی بوونی شێوازی خۆکوژی دەلالەت دەکات لە هۆکارگەلی فرە رەهەند و پێوەندییەکی ڕاستەوخۆشیان هەیە بە دۆخی کۆمەڵایەتی و

پەروەردەی ئایینی لەسەر ئەو کەسانەی کە هەڵدەستن بە بڕیاری خۆکوشتن. ئەو فاکتانەی کە دورکهایم لە پێوەندی بەم دیاردەیەدا زوومیان دەکاتە سەر، بریتین لە دین، ئابووری، خوێندن، پێوەندی خێزانی، ئانۆمی (پاشاگەردانی) و بە گشتی دوو پرسی جێی سەرنج کە بەلای دورکهایمەوە گرنگییەکی تایبەتیان پێدراوە، بریتین لە رادەی "گونجاندنی تاك لە نێو کۆمەڵدا" و "کارتێکەری نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان".

بە گشتی روانگەی کۆمەڵناسی دورکهایم خۆی لە پێوەندی بە کۆمەڵگا و کولتوردا دەبینێتەوەو، کەمتر خۆی بە مۆتیڤە تاکەکەسییەکانەوە سەرقاڵ دەکا. دورکهایم کۆمەڵگا وەك فاکتێکی بان ئۆرگانیکی و، ستروکتورە کۆمەڵایەتییەکان وەك رۆحێکی نادیار لە دەرەوەی دەسەڵاتی تاکدا دەبینێ و، لەسەر ئەو قەناعەتە راوەستاوە کە کۆمەڵگا سیستەمێکە کە بە پێوانەی فۆنکشیۆن و پرۆسەی گەشەکردن (تکاملی) و مەرجە سەلمێندراوەکاندا دەشێ ئاوری لێ بدرێتەوە. بێگومان کۆمەڵگا سیستەمێکە کە پێکهاتووە لە نیهادە کۆمەڵایەتییەکان و ئەم نیهادانەیش بەشێکن لە گشتێتی کۆمەڵگا کە کاریگەرییەکی بەهێزیان هەیە لە مەڕ تەناهی و سەقامگیر بوون. دورکهایم لە گشت توێژینەوەکانیدا خۆی دوور دەگرێت لە بەهادان یاخود بەرزەبایی کردنی کۆمەڵگایەك لە چاو کۆمەڵگایەکی دیکە، چونکە هەر کۆمەڵگایەك تایبەتمەندی تایبەت بەخۆی دەردەخات لەمەڕ روودانی دیاردەی خۆکوژی. هەر بەپێی ئەم قەناعەتەیە کە ئەو کۆمەڵگاکان بەیەکەوە بەراورد ناکات و پێی وایە کە کۆمەڵگایەکی سەرکەوتوو بە نیهاد، سیستەم و، فۆنکشیۆنە کۆمەڵایەتیانەوە مەزندە دەکرێت کە لە پەیوەندییەکی سیستەماتیك و پراکتیکیدا، لە هەوڵی بەدیهێنانی نیازەکانی تاك و پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی نێو کۆمەڵگاکەیانن. ئەم فاکتانە لە خۆیدا پێوەندییەکی راستەوخۆیان هەیە بە پرسی سەقامگیربوونی (ثبات) کۆمەڵگا. لەم پێوەندییەدایە کە دەتوانین بڵێین سیستەم، وەڵامدەرێکی ئەرێنی و بەرزەباییە. ئەوەی کە بەلای دورکهایمەوە جێی سەرنجە و لە هەمان کاتیشدا لە لێکۆڵینەوە مەیدانییەکانیدا ماتێریاڵی شرۆڤەکانی ئەو پێك دێنن، پێوەندی و کارلێکی دوو وتەزای هەمەکی (کل) و بەشەکییە (جزء) بەسەریەکەوە. دورکهایم سەرنجی خۆی ئاوا دەردەبڕێت کە: "زۆربەی دۆخە سەبژەکتیڤەکانی ئێمە، بە تایبەت گرینگترینەکانیان، رەگێکی کۆمەڵایەتیان هەیە. هەر بۆیە سەبارەت بەم ڕاستیە دەبێ رابگەیەنین کە، هەمەکییەکان لە پێوانەیەکی بەریندا پاساودەری بەشەکین و، ئەم بابەتەیش واتە هەمەکی، بەبێ شرۆڤەکردنی بەشەکی، دوور لە گونجانە- لانیکەم شرۆڤەی ئەم خاڵە کە هەمەکی دەرەنجامی بەشەکییەکانە" (DURKHEIM, 1973).

هەوڵی دورکهایم بۆ شرۆڤەکردنی هۆکاری دیاردەی خۆکوژی و پاڵنەرە شاراوەکانیان لە کتێبی "خۆکوژی"دا، یەکێکە لە لێکۆڵینەوەکانی ئەو سەبارەت بەم دیاردە کۆمەڵایەتییە. دورکهایم لەسەر ئەم قەناعەتە راوەستاوە کە رادەی مەجالی حەوانەوە یاخود گونجاندن (INTEGRATION) لە کۆمەڵگادا، ئاماژەیەکە بۆ ڕادەی هەست بە بەختەوەری کردنی تاك. بەم پێوەرە ڕادەی تەنیایی و لە پەراوێزکەوتنی تاکیش لە خۆیدا پێوەرێکە بۆ پیشاندانی نابەختەوەری ئەو. لەم سۆنگەیەوە نایەکسانییەکی بەرچاو لە دیاردەی خۆکوژیدا دەردەکەوێ، هەر بۆ ئەم مەبەستەیە کە پێویستە ئاوڕ لە خۆکوژی بدرێتەوە وەك پێودانگێك بۆ دۆخە کۆمەڵایەتییەکان کە پیشانی دەدات ئەو کۆمەڵگایە تا چەندە تۆکمە و بێ گرفتە. هەر لەم گۆشەنیگایەوە دورکهایم سەرنجێکی تایبەتی داوە بەم پرسیارە کە چ فاکتۆرگەلێکی دیکە کاریگەریان هەیە لەسەر دیاردەی خۆکوژی، بۆ نموونە ئەو سەرنج دەدات بە هۆکارگەلی وەك ئاڵۆزی دەروونی، دیمۆگرافی، رەگەز و هتد، بەم چەشنە ئەو بەم ئەنجامە دەگات کە ئەگەرچی هیچکام لەم فاکتانە هۆکارێکی سەرەکی نین بۆ بەرز و نزمی رێژەی خۆکوژی، بەڵام کازاوڵێکن بۆ نزیك بوونەوە لە سەرەگرێی ئەم بگۆڕانە (VARIABLE) کە لە واقعە کۆمەڵایەتییەکاندا بەدی دەکرێن. ئەم بگۆڕانە بەگوێرەی کۆمەڵگاکان

جیاوازیان هەیە و تایبەتمەندی خۆی وەردەگرێت. دورکهایم پرسی کۆمەڵگا بەسەر دوو چەشنە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا پۆلێن دەکا کە پێوەندی هەیە بە رادەی پابەندبوونی تاك بە کۆمەڵگاکەیەوەو، لە روانگەوەی دورکهایمەوە پرسی پابەندبوونی (SOLIDARITY) کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگاکاندا، دینامیزمێکی بەهێزە بۆ پرسی کۆگەرایی (COLLECTIVE). ئەم دوو فۆرمە جیاوازە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی کە دورکهایم فۆرمولەیان دەکات، بریتین لە کۆمەڵگای میکانیکی و کۆمەڵگای ئۆرگانیکی.

## پابەندبوونی میکانیکی و پابەندبوونی ئۆرگانیکی

لە پێوەندی بە فۆرموولە کردنی دوو کۆمەڵگای میکانیکی و ئۆرگانیکیدا — کە لەسەرێدا هاتنە بەر باس، گرنگی حەوانەوەی تاك لە هەر کام لەم کۆمەڵگایانەدا پەیوەست دەبێتەوە بە ئەو فۆنکشیۆنانەی کە تاك هەیەتی لە هەمبەر کۆمەڵگاکەیدا و ئەو مەرجانەی کۆمەڵگایش لەبەردەم پراکتیزەکردنی تاکدا دایدەنێت. کۆمەڵگایەکی مێکانیکی و پرسی پابەندبوونی تاك لە هەمبەر کۆمەڵدا گوزارشت دەکات لە سیستەمێکی نەریتی، یان بە واتایەکی دیکە پێش مۆدێرن و، لەسەر بنەمایەکی تاك لایەنی (واتە بەبێ پاداش، بەپێی ئەرکێکی کۆمەڵایەتی) و هاوسۆزییەك دامەزراوە کە توخمێکی سەرەکییە بۆ گرێدانی تاك بە قەوارەی کۆمەڵەوە. لە وەها دۆخێکدا بایەخی تاك لە پێناو هەڵوێستە خۆبەخشەکانیدا مەزندە دەکرێت و گرنگی تاك لە پێناو پاراستنی لایەنە پیرۆزەکانی وشیاری کۆگەراییدا بەرجەستە دەبێتەوە. پرسی خۆناساندنی تاك وابەستەیە بە شووناسێکی بانتر لە خۆی و، دەربازبوون لە تەوەرەی کۆگەرایش تابۆیەکی سامناکە کە رێگرە لەبەردەم دەربازبوون لە چارەنووسی کاراکتێرە کۆگەراییەکانی. لەم چەشنە فاکتۆرەدا کۆمەڵگا وێنایەکی بابەتییە (عەینی) کە پێك هاتووە لە کۆمەڵێك یەکەی نەگۆڕ بە چەشنێك کە کۆمەڵێ سیمبولی بان تاکە کەسی تاکەکانی نێو کۆمەڵ لە دەوری یەکتر کۆ دەکاتەوە. ئەم سیمبولانە بریتین لە نۆرمە پاوەجێیەکان (ثابت) و بەها کۆمەڵایەتییەکان. پابەندبوونی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای میکانیکی لەسەر بنەمایەکی هاوچەشن (HOMOGENEITY) لە نێو گروپە کۆمەڵایەتییەکاندا دامەزراوە، واتە زۆربەی ئەندامانی ئەم یەکە کۆمەڵایەتییانە لە باری پێگەی کۆمەڵایەتییەوە خاڵی هاوبەشیان زۆرە و ئەم هاوچەشنییە توخمی سەرەکیی فاکتی "هەڤبوون"ی ئەوان پێك دێنێت. لەم دۆخەدا نۆرم و رەفتارە کۆمەڵایەتییەکانی تاك سەرچاوە دەگرێت لە سروشتی ئاژەڵ ئاسای (حەیوانی) تاك و ئەو قانونمەندیانەی کە لەگەڵ ئەزموونی رۆژانەیاندا بەرهەم دێنەوە بەشێکە لە سروشتی کۆمەڵایەتی ئەوان. کۆگەرایی لەم سیستەمەدا بەستراوەتەوە بە هەستی هاوچەشنی لە نێوان ئەندامانی یەکەکان و، هەر چەشنە لادان یاخود کردەی دژەباو لەهەمبەر یاسامەندییەکانی کۆمەڵگا، لەلایەن کۆمەڵەوە بەرەو رووی سەرکۆنە (SANCTION) دەبێتەوەو، سەرکۆنەیش سزایەکی کۆمەڵایەتییە کە سەرچاوەی مافناسانەی نییە و شەرعییەتی خۆی لە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان وەردەگرێت. پابەندبوونی میکانیکی لە کۆمەڵگا پێش مۆدێرنەکاندا لەسەر بنەمای رێکەوتن و سازان دامەزراوەو، دورکهایم ئەم حاڵەتە بە "وشیاری کۆگەرایی" پێناسە دەکات. واتە رۆحێکی جەماوەری لە رێگای رێسا و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانەوە و لە پرۆسەیەکی درێژخایەندا، تاك رادەهێنن بۆ ملکەچ بوون و پابەندبوون بەم رەهەندە ئەبەدییانەوە.

کۆمەڵگای ئۆرگانیکی بە پێچەوانەی کۆمەڵگای میکانیکی فۆرمێکی مۆدێرنە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی کە لەسەر بنەمایەك دامەزراوە بۆ پێوەندییەکی فرەلایەنی لە نێوان تاکەکانی نێو کۆمەڵ (واتە لە پێوەندییەکی سات و سەوداییدا). لە وەها دۆخێکدا پرسی تاك لە پەیوەندییەکی مامەڵە ئاسایی و فرەچەشنیدا بەرز دەکرێتەوەو، خۆ بەرهەم هێنانەوەی تاك مۆتیڤی سەرەکی پابەندبوونی تاکە لە حاند کۆمەڵەکەی. ئەم

حاڵەتە بە پێچەوانەی کۆمەڵگای میکانیکی کە بایەخی تاك لە پێناو بەرژەوەندی کۆدا دادەبەزێنێ، ئێستا ئیدی گرنگی تاك لە کۆنتێکستێکی "بێنە-بدە"دا بەرجەستە دەبێتەوە کە بە قەناعەتێکی مامەڵەگەرانە لەگەڵ کۆ هەڵسوکەوت دەکات. دورکهایم بۆ دەستنیشانکردنی نیشانەکانی کۆمەڵگایەکی ئۆرگانیکی ئاماژە دەدات بە فۆرمی پسپۆری و تایبەت بوون (SPECIALIZATION) لە خانەی وەبەرهێناندا، لەو شوێنەی کە گشت ئەندامان بە کارکردە تایبەتەکانی خۆیانەوە لە کۆمەڵگادا پێگەو شوێنیان بۆ دیاری دەکرێت. بە مۆدێرن بوونی کۆمەڵگا ستایلی ژیانی تاك لە کۆمەڵە بچووکەکانەوە بەرەو فۆرمی شارستانی دەگۆرێت و، پابەندبوونی میکانیکی و مۆتیڤە ئەخلاقییەکانیان کە بەشێکن لە بەها کۆمەڵایەتی و قەناعەتە گشتییەکانی کۆمەڵگا بەرەو رووی نوشست دەبێتەوەو، لە ئاکامدا "نەزمی کۆمەڵایەتی" (SOCIAL ORDER) دەبێت بە ئەلتەرناتیڤی "وشیاری کۆمەڵایەتی".

## تیۆری خۆکوژی

"خۆکوژی دیاردەیەکی (PHENOMENON) کۆمەڵایەتییە" (DURKHEIM, 1973). ئەم رستەیەی دورکهایم دێسکۆرسی دیاردەیەکە بە ناوی خۆکوژی، کە لە کتێبی "خۆکوژی"دا هاتوەتە بەر باس. وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا دورکهایم هەستا بە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی لەمەڕ پرسی خۆکوژی و، ئەم لێکۆڵینەوەیە بە شێوازێکی میتۆدیك پشکنینی بۆ کرا لە نێوان ئایینە جیاوازەکان، کولتوورە جیاوازەکان، جوگرافیا جیاوازەکان و رەگەزە جیاوازەکان و هتد. سێ فاکتەری سەرەکی لە پێوەندی بە دیاردەی خۆکوژی لەم لێکۆڵینەوەیەدا تیشکی خراوەتە سەر کە بریتین لە: ئایین، رەگەز، کولتوورو، ئەم بابەتەیش لە پێوەندیدایە بە پرسی گونجاندن (INTEGRATION) واتە نەگونجاندنی تاك لە کۆمەڵدا.

دورکهایم لە گشت شرۆڤە کۆمەڵناسییەکانیدا سەرنجێکی تایبەت دەدات بە پرسی "هەڤبوون". ئەو پێی وایە تاکگەرایی لە توانایدا نییە بنەمایەکی گونجاو برەخسێنێ بۆ بنیاتنانی پابەندبوونی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگادا. ئەم بابەتە پێوەندی هەیە بە گۆران و گەشەسەندن لە سیستەمە بنیاتییەکانی کۆمەڵگادا کە بەرهەمی شۆرشی پیشەسازی بوو و لە خۆیدا دیاردەیەکی ئافراند کە بە تاکگەرایی ناوزەد کرا. ئەم دۆخە نۆرم و بەها کۆمەڵایەتییەکانی بەرەو ئاقارێك راماڵی کە وێناکردنی ئایندەی سیستەمی کۆمەڵایەتی شێواند و گومان و نیگەرانی لە نێو نوخبەی ئەو سەردەمەدا دروست کردبوو. گۆرانکاری لە سیستەمی کۆمەڵایەتی و قەناعەتە گشتییەکاندا بە رادەیەك خێرابووەوە کە بنەما مەعریفییەکانی ئایینیشی لەبەریەك هەڵدەتەکاند، ئەم دۆخە تەنانەت لە پەیامی نیچەدا بە ئاشکرا بەرجەستە کراوەتەوە کە دەڵێ: "خوا مرد!". ئەگەر پابەندبوونی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای میکانیکیدا لە ژێر کاریگەری ئامۆژگارییە دینییەکاندا فۆنکشیۆنێك بوو بۆ بەرزکردنەوەی وشیاری کۆمەڵایەتی و هەڵوێستی تاك لایەنانەی پێوەندی تاك بە کۆمەڵگاوە، ئەوەتا ئێستا لە فۆرمی پابەندبوونی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای ئۆرگانیکیدا ئەم فاکتانە هەرەس دێنێ و، فۆنکشیۆنی فرەلایەنی و پێوەندییەکانی کۆمەڵ و تاك لەسەر بنەمایەکی بەرژەوەندی خوازیدا بەرجەستە دەبێتەوە کە دیاردەی تاکگەرایی وەك ستایلێکی نوێ دەخاتە رۆژەڤەوە بۆ بەردەوامبوون لە کۆمەڵگادا. بێگومان دورکهایم قەناعەتێکی ئایینی نەبووە کە داکۆکی بکات لە تایبەتمەندییە مۆجیزە ئاساکانی ئایین، بەڵام ئەو لەسەر ئەو بۆچوونەیە کە کارکردی ئایین لە هەمبەر تووش نەبوونی ئیرادەی خۆکوژی لە نێو کۆمەڵدا، لە پرسی کۆگەراییدا بەرجەستە دەبێتەوە کە جێی گرنگیدانە. کۆمەڵگای مۆدێرن بە ستایلێکی تاکگەرایانەوە بەرەو رووی واقعە کۆمەڵایەتییەکان دەبێتەوە کە گشت مۆتیڤەکانی پرسی کۆگەرایی دەخاتە بەر تەوژمی فەوتان. بەڵام داخوا کۆمەڵگا بەبێ تایبەتمەندی ئایینی دەتوانێت لە هەمبەر دیاردەکانی وەك

خۆکوژی چ ڕێکارێك بۆ چارەسەری ببینێتەوە؟ بێگومان وتەزای ئایین وەك هەموو دیاردەکانی دیکە لە تایبەتمەندییەکی ئەستوونی و ئاسۆییدا شرۆڤە دەکرێت. ئەو بابەتانەی کە پێوەندیان هەیە بە فەرزییەتی ئایین (وەك نوێژ کردن، قوربانی کردن، حەج، رۆژوو..) دووره دیمەنێکن لە پرسی ئایین و، بێگومان حزووری سەرەکی ئایین بۆ نەزم و سەقامگرتوویی لە کۆمەڵگادایە کە دورکهایم وەك کارکردێکی گرنگ سەرنجی پێدەدات. لە فەوتانی ئەم کارکردە گرنگەدا پێویستە کۆمەڵگای ئۆرگانیکی لە بیری ئەفراندنی سیستەمێك بێت کە بۆشایی ئەم پێداویستییە پڕ بکاتەوە. دورکهایم لە گوتارە سیاسییەکانی سەردەمی خۆیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پرسی "هەڤبوون" پێداویستییەکی گرنگە بۆ سەقامگیربوونی کۆمەڵگا. دورکهایم پێی وایە کە وێناکردنی کۆمەڵگا بەبێ پرسی کۆگەرایی دوور لە گونجانەو، بە هەند نەگرتنی گرنگی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان، هۆکارێکی سەرەکییە بۆ ئاڵۆزی (پاشاگەردانی). ئەو لەسەر ئەم قەناعەتە بوو کە رادەی هۆگری بە سوسیالیزم بۆ چینی کرێکار لە سەردەمی مۆدێرنیزمدا، بە چەشنێك وێناکردنی ئەو نیگەرانییەیە بوو لە مەڕ هەرەسهێنانی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ئاشبەتاڵی پرسی کۆگەرایی. بە بۆچوونی دورکهایم ئەو سۆنگەیە لە سوسیالیزم دێتە خانەی هۆگری چینی کرێکار نەك تێداچوونی سیستەمی خاوەندارێتی. دورکهایم پرسی سەندیکا و یەکێتییە کرێکارییەکان بە ئامێرێك وەسف دەکات بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی هەستی پابەندبوونی کۆمەڵایەتیی.

بەپێی ئەم تیۆرە کە دورکهایم لە شرۆڤەی کۆمەڵگای میکانیکی و ئۆرگانیدا دەیخاتە رۆژەڤی خوێندنەوەیەکی میتۆدێك، پرسی پاڵنەرانەی کولتور و تاك لە هەمبەر گۆڕان لە کۆمەڵگادا بابەتێکی رووەکی و دوور لە واقع دەبینێت. بێگومان سەرنجی دورکهایم ئاراستەی تیۆری ماتیریالیزمی مێژووی مارکسە کە کارکردی مەتەریاڵ وەك ئامێرێکی بنچینەییە بۆ گۆڕان لەبەرچاو دەگرێت و دەورێکی گرنگ دەگێڕێ لەمەڕ گۆڕان لە مرۆڤ و سروشت و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا. روانگەی مارکس لە هەمبەر مرۆڤ، لە پێوەندی فۆنکشیۆنەکانی مرۆڤ و بەرهەمهێناندا دیاری دەکرێت و، مارکس پێی وابوو کە وەبەرهێنان پێوەرێکی لۆژیکییە بۆ ئافراندنی شووناسی مرۆڤ. بێگومان کولتوور و تاك لە ژێر کارتێکەری پرسی بەرهەم هێناندایە و گرنگی مەتریاڵ و ئەو شتانەی کە مرۆڤ بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات، لە بەستێنی وەبەرهێنان و پرسی کەرەسەی وەبەرهێناندا بەرجەستە دەبێتەوە.

لەمەڕ پرسی ئایین و پێوەندی ئەو بە خۆکوژییەوە، دورکهایم لە پشکنینەکانیدا هاوسەنگییەکی نەگۆڕ دەبینێتەوە لە نێوان ئایینە جیاوازەکان و قەناعەتی خۆکوژی و، لە ئاکامدا دەبینێ کە رێژەی خۆکوژی بەلای پرۆتێستانتەکانەوە زۆرترە لە کاتۆلیکەکان و، ئەم رێژەیە بە نیسبەت، بەلای جووەکانەوە (یەهودییەکان) زۆر کەمتریشە. دورکهایم هۆکاری سەرەکی ئەم پرسە لە ستروکتوری کاتۆلیزم و پرۆتێستانتیزمدا شرۆڤە دەکا و لەم گۆشەنیگایەوە پرسی تاکگەرایی و مەجالی ئەندێشەی ئازاد کە بەشێکن لە پێکهاتەی ئایینی پرۆتێستانتیزم، دەخاتە رۆژەڤی پشکنینەکەی. کاتۆلیکتیزم لە ڕوانگەی دورکهایمەوە پتر دوگماتیکە و داخراوەترە کە مەجالی ئەندێشەی ئازاد و تاکگەرایی تێیدا بەرتەنگتر کراوەتەوە. ئەم دەرەنجامە ئاماژەیەکە بە سیستەمی خۆجەیی دەسەڵاتی کڵێسا بەلای کاتۆلیکەکانەوە. دورکهایم لە سەرنجەکانیدا ئەم ئاکامە وەردەگرێت کە سیستەمی خۆجەیی کڵێسای کاتۆلیکەکان بنەمایەکی ریتواڵی (مشاعر) هەیە و ئەم بابەتە هێز دەبەخشێ بە پرسی گونجاندن و لە ئەنجامدا ئەم فۆنکشیۆنە توانایەکی بەهێزتان پێدەبەخشێ بۆ کۆکردنەوەی تاکەکان لە دەوری سیمبولە کۆگەراییەکاندا، بەم چەشنە پرسی گونجاندن لە نێوان کاتۆلیکەکاندا بەهێزترە. پرسی تاکگەرایی لە نێو کۆمەڵگاکاندا لایەنی کۆگەرایی کەم بایەخ دەکاتەوە و، تاك خۆی لە دەرەوەی نۆرم و خانە کۆمەڵایەتییەکاندا پراکتیزە دەکاتەوە. لە پێوەندی بە خوێندنی

بالاّ، دورکهایم هاوسەنگییەك دەبینێتەوە لەمەڕ ڕادەی خوێندنی بالاّ بەلای پڕۆتێستانتەکانەوە و کردەوەی خۆکوژی و، ئەم دەرەنجامە وەردەگرێت کە خوێندنی بالاّ لە گەشەدانی تاکگەرایی و پەرەسەندنی ئەندێشەی رەهادا کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەیە و هەر ئەم بابەتە دەبێتە هۆی زیاتر لە پەراوێزکەوتنی تاك لە کۆمەڵگادا و دەرکپێکردنی هەستی نامۆبوون لە نێو جەغزی کۆدا.

سەبارەت بە پرسی ڕەگەز لە پشکنینەکانی دورکهایمدا ناهاوسەنگییەك بەدی دەکرێ لە نێوان هەوڵی خۆکوژی بەلای ڕەگەزی مێ و ڕەگەزی نێر. لەو وڵاتانەی کە دورکهایم لێکۆڵینەوە مەیدانییەکانی تێدا بە ئەنجام گەیاندووە، دەبینێ کە ڕێژەی خۆکوژی پیاوان لە ڕێژەی خۆکوژی ژنان زیاتر تۆمار کراوە. هۆکاری ئەم پارادایمە بە قەناعەتی دورکهایم دەگەڕێتەوە بۆ ئامۆژگارییە ئایینییەکان و پرسی پابەندبوونی ژنان بە ئایینەوە. ئەو پێی وایە کە ژنان زیاتر لە پیاوان لە ژێر کاریگەری ئایین و قەناعەتە ئایینیەکاندان و، هەر ئەم دۆخە وا دەکات کە ژنان کەمتر بیر لە کردەوەی خۆکوژی بکەنەوە و زیاتر لە پیاوان ملکەچی ئیرادەی کۆگەرایی بن.

لە سۆنگەی کولتوردا ئەم بابەتە، واتە پرسی خۆکوژی پێوەند دەداتەوە بە ستروکتوری کۆمەڵگا و پێوەندییە چینایەتییەکان. لە پشکنینەکانی دورکهایمدا ڕێژەی خۆکوژی بەلای چینی خوار کۆمەڵگا کەمترە لە توێژی مامناوەندی و، هەروەها دیاردەی خۆکوژی لای چینی مامناوەندی کەمترە لە چینی بالاّدەست. هۆکاری ئەم بابەتە دەگەڕێتەوە بۆ پرسی ئاوتۆریتە لە نێو چینی بالاّدەست و تارادەیەك لای چینی مامناوەندیش.

بە گشتی دیاردەی خۆکوژی فرەچەشنییە و هەر کام لە نموونەکانی خۆکوژی پێوەندی هەیە بە دۆخی تایبەت بە ئەو حاڵەتەی کە تاك دنە دەدات بە کردەوەی خۆکوژی. لە پۆلێن کردنی شێوازەکانی خۆکوژی، دورکهایم ئاماژە دەدا بە چوار نموونەی بنەڕەتی لە خۆکوژی کە بریتین لە:

1- خۆپەرستی

2-(EGOISTIC)، خۆبەخشانە

3- (ALTRUISTIC)، زەبر و زەنگ (FATALISTIC)،

4-ئاڵۆزی (ANOMIC).

دورکهایم ئەم چوار نموونە سەرەکییە لە مەڕ پرسی خۆکوژی دابەش دەکا بەسەر دوو قۆناغدا. قۆناغی یەکەم بریتییە لە "گونجاندن لە کۆمەڵدا" کە نموونەکانی "خۆپەرستانە" و "خۆبەخشانە" دەگرێتە خۆی، ئەم قۆناغە لە پێوەندیدایە بەڕادەی گونجاندن و تێکەڵاوی تاك لە کۆمەڵگادا. نموونەکانی "زەبر و زەنگ" و "ئاڵۆزی" لە خانەی "هەرەسی کۆمەڵایەتی"دا جێ دەکاتەوە کە ئاماژە دەدات بە هەرەس هێنانی نۆرمەکان و هەڵوەشانەوەی پەیمانە کۆمەڵایەتییەکان.

### فیگۆری ژمارە یەك



**خۆكوژیی خۆپەرستیانە** (EGOISTIC):

ئەم فۆرمە لە خۆكوژی ئاماژەیەكە بۆ شوێنی تاك لە كۆمەڵدا. واتە لە ئەنجامی لە پەراوێز خستنی تاكدا هەستی هاوبەشی و پێوەندی ئەو بە كۆمەڵگاوە لە بار دەچێت و لە ئەنجامدا تاك تەریك دەمێنێتەوە. لەم پێوەندییەدا تاك مەجالی خۆگونجاندن لە نێو خانەی كۆمەڵگادا نییە و هەر ئەم بابەتە دەبێتە هۆی لاواز بوونی بەهای ژیان بەلای مرۆڤەوە (DURKHEIM, 1991, 9). بە بۆچوونی دوركهەیم ئەگەری هەڵبژاردنی خۆكوژی لە فۆرمی خۆپەرستانەدا بەلای پرۆتێستانەكانەوە زیاترە لە چاو كاتۆلیكەكان، چونكە رەگی پرسی تاكگەرایی لە ستروكتوری پرۆتێستانتیزمدا بەهێزەترە. لە راستیدا دیاردەی تاكگەرایی بەرهەمی پەرەسەندنی ئازادی ئەندێشەیەو، تاكگەرایی هۆكارێكە بۆ لاوازبوونی بنەماكانی هەستی پابەندبوونی كۆمەڵایەتی لە كۆمەڵگای میكانیكیدا و، سەرنجی تاكگەرایی ئاراستەی مەبەستە تاكەكەسییەكان و بەرژەوەندییە تاكگەراییەكانی خۆیدا دەبێتەوە. دوركهەیم لە لێكۆڵینەوەكانی خۆیدا و لە نموونەی جوگرافیاییدا ئەم ئەنجامە وەردەگرێ كە لە بریتانیا مەجالی خۆكوژی لە فۆرمی خۆپەرستانەدا نزمترین رێژەی هەیە. هۆكارەكەی بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە كە ترادیشۆنێكی بەهێز لە ستروكتوری سیستەمی چینایەتی بریتانیاییەكاندا بەدی دەكرێت كە رێگرە لەبەردەم ئەم حاڵەتە لە خۆكوژی. ئەو سیستەمی مۆناریشی و بەهێزبوونی ئاوتۆریتە و بروكراسی دەزگا حكومی و سیستەمە خۆجێیەكانی كڵێسای بریتانیا بە هۆكارێكی دیكە دەزانێت كە مەجالی حاڵەتی خۆكوژی خۆپەرستانە كەم دەكاتەوە. لەمەڕ پرسی ئاوتۆریتە ئەو پێی وایە كە ئەم فاكتە بەربەستێكی پتەو دەخاتە بەردەم هزری تاكگەرایی و ئازادییە رەفتارییەكان. هەر سەبارەت بە حاڵەتی خۆپەرستانەی خۆكوژیدا، هاوسەنگییەكی تایبەت دەبینێتەوە لە نێوان رادەی خوێندنی بەلای توێژی باڵادەست و رێژەی خۆكوژی، كە بێگومان هۆكارەكەی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی كە خوێندن پاڵنەرێكی بەهێزە بۆ ئازادی و خۆ دەرهاویشتن لە تەوەرەی ئاوتۆریتەی سیستەمە كۆمەڵایەتییەكان. لە حاڵەتی خۆپەرستانەی خۆكوژیدا نموونەی پێوەندییە خێزانییەكان دێتە خانەی ئەم حاڵەتە بە تایبەت ئەو لاوانەی كە مەجالی پێكهێنانی ژیانی هاوبەشیان كەمە زیاتر دەكەونە ژێر هەڕەشەی ئەم حاڵەتە لە خۆكوژی. لە لێكۆڵینەوەكانی دوركهەیمدا رێژەی خۆكوژی منداڵان و مێرمنداڵان بەدی ناكرێت كە بە قەناعەتی دوركهەیم بنەماڵە كۆنتێكستێكی گونجاو دابین دەكات بۆ پرسی گونجاندن و هەڤبوون و بەرزكردنەوەی هەستی كۆگەرایی.

**خۆكوژی خۆبەخشانە** (ALTRUISTIC):

ئەم حاڵەتە لە خۆكوژی ئاماژەیەكە بۆ پاڵنەرێكی دەرەكی كە تاك دنە دەدات بە مەبەستی گیان بەختكردن لە پێناو ئەوانی تر (DURKHEIM, 1991, 9). بە بۆچوونی دوركهەیم ئەم حاڵەتە لە خۆكوژی بە پێچەوانەی حاڵەتی خۆپەرستانە كە لە سەرێدا ئاماژەی پێدرا، زێدەرۆیی دەكرێت لە گونجاندنی تاك لە كۆمەڵدا. واتە لە رێگای هەست و سۆزە كۆگەراییەكانەوە زیاتر لە رادەی پێویست تاك بە ناخی خۆشەویستی و ئەوینی كۆمەڵدا رۆ دەچێت كە ئامادە دەبێت لە پێناو ئەوانی تردا هەستێ بە كردەوەی خۆكوژی. وەك نموونە دوركهەیم ئاماژە دەدات بە دۆخی سەربازێك كە لە بەرەی شەڕدا و لە پێناو لە مەترسی نەكەوتنی ئەوانی دی گیانی خۆی بەخت دەكات، دوركهەیم ئەم حاڵەتە لە خانەی خۆكوژیدا پێناسە دەكات. هەر سەبارەت بەم نموونەیە دەكرێ كردەوەی خۆكوژی لە پێناو ئامانج یان ئایدۆلۆژی و دین و نەتەوەپەرستیدا بێتە خانەی ئەم چەشنە لە خۆكوژی. دین یاخود ئایدۆلۆژی كە پەیوەندییەكی ئەوتۆی هەیە بۆ دنە دانی تاك بۆ كردەوەی خۆكوژی، پارادایمێكی جێی سەرنجە كە لە روانگەكانی دوركهەیمدا رەنگدانەوەی خۆی

هەیە. ئەو لەسەر ئەو قەناعەتەیە کە ئەم فاکتۆرانە (دین، ئایدۆلۆژی) بریتین لە چەمکێکی گشتی لە واتای کۆمەڵگا و، هەروەها شتە پیرۆزەکان لەو رووەوە خاوەن پەرستنن کە دەورێکی گرنگ دەگێڕن لە وێنا سەبژەکتیڤەکانی کۆمەڵگا. لە وەها دۆخێکدایە کە دین و ئایدیالۆژی لە بری سیستەم چاوەدێری دەکەن بەسەر دۆخە کۆمەڵایەتییەکان و، زۆر ئاساییە کە لەم دۆخەدا واتا دنیاییەکان و بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکان لە پێناو وشیارییەکی کۆگەرایانەدا کەم بایەخ بکرێنەوەو هەستی پاراستنی دۆخی ئارایی و شتە پیرۆزەکان دێتە خانەی ئەرکێکی پیرۆز. یەکێك لە فۆنکشیۆنە گرنگەکانی پرسی دین و ئایدۆلۆژی و نەتەوەگەری لەو دۆخەدا بەرجەستە دەبێتەوە کە چەمکی ژیان لە لای تاك ئاڵۆز دەکات و مەرگ لە پێناو واتا پیرۆزەکاندا خۆشەویست دەکات. کولتوری دینی یاخود ئایدیالۆژی لەسەر بنەمای کۆمەڵێ بەهای کۆگەرایی دامەزراوە کە هۆکارێکی گرنگن بۆ یەکگرتویی و بەخشینی کەسایەتی بە کۆمەڵگاو، هەر لەم پێناوەدا سێرمۆنییە ئاینی و روانگە ئایدۆلۆژیکییەکان خاوەن فۆنکشیۆنێکی بەهێزن بۆ بەها کۆگەراییەکان و سەقامگرتویی کۆمەڵگا. ئاشکرایە کە پیرۆز راگرتنی کولتورە دینییەکان و مەبەستە ئایدۆلۆژیکەکان، لەم دۆخەدا پاساودەرێکی سەرەکییە بۆ سادەکردنەوەی بڕیاری خۆکوژی. ئەم دۆخە لە خانەی کۆمەڵگای میکانیکیدا پتر دەگونجێ.

**خۆکوژی زەبر و زەنگ** (FATALISTIC):

ئەم حاڵەتە ئاماژە دەدا بە دۆخێك کە لەودا سەرکوت و سەختگیری یاساکانی سیستەم و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان دەلالەت دەکەن لە بڕیاری خۆکوژی لەلای تاك. ئەم حاڵەتە گوزارشت دەکا لە دۆخێکی پڕ لە زەبر و زەنگ کە ئەنجامەکەی فەوتانی هەست و سۆزە ئینسانییەکان و، کەم مەیلی تاك لە هەمبەر درێژەدان بە ژیانە، لەم دۆخەدا دیسپلینی کۆمەڵایەتی دەورێکی گرنگ دەگێڕێت (DURKHEIM, 1991, 162). وەك نموونە دورکهەیم ئاماژە دەدات بە بارودۆخی کۆیلە و زیندانییەکان کە لە ژێر قورسایی دیسیپلین و سزا سەختەکاندا جەزرەبە دەدرێن کە چەمکی ژیان بایەخی خۆی لە دەست دەدات و ناچار دەبن کۆتایی بە ژیانی خۆیان بێنن و، ئەم کردەوەیە بە چەشنێك کۆتایی هێنانە بە ئازار و مەینەتیەکانیان. ئەم حاڵەتە لە خۆکوژی بە بۆچوونی دورکهەیم کۆمەڵێ نموونەی دیکە دەگرێتە خۆی کە سەرەکیترینیان دۆخی ناتەبایی تاك لە نێو کۆمەڵگایەکی داخراوەدایە کە نۆرم و بەها کۆمەڵایەتییە نەگۆڕەکان رۆشنایی گەشەسەندن و هیوایان لێڵ دەکات و، لە دۆخێکی رەشبینانەدا بە ناچار کۆتایی بە ژیانی خۆیان دێنن. ئەم حاڵەتە لە کۆمەڵگا نەریتییەکاندا نموونەیان زۆرە، چونکە پابەندبوونی میکانیکی رێگرە لەبەردەم هەر چەشنە کردارێك کە لە دەرەوەی ئیرادەی کۆگەراییدا بێت.

**خۆکوژی ئاڵۆزی** (ANOMIC):

ئەم حاڵەتە ئاماژەیەکە بۆ دۆخی کۆمەڵایەتی، لەو جێگایەی کە تاك لە رووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ کۆمەڵگادا هەست دەکات کە ستروکتور و خانە کۆمەڵایەتییەکان تووشی هەرەس هاتوون. لە راستیدا ئانۆمی دیاردەیەکی مۆدێرنە کە تایبەتمەندییەکی بگۆڕی کۆمەڵگا مۆدێرنەکانە. ئەم بابەتە پێوەندی هەیە بە پرسی گۆڕانکاری لە ستروکتوری کۆمەڵگادا. ئەم حاڵەتە لە خۆکوژی لە دۆخێکدا بەرجەستە دەبێتەوە کە تاك هەست دەکا ئەو نۆرم و رێسا کۆمەڵایەتیانەی کە لەگەڵیان گۆش کراوە، تووشی هەرەس هێنان هاتوون. ئانۆمی سەرچاوەی گرتووە لە وشەی یۆنانی "ئانۆمیا" کە بە مانای بێ یاسایی یان پاشاگەردانییە. دۆخێکی ئانومی لە حاڵەتێکدا سەر هەڵدەدات کە پنتکە سروشتییەکانی کۆمەڵگاکە بریتین لە نۆرم و بەها

کۆمەڵایەتییەکان، گۆڕانیان بەسەردا دێت و دەکەونە ژێر کاریگەری مۆدێلی نوێ. بە قەناعەتی دورکهەیم ئانۆمی لە حاڵەتێکی ئەوتۆدا سەرهەڵدەدات کە گۆڕانکارییەکی خێرا لە ستروکتوری کۆمەڵدا پێك دێت، بۆ نموونە ئەو ئاماژە دەدات بە گەشە یاخود نوشستی ئابوری. بە بۆچونی دورکهەیم گەشەی ئابوری دەبێتە هۆکارێك بۆ سەرلەنوێ ئورگانیزەکردنەوەی سیستەمی کارو، هەروەها چوونە سەرەوەی رادەی کارامەیی و سودمەندی. ئەم دۆخە دەبێتە هۆی ئەوە کە فۆرمی خێزانییە ترادیشۆنەکان و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان گۆڕانیان بەسەردا بێت. ئەمە لە خۆیدا دەبێتە هۆی ئەوەی کار و فۆنکشیۆنەکان بەشی جۆراوجۆری لێ ببێتەوەو، لە هەمان حاڵیشدا پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە نێوان مرۆڤەکاندا کەمتر دەبنەوە و مرۆڤ پتر لە خەمی پاراستنی کار و بەرژەوەندییەکانیدا دەبێت. لە حاڵەتێکدا کۆمەڵگا بەرەو رووی ئانۆمی دەبێتەوە، کە یاسا و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان هەرەس دەهێنن و ئەم دۆخە بە چەشنێك هەرەشەیەکە بۆ شووناسی تاك، کە مۆتیڤێکی سەرەکییە لەمەڕ مانەوەی تاك لە کۆمەڵگادا. مەجالی بەرەنگاربوونەوە لە حاست ئانۆمیدا، پێویستی بە پتەوکردنی هەستی هەڤبوون هەیە بۆ نەهێشتنی ئانۆمی (DURKHEIM, 1991, 10).

## دوا سەرنج

ئەوەی لە سەرێدا هاتە بەر دیدی خوێنەرانی ئەم بابەتە پوختەیەك بوو لە تیۆری خۆکوژی دورکهەیم، ئەم بابەتە لە باری میتۆدیکەوە دەچێتە خانەی کاوزال، واتە لە پێوەندییەکی هۆکارانەدا بەرجەستە کراوەتەوەو تیشك دەخاتە سەر ئەو هۆکارانەی کە دەبنە پاڵنەر بۆ ئەم دیاردەیە. لە خوێندنەوەیەکی کاوزالی دا سەرنجی لێکۆڵەر بەدوای وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا دەگەڕێت: لەبەرچی کۆمەڵێك دیاردە یاخود رووداو روو دەدات، کە ئەم دۆخەیش بەندە بە ئەو هۆکارانەی کە لە رابردوودا کارتێکەری خۆیان بەسەر دیاردەکانی هەنووکەدا بەجێهێشتووە. هەر ئەم دۆخە توێژەر دەخاتە بەردەم پێداویستییەکی گرنگ بۆ بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە بەپێی بنەما ئیمپیری و تیۆریکییەکان کە پێوەندییان هەیە بەم پرسیارەی کە هۆکاری کارتێکەری رووداوەکانی رابردوو چییە بەسەر رەفتارەکانی تاك لە ئێستادا. بۆ زیاتر شیکردنەوەی ئەم میتۆدە پێویستە سەرنجێکی تیژتێپەر بدرێت لە بنەمای فۆرموولەکردنی میتۆدی لێکۆڵینەوەی کاوزاڵی. CARL G. HEMPEL (1942) لە داهێنانی فۆرمالیزاشینێك بۆ فۆرموولەکردنی خوێندنەوەی کاوزاڵی دا ئاماژە دەدات بە سێ توخمی سەرەکی کە تەواوکەری میتۆدی خوێندنەوەیەکی کازاوڵییە: یەکەم- خوێندنەوەیەك بۆ ئەو بابەتەی کە بڕیارە بخرێتە بەر باس، دووهەم- یاسایەك یاخود چەند یاسای گشتی و سێهەم، مەرجە سنووردارەکان. ئەم سێ توخمە دابەش دەکرێت بەسەر دوو حاڵەتی گشتی لە فۆرمی خوێندنەوەدا و ئەم دوانە بریتین لە ئیکسپلاناندێم (EXPLANANDUM) کە توخمی یەکەمی تێدا جێگیر دەبێت، واتە خوێندنەوەیەك بۆ ئەو بابەتەی کە بڕیارە بخرێتە بەر باس، ئێکسپلانانس (EXPLANANS) کە توخمی دووهەم و سێهەمی لێ جێگیر دەبێت، واتە یاسا گشتییەکان و مەرجە سنووردارەکان.

**فیگۆری ژمارە دوو** (1)

$$\frac{explanans = \dfrac{\text{یاسای گشتی}}{\text{مەرجە سنوردارەکان}}}{\text{explanandum} = \text{خوێندنەوەیەک بۆ ئەو شتەی کە دەبێ بخرێتە بەر باس}}$$

بەسەرنجدان بەم فۆرمووله بۆ خوێندنەوەیەکی کاوزاڵی لەمەڕ دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی دیاردەی خۆکوژی بەلای دورکهەیمەوە، بەم چەشنە دەرەنجامی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکەی دورکهەیم فۆرمووله دەکەین:

**فیگۆری ژمارە سێ** (2)




دورکهەیم لەسەر ئەوە مکورە کە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانن کە قەناعەتی خۆکوشتن بەلای تاکەوە بەهێز دەکەن و، لە دەرەنجامی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکانیدا دەگاتە پرسی گونجاندن لە کۆمەڵگادا. دورکهەیم پرسی گونجاندن بە ئاگر دەشووبهێنێ لە وەرزێکی بەستەڵەکدا و، رادەگەیەنێ کە نزیک بوون یاخود دوورکەوتنەوە لە تینی ئاگر دوو ئەنجامی پێچەوانەی لێ دەکەوێتەوە. کاتێ کەسێك لە ئاگر زۆر نێزیك دەبێتەوە ئەگەری سووتانی پترە و، لە هەمان حاڵدا ئەگەر مەودایەکی دووری هەبێت لە تینی ئاگرەکە تووشی سەرما بردوویی دەبێت. ئەو پێی وایە کە پێویستە هاوسەنگییەك لەمەڕ مەوداو شوێنی تاك لە کۆمەڵگادا پێش چاو بگیردرێ.

لە پێوەندی بە دیاردەی خۆکوژی گریمانەی جیاواز لە ئارادا هەن کە بێگومان دورکهەیم سەرنجی تایبەتی بەم گریمانانەیش داوە وەك پرسی بیۆلۆژی کە دەشێ دیاردەی خۆکوژی ببەستێتەوە بە هۆکارە هۆرمۆنییەکان یاخود ژێنەکان، هەروەها پرسی سایکۆلۆژی کە ئاماژە دەدات بە فاکتە دەروونییەکانی تاك وەك خەمۆکی و ئاڵۆزییە دەروونییەکانی تاك. ئەم سێ فاکتۆرە لە خۆکوژی، واتە فاکتۆری بیۆلۆژی، فاکتۆری سایکۆلۆژی و فاکتۆری سۆسیۆلۆژی، هەر کامیان هاوتەریب لەگەڵ پێوەندییەکی هۆکارانەدا (KAUSAL) شرۆڤە کراون و، ئەم ڕاستیە دەردەخەن کە دیاردەی خۆکوژی لە پێوەندییەکی بنەماییدا (INTENTIONAL) نییە. مەبەست لە پێوەندی بنەمایی لەم بابەتەدا ئاماژەیە بە ئەو بنەما یاخود یاسایانەی کە خۆکوژی وەك ئەنجام لەبەرچاو دەگرێت. بە واتایەکی دیکە خۆکوژی هیچ پێوەندییەکی بە بڕیاری تاکەکەسەوە نییە.

بە سەرنجدان بە تیۆر و نموونەکانی حاڵەتی تووشبوون بە دیاردەی خۆکوژی کە لە سەرێدا هاتنە بەر باس، ئەم دیاردەیە لە پێوەندییەکی کۆمەڵایەتیدا و لە ناو کۆنتێکستی جیاوازدا روودەدات. یەکەمیان لە خانەی کۆگەرایی و لە پێوەندی بە "وشیاری کۆمەڵایەتیدا" راڤە دەکرێت و، وشیاری کۆمەڵایەتیش لە

فاکتۆری پابەندبوونی میکانیکیدا تیۆریزەکراوە (تایبەتە بە کۆمەڵگای نەریتی). دووهەمیان لە پێوەندیدایە بە پرسی تاکگەرایی و لە فاکتۆری "نەزمی کۆمەڵایەتی" و لە فۆرمی پابەندبوونی ئۆرگانیکیدا تیۆریزە دەکرێت (تایبەتە بە کۆمەڵگای مۆدێرن).

لێرەوە خشتەیەکی دی لە تیۆری خۆکوژی وێنا دەکەین کە پێوەندی هەیە بە ئاستە کۆمەڵایەتییەکان و ئەم حاڵەتانە بەپێی کاراکتێری کۆمەڵایەتیان، لە دوو تەوەردا پۆلێن دەکەین و دەیخەینە ڕۆژەڤێکی میتۆدێك بۆ پێوەندی دانەوە بە کۆمەڵگای ئێمە. ئەو نموونانەی کە پتر لە خانەی کۆمەڵگا پێش مۆدێرنەکاندا ئەگەری ڕوودانیان پترە بریتین لە خۆکوژی زەبرو زەنگ و خۆکوژی خۆبەخشانە. ئەو نمونانەیش کە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا ئەگەری ڕوودانیان هەیە بریتین لە خۆکوژی ئاڵۆزی و خۆکوژی خۆپەرستانە.

### فیگۆری ژمارە چوار




بینیمان کە لە خۆکوژی خۆپەرستانەدا تاك لە کۆمەڵدا بە ڕادەیەکی کەم مەجالی خۆ گونجاندنی بۆ دەرەخسێ و لە پەراوێزی کۆگەراییدا تەنیا و تەریك دەمێنێتەوە. لە نموونەی خۆکوژی ئاڵۆزی، تاك خۆی لە دۆخێکی کۆمەڵایەتیدا دەبینێتەوە کە پێوەندی هەیە بە گۆڕانکاری لە نۆرم و بەها کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگا، لەم دۆخەدایە کە نۆرم و بەها گشتییەکان بەرەو ڕووی هەرەس هێنان دەبنەوە و تاك خۆی لە ئاژاوڵەییدا دەبینێتەوە. لە نموونەی زەبرو زەنگدا کە پێچەوانەی حاڵەتی ئاڵۆزییە، پێوەندی هەیە بە کۆمەڵگایەك کە زەبر و زەنگ دەنوێنێ لەمەڕ هێشتنەوەی نۆرم و بەها گشتییەکان و، لە ئەنجامدا تاك بەرەو ڕووی سیستەمێکی داخراوە دەکاتەوە کە بەربەست دەخاتە سەر ڕێی گەشەکردن و بەرهەم هێنانەوەی تاکێتی خۆی. لە نمونەی خۆبەخشانەدا تاك بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی گشتی لە پێناو کۆمەڵدا گیانی خۆی بەخت دەکا. لەهەر کام لەم قۆناغانەدا هەست بە نەبوونی هاوسەنگییەك دەکرێت لە نێوان پرسی حەوانەوە یاخود گونجاندنی تاك لە کۆمەڵدا.

### نموونەکانی خۆکوژی کە پتر لەگەڵ کۆمەڵگای ئێمە دەگونجێن

وەك لە سەرەتای ئەم باسەدا ئاماژە درا بە ڕێژەی خۆکوژی و هۆکارەکانیان کە لە ڕاگەیاندنەکاندا دێنە بەر باس، هەر کام لە نموونەکانی خۆکوژی چ لە فۆرمی خۆکوژی زەبر و زەنگ و چ خۆکوژی خۆبەخشانە لە ڕاپۆرتەکاندا ڕەنگدانەوەیان هەیە. ئەو هۆکارانەی کە کەسی خۆکوژ هاندەدات بە کردەوەی خۆکوژی بە لایەنی زۆرەوە لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا دەبیندرێنەوە کە بریتین لە پێوەندی خێزانی (زەبر و زەنگی بنەماڵە)، شکست هێنان لە ئەزموونی خۆشەویستی (کە دەشێ پێوەندی هەبێت بە بەربەستەکانی بەردەم خۆشەویستی لاوان و ئەو لەمپەرانەی کە ڕێگرن لەبەردەم دەرفەتی هاوسەرگیری)، لە پێوەندی خوێندندا

(کە پێوەندی هەیە بە فاکتی جەبرگەرایانە لە سیستەمی پەروەردە)، دۆخی نالەباری زیندانییەکان، گرفتی ئابووری و پرسی بێکاری، نەبوونی مەجالی گەشەی تاك و داخراوە بوونی کۆمەڵگا بەسەر گەنجان و...

وەك پێشتر لە شرۆڤەکردنی نموونەی خۆکوژی زەبر و زەنگدا ئاماژەمان پێدا، بینیمان کە ستروکتوری کۆمەڵگا پێك هاتووە لە فۆرمێکی میکانیکی کە تاکەکانی نێو کۆمەڵ بەرەو "وشیاری" یەك پاڵ پێوەدەنێت کە مۆتیڤی سەرەکییەکەی پرسی کۆگەراییە. پرسی کۆگەرایی لەم دۆخەدا کاریگەری هەیە لەسەر چێبوونی پرسی "وشیاری کۆمەڵایەتی" و ئەم فاکتە لە سۆنگەی ئەو ئیرادەیەوە بەرجەستە دەبێتەوە کە تاك لە حاند نۆرم و یاسا ئابستراکەکانی نێو کۆمەڵگاکەیدا ملکەچ دەکات و دەیخاتە دۆخێکەوە کە دەرچوون لە تەوەرەی دەسەڵاتی کۆ بە سنووری فەوتانی خۆی دەزانێت. بۆ نیهادینەکردن و پیرۆزبوونی ئەم وابەستەبوونە، نیهادەکانی کۆمەڵگای میکانیکی دەورێکی گرنگ دەگێڕن و گشت تەقەلاکانیان دەخەنە گەڕ بە مەبەستی بەهێزبوونی هۆگری تاك لەمەڕ پرسی مانەوە لە چارەنووسی کۆگەراییدا. گرنگ نییە ئەم نیهادانە بە شێوازێکی رێکخراوەیی یان بە فۆرمێکی سیستەماتیك کارتێکەرییەکانی خۆیان پیشان بدەن، چونکە ئەم نیهادانە بەشێکی گرنگن لە ستروکتوری کۆمەڵگا و تایبەتمەندییەکی سایکۆلۆژیانەو سەبژەکتیڤیان هەیە کە تاك تا تاریکترین قووژبنەکانی قەناعەت هێنان پاڵ پێوەدەنێت. ئەم نیهادانە وەك پێشتر لە تیۆری خۆکوژی دورکهەیمدا ئاماژەیان پێدرا نیهادگەلی ئایینی (لەلای ئێمە وەك: مزگەوت، نیهادە پەروەردەییەکان، خانەقا، مەکتەبەی قورعان...) و کولتورین (وەك قەناعەتی خێڵەکی، بنەماڵەیی، ناوچەگەرایی و، خووخدە، سیرمۆنییەکان، ریتواڵەکان...).

## فیگۆری ژمارە پێنج




لە پێوەندی بە خۆکوژی خۆبەخشانەدا ئەم بابەتە زیاتر دراماتیك دەبێتەوە کاتێ سەرنج دەدەین بە رێژەی کردەوەی خۆکوژی یاخود خۆتەقاندنەوەی کەس یان کەسانێك کە بە مەبەستێکی ئایدۆلۆژیك هەڵدەستن بەم کارە. ئەو کەسانەی کە بە پەنا بردنە بەر رێکارە تاك رەهەندییەکان هەڵدەستن بە کردەوەی خۆبەخشانە لە پێناو چارەسەری یاخود وەدیهێنانی ئامانجە سیاسی، دینی و نەتەوەییەکانیان، لە راستیدا نموونەکانی پرسی خۆکوژی خۆبەخشانەن کە دورکهەیم لە تیۆری خۆکوژیدا ئاماژەی پێداوە. بۆ هەرکام لە ئێمە کاتێ بەرەو رووی حاڵەتێکی خۆبەخشانە دەبینەوە، بەر لەوەی بە نیگایەکی ئۆبژەکتیڤەوە ئاوڕ لەم حاڵەتە لە خۆکوژی بدەینەوە، بە هەڵسەنگاندنێکی سەبژەکتیڤەوە هەڵوێست وەردەگرین. زۆر سروشتییە

که ئەم بابەتە بە دوو ئاقاری جیاواز و لە دوو پێودانگی بە تەواوی لێك جیا، بەراورد بکرێن. کاتێ کەسێکی خۆکوژ بە مەبستی نێزیك بوونەوە لە ئامانجە ئایدیالۆژییەکانی دەست دەداتە کردەوەی خۆتەقاندنەوە، هەر ئەم کەسە بەرەو رووی دوو هەڵوێستی نەرێنی و لە هەمان کاتیشدا ئەرێنی دەبێتەوە، ئەو کەسانەی کە لە پشتەوەی ئەم چەشنە قەناعەتە رادەوەستن بە شەهید ناوزەدیان دەکەن و بە چاوێکی ئافەرینییەوە دەڕواننە کردەوەکانیان، بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە لە هەمبەر ئەم کردەوەیە هیچ گرێیەکیان نییە و لە دەرەوەی قەناعەتەکانی کەسی خۆکوژ راوەستاون، بە چاوێکی قێزەوون و ترسنۆکانە دەڕوانێتە کردەوەی خۆکوژی ئەم تاقمە. ئەوەی کە لەم نێوەندەدا سەرنجی پێویستی پێ نادرێت بینینێکی ئۆبژەکتیڤانەو، تێداچوونی ژیانی کەس یان کەسانی خۆکوژە. هەر چەشنە هەڵوێستەیەك لە هەمبەر ئەم حاڵەتە پێوەندی هەیە بە فاکتی سیاسی/ ئایدۆلۆژی کە پێویستە خوێندنەوەی بۆ بکرێت لە فۆرمێکی مایکرۆدا. تۆ بڵێی قەناعەتی خۆبەخشانە نیسبەتێکی هێندە قەتعی هەبێت کە حەتمەن ئەنجامی خۆکوژی لێ بکەوێتەوە؟ ئەگەر کەسی خۆکوژ لە مەجالێکی دیکەی کۆمەڵایەتیدا دەرفەتی هەڵبژاردنی بۆ برەخسێت، تۆ بڵێی بە هەمان کردەوە هەڵدەستێ؟ سروشتییە کە ئەم ئەنجامە لە پێوەندییەکی راشیۆناڵی دا رووندادات و زیاتر لە ژێر کاریگەری لایەنە هەستەکییەکاندا ئەم چەشنە هەڵوێستانە دەبن بە بڕیار.

### فیگۆری ژمارە شەش




### دەرەنجام

بۆ بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم حاڵەتانەی خۆکوژی کە لەم بابەتەدا تیشکیان خرایە سەر، رەنگە رێکار یان میکانیزمێك بە تەنیا نەتوانێت کاریگەری ئەوتۆی هەبێت لەمەڕ نەهێشتنی ئەو دەرفەتانەی کە مەیلی خۆکوژی لای تاك بەهێز دەکات. ئەم بابەتە پێویستی هەیە بە خوێندنەوەیەکی بەڵگەمەندانە و لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی و درێژخایەن بۆ ئەوەی بتوانێت گشت رەهەندەکانی پێوەندیدار بەم دیاردەیە بناسێت و پێش مەرج و رێکاری گونجاوی بۆ بەرز بکرێتەوە. لە هەمان کاتدا ئەمە لە خۆیدا گرنگە کە دیاردەی خۆکوژی لە کۆمەڵگادا وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی پێش چاو بگیردرێ، تاکو بە ئاستێکی بەرپرسانە و بە دەرکێکی لۆژیکییەوە بەرەو رووی ئەم حاڵەتانە بینەوە.

پەرەسەندنی ڕێژەی خۆکوژی و ڕادەی پاوەجێبوونی نموونەکانی ئەم دیاردەیە لە کۆمەڵگای ئێمەدا پێویستی هەیە بە تێڕامانێکی جیددی لە هەمبەر ئەم کارەساتە کۆمەڵایەتییە. ئەوەی کە لە هەواڵەکاندا ئاماژەی پێدەدرێت ڕاستەوخۆ پێوەندی هەیە بە فاکتە مایکرۆکان وەك سیستەمی پلان دانان و بەڕێوەبەری کۆمەڵگا. ڕێژەکانی دیاردەی خۆکوژی وێنایەکی شەفاف و لە هەمان حاڵیشدا ڕووی ڕاستی لاوازبوون و کەم و کووری ئەم سیستەمانە دەخەنە ڕوو کە هۆکاری سەرەکین لە هەمبەر پرسی نایەکسانی و نادادپەروەری کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگادا. دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ئەگەر لە حاڵەتێکی ناهارمۆنیك یاخود تراژیکدا خۆ دەنوێنن، لە هەمان حاڵدا بەیانگەری ئەم واقعەن کە پێداویستی گۆڕان لە سیستەمدا دەخەنە ڕۆژەڤەوە. پێشتر ئاماژەمان پێدا کە ئەگەری ڕوودانی دوو نموونەی حاڵەتی خۆکوژی (زەبرو زەنگ و خۆبەخشانە) لەگەڵ دۆخە کۆمەلایەتییەکانی ئێمەدا دێنەوەو، هەر بۆ ئەم مەبەستە پێویست دەکات سەرنجێکی ووردتر بدرێتەوە لەو فاکتانەی کە کارتێکەرییان هەیە لەسەر ئەم دیاردەیە. سەبارەت بە حاڵەتی خۆکوژی لە فۆرمی زەبرو زەنگدا، ئاماژەکان بەرەو ڕووی دۆخە ئابستراکەکانی کۆمەڵگا دەبنەوە. لە وەها دۆخێکدا یاسا و ڕێساکانی کۆمەڵگا وەك زەمینەیەك بۆ ڕوودانی ئەم حاڵەتە لە خۆکوژی پتر لە هەر فاکتێکی لاوەکی دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، تۆ بڵێی بۆ بەرگرتن بەم حاڵەتە لە خۆکوژی کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا زۆر باوە چ ڕێکارێك گرنگی خۆی وەربگرێت؟ ئایا گۆڕانی کۆمەڵگا وەك پێشمەرجێکی واقعی دەتوانێ نموونەیەکی ئەڵتەرناتیڤی بێت بۆ ئەم مەبەستە؟ وەلامدانەوە بەم پرسیارە کارێکی ئاسان نییە، چونکە ئێمە نازانین کە لە دۆخێکدا کە کۆمەڵگا گۆڕانی بەسەردا دێت — گریمان ئێمە ئەو توانایەمان هەبێ — دەرەنجامەکانی ئەم گۆڕانکارییە چی لێ ساغ دەبێتەوە. بە واتایەکی دیکە کێ دەتوانێ پێشبینی ئەنجامەکانی گۆڕان بکات، یاخود بوارەکانی گۆڕان بە چ ئاقارێکدا تێدەپەڕێت.

ڕەنگە پێشبینی کردنی گۆڕانکارییەکی خێرا لە ستروکتوری کۆمەڵایەتی، بەتایبەت لە کۆمەڵگای ئێمەدا، کارێکی گەلێ ئەستەم بێت و دوور لە گونجان خۆی بنوێنێت، چونکە زەمینەی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگادا پێویستی هەیە بە کەرەسە و مەتریاڵی خۆی و، ئەوەی کە تا ئێستا دیارە، کارێکی ئەوتۆ بۆ زەمینە خوڵقاندنی چێبوونی ئەم فاکتە لە کۆمەڵگای ئێمە نەکراوە کە پێوەندی هەیە بە گەشەدانی سەرمایەی کولتوری. ئەگەر ئەم بەشە واتە گەشەسەندنی سەرمایەی کولتوری بەهۆی قورس بوونی پرۆژەکە پێویستی هەیە بە پشوویەکی درێژتر، بەڵام خۆ دیمۆکراتیزەکردنی سیستەمی بەڕێوەبەری و ناوەندە بڕیاردەرەکان و کردنەوەی مەجالی بەشداربوونی تاك لە بڕیارەکانی پێوەندیدار بە کۆمەڵگا، کارێکی هێندە ئەستەم نییە و تەنانەت لە درێژخایەندا ئەم دۆخە قازانجی خودی دەسەلاتی سیاسی کۆمەڵگەشی لێ دەکەوێتەوە. مەرجی دیمۆکراتیزەکردن گرنگیەکی حەتمییە بۆ هەر چەشنە گۆڕانێك لە ستروکتوری کۆمەڵگادا و، ئەم بابەتە لەو سۆنگەوە گرنگی خۆی وەردەگرێت کە بەر لە هەر نیهادێك نیهادە پەروەردەییەکان بەرەو ڕووی گۆڕان بێتەوە بە مەبەستی زیاتر ریفلێکتیڤ کردن و دیمۆکراتیزە کردنی سیستەمی پەروەردە. گۆڕانکاری لە سیستەمی پەروەردەدا گرنگییەکی ئەوتۆی هەیە، بەتایبەت کە ستروکتوری پەروەردە لە سیستەمی ڕاهێنانی کۆمەڵگای ئێمەدا پەیڕەوی دەکات لە شێوازێکی ئاوتۆریتەیی و ئەم دۆخە لە خۆیدا مەجالی دیسپۆتیزمی ئیداری بەهێز کردووە. بە ڕاستی پەروەردە و سیستەمی خوێندن بۆ هەر کام لە ئێمە بیرەوەری چ دۆخێکی نالەباری ڕۆحییە؟ بە لانی کەمەوە وەچەی ئێمە باش دەرك بە حاڵەتە ترساوییەکانی سەردەمی خوێندن دەکا و، ئێستاشی لەگەڵدا بێت وەك سامێکی ئەبەدی لەگەڵماندا دەژیت و تەنانەت ئەم حاڵەتە دیسپۆتیزمییە دزەی کردۆتە نێو نیهادەکانی دیکەی کۆمەڵگاش. وەك لە کۆمەڵێك لە ڕاپۆرتەکاندا ئاماژە کراوە بە خوێندن، وەك هۆکارێك بۆ کردەوەی خۆکوژی خوێندکاران، ئەم حاڵەتە لە خۆیدا ڕەنگدانەوەی

کاریگەری زەبرو زەنگ نواندن و ئاوتۆریتەیە لە سیستەمی پەروەردەدا.

دەسەڵاتی نیهادە ترادیشۆنییەکانی کۆمەڵگا وەك نیهادە کولتوورییەکان لە بری نیهادی مەدەنی و مۆدێرنەکان، هەتا ئێستاش چاوەدێری رێکخستنی کۆمەڵگا دەکەن و ئەمەیش تایبەتمەندی کۆمەڵگای میکانیکییە و نکوڵی لێ ناکرێت. ئێمە بە گشتی دەرك بەوە دەکەین کە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای ئێمە لە چ کۆنتێکستێکی کۆمەڵایەتییەوە خۆی دەردەخات، ئەم کۆنتێکستە میکانیکییە وەك مۆتۆری (مەکینەی) ماشێنێك، هێزی جووڵەی خۆی لەو دینامیزمە وەردەگرێ کە بە بەراوردێك دەشێ بە "رۆحی کۆمەڵگا" ناوزەدی بکەین. واتە کۆمەڵگا هێزی جووڵەی خۆی لە دینامیزمێك وەردەگرێت کە رەگێکی قووڵی لە وشیاری کۆمەڵایەتیدا هەیە. کەواتە گرنگترین ئەکسیۆنێك کە دەتوانێ کاریگەری هەبێت لە گۆرانی ستروکتورەکانی کۆمەڵگا، دەست بردن بۆ دێفاکتەکانی "وشیاری کۆمەڵایەتییە". گرنگترین پرۆژەیەك کە لەم میانەیەدا دەتوانێ ببێت بە دەسپێکێك بۆ رێگا خۆش کردن لەبەردەم گۆران لە دێفاکتەکانی وشیاری کۆمەڵایەتیدا، لە گرەوی هەموارکردنی بنەماکانی ژێرخانی کۆمەڵگایە کە پێویستی بە دابینکردنی سەرمایەی ئابوری و کولتورییەکانە. هەر چەشنە گۆرانێك لە سیستەمی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگا، لە درێژخایەندا دەبێتە هۆی گۆرانکاری لە ستروکتوری کۆمەڵگا. بەم پێیە هەتا کۆمەڵگا ریفلێکتیڤ تر (منعطف) بکرێتەوە گۆران لە شووناسی وشیاری کۆمەڵایەتیدا بە ئاقاری ئاسایی خۆیدا تێدەپەرێت و، نیشانەکانی تاکگەرایی و نەزمی کۆمەڵایەتی" پتر خۆی دەردەخات. هاتنە دی ئەم ئەنجامە لە گرەوی گۆرانکاری لە سیستەمی کار و بەرهەم هێناندا مسۆگەر دەبێت و، هەتا کار، فانکشیۆنەکانی نێو کۆمەڵگا، نیهادەکان و بنیاتە کولتورییەکان نەچنە پرۆژەی مۆدێرن بوون، هەر چەشنە گۆرانێك لە بەستێنی کۆمەڵگادا روو نادات. پێوەندی کار و فۆنکشیۆنەکانی نێو کۆمەڵ، وەك دامەزراوە و دایرەو کۆمپانیاکان و.. ئەگەر پتر لە ژێر کارتێکەرییەکی تەکنۆلۆژیانەدا بن رادەی نیازی تاك بە خۆ تەیارکردن بە خوێندن و خۆ پێگەیاندن لە ئاستی باڵادا (جووڵەی کۆمەڵایەتی) پتر دەکا. گۆران لە سیستەمی بەرهەم هێنان و کاردا بەپێی ئەزموونەکانی وڵاتانی مۆدێرن، نمای کۆمەڵگا لە هاوچەشن بوونەوە بەرەو فرەچەشن بوون گۆری و ئەم ئەنجامەی لێ کەوتەوە کە یەکەم: پرسی ژن لە چوارچێوە پریڤاتییەکانی بنەماڵە هاتە دەر و بوو بە پرسی دەرەوەی بنەماڵە، دووهەم: ئەم دۆخە، واتە نیازی کۆمەڵگا بە کاری ئافرەت، زەمینەکانی بنەماڵەی ترادیشیۆنی تووشی هەرەس کرد و وێنایەکی نوێ و ریفلێکتیڤ تر لە فاکتی بنەماڵە هاتە چێ کردن و پرسی پریڤات (خصوصی) بوونی ژن و منداڵ لە پاوانی مافی مێرد هاتەدەر و لە باری مافناسییەوە کۆمەڵێ چەمکی نوێ لە پرسی خاوەندارێتیدا هاتە ئاراوە، سێهەم: لە ئاکامی ئەم گۆرانکارییانە لە ستروکتوری کۆمەڵدا، گۆران بەسەر یاسا گشتییەکانیشدا هات. رەنگە لە میانەی ئەم باسەدا جێی خۆی بێت کە ئاوردانەوەیەکمان هەبێت لە سیستەمە بەرێوەبەرییەکانی لای خۆمان کە بە پێچەوانەی پرۆسەی گەشەی سیستەمە مۆدێرنەکان، پرسی یاسادانان لە پێشەوەی فاکتۆرەکانی دیکەدا بەرجەستە دەکاتەوە. یاسا بنچینەییەکان لەم سیستەمانەدا لە باری چۆنایەتییەوە رەنگە چی وا کەمتر نەبێ لە یاسا بنچینەییەکانی وڵاتانی مۆدێرن، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە پراکتیزەکردنی ئەم یاسایانە پێویستی بە کەرەسە و میکانیزمی شیاوی خۆی هەیە، هەنووکەیش بە دەست لێنەدراوی لە ئەرشیفی بەڵگەنامەکانی پەرلەمان و لەسەر مێزی یاسادانان واوەتر نەرۆشتووە. ئێستاشی لەگەڵدا بێت لە بەشێکی زۆری وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناڤین و بە تایبەت کۆمەڵگای ئێمەدا پرسی جێبەجێنەکردنی یاسا بنچینەییەکانی وڵات گەورەترین گرفتە و بگرە گەلێ قوربانیشی بۆ دراوە. هەر بەم هۆیەیە کە سەروەری یاسا لەم چەشنە کۆمەڵگایانەدا گومانێکی وەهم ئاسایەو وێناکردنی سەقامگیری کارێکی دوور لە واقع دەنوێنێ.

ڕەنگە هیچ مەڵبەند و هیچ هەرێمێك بە هێندەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین — بەسەرنجدان بە ستروکتوری فرە ئایینی بوون و نەقشەی فرە ئەتنیکی بوون و ئەکسیۆنە سیاسییەکانیەوە — گیرۆدەی دیاردەی خۆکوژی لە حاڵەتی خۆبەخشانەدا نەبووبێتەوە. بابەتێکی جێی سەرسوڕمان لەم پێوەندییەدا پیرۆزکردنی کردەوەی خۆکوژییە کە بە سیفەتی شەهید و قارەمان و ئازایەتی و لەم چەشنە سیفاتانەوە ڕازاوە دەکرێن و، لە پڕۆپاگەندەو ئامۆژگارییە خۆجەییەکاندا بە پێش چاوی جیهانەوە و لە ڕێگای کەرەسەکانی میدیا و ڕاگەیاندنەوە بە مەبەستی دنەدانی تاك بۆ خۆکوژی خۆبەخشانە ڕێکلام بڵاودەکەنەوە. ئەم دیاردەیە لە دوو حاڵەتی خۆکوژیدا ڕەنگدانەوەی هەیە کە یەکەمیان بریتییە لە خۆکوژی مەبدەئی و کردەوەی تیرۆریستی. خۆکوژی خۆبەخشانە لە پێناو ئامانج یاخود قەناعەتی ئایدۆلۆژیك ئاماژەیەکە بۆ دۆخی شەڕ، لە حاڵێکدا کە نیشتمان، دەسەڵات، ئایین، حیزب، یەکەی سەربازی و بە گشتی گشت ڕەمزەکانی کۆگەرایی دەکەوێتە بەر هەڕەشەی دەستدرێژی یاخود کردەوەی توندوتیژی. لە وەها دۆخێکدا بایەخدان بە پرسی خۆ فیداکردن لە پێناو ڕەمزەکانی کۆگەرایی، لە سنووری ئەخلاقی تێدەپەڕێن و تەنانەت پەنا دەبەنە بەر ترسناکترین نموونەکانی خوراڤ و، بە تەحریف کردنی بنەما ئەخلاقییەکانی ئایین و ئایدۆلۆژیا بە قازانجی ئامانجە تاکتیکییەکان، پاداشتی شەهیدبوون (کردەوەی خۆکوژی) لەم دنیایەدا و لە دونیای پاش مەرگیشدا دیاری دەکەن. ڕەنگە بەلای خوێنەری ئەم بابەتەوە ئەم پرسیارە بەرجەستە بکرێتەوە کە لە وەها دۆخێکدا کە وڵات یان لایەنێك بە مەبەستی دوژمنکاری هێرش دەکاتە سەر لایەن یاخود وڵاتێکی دیکە، جگە لە حاڵەتی بەرەوڕووبوونەوە دەشێ چ بڕیارێکی دیکە بدرێت؟ بێگومان وەك هەر چەشنە حاڵەتێکی غەریزەیی، پرسی بەرگری کردن کاردانەوەیەکی زۆر سروشتی بنوێنێت، بەڵام لە گشت حاڵەتەکاندا مۆتیڤی شەڕ پێوەندی هەیە بە هەردوو لایەنی ناکۆك. بە واتایەکی دیکە هەردوو لایەن چ هەڵمەتبەر و چ بەرگریکەر لە زەمینەیەکی ناعەقڵانییەوە ڕێ خۆشکەر دەبن بۆ مەجالی بەرپابوونی شەڕ. واتە مەرج نییە شەڕ تاکە ڕێکار بێت لە بەرەو ڕووبوونەوەی ناکۆکییەکاندا.

خۆکوژی خۆبەخشانە بە پەنا بردنە بەر کردەوەی تیرۆریستی یەکێکە لە ئەکسیۆنە شوومەکانی ئەم سەردەمە. ئەگەرچی گرووپی مافیا ئاسایی بە شێوەیەکی گشتی لە پشتەوەی ئەم حاڵەتانە لە خۆکوژی ڕاوەستاون، بەڵام نابێت ئەوە لە بیر بکەین کە پاڵنەرە سەرەکییەکانی هاندان و دنەدەری ئەم حاڵەتە لە خۆکوژی لە ڕەمزە پیرۆزەکانەوە، وەك قەناعەتی ئایین و کولتوری جیهاد و شەهادەت سەرچاوەی گرتووە. لەم دۆخەدایە کە بە نیازی شوومەوە کەڵك لە نیهادە ترادیشۆنییەکان وەردەگرن و، وەك لە تیۆری خۆکوژی دورکهەیمدا ئاماژەی پێدراوە، تاك لە ڕادەی پێویست زیاتر لە کۆمەڵدا دەگونجێنن کە لە ڕێگای دۆخە هەستەکییەکانیەوە و نیازپاکییە سروشتی و ساکارەکانیانەوە قەناعەتی خۆبەخشین لە پێناو کۆمەڵی پێ تەڵقین دەکرێت.

لە پێوەندی بە هەوڵدان بۆ نەهێشتنی حاڵەتی خۆکوژی لە فۆرمی خۆبەخشانەدا، ئەم بابەتە پێویستی هەیە بە هەڵوێستە کردنێکی مێتا ئەخلاقییەوە. مەبەست لە هەڵوێستەی مێتا ئەخلاقی گەڕانەوەیە بۆ پرینسیپە گشتییەکانی ڕێز گرتن لە مافی ژیانی تاك. مافی ژیان بۆ مرۆڤ، مافێکی پارێزراوە و کەس، تەنانەت خۆیشی بۆی نییە سەرپشك بێت بۆ ستاندنەوەی ئەم مافە. هەر بەم پێودانگە هەر چەشنە هاندانێك، چ لە سۆنگەی پیرۆزبوون، یاخود پابەندبوونی نیشتمانی، یاخود ئامانجی سیاسیی یان هەوڵی ڕزگاریخوازانە، کە تاك دنە بدات بە ئاکسیۆنی توندوتیژی و ئەگەری ئەنجامی کوژرانی تێدا بێت، لە خانەی خۆکوژیدا پێناسە دەکرێت و لە باری ئەخلاقییەوە دێتە خانەی حەرام بوون. هەر لەم سۆنگەیەوە کەس یان گرووپ، دەوڵەت یان حزبی سیاسی، سیستەم یان سەرچاوەی بڕیاردەر، بەرپرسی سەرەکین لە کردەوە خۆکوژییەکان.

## پەراوێزەکان

1-فیگۆری ژمارە یەك لەم کتێبە کۆپی کراوە:

SAMFUNNSVITENSKAPELIGE TANKEMÅTER. ET HJELPEHEFTE.LISE GRANLUND OG GLISE ANDERSEN. 2.OPPLAG 2008

2-هەمان سەرچاوە.

3-بۆ زانیاری زیاتر لەسەر لێکۆڵینەوە سەبارەت بە خۆ کوژی ئافرەتان لە کوردستانی عێراق سەردانی ئەم ئادرەسە بکە لە سایتی بی بی سی دا:

http://www.bbc.co.uk/persian/worldnews/story/2008/02/080210_shr-kurdish-women.shtml

## سەرچاوەکان:


-GRIMEN HARALD. (2007). SAMFUNNSVITENSKAPELIGE TANKEMÅTER, 3. OPPLAG

-EMILE DURKHEIM. (2007). SELVMORDET, OVERSATT AV: HALVOR ROLL 4. OPPLAG

ئیبراهیم دادجو
لە فارسییەوە: سامان کۆنەپۆشی

# مێژووگەری لە هزری هیگڵدا

١) سیستمی فەلسەفیی هیگڵ لە لایەکەوە تێروتەسەلترین، دژوارترین و شوێندانەرترین سیستمی فەلسەفیە کە تاکو ئێستا لە مێژووی خۆرئاوادا سەری هەڵداوە. هیگڵ خۆی و کۆمەڵێك کەسی دیکەش کەوتوونەتە شوێن ئەم ئیدیعایە و پێیان وابووە هیگڵ دوایین قسەی لە فەلسەفەدا کردوە.

٢) فەلسەفەی هیگڵ، بەو جۆرەی خۆی دەڵێت، پەلی هاویشتۆتە نێو هەموو لقەکانی زانینی مرۆییەوە و دەبێ لەیەك کاتدا بە لۆژیك، مێتافیزیك، ئەنتۆلۆژیا، دەروونناسی، سۆسیۆلۆژیا، ستاتیکا، مێژوو، بە زانستەکانی دیکەی بزانین. بیرۆکە و ئایدیاکانی هیگڵ لەسەر لۆژیك بە جۆرێك لە جۆرەکان مێتافیزیکەکەی و مێتافیزیکی هیگڵ بە جۆرێك لە جۆرەکان دەروونناسیەکەی و ... هتد. لەم رووەوەیە، هزر و بیرۆکەکانی هیگڵ لەسەر دیاردە مێژووییەکانیش نەك تەنیا بەشێکن لە فەلسەفەکەی، بەڵکو بە مانایەك خودی فەلسەفەکەی ئەون. چونکە ئەو رووداوە لاوەکیانە لە مێژوودا روودەدەن، لە راستیدا گوزارشت لە ساتێك لە گۆڕانی دیالێکتیکی رۆح دەکەن کە لە کات و شوێنێکی دیاریکراودا بەدی دێن.

لێرەوەیە دەتوانین بەرهەمە سەرەکیەکانی هیگڵ بە فەلسەفەی مێژووەکەیشی لەقەڵەم بدەین. ئەمە نەك تەنیا لە پەیوەندی لەگەڵ کتێبی فەلسەفەی مێژوو و فەلسەفەی مافدا، بەڵکو لە پەیوەندی لەگەڵ کتێبەکانی دیاردەناسیی رۆح و لۆژیك و کتێبەکانی دیکەشدا دروست دەردەچێت. چونکە، بە بۆچوونی هیگڵ، دیاردەکانی رۆح و بیرکردنەوە لۆژیکیەکان شتگەلێکی راستەقینە و ئەقلانین کە لە رێگای گۆڕانەوە

بەدی دێن و بەبێ گۆڕان وێنا ناکرێن و دەشزانین لە مێژوودایە کە گۆڕانیان بە سەردا دێت.

٣) کاتێك هیگڵ لۆژیکەکەی خۆی بەتەواوەتی وەك ئەنتۆلۆژیاکەی و ئەنتۆلۆژیاکەی بەتەواوەتی وەك ئەبستمۆلۆژیەکەی بزانێت، بەم پێیە ناسینی رووداوە مێژووییەکانیش بەتەواوەتی وەك ئەنتۆلۆژیەکەی لەقەڵەم دەدات و بەو ئاکامە دەگات کە ناسینی رووداوە مێژووییەکان، شتێك نیە جگە لە ناسینی پێویستیی لۆژیکی وەدیهاتنی ئەم رووداوانە و ئاگامەندبوون سەبارەت بە وەدیهاتنی دەرەکیان.

٤) وتمان کە هیگڵ کتێبێکی بە ناوی فەلسەفەی مێژوو هەیە. ئەم کتێبە زنجیرە وانەکانی هیگڵ لە زانکۆدا لەخۆ دەگرێت (بەشێك لەم کتێبە لە ژێر ناوی ئاوەز لە مێژوودا وەرگێڕراوەتە سەر زمانی فارسی و شارەزایانی ئەم زمانە دەتوانن کەڵکی لێ وەربگرن). لێرەدا، لەبەر سنوورداربوونی بابەتەکەمان، پتر بە گەرانەوە و سەرنجدان لەم کتێبە، فەلسەفەی مێژووی هیگڵ بە کورتی دەخەینە بەر توێژینەوە، کە لە هەموو سیستمە فەلسەفیەکەی جیا ناکرێتەوە و تا رادەیەکیش رووناکی دەخاتە سەر هەڵوێستە سیاسیەکەی.

٥) فەلسەفە، هەروەك هونەر و ئایین مێژوویەکی هەیە و ئەم مێژووەش پرۆسیسێکی دیالێکتیکیە، پرۆسیسێك کە بە هۆی ئەم ئایدیا ناکۆتایەوە دەگاتە شوێنێك کە بە شێوەیەکی ئاشکرا لە خۆی ورد دەبێتەوە. فەلسەفەی مێژووی هیگڵ «تاوتوێکردنێکی قووڵ هزرینانە»ی مێژووە. ئاوەز تاکە ئایدیایەکە کە فەلسەفە بۆ لێوردبوونەوەی قووڵ لە بەردەستیدایە، بەم مانایەی کە ئاوەز بەسەر جیهاندا زاڵە و دەبێ نیشان بدرێت مێژووی جیهان مێژووی خۆبەرفراوانکردنەوەی «رۆح»ە. مێژووی جیهان بریتیە لە ئاگایی راستەقینەی رۆح سەبارەت بە خۆی لە پلەی ئازادیدا. رۆح یاخود ئایدیای (بیرکردنەوەی خود) تەنیا لە زەینی مرۆڤدا و لە رێگای مرۆڤەوەیە کە رێگایەك دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی بچێتە نێو گۆڕەپانی زانینی رەهاوە. بەم چەشنە، مێژووی فەلسەفە بە درێژایی قۆناغەکانی خۆی، هەڵگری قۆناغگەلێکی پێشینە و هەروەها بنەماکان و سیستمە فەلسەفیەکانی پێشووش لەخۆ دەگرێت.

٦) هیگڵ "مێژوو" لە مانایەکدا بەکار دەبات کە لە "فەلسەفەی مێژوو" جیا ناکرێتەوە. بە بۆچوونی ئەو، مێژوو بە مانای تۆمارکردنی رووداوە مێژووییەکان نیە، بەڵکو بە مانای هزرینی مێژووییانەیە. هزرینی مێژووییانە بەم مانایە دێت کە مەبەست لە خوێندنەوەی مێژوو ئەوە نیە کە ئاگاییەك سەبارەت بە روودانی رووداوەکان بەدەست بێنین، بەڵکو مەبەست لەم کارە بریتیە لە ئاگاداربوون لەسەر فاکتەر و ئاراستەی روودانی ئەو رووداوانە. هیگڵ لە مانایەکی گشتگیردا باس لە گەردوون دەکات، کە هەم مانای مادی و هەم مانا رۆحانیەکەی گەردوون دەگرێتەوە، هاوکات لەگەڵ ئەوەی ئەو لەسەر ئەم باوەڕەیە کە سروشتی مادی لە گۆڕانی مێژوودا بەشدارە، بەڵام رۆح و گۆڕانی رۆح بە فاکتەری سەرەکیی گۆڕانی مێژوو دەزانێت. تەنانەت دەبێ سروشتی مادیش لە پەیوەندی لەگەڵ رۆحدا هەڵبسەنگێندرێت، چونکە ئەوە رۆحە کە لە مێژوودا گۆڕانکاریی بەسەردا دێت. لەم روویەوە مێژوو شوێنی گۆڕانی رۆحە و دەتوانین بڵێین لە راستیدا مێژوو خشتەی قۆناغە جۆربەجۆرەکانی وەدیهاتنی ئازادیە، چونکە ئازادی جەوهەری رۆحە. قۆناغە جیاوازەکانی رەوتی مێژوویی مرۆڤ گوزارشت لە جۆرێك پێشکەوتن و گەشەسەندن لە فۆرمی دڕندانەی سەرەتاییەوە، بۆ شارستانیەتی ئەمڕۆیی دەکات. پرۆژە و ئامانجی سەرەکیی ئەم چیرۆکە بریتیە لە وەدیهاتن و بڵاوبوونەوەی ئازادیی مرۆڤ، یاخود گەیشتنی مرۆڤ بە ئازادی. رەوتی مێژوویی شتێك نیە جگە لە وەدیهاتنی هەنگاو بە هەنگاو و قۆناغ بە قۆناغی ئازادیی مرۆڤ. پێویستە و دەبێ وەدیهاتنی قۆناغ بە قۆناغی ئازادی لە رەوتی مێژوودا، هاوکات وەدیهاتنی قۆناغ بە قۆناغی ئاگایی و فام و تێگەیشتنیش بێت. لە راستیدا هیگڵ مێژووی جیهان بە مێژووی رۆح دەزانێت. چونکە رۆح هەوڵ دەدات بەخۆئاگا بێت و خۆی ئازاد بکات و ئەم ئاگایی و ئەم ئازادیە بە شێوەی قۆناغ بە قۆناغ و دیالێکتیکی نەبێت دەستەبەر نابێت. لە لایەکی دیکەوە، ئەم

وەدیهاتنە قۆناغ بە قۆناغەی ئازادی هەر ئەو وەدیهاتنی هەڵسوکەوتی مۆراڵی یان ئاوەزی کۆمەڵایەتیەی جۆری مرۆڤە، کە لە سیستمی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا خۆی دەنوێنێت. وێنا و تێگەیشتنی هیگڵ لە سەر مێژوو بە مانای «تاوتوێکردنی قووڵ هزرینانەی مێژوو»ە و هێند چەمکێکی گشتیی فەلسەفیە کە تەعبیرەکانی «فەلسەفەی مێژوویی» و «مێژووی فەلسەفە» بە یەك مانا ئەژمار دەکات.

٧) ئەگەر هەر بەو جۆرەی کە باسمان کرد، ئامانجی مێژوو وەدیهاتنی ئازادیی مرۆڤ یان ئازادبوونی مرۆڤ بێت، کەواتە چیەتی ئەم ئازادیە چیە؟ بە بۆچوونی هیگڵ ئازادیی مرۆڤ بریتیە لە ئاگایی و تێگەیشتنی ئەو لەسەر پێویستی رەوتی رووداوە مێژووییەکان. وەسفکردنێکی لەم چەشنەی ئازادی پێویستی بە دوو شت هەیە:

A) گەشەی ئازادیی مرۆڤ بە مانای گەشەی ئاگایی ئەو دێت.

B) ئازادی بە مانای تێگەیشتن لە پێویستی ئاوەزە و شتێك نیە لە دەرەوەی سیستمی ئاراستەی ئاوەزیدا بێت.

٨) مێژووی فەلسەفە تەنیا گوزارشت لە رەوتێکی مرۆیی ناکات، بەڵکو گوزارشت لە رەوتێکی جیهانیش دەکات. واتە خوێندنەوەی مێژوو نەك تەنیا سەرهەڵدانی مرۆڤ، بەڵکو سەرهەڵدانی جیهانیش دەگرێتەوە. مێژووی فەلسەفی راپۆرتێکی مێتافیزیکیە سەبارەت بە مێژووی جیهان لە پلەی رۆحی رەهای جیهانیدا. رەها هەر ئەم بوونەیە و بوون تەنیا لە رۆحی مرۆیی و لە رێگای ئەوەوەیە کە لە پلەی رۆحدا دێتە بوونەوە. رۆحی رەها تەنیا لە رۆحی مرۆییدا و لە رێگای ئەوەوەیە کە هەیە، بەم جیاوازیەوە کە ئەم کارە لە مەیدانێکدا ئەنجام دەدات و لەو مەیدانەدا رۆحی تاکی مرۆیی رۆحێکی تاکەکەسی و سنووردار نیە، بەڵکو دەمێکە لە ژیانی رۆحی رەها. لەم قۆناغەدا، رۆحی مرۆیی رۆحی رەهایە لە گۆڕەپانی زانینی رەهادا. بەم چەشنە زانیاریی مرۆڤ لەسەر رۆحی رەها و زانیاریی رۆحی رەها لە سەر خۆی دەبنە دوو لایەنی یەك راستی.

٩) بە باوەڕی هیگڵ «هێزی سەرەکیی زاڵ بەسەر مێژوودا، ئاوەزە.» مەبەستی هیگڵ ئەوەیە هەموو ئەو رووداوانەی لە مێژوودا روودەدەن، هۆکردی ئیرادەی مرۆڤن. چونکە رەوتی مێژوو شتێك نیە جگە لە کردارەکانی مرۆڤ. یان باشتر وایە بڵێین، جگە لە فکر و بیرۆکەکانی مرۆڤ، کە لە کردارەکانی ئەودا دەردەکەون و خۆ دەنوێنن، شتێکی دیکە نیە. دیارە لێرەدا مەبەستی هیگڵ ئاوەزی گشتیە، نەك ئاوەزی مرۆڤی رەشۆکی و تاکەکەسی. هیگڵ لەو بڕوایەدایە ئەو شتەی لە مێژوودا روویداوە، ئاوەزمەندانەیە و ئەو شتەی ئاوەزمەندانەیە روودەدات. لە روانگەی هیگڵدا، ئەگەر کەسێك بە پشتبەستن بە تێگەیشتنێکی رووکەشبینانە و رەشۆکیانە لافی ئەوە لێبدات کە لە رەوتی مێژوودا گەلێك رووداوی نائاوەزمەندانە بە دەستی مرۆڤ روویان داوە و پرسیار لەسەر ئاوەزمەندانەبوونی ئەم رووداوانە بکات، ئەوا هیگڵ وەڵام دەداتەوە کە رووداوە مێژووییەکان لە بۆشاییدا روونادەن، هەموو رووداوێکی مێژوویی تەنیا لە ناو مێژوودا و هاوکات لەگەڵ هەلومەرجێکی مێژوویی تایبەتدا روو دەدەن. بە بۆچوونی هیگڵ ئەم رەخنەگرتنانە و نکۆڵیکردن لە ئاوەزمەندانەبوونی مێژوو و رووداوە مێژووییەکان، لە نەبوونی ئاگایی و فامنەکردنی هەلومەرجی مێژووییەوە سەرچاوە دەگرێت. هەموو کاراکتەرێکی مێژوویی لە هەلومەرج یاخود سەردەمێکی مێژووییدا و بەپێی ئەو هەلومەرجە، بەو جۆرەی کە دەتوانێت دەهزرێت و هەڵسوکەت دەکات، بەبێ کەم و زیاد. هیچ کەسێك ناتوانێت زۆرتر یان کەمتر یان باشتر یان خراپتر لەو شتەی کە هەلومەرجی مێژوویی خستوویەتیە ئەستۆی، بهزرێت و هەڵسوکەوت بکات.

هیگڵ وەك یەکێك لە ئاکامەکانی ئەم بۆچوونەی خۆی و هەروەها بۆ پاساودانەوە و سەلماندنی باوەڕی خۆی لەم بوارەدا، رەخنەگەلێك ئاراستەی روناکبیری سەردەمی رۆشنگەری دەکات کە ئەو وێنەیەی بۆ

مرۆڤ خستوویانەتە روو، وێنەیەکی ئەبستراکت و دوور لە راستیە. مرۆڤ، بەو جۆرەی ئەوان بیریان لێ کردۆتەوە، بوونەوەرێکی ئاوەزمەندی پەتی نیە. مرۆڤ پێکهاتەیەکە لە سۆز و ئاوەز. ئەم دوو دیاردەیەش بە جۆرێك لە مرۆڤدا ئاوێتەی یەکتر بوون کە سۆزەکانی مرۆڤ سۆزی بوونەوەرێکی ئاوەزمەند و ئاوەزی مرۆڤ ئاوەزی بوونەوەرێکی سۆزدارە. هەڵەیە ئەگەر ئەم دوو دیاردەیە لە بوونی مرۆڤدا لێك جیا بکەینەوە. ئەم جیاکردنەوەیە هەقیقەتی زاتی مرۆڤ لە خۆیدا دەتوێنێتەوە. بەبێ سۆز و کارتێکەری نە ئاوەزێك هەیە و نە کردارێك. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ناتوانین ئەو کردارانەی لە سۆز و کارتێکەریەوە سەرچاوە دەگرن، وەك کردارگەلێکی نائاوەزمەندانە لەقەڵەم بدەین. مێژوو گۆڕەپانی بەڕێوەچوونی سۆزەکان و کارتێکەریەکانە کە بە هیچ جۆرێك دیاری ناکرێت کە لە بیاڤی (حوزە) ڕێنوێنی ئاوەز دەرچووبن. لە روانگەی هیگڵدا سۆز و کارتێکەری کەرەستە سەرەتاییەکانی تەلاری مێژوون. مێژوو بە مانایەك بریتیە لە روخسار و دەرکەوتەکانی کارتێکەریەکان کە دیارە هەر بەو رادەیەش دەرکەوتنی ئاوەزە، چونکە ئاوەز دەبێ وەك ئامرازێك کەڵك لە سۆز وەربگرێت هەتا بتوانێت ئامانجەکانی خۆی بەدی بێنێت.

١٠) لێرەدا دەتوانین ئەم پرسیارە بێنینە ئارا: مەبەستی هیگڵ لەم ئاوەزە چیە کە سۆزەکان و کارتێکەریەکان دەخاتە خزمەت خۆی؟ بە دەربڕینێکی دیکە، ئەم ئاوەزە کێیە و لە کوێوەیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە ئەوە مرۆڤە، ئەوە مرۆڤ خۆیەتی، ئەوە روخسار و دەرکەوتەی رۆحە کە هەنووکە هاوکات لەگەڵ رەوت و جوڵەی خۆیدا، گەیشتۆتە قۆناغی رۆح و زەینی مرۆیی و لە فۆرمی کردارەکانی ئەودا دەرکەوتووە و مێژووی بنیات ناوە. ئەم ئاوەزە، نە بەو چەشنەی دەروونناسەکان بیری لێدەکەنەوە، یەکێك لە هێزەکانی ناسین و دیاریکردنی زەینی مرۆییە، نە بەو جۆرەش کە «هەندێك وا» بیری لێ دەکەنەوە مێتافیزیکێکی یەزدانیە، بەو مانایەی کە لە سەروو جیهانی مرۆییەوە بێت. ئەم دیاردەیە ئەگەر یەزدانیش بێت هەنووکە بە جوڵەی خۆی گەیشتۆتە قۆناغی مرۆیی و دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین، ئەوە خودی مرۆڤە. ئەوە هەقیقەتی مرۆڤە کە هیگڵ وێنەیەکی بزاوت و گۆڕانهەڵگر و ناسەقامگرتووی لێ خستۆتە روو. ئاوەزی مرۆڤ بە درێژایی مێژوو لەبەردەم گۆڕانکاری و کامڵبوندایە. ئاوەز دیاردەیەکی بێ جوڵە و سەقامگرتوو نییەو هەنگاو بە هەنگاو و هاوکات لەگەڵ وەدەستهێنانی خۆئاگاییدا، بە ئۆبژێکتیڤ بوون و لەکاردابوونی خۆی بە درێژایی مێژوو وەدەست دێنێتەوە.

١١) جیهانی دەرەوە ئایدیایەکە لە گەردونداا ئازاد کراوە. ئەم ئایدیایە لە رێگای تێکەڵاویی دژایەتیەکانەوە دەگاتە پلەگەلێکی بەرزتر. جەوهەری رۆحی رەهای جیهانی، کە لەم جیهانەدا ئازاد کراوە و لە فۆرمی مرۆڤ و بوونەوەرە سروشتیەکاندا سەری هەڵداوە، ئازادیخوازیە. ئازادی جەوهەری رۆحە، بەڵام لەو کاتەوە کە رۆحی رەهای جیهانی خۆی لەم جیهانەدا بەرەڵا کرد، خۆی کرد بە ئایدیایەکی سەرلێشێواو و لە شێوەیەکی رەهەندیانە و ئەندازەییانەدا هاتە بوونەوە و بوو بە بوونەوەرێکی دیار و دیاریکراو و لە ئاکامدا لە ئازادی رەها بێبەش بوو، ئیتر حەز و خواستی گەیشتنەوەی دووبارە بە ئازادی هەموو بوونی دادەگرێت. رۆح ئازادە و ئامانجی رۆحی جیهانی لە مێژووی جیهانیدا بریتیە لە وەدیهێنانی خودی خۆی و گەیشتن بە نیعمەتی ئازادی. هەوڵی ئەو ئەمەیە خۆی بناسێت و دووبارە بناسێتەوە. ئایدیای رەهای جیهانی لە سەرەتاوە گرێ درابوو بە رۆحی بنەمایی و بەرز و ئازادەوە، بەڵام لە پاشان لێی جیابۆتەوە و ئێستاش سکاڵا لە جیایی هەموو بەسەرهات و چارەنووسی ئەم بوونەوەرە پێك دێنێت و، دەخوازێت بگاتەوە بە بناژۆکەی خۆی. مێژووی جیهانی تەنیا روخسارێکی ئەم ئاوەزە یەکانە و رەسەنەیە و، فۆرمێکە لەو وێنە لاوەکیانە کە ئاوەز بە هۆی ئەوەوە خۆی ئاشکرا دەکات. رۆحی رەها لە مێژووی جیهانیدا خودی راستەقینەی خۆی وەدەست دێنێتەوە و بەخۆئاگا دەبێت. بەڵام دەرکەوتنی دەرەکیی رۆح جگە لە دووری و سنووردارێتی شتێکی دیکە

نیە. لەلایەك لە خۆی دوور دەكەوێتەوە و لەلایەكی دیكەش دەخوازێت سەرلەنوێ بگەڕێتەوە بۆ خۆی. كەواتە لەودا كێش و هەوڵێك دروست دەبێت. كێشێك كە لە بیری نەهێشتنی سنووردارێتیدایە و هەوڵێك كە بیر لەوە دەكاتەوە لەگەڵ ژێدەری سەرەتاییدا گرێ بخوات.

بە بۆچوونی هیگڵ، بەبێ ئەوەی كە قەبووڵ بكەین ڕۆحێك بەسەر جیهاندا زاڵە، فەلسەفەی مێژوو لە ئارادا نیە و ئایدیای «ئاوەز» تەنیا ئایدیایەكە كە فەلسەفە بۆ تاوتوێكردنی مێژوو دەیهێنێتە كایەوە، واتە ئەو ئایدیایەی كە ئاوەز بەسەر جیهاندا زاڵە و بەم پێیەش مێژووی جیهان ڕەوتێكی ئاوەزمەندانەیە. بە باوەڕی هیگڵ، فەلسەفە ناچارە بوونی ئاوەزێكی لەم چەشنە بسەلمێنێت، بەڵام لەو كاتەدا كە دەخوازین مێژووی جیهان ئاشكرا بكەین، پێویستە و دەبێ بوونی ئاوەزێكی لەم چەشنە گریمانە بكەین و قەبووڵ بكەین كە ڕۆحێكی لەم چەشنە بە سەر جیهاندا زاڵە.

١٢) چونكە ئاوەزێكی لەم چەشنە خاوەن زاڵیەتیە بەسەر جیهاندا و مێژوو شتێك نیە جگە لە مێژووی فكر و دەستنیشانكردنی زاتی و خۆبەخۆیی ئاوەز، كەواتە ئامانجی توێژینەوەی فەلسەفی دەبێ بریتی بێت لە بایكۆتكردنی كاروبارە بەهەڵكەوت و لواوەكان. لێرەوەیە ڕەوتی مێژوو ڕەوتێكی لۆژیكی و پێویست و ڕەهایە و، فەلسەفەی هیگڵ بوونی بوونەوەرێكی ناپێویست لە جیهاندا قەبووڵ ناكات. بەڵكو هەموو بوونەوەرەكان بە هۆی پێویستیەكی لۆژیكیەوە هاتوونەتە بوونەوە. بەم پێیە ناتوانین ئەوە قەبووڵ بكەین كە ڕووداوێك لە جیهاندا ڕووی داوەو سەبارەت بە سەرەتاكانی خۆی خاوەن پێویستیی لۆژیكی نەبووە. كەواتە ئامانجی توێژینەوەی فەلسەفی ئەوەیە كاروبارە بەهەڵكەوت و لواوەكان بایكۆت بكات و نكۆڵیان لێ بكات. دیارە مەبەستی هیگڵ ئەوە نیە بۆ ناسینی مێژوو پێویستیمان بە ناسینی كاروبارە پاژەكیەكان نیە و دەتوانین بەهۆی میتۆدگەلێكی ئاوەزمەندانەی پەتی و پێشینیەوە و بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەزموون مێژوو بناسین، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە واقعیەتی دەرەكی دەركەوتە و ڕوخسارێكە لە ئاوەز، كەواتە ئەو شتەی لە جیهاندا ڕوودەدات، پێویستە شت یاخود دیاردەیەكی ئاوەزمەندانە بێت. لە ڕاستیدا قسەی هیگڵ ئەوەیە، مەعریفەی ئاوەزمەندانە و ئەزموونی جۆرێكە لە مەعریفە و لەم ڕوانگەیەوەیە كە مەعریفەی مێژوویی بە خاوەن پێویستیی ئاوەزی دەزانێت. ڕووداوە مێژووییەكان وەك ئەوەی كە بەتەنیا ڕووداوێكی پەتی بن و بەبێ لەبەرچاوگرتنی پەیوەندیەكەیان لەگەڵ ئاوەزدا، خاوەن هیچ پێویستیەك نین. پێویستی ئەوان لە ئاوەز و ئایدیاگەلێكەوە سەرچاوە دەگرێت كە زاڵن بەسەریاندا.

١٣) ئێمە لە مێژوودا دەبێ بە شوێن ئامانجێكی گشتی و مەبەستێكی كۆتاییدا بگەڕێین، نەك بە شوێن ئامانجێكی پاژەكی لە ڕۆح یان زەیندا (جۆرێك ئاراستەی ئاوەزی). دەبێ بە یارمەتی ئاوەز لەم ئامانجە گشتیە تێبگەین، چونكە تەنیا ئاوەز دەتوانێت سەروكاری لەگەڵ ئامانجی ڕەهادا هەبێت. ڕەها و ڕۆح لە ڕێگای فۆرمگەلێكی بێ ئەژمارەوە، كە بە نەتەوەكان و گەلەكان ناویان دەبەین، خۆیان دەردەخەن. گریمانەكەی هیگڵیش بریتیە لەوەی ڕووداوە مێژووییەكان شوێنكەوتووی ئاوەزن، ئەویش نەك ئاوەزی پاژەكی، بەڵكوو ئاوەزی یەزدانی و ڕەها. بە دەربڕینێكی دیكە، مێژوو بریتیە لە نمایشی ئاوەز. واتە ئەوە نیە كە ئاوەز لە سوچێكدا دانیشێت و كردەوەگەلێك لە خۆی بنوێنێت، بەڵكو ئاوەز خۆی هاتۆتە مەیدانەوە و هەموو ڕووداوەكان بەرهەمی دەركەوتنی ئەون. لە بنەمادا ڕووداوەكان بەتەواوەتی دەركەوتنی ئاوەزن. مێژووی جیهانی بەرهەمی ڕەوتی ئاوەزمەندانە و پێویستیی ڕۆحە. لە ڕەوتی مێژوودا، ڕۆح لە فۆرمگەلێكی ئێجگار زۆردا خۆی دەنوێنێت و ئەم ڕۆحە جیهانیە لەگەڵ ڕۆحی یەزدانیدا كە هەمان ڕۆحی ڕەهایە گونجاوە.

١٤) كەوابوو فەلسەفەی هیگڵ لێرەوە دەست پێ دەكات كە ڕۆحێكی سەرلێشێواو دێتە نێو جیهانەوە. جەوهەری ئەم ڕۆحە ئازادیخوازیە، بەڵام كاتێك ئەم ڕۆحە دێتە نێو جیهانەوە لە خۆی نامۆ دەبێت و لێرە

به دواوه بەردەوام هەوڵ دەدات بە سەر ئەم لەخۆنامۆییەدا زاڵ بێت. ئامانجی مێژووش بریتیە لە زاڵبوونی ڕۆح بە سەر لەخۆنامۆییدا و گەیشتن بە خۆئاگایی. ڕۆح لە ڕێگای خودی مرۆیی و مێژووەوەیە دەگاتە خۆئاگایی.

ئەگەر مرۆڤ و مێژوو گەیشتن بە خۆئاگایی و دۆخی سیاسیی حکوومەت وەك ئەو شتەی لێ هات كە ئاوەز دەخوازێت، ئەوكات ڕۆح لە ڕاستیدا بە خۆئاگایی گەیشتووە، یان بە دەربڕینێكی دیكە جیهان بووە بە شوێنێك كە شایستەی ڕۆحە.

هەروەها دەتوانین بڵێین ڕۆح واتای ڕاستەقینەی خۆی لە نێو خۆیدا پەروەردە دەكات و بەئۆبژێكتیڤ دەبێت، بەم چەشنە پشتڕاستكەرەوی واتای خۆیەتی. واتە ڕۆح خۆی ئایدیایەكی جیهانیە و بوونەوەرە دەرەكیەكان دەكاتە دەرەوە. واتە بوونەوەرە دەرەكیەكان بە تەواوەتی وەك پشتڕاستكەرەوەگەلێكن كە بە شێوەی دیالێكتیكی لەو واتا گشتیەوە لەدایك بوون.

١٥) هیگڵ شوناسێكی سەربەخۆ و دەرەكی بۆ مێژوو لە بەرچاو ناگرێت. مێژوو بە شوێن ئامانجەكانی خۆیدا دەڕوات و مرۆڤ و قارەمانەكانی ئامرازەكانی دەستی ئەو ڕۆحەن كە بە سەر جیهاندا زاڵە. كەواتە باشتر وایە لەگەڵ مێژوودا هاوهەنگاو و هاوئاهەنگ بن، ئەگینا لەژێر سووری مێژوودا دەتلیقێنەوە و دەكەونە نێو زبڵدانی مێژووەوە. هیگڵ باس لە سەربزێوی ئاوەز دەكات:»سوودە پاژەكیەكان پێكەوە بە شەڕ دێن و هەندێكیان لە ڕەوتی شەڕدا لە نێو دەچن، بەڵام هەر لە نێو ئەم شەڕ و لەنێوچوونانە دایە كە جەوهەری گشتی، بە دوور لە هەر چەشنە مەترسی و زیانێك سەرهەڵدەدات، چونكە نموونە گشتیەكە خۆی ناچێتە نێو گۆڕەپانی شەڕ و پێكدادانەكان و خۆی ناخاتە مەترسیەوە، بەڵكوو لە تەنیشت ئەوان و بە دوور لە هەر چەشنە كێشە و گرفت و زیانێك دەمێنێتەوە و سوودە پاژەكیەكانی سۆزەكان لە بری خۆی ڕەوانەی مەیدانی شەڕ دەكات تا لە نێو بچن. دەتوانین ئەمە بە «فرتوفێڵی ئاوەز» ناو ببەین. چونكە ئاوەز بە هۆی ئەوەوە سۆزەكان لە بری خۆی بە كار دێنێت و بەم چەشنە، هەر ئەو فاكتەرانەی ئاوەز بە هۆی ئەوانەوە بوون دەبەخشێتە خۆی، باجەكەشی دەدەن. واتە مرۆڤەكان بە گشتی لە كۆتی سۆزەكانی خۆیان دان و كاتێك كە ئەڤیندار یاخود هۆگری شتێك دەبن بە لایدا ڕادەكێشرێن، بەڵام لە ڕاستیدا ئاگادار نین لەوەی خەریكن بەرنامەی كەسێكی دیكە بەڕێوە دەبەن. لە هەمبەر ئەم توخمە گشتی و جەوهەریەدا (واتە ئاوەز) كە بوونی لە خۆی دایە و بۆ خۆیەتی، هەموو شتەكانی دیكە فەرمانبەر و بندەست و نۆكەر و كەرەستەی كارن. مرۆڤەكان پێیان وایە هێز و تواناكانی خۆیان جێبەجێ دەكەن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە ئاوەزە فەرمانیان پێ دەدات و بە هەر ئاراستەیەكدا كە بخوازێت ڕایان دەكێشێت. ئاوەز بە سەر جیهاندا زاڵە و لەم ڕوویەشەوە بەسەر مێژووی جیهانیشدا زاڵە.

تاكەكان مێژووی جیهانێكن كە ئامانجە سەرەكیەكانی مێژوو دەستەبەر دەكەن. ئەوان بەبێ ئەوەی بزانن مێژوو بە كاریان دێنێت، بە شوێن ئامانجەكانی خۆیاندا دەڕۆن. هیگڵ پیاوە مەزنەكانی مێژوو بە كەسانێك دەزانێت كە جەوهەری ئامانجە تاكەكەسیەكانیان هەمان جەوهەری ویستی ڕۆحی جیهانە. ئەم كەسانە پێویست نیە خاوەن سەرئەنجامێكی باش بن، كاتێكیش مێژوو پێویستی پێیان نەمێنێت فڕێیان دەدات. بەم چەشنە بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە قارەمانەكان چلۆن دەسكەلا و گاڵتەجاڕی مێژوون. قارەمانەكان پێیان وایە شوێن لە سەر مێژوو دادەنێن و كەسانێكی كاریگەرن. خەڵكانی كۆیلە پێیان وایە ئەوانن مێژوو دروست دەكەن، بەڵام لە ڕاستیدا مێژوو بە ڕێچكەی خۆیدا دەڕوات و مرۆڤەكان دەسكەلا و گاڵتەجاڕی مێژوون. پیاوە مەزنەكانی مێژوو ئەو كەسانەن توانیویانە بە باشی خۆیان لەگەڵ ئامانجی شاراوەی ئاوەزی جیهانیدا ڕێك بخەن. ئەوە پیاوە مەزنەكانی مێژوون كە لەم گشتێتیە بەرزترەی مێژوو تێدەگەن و دەیكەن

بە ئامانجی خۆیان. هەر ئەوانیشن ئەم ئامانجە بەدی دێنن کە لەگەڵ واتای بەرزتری ڕۆحدا دەگونجێت. لەم ڕوویەوە دەبێ بە قارەمان ناویان ببەین و نابێ بە هۆی پێودانگە ئاساییەکان داوەریان لە سەر بکەین. ئەوان لەو سیستەمە هێمن و ڕازاوەدا کە هەیە و هەروەها لە ڕەوتی ئەو کاروبارانەدا کە پیرۆزیان بەدەست هێناوە، بە شوێن ئامانج و پیشەی خۆیاندا ناگەڕێن. ئەو شتەی پاساوی کارەکانی ئەوان دەداتەوە ئەو دۆخە نیە کە هەیە، بەڵکو ئەو ڕۆحە شاراوەیە کە خواستی خۆئاشکراکردنی هەیە، بەڵام هێشتا لەم سەردەمەدا نەهاتۆتە بوونەوە. ڕۆحێکی نادیار کە دەخوازێت خۆی لە تەنگژەی ئەو جیهانەی هەیە ڕزگار بکات، چونکە ئەم جیهانە وەك پێستەیەکە هەڵگری ناوکەکەی خۆی نیە. تەنیا لە ڕووگەی سەردەمەوە دەتوانین کەسایەتیی پیاوە مەزنەکان بناسین. ئەو تایبەتمەندیەی لەواندا پتر شایانی پێداهەڵگوتنە ئەمەیە کە خۆیان کردۆتە ئامرازی ڕۆحی جەوهەری. هەر ئەمەش گرێخواردنی ڕاستەقینەی تاکە لەگەڵ جەوهەری گشتی خۆیدا، چونکە ئەم جەوهەرە ژێدەری هەموو شتێکە، ئامانجێکی تاکانە و هێزێکی یەکانەیە کە شیاوی پیاوگەلێکی لەم چەشنەیە و لەواندا بە شوێن وەدیهاتنی تاکدا دەگەڕێت و لە سەر دەستی ئەوان دێتە بوونەوە. ئەمە فرتوفێڵی ئاوەزە کە هۆگریەکانی قارەمان دەخاتە خزمەت ئامانجەکانی ئاوەز و بە کاریان دێنێت. ئەگەرچی ئەو ئامرازانەی ئاوەز کەڵکیان لێوەردەگرێت و بە کاریان دەبات هۆگریە تاکەکەسیەکانی مرۆڤگەلێکن کە لە نێو دەچن، بەڵام ئاوەز بە سەر جیهاندا حکومەت دەکات و مێژووی جیهان گۆڕەپانی دەسەڵاتداریەتیی ئەوە.

١٦) وتمان مێژووی جیهان مێژووی وشیاریی ڕاستەقینەی ڕۆحە لەسەر خۆی لە پلەی ئازادیدا کە تەنیا لە زەینی مرۆڤ و لەو ڕێگەیەوە دەگات بە ئاگایی، بەڵام لە سۆنگەی ئەو تێبینیەوە کە ڕۆحی مرۆیی قۆناغێك و بەشێکە لە ڕۆحی نەتەوەیی، کەواتە ئەمە ڕۆحی نەتەوەییە کە هەڵگری ڕۆحی جیهانیە و تا ئەو شوێنەی تاك لەم دۆخە جیهانیەدا بەشداری دەکات هەڵگری ڕۆحی جیهانیە. ڕۆحە نەتەوەییەکان سنووردارن و لە دیالێکتیکی ئەوان دایە کە ڕۆحی گشتی سەر هەڵدەدات. ئەم ڕۆحە گشتیە لە گۆڕەپانی مێژووی جیهاندا حوکمی خۆی لە سەر ڕۆحە سنووردارە نەتەوەییەکان ڕادەگەیەنێت. کەواتە ڕۆح لە ڕەوتی پێشکەوتن بەرەو خۆئاگایی تەواودا فۆرمی هێماگەلێکی سنووردار و یەکلایەنە بە خۆیەوە دەگرێت، واتە فۆرمی ڕۆحە نەتەوەییە چەندفاقەکان، هەر بۆیە لە هەر قۆناغێکی تایبەتدا نەتەوەیەك دەبێتە نوێنەری پەروەردەکردنی ڕۆحی جیهانی.

لە ڕوانگەی هیگڵدا مێژووی گەردوون لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا دەڕوات، چونکە ئاسیا دەسپێکی ئەو مێژووەیە و ئەوروپا کۆتاییەکەیەتی. ڕۆژ لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێت و لە خۆرئاواوە ئاوا دەبێت و لەگەڵ ئەم ئاوابوونە دەرەکیەدا، هەڵهاتنی ناوەکی دەست پێ دەکات کە هەمان تێگەیشتنە لە ئازادی.

بە بۆچوونی هیگڵ ڕۆحی ڕەهای جیهانی لە فۆرمی ورەی گەلەکان و نەتەوەکاندا خۆی دەنوێنێت. واتە ئەگەر دەخوازین بزانین ڕۆحی جیهان کە بە شوێن ئازادیدا دەگەڕێت، بە چ قۆناغگەلێکدا تێپەڕ بووە و ئێستا لە چ قۆناغێك لە قۆناغەکانی ئازادیدایە، ئەوا دەبێ سەرنج لە نەتەوەکان و گەلانی ڕابردوو بدەین. مێژووی جیهان نیشاندانی قۆناغەکانی گۆڕانی یەزدانیە کە ڕۆح لەودا خۆی دەناسێت و وەدی دێت. قۆناغە جۆربەجۆرەکانی قۆناغەکانی خۆناسینی ڕۆحە و ڕۆح شایەنیەتی کە خۆی بناسێت و خۆی بەئۆبژێکتیڤ بکات.

ئەمە هەر ئەو کارەیە کە ڕۆح لە مێژووی جیهانیدا دەیکات. واتە فۆرمگەلێکی دیاریکراو بە خۆیەوە دەگرێت و ئەم فۆرمانەش هەمان گەلەکانی مێژووی جیهانین. هەر کام لەم گەلانە خشتەی قۆناغێکی تایبەت لە ڕەخسکانی ڕۆح و خولێکی دیاریکراو لە مێژووی جیهانین. بە دەربڕینێکی باشتر، ئەو بنەمایانەی ڕۆح

تێگەیشتووە کە دەبێ لە جیهاندا وەدی بێن، لەم گەلانەدا خۆیان دەنوێنن و دەردەکەون. بەم چەشنە پەیوەندیەکی خودێتی لە نێوانیاندا هەیە کە تەنیا گوزارشت لە چیەتیی رۆح دەکات.

هیگڵ بەم جۆرە روخساری رەوتی رۆحی جیهانی لە پۆششی نەتەوەکاندا وێنا دەکات. دەتوانین لەم پێناسە ئەبستراکتەوە بڵێین مێژووی جیهانی راپۆرتی هەوڵەکانی رۆحە بۆ زانینی ئەمەی کە لە زاتی خۆیدا چیە. خۆرهەڵاتیەکان نازانن رۆحی مرۆڤ بە تەواوەتی ئازادە و بەم پێیەش خۆشیان ئازاد نین، چونکە ئاگادار نین مرۆڤ بەتەواوەتی ئازادە. تەنیا دەزانن کە تاکە کەسێك (فەرمانڕەوا) ئازادە. یونانیەکان یەکەمین گەلێك بوون ئاگاییان لە سەر ئازادی وەدەست هێنا، هەر بۆیە ئازاد بوون. بەڵام یونانیەکان هەر وەك رۆمیەکان تەنیا دەیانزانی کۆمەڵێك لە مرۆڤەکان ئازادن، بەڵام نەیاندەزانی مرۆڤ بە تەواوەتی ئازادە. یەکەمینجار گەلانی جێرمەنی، بە سەرهەڵدانی مەسیحیەت، بەم ئاگاییە گەیشتن کە مرۆڤ وەك مرۆڤ ئازادە.

هیگڵ لە بەرایی فەلسەفەی مێژوودا، لە پەیوەندی لەگەڵ ئاراستە و ئامانجی سەرانسەری مێژووی مرۆڤدا دەڵێت:(مێژووی جیهان جگە لە پێشکەوتنی ئاگایی لە سەر ئازادی، شتێکی دیکە نیە.» ئەم رستەیە نێوئاخنی گشت ئەم کتێبە پێك دێنێت).

بەڵام بزانین هیگڵ چۆن ئەم کتێبە فراوان دەکات. بە بۆچوونی ئەو سفەتەکان و خەسڵەتەکانی سێ قۆناغی پێشکەوتنی مرۆیی بەم چەشنەیە: یەکەمین قۆناغی رۆح، قۆناغەکانی پێگەیشتنی ئاوەزی مرۆیی، وەك منداڵی رۆحە و لەم قۆناغەدا رۆح لەگەڵ سروشتدا یەکانەیە، بەو چەشنەی کە لە جیهانی خۆرهەڵاتیدا دەبینرێت. ئەم رۆحە سروشتیە رۆحێکە هێشتا لە سروشتدا دەژی و لە سەر پێی خۆی رانەوەستاوە، لەم روویەوە هێشتا ئازاد نیە و پرۆسیسی ئازادی تێپەڕ نەکردوە. لەم جیهانەدا، رۆح جەوهەرێکە مرۆڤ بەوەوە بوونی هەیە. هەلومەرجی هەموان لە هەمبەر ویستی فەرمانڕەواییەکانەدا، لە دۆخی منداڵان و بندەستەکان دەچێت. بە باوەڕی هیگڵ خۆرهەڵاتیەکان نەیاندەزانی مرۆڤ بە چێژەکانەوە ئازادە، هەر بۆیە ئازاد نەبوون. ئەوان تەنیا تاکە کەسێکیان پێ ئازاد بوو، ئەویش خواکەیان بوو. قۆناغی دووەمی رۆح، قۆناغی لاوێتیە کە لەودا رۆح لە خۆی رادەمێنێت و لە دۆخی فەرمانبەری و بەستراوەیی رەها دەرباز دەبێت. ئەم قۆناغە لە دوو بەش پێك هاتووە: بەشی یەکەمی ئەم قۆناغە سەردەمی پێگەیشتوویی رۆحە. لەم کاتەدا رۆح بۆ خۆی خاوەن جۆرێك ئازادیە، بەڵام ئەم ئازادیە هێشتا لەگەڵ جەوهەری رۆحدا ئاوێتەیە. ئازادی هێشتا لە قوڵایی رۆحەوە سەرلەنوێ لەدایك نەبووە. ئەم سەردەمە سەردەمی جیهانی یونانیە. بەشی دووەمی ئەم قۆناغە کاتی پیاوەتی رۆحە کە لەودا تاك ئامانجگەلێکی جیاواز بۆ خۆی دەدۆزێتەوە، بەڵام ناتوانێت دەستەبەریان بکات مەگەر ئەوەی لە رێگای خزمەتکردن بە جەوهەری گشتی، واتە هەمان وڵات یاخود دەوڵەتەوە. ئەم سەردەمە سەردەمی جیهانی رۆمیە. لە جیهانی یونانی- رۆمی دایە ئاگایی لەسەر ئازادی لەنگەر دەگرێت، بەڵام یونانیەکان و رۆمیەکانیش تەنیا بەشێك لە مرۆڤەکانیان بە ئازاد دەزانی، واتە ئەو کەسانەی کە کۆیلە نەبوون.

قۆناغی سێیەمی رۆح قۆناغی پوختبوونی رۆحە، رۆژگاری جێرمەنی یاخود جیهانی مەسیحی. لە رۆژگاری مەسیحیدا رۆحی یەزدانی دادەبەزێتە سەر جیهانی خاکی و لە ئاوەزی مرۆڤدا جێگیر دەبێت، کە ئێستا بە یەکجاری رزگار بووە و بووەتە خاوەن ئازادیی جەوهەری. بە باوەڕی هیگڵ ئەوە خەڵکی جێرمەنی بوون بۆ یەکەمجار، لە ژێر کاریگەریی دەستڕۆیشتوویی مەسیحیدا تێگەیشتن مرۆڤ بە چێژەکانەوە ئازادە.

١٧) هیگڵ مێژووی نەتەوەکانی هەر لە رۆژگاری کەونارەوە تاکو سەردەمی خۆی، خوێندۆتەوە و ئەرك و پەیام و هەلومەرجی مێژوویی هەر کام لە نەتەوەکان، هەر لە نەتەوە خۆرهەڵاتیەکانی چین و هیند و ئێرانەوە بگرە هەتا نەتەوە ئەوروپیەکان لە یونانەوە تاکو رۆم و سەدەکانی ناوەڕاست، شی دەکاتەوە و

باسی تایبەتمەندیی نەتەوەیی یان رۆحی ئەتنی هەموویان دەکات. ئەو لە هەر سەردەمێکدا پێ لە سەر ئەرك و پەیامی نەتەوەیەکی تایبەت دادەگرێت و لە دنیای نوێدا ئەم ئەرك و پەیامە دەخاتە ئەستۆی جێرمەنەکان. هیگڵ سەرانسەری خولێکی مێژوویی کە لە رووخانی ئیمپراتۆریی رۆمەوە تاکو رۆژگاری هاوچەرخ دەگرێتەوە، بە «جیهانی جێرمەنی» ناودێر دەکات. هیگڵ بە بەکارهێنانی ئەم رستەیە دەخوازێت بڵێت لە دوای روخانی رۆم، ناوەندی چالاکیە مێژوییەکان گواستراوەتەوە بۆ ئەورووپای باکور. مەبەستی هیگڵ لە «جیهانی جێرمەنی» هەرێمی ئەورووپای باکورە کە وڵاتانی ئەسکەندەناڤی و هوڵەندا و ئەڵمان و بریتانیا و تەنانەت خەڵکی گێڵ، سێڵتەکان و مەجارەکان و گوتەکانی ئیسپانیاش دەگرێتەوە. خاڵی هەرە گرنگی هیگڵ بۆ جیاکردنەوەی «جیهانی جێرمەنی» لە رۆژگاری رۆمیەکان، «بزاڤی چاکسازیی دینی»ە. بە بۆچوونی هیگڵ، بزاڤی چاکسازیی دینی دەسکەوتی گەلی جێرمەنە، ئەم دەسکەوتەش بە بەرهەمی راستبێژی و دڵپاکی و دروستی گەلی جێرمەن دەزانێت و ئاکامەکەشی بە دارمانی گەورەیی و شکۆی کڵێسەی کاسۆلیکی رۆح دەزانێت. دیارە هیگڵ بزاڤی چاکسازیی دینی بە بەشێکی سەروتر لە بەکەماڵ گەیاندنی ژیانی دینی لە قەڵەم دەدات و جەخت لە سەر شکۆفاکردنی زاتی رۆحانی و مەعنەوی مرۆڤ دەکاتەوە. بزاڤی چاکسازیی دینی ویژدانی تاکەکەسی بە ژێدەری داوەریکردن لە سەر راستی و دروستی دەزانێت و باوەری بەم بنەمایە هەیە کە «چارەنووسی مرۆڤ بە حوکمی جەوهەرەکەی، ئازاد بوونە.» لێرە بە دواوە ئەم بنەمایە بوو بە بنەمای «جیهانی جێرمەنی»، چونکە ئەگەر هەموو مرۆڤێك بتوانێت بە هۆی توانایی ئاوەزیی خۆی لە سەر راستی و دروستی داوەری بکات ، تەنیا لە کاتێکدا هەمووان لە جیهان رازی دەبن کە لەگەڵ پێودانگە ئاوەزمەندەکاندا گونجاو بێت. هیگڵ لێرەدا بە باشی ئایدیای سیاسی خۆی لە فەلسەفەی مێژووەکەیدا دەخاتە روو. بە باوەر بەوەی گۆرانکاریی مێژوو لە نەتەوەی ئاڵمان یان رۆحی گەلی جێرمەنیدا کۆتایی پێ دێت و رۆحی رەها لە گەلی جێرمەندا بە ئازادیی رەها (کە ئامانجی مێژووە) دەگات، بە دەوڵەتی ئاوەزمەندانەی ئاڵماندا هەڵدەڵێت و نەتەوەی ئاڵمان بە میراتگری شارستانیەتی جیهانی دەزانێت. بەپێی بریاری ئاوەزی گشتی، ئەرکی رێنوێنیکردنی کۆمەڵگەی جیهانی دەخاتە ئەستۆی ئەوان.

بە بۆچوونی هیگڵ نمونەی گشتی لە حکومەتدا خۆی دەنوێنێت، دەرکەوتنی رۆح بەرامبەرە لەگەڵ بەئۆبژێکتیڤبوونیدا و ئێمە دەبێ ئەم شانۆیە لە شاندی حکومەت و تاکەکاندا بەدی بکەین. حکومەت هەمان نمونەی یەزدانە لە سەر زەویدا و دەوڵەت هەر هەمان جوڵەی یەزدانە لە جیهاندا. لە حکومەتدایە کە ئازادی بەدی دێت و سوود لە بەرهەمەکانی ئەم وەدیهاتنە وەردەگرێت، چونکە یاسا دەرکەوتەی بەئۆبژێکتیڤبونی رۆح و خواستە بە مانا راستەقینەکەی. ئێمە دەتوانین تەنیا خواستێك بە خواستی ئازاد بزانین کە پەیرەوی لە یاسا بکات. رەهەندی حکومەت هەمان ساتەکانی ئاوەزی رەهایە و پاشا هێمای مادی حکومەت و دەرکەوتنی جەوهەری رەهای جیهانیە. هیگڵ کە حکومەتی «پرۆس»ی بە دەرکەوتە و روخساری یەزدان لە سەر زەوی دەزانی و ئازادیی مرۆڤەکانی لە پەیرەویکردن لە پاشادا بەدی دەکرد، بە هیچ جۆرێك هیچ رۆڵێکی بۆ خەڵك لە بەرچاو نەدەگرت و بە توندی دژایەتی لەگەڵ «دەسەڵاتداریەتیی خەڵك»دا دەکرد.

بێگومان داوەریی هیگڵ لە سەر پرۆس و پشتیوانیە دەمارگرژانەکەی لەم حکومەتە، بۆ نیعمەتگەلێك دەگەرێتەوە کە لە لایەن ئەم حکومەتەوە پێی دەگەیشت. ئەو لە لایەکەوە لەم باوەرەدا بوو دەبێ تاکەکان بە شێوەیەکی هاوتەریب لەگەڵ ویژدان و باوەرە راستەقینەکانی خۆیان بە سەر خۆیاندا حکومەت بکەن، لە لایەکی دیکەشەوە دەبێ جیهانی دەرەکی بە هەموو دامەزراوە و بنیاتە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانیەوە، بە شێوەیەکی ئاوەزمەندانە رێك بخرێت. بە بۆچوونی ئەو، سەرەرای حکومەتی تاکەکان بەسەر خۆیاندا بەپێی ویژدان و باوەرەکانیان کە تەنیا ئازادیی زەینی لێدەکەوێتەوە، دەبێ رێکخراوە ئاوەزمەندانەکان

بەسەر دەوڵەمەندەکانیشدا حکومەت بکەن، تاکوو بەم شێوەیە بە دژی یەکتر رانەوەستن و ئازادیەکانی یەکتر سنووردار و بەرتەسك نەکەنەوە. کاتێك جیهانی دەرەکی بە شێوەیەکی ئاوەزمەندانە رێك خرابێت، ئەوا ئەو کەسانەش کە پەیڕەوی لە ویژدانی خۆیان دەکەن ئازادانە بڕیار دەدەن کە بەپێی یاسا و مۆراڵی جیهانی دەرەوە هەڵسوکەوت بکەن. بەم جۆرەش ئایدیای ئازادی بەدی دێت. هیگڵ پێی وایە پێکهاتەیەکی لەم چەشنە لە وڵاتی ئاڵماندا وەدی هاتووە.

## ژێدەرەکان:


١) هگل، گئورگ ویلهلم فردریش. عقل در تاریخ. ترجمە حمید عنایت. انتشارات دانشگاه صنعتی شریف.

٢) مجتهدی، کریم. درباره هگل و فلسفه او. انتشارات امیرکبیر، ١٣٧٦.

٣) سینگر، پیتر. هگل. ترجمه عزت الله فولادوند. گرح نو، ١٣٧٩.

٤) پوپر، کارل. جامعه باز و دشمنانش. ترجمه علی اصغر مهاجر. تهران، شرکت سهامی انتشار.

٥) لین.و.لنکستر. خداوندان اندیشه سیاسی. ترجمه علی رامین. جلد سوم، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٨٠.

٦) پازارگاد، بهاالدین. تاریخ فلسفه سیاسی. جلد دوم، ١٣٨٢.

7) Alasdari Maclntyre, ed., Hegel:A Collection of Critical Essays (Anchor, Newyork, 1972).

8) Sidney hook, From Hegel to Marx (Humanities Press, Newyork, 1958).

9) David McLellan, the Young Hegelians znd Karl Marx (Macmillan, London, 1969.)


## سەرچاوە:


گۆڤاری «راهبرد» ژمارە ٣٣، پاییزی ١٣٨٣. لاپەڕە ١٥٧ تا ١٦٧

د. مەهدی مەحفوز
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

# بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی

یەکێك لە خەسڵەتەکانی فیکری سیاسی سەدەکانی ناوەڕاست ئەوە بوو کە بیریاران و فەیلەسوفانی ئەو قۆناغە، لە کاتی تاوتوێکردنی دیاردەی سیاسیداو پەیوەندی ئەو دیاردەیە بە دەسەڵاتی سیاسیەوە، پشتیان بە لێکۆڵینەوەو چەمکە تیۆلۆژییەکانی کڵێسا دەبەست. ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا دەسەڵات و هەیبەتی کڵێسا نیشان بدەن و بیسەلمێنن کە دەسەڵاتی پاپا لەسەرو دەسەڵاتە دنیاییەکانەوەیە، بە دەسەڵاتی پادشایی و ئیمپراتۆریەوە. واتە دەتوانین بڵێین پەیوەندیەکی توندوتۆڵ لەنێوان تیۆریای سیاسی و تیۆریای تیۆلۆژیدا هەبوو، بە جۆرێك بووبوە فۆرمێك لە فۆرمەکانی تێکەڵکردنی کایەی ئایینی و سیاسی، ئەمەش تایبەتمەندیەك بوو کە فیکری سیاسی سەدەکانی ناوەڕاستی لە قۆناغ و سەردەمەکانی دی جیا دەکردەوە.

دوای ئەوەی سەردەمی ڕێنیسانس لە هەوڵی جیاکردنەوەی سیاسەت بوو لە ئایین، ئەویش لەڕێی نوسینەکانی «مەکیاڤیلی»یەوە، دەبینین بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی، بزوتنەوەیەك کە لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا لە هەڵکشاندا بوو، دەیویست جارێکی تر تیۆریای سیاسی و مەسەلە تیۆلۆژی و ئایینیەکان پێکەوە گرێ بداتەوە. کارێك کە بووە مایەی دابەشبوون لەناو کڵێساداو جیابوونەوەی تەواوی دەوڵەت لە کڵێسا و دەسەڵاتی پاپا، لەڕووی ئایینی و سیاسیەوە.

لەگەڵ بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینیدا، بەڵگەو بەهانە تیۆلۆژیەکان بوونە ئامرازێك بۆ داکۆکیکردن لە تیۆریاو هەڵوێستی سیاسی. واتە بیروباوەڕی ئایینی بوو بە ڕێنمایکەری هاوپەیمانێتی سیاسی و لەو قۆناغەدا هانی پادشایەتی ڕەهای دەدا، تا دەسەڵاتی خۆی لە بەرامبەر کڵێساو حوکمی ئیمپراتۆریەتدا قایمترو بەهێزتر بکات. لە سەرەتای

سەدەی شازدەهەم و لەگەڵ سەرهەڵدانی پاشایەتی ڕەهادا، سستمی پادشایەتی لە ململانێیەکی بەردەوامدا بوو لەگەڵ دەسەڵاتی پاپادا، تا ئەو کاتەی بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی هاتە ئاراو ئەو ململانێ تولانیەی لە بەرژەوەندی سستمی پاشایەتی یەکلایی کردەوە. بەمەش دەرگای لەبەردەم دروستبوونی پادشایەتی نەتەوەییدا کردەوە کە ئەوروپای لەسەر فۆرمێکی تازە رێکخستەوە، ئەو فۆرمە تازەیەش دەوڵەتی نەتەوە بوو کە هەریەکەو سەربەخۆیی و تایبەتمەندی خۆی هەبوو.

کڵێسا دوای ئەوەی نەیتوانی لە ڕێگەی ئەنجومەنی گشتی کڵێساوە خۆی ریفۆرم بکات، ئەو بیرو بۆچون و نوسینانەی بەرهەمی بزاوتی ریفۆرمی ئایینی بوون، بوونە مایەی بەهێزترکردنی دەسەڵاتی دنیایی پادشاکان و تۆکمەترکردنیان. ڕێبەرانی بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی دڵنیابوون لەوەی کە چاکسازی نوێی ئایینی سەرکەوتوو نابێت، گەر نەتوانێت فەرمانڕەواکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و پاڵپشتی سیاسی و سەربازی ئەوان بۆ خۆی مسۆگەر بکات.

لێرەوە دەبینین یەکەمین بیریاری بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی «مارتن لوتەر»، هەر زوو درك بەوە دەکات سەرکەوتنی ریفۆرم لە ئەڵمانیادا، وابەستەی ئەو هاوکاری و پشتیوانی لێکردنەیە کە میر و دەسەڵاتدارەکانی وڵات پێشکەشی دەکەن. لە ئینگلتەراشدا ریفۆرم لە ڕێی دەسەڵاتی ڕەهای «هێزی هەشتەم»ەوە سەریگرت. بەمجۆرە و لە سەرتاسەری ئەوروپادا، پادشا بووە دەسەڵاتی سێنتراڵ و پنتی سەرەکی یەکیەتی نیشتمانی. لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەمیشدا، ئەم دۆخە فەرەنساشی گرتەوە.

لە پای ئەم سەرکەوتنانەی دەسەڵاتی دنیایی پادشاکان بە دەستی هێنا، گەشە و بەرەو پێشچونی گروپ و ڕێچکا ئایینیەکان، وابەستەی دەست تێکەڵکردن و هاوپەیمانێتی بەستنی ئەوان بوو، لەگەڵ دەسەڵاتی ڕەهای پادشاکاندا. لە ئینگلتەرا و باکوری ئەڵەمانیادا، پرۆتستانت مەزهەبەکان دایەنە پاڵ میرەکان و سەرکەوتنیان دەسگیر بوو، بەڵام لە فەرەنسا و ئیسپانیا بوونە هاوپەیمانی ئەو خانەدانانەی خواستی سەربەخۆییان هەبوو، بەمەش دووچاری شکست هاتن و ئەوەی سەرکەوتوو بوو ئایینزای کاتۆلیکی بوو کە ئایینی دەسەڵاتی پادشایەتی ڕەها بوو. لە ڕاستیشدا بردنەوەو دۆراندنی هەریەك لەو ئایینزایانە تەنها لە بەرژەوەندی پادشایەتی ڕەهادا بوو، واتە ئەوەی بەشێوەیەکی سەرەکی سودی سیاسی لەو ململانێیە دەبینی، سستمی حوکمرانی پادشایەتی ڕەها بوو، ئیتر سەرکەوتوو پرۆتستانت بوایە یان کاتۆلیك.

لەو ماوەیەدا کەم تا زۆر فیکری سیاسی لەوەدا بوو تەبەنی هەندێ لە بیرو بۆچونەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بکات، بە تایبەت ئەوانەی باسیان لەوە دەکرد کە یەزدان سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسیە و خاوەنی ئەم دەسەڵاتە سیاسیەش، سێبەری یەزدانە لەسەر زەوی. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەم دەسەڵاتە سیاسیە لە دەستی کڵێسا و ئیمپراتۆرەکاندا بوو، بەڵام لە سەدەی شازدەهەمدا ریفۆرمیستەکان ڕایانگەیاند کە ئەم دەسەڵاتە دەبێت لە دەستی میرو پادشاکاندا بێت، نەك کڵێسا و ئیمپراتۆر خاوەنی بن.

مەبەست لەمەش بەهێزکردنی پێگەی پادشاکان و بەدەست هێنانی ڕەزامەندیان بوو، تا ببنە پارێزەری ئاینزا نوێیەکان کە لەگەڵ ئاینزای کاتۆلیکیدا ناکۆك بوون و پاپا خۆی ڕێبەرایەتی دەکرد. هاوکات دەیانویست سنورێك بۆ ئەو داواکارییەی پاپا دابنێن کە دەیویست خۆی بکاتە میراتگری مەسیحیەت لە تەواوی ئەوروپادا، لە بەرامبەریشدا دەسەڵاتی پادشاکان وا لێبکەن کە لە دەسەڵاتی خودی پاپاش باڵاتر بێت.

بەو پێیەی پادشا بە فەرمانی یەزدان حوکم دەکات، ئەوا تەنها لە بەرامبەر ئەودا بەرپرسیارە، نەك لە بەردەم یەکێك لە بەندەکانی خوادا، لێرەوە پادشا لە بەرامبەر پاپادا بەرپرسیار نییە. ئەم بەرپرسیارێتیەش لە بەردەم یەزداندا، خەڵك و خوا ناچار دەکات گوێ ڕایەڵی تەواوی پادشاکانیان بن و هەر کەسێکیش بێگوێی پادشا بکات، گوناهبارە و وەکی ئەوە وایە لە یەزدان یاخی بووبێت. ریفۆرمیستە ئایینیەکان

دەوڵەمەندبوونی کڵێسا و بایەخی زۆری پیاوانی ئایینیان بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان، کردە ئامرازێك بۆ پەلاماردانی کڵێسا و هێرشکردنە سەر خودی پاپا. ڕیفۆرمیستەکان ئەوەیان بۆ خەڵك ڕوندەکردەوە کە مرۆڤ لە پەیوەندی بەستنی لەگەڵ یەزداندا، پێویستی نە بە پاپایە و نە بە کڵێسا، تەنانەت هەندێکی وەك «مارتن لۆتەر» دەڵێت: (هەموو کەسێك بە پێی ویست و ویژدانی خۆی، مافی ئەوەی هەیە کتێبی پیرۆز لێکبداتەوە و شرۆڤەی بکات).

لەگەڵ هەموو ئەو تیۆریا و بیروبۆچوونانەی ڕیفۆرمیستەکان هێنایانە ئارا بۆ لاوازکردنی دەسەڵاتی کڵێسا و بەهێزکردنی دەسەڵاتی پادشاکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پادشاکان تەنها گرنگیان بەو دەرەنجامە سیاسیانەی بزوتنەوەکەدا کە دەسەڵاتی تۆکمەتر دەکردن، چونکە ئەوان لە خەمی ئەوەدا بوون موڵك و ماڵاتە بێشومارەکانی کڵێسا بۆ خۆیان پاوان بکەن و لە دەست ئەو باجە ئایینییە ڕزگاریان بێت کە دەیان دا بە پاپا. ئەم خواستە هۆکاری سەرەکی بوو کە پاڵی بە شای ئینگلتەراو زۆرێك لە میرەکانی ئەڵەمانیاوە نا، تا ببنە پرۆتستانت مەزهەب و بەگژی کڵێسای کاتۆلیکیدا بچنەوە. لە ڕێی پاوانکردنی موڵك و ماڵاتی کڵێساوە، دەوڵەت داهاتێکی زۆر و زەوەندی بۆ خۆی مسۆگەر کرد کە دەسەڵاتی مەرکەزی پادشای بەهێزتر کرد و هاوڵاتیانیشی ناچار کرد ملکەچی یەك دەسەڵاتی سیاسی بن.

هەرچەندە بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی کاری بۆ بەهێزکردنی سستمی پادشایەتی دەکرد، بەڵام هاوکات هەوڵی ئەوەشی دەدا تاکە کەس لە جەبری کڵێسا ڕزگار بکات و تاکەکەس بکاتە بنەمای بۆچونە فیکری و ئایینی و مەدەنیەکانی. ئەگەرچی ئامانجی سەرەکی بزوتنەوەکە ئەوە نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرانسیپ و دەرەنجامە فیکری و کۆمەڵایەتیەکانی بەوە گەیشت. هەر بۆ نمونە باسکردنی ئەوەی تاکە کەس مافی شرۆڤە کردن و لێکدانەوەی کتێبی پیرۆزی هەیە، گوازرایەوە بۆ سەرجەم لایەنەکانی ژیانی فیکری و کۆمەڵایەتی و لە ئاکامیشدا لەگەڵ گەشە و بەرەو پێشچونە ئابووریەکان و لەگەڵ هێزی تازە پێگەیشتوی چینی ناوەندا یەکیان گرتەوە، ئەو چینەی داوای کارکردنی زیاتر و زۆرتری دەکرد، بە مەبەستی کەڵەکە کردنی سامان، ئەویش لە ڕێی بازرگانی و پیشەسازی ئازادەوە. بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی بەرادەی بەشداریکردنی لەبەرەو پێشبردنی واقعی ژیانی سیاسی لە ئەوروپادا، ڕۆڵێکی گەورەشی لە پەرەپێدانی فیکری سیاسیدا هەبوو، بە تایبەت ئەو فیکرە سیاسیەی ئەو کات لە ئارەدا بوو.

گرنگترین ئەو بەرەو پێشچونەی فیکری سیاسی لەو قۆناغەدا بە خۆیەوە بینی، دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆیان بکەینەوە:

١-بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی لە ڕوی فیکری و پراکتیکەوە، پاڵپشتی پادشا بوون و دەسەڵاتیان تۆکمەتر کرد، تا دەسەڵاتیان کردە دەسەڵاتێکی یەزدانی و لە بەرامبەر دەسەڵاتی ڕوکەشانەی ئیمپراتۆر و هەیبەت و شکۆی پاپادا ڕایانگرت.

٢-بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی لەگەڵ هەوڵدانی بۆ بەهێزکردنی پێگەو دەسەڵاتی پادشا، ڕاستەوخۆ و نا ڕاستەوخۆ کاری بۆ ئەوەشکرد تا تاکە کەس ئازاد بێت، بەمجۆرە زەمینەی بۆ حوکمرانی دیموکراسی خۆشکرد.

٣-هەرچەندە بزوتنەوەی ڕیفۆرم لە چەند وڵاتێکی ئەوروپایدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەڵام لە زۆربەی بەشەکانی باکوری ئەوروپادا، بووە مایەی دروستبونی کەمینەی ئایینی بەهێز و ئەمەش کێشەی کەمینەی دروستکرد و بوونە سەرچاوەی پشێوی و نا ئارامی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە ناو وڵاتەکانیاندا. چارەسەری ئەم کێشەیە دوای ماوەیەکی دوور و درێژکرا، کاتێك بڕیار لەسەر تۆلێرانسی ئایینی درا و چەمکی پێکەوە ژیانی گروپە ئایینیە جیاجیاکان، لەناو چوارچێوەی یەك دەوڵەت و لە سایەی یەك دەسەڵاتدا چەسپی.

٤-بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی بووە مایەی دروستکردنی مشتومڕ دەربارەی ماف کەمینەکان لەبەرخوردکردن و ڕاپەڕیندا. بەو پێیەی ئەو کەمینەیە بیروباوەڕی ئایینی خۆی بە دروست دەزانێت و بەرنامەی خۆی پێ ڕاستەو پێچەوانەی بیروباوەڕەکانی پادشایە، ئایا ماف ئەوەی نییە لە پادشا ڕاپەڕێت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەکات، ئایا کارێکی لەمجۆرە ناچێتە خانەی کوفر و گومراییەوە، وەك چۆن لەسەدەکانی چواردەو پانزەدا هەموو بەرخوردێکی پاپا بە کوفر و لە ڕێیلادان ئەژماردەکرا؟ یان پێویستە ئەو کەمینەیە بێ چەند و چون و کوێرانە ملکەچی پادشا و فەرمانەکانی بێت.

لەسەر ئەم مەسەلەیە، فەلسەفەی سیاسی بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی، زۆرترین مشتومڕی بەخۆیەوە بینی. واتە دەربارەی ئەوەی ئایا خەڵك و خوا ماف بەرخوردی حوکمڕان و فەرمانەکانی ئەوانیان هەیە، یاخود دەبێت کوێرانە گوێڕایەڵی بڕیارەکانیان بن و بەم پێیەش بەرخورد و گوێڕایەڵی نەکردن دەچێتە خانەی تاوانەوە و خاوەنەکەی پێ گوناهبار دەبێت.

بە درێژایی سەدەی شازدەهەم ئەم دوو جۆرە لە تیۆریای سیاسی سەبارەت بە ڕەوایەتی و ناڕەوایەتی بەرخورد کردن لەگەڵ پادشا دا لە ئارادا بوو، هەر یەکەشیان پێچەوانەی ئەوی دی و دژی ئەوی تریان بوو.

دیارترین ڕیفۆرمیستێك کە بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینی لە سەدەی شازدەدا بە خۆیەوە بینیبێت، بریتین لە: «مارتن لۆتەر» (١٤٨٣-١٥٤٦) و «جۆن کالڤن» (١٥٠٩-١٥٦٤). ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین باس لە بیرو بۆچوونە سیاسیەکانی ئەو دوو ڕیفۆرمیستە بکەین کە لە ڕێی بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ئایینیەوە پێشکەشیانکرد.

## یەکەم/ مارتن لۆتەر ( 1483 - 1546 ):

«مارتن لۆتەر» ساڵی ١٤٨٣ لە شاری ئیسیلبین لە هەرێمی سکۆنیا هاتۆتە دنیاوە. باوکی کرێکاری کانە خەڵووز بووە. سەدەمی منداڵێتی پڕی بووە لە هەژاری و نەهامەتی، بەڵام سەرباری ئەوەش توانیویەتی قۆناغەکانی خوێندن ببڕێت و بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە زانکۆی ئێرفۆرت بەدەست بێنێت. ساڵی ١٥٠٥ واز لە خوێندنی زانستی دێنێت و دەبێتە قەشە لە کڵێسادا. ئەمەش دوای ئەوەی هەورە بروسکەیەکی توند لێی دەدات و دەکەوێتە سەرزەوی و لە هۆش خۆی دەچێت. ساڵی ١٥٠٧ کە بە فەرمی دەبێتە کەشیش، خۆی بۆ خوێندنی خوداناسی تەرخان دەکات و ساڵی ١٥١٢ بڕوانامەی دکتۆرا لە زانکۆی ویتنبرگ وەردەگرێت و هەر لەوێشدا دەبێتە مامۆستا[1].

لە ساڵی ١٥١٧ کێشەی «لۆتەر» لەگەڵ کڵێسای ڕۆمادا سەرهەڵدەدات، کاتێك هێرش دەکاتە سەر پرۆسەی فرۆشتنی (صكوك الغفران) کە کڵێسا پێی هەڵدەستا، بەرامبەر وەرگرتنی پارەو پولێکی زۆر. ئەمەش لە خەڵکانی هەژار و دەست کورت وەردەگیرا. «لۆتەر» پێیوابوو ئەمە کارێکی قێزەونەو دوور و نزیك پەیوەندی بە ئایینەوە نییە. ئەم هەڵوێستەی هەڵایەکی گەورەی نایەوەو پاپای ناچار کرد وەك گومڕا و لە ڕێی لادەرێك ناوزەدی بکات کە شایەنی ئەوە بێت لە کڵێسا وەدەربنرێت. ئەمە وایکرد «مارتن لۆتەر» هەڵبێت و خۆی بشارێتەوە. بەڵام هەر ئەوەندەی ئەو بیروبۆچونانەی داوای ڕیفۆرمی ئایینیان دەکرد ئەڵەمانیای گرتەوە، جارێکی تر «لۆتەر» دەرکەوتەوەو ساڵی ١٥٢٥ چووە ژیانی هاوسەریەوەو خێزانی پێك هێنا. لەسەروەختی خۆشاردنەوەیدا «لۆتەر» ئینجیلی وەرگێڕایە سەر زمانی ئەڵەمانی و بەمجۆرە یەکەمین کتێبی ئایینی بە زمانی زگماکی خۆیان، پێشکەش بە ئەڵەمانەکان کرد[2].

لە ساڵی ١٥٤٦ «مارتن لۆتەر» کۆچی دوایکرد، پاش ئەوەی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەشداری لە هێنانە

ئارای بزاوتێکی نوێی ئایینیدا کرد کە درایە پاڵ ئەو و بە بزاوتی (لۆتەریزم) ناوی دەرکرد، دەست بەجێ و لەگەڵ ئەو بزاوتە ئایینیە نوێیەدا کڵێسایەکی تازەی لە ئەڵەمانیادا دروستکرد کە کڵێسای پرۆتستانتی بوو.

## بیروبۆچوونەکانی:

دەسپێکی بیرو بۆچوونەکانی «لۆتەر» بۆ چاکسازیکردن لە کڵێسادا، لەو داوەشان و گەندەڵی و گومڕاییەوە دەستی پێکرد کە کڵێسا پێی گەیشتبوو. «لۆتەر» هەمیشە بۆچوونەکانی خۆی لەگەڵ ئەو پرانسیپەدا یەکدەخست کە ململانێی ناو ئەنجومەنی کڵێساکان ڕەواجی پێدەدا و تەئکیدی لێدەکردەوە، بەوەی کڵێسا (مەڵبەندی کۆبوونەوەی تەواوی ئیماندارانە لەگەڵ عیسای مەسیحدا لەسەر زەوی). ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی کڵێسای دەکرد، دەرهەق بەو ژیانە پڕ عەیش و نۆش و بێسەوادەی ناو کۆشکەکانی ڕۆما و بە هەدەربردنی دەسکەوت و پاشەکەوتی کڵێساکانی ئەڵەمانیا بوو بۆ خاتری پاپا، لەگەڵ فرۆشتنی (صكوك الغفران)دا. ئەو لە دەسکەوت و ئەو تایبەتمەندیە زۆرانەی پیاوانی ئایینی توورە بوو (بەڕەوای نەدەزانی یاسای ڕوحانی بە چاوی ڕێزەوە لە ئازادی و گیان و موڵك وماڵاتی پیاوانی ئایینی بڕوانێت، بەڵام ئەم مافە بە خەڵکانی ئاسایی تر ڕەوا نەبینرێت، وەك ئەوەی ئەوانی دی مەسیحی نەبن و ئەندامی کڵێسا و باوەڕداری سەر ڕاست نەبن)[٣].

«لۆتەر» لایەنگری ئازادی تاکە کەس و دژ بە سەرکوتکردن و بە زۆر سەپاندنی بیروباوەڕی ئایینی بوو. ئەو پێیوابوو هێز و بەکارهێنانی زەبر و زۆر، ئامرازی گونجاو نین بۆ برەودان بە ئایین یاخود بۆ ڕێگرتن لە کوفرو گومڕایی. (هەرگیز ناکرێت بە زەبری هێز کوفر و گومڕایی نەهێڵین. نەخێر ئەم کارە پێویستی بە ئامرازێکی دیکەیە، پێویستی بەمشتومڕی فیکری و ڕاگۆڕینەوەیە، بە پێچەوانەی شەڕە شیرەوە. ئێمە پێویستە لێرەدا قسە لەسەر وتەکانی یەزدان بکەین. ئەگەر ئەوەش کەڵکی نەبوو، ئەوا دەسەڵاتی دنیایی کێشەکە چارەسەر ناکات، تەنانەت ئەگەر سەرزەمین خوێن دایبپۆشێت)[٤].

لای «مارتن لۆتەر» جەوهەری ئایین لەو ئەزموونە ناوەکی و عیرفانیەدا کە هەر کەسە و بۆ خۆی ئەزموونی دەکات و ناکرێت بۆ کەسێکی دی بگوازرێتەوە، لە کاتێکدا وێنە دەرەکیەکانی و ئەو سروت و ڕێو ڕەسمانەی پیاوانی ئایینی ئەنجامی دەدەن، تەنها هۆکارێکن بۆ گەیشتن بەو ئامانجە یاخود کۆسپن لە بەردەم گەیشتن بەوەدا.

سەربارى ئەوەی «لۆتەر» دژی سەرکوتکردنی ئایینی و یاسای کڵێسا و حوکمی پیاوانی ئایینی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا پێیوابوو دەبێت گومڕاو سەر لێشێواوەکان لە ناو ببرێن و ڕێگە بە بڵاوکردنەوەی بیروبۆچونەکانیان نەدرێت. بێگومان دەرەنجامی ئەم بیروڕایانەی «لۆتەر» ڕاستەوخۆ بەرەو سەرکوتکردن دەچوو. مادامەکی کڵێسا نەیتوانی خۆی ڕێك بکاتەوەو چاکسازی لە ناوخۆیدا ئەنجام بدات، ئەوا لێرە بەدواوە ئومێدی ئەنجامدانی ئەو کارە بۆ پاکژ کردنەوەی کڵێسا، ڕادەستی فەرمانڕەوایانی مەدەنی و پادشاکان دەکرێت[٥].

لێرەوە «لۆتەر» بە قسەیەکی تەئکید لەوە دەکاتەوە کە دەبێت (میر و پادشاکان بە حوکمی زەرورەت کەشیش و پیاوی ئایینی بن)، هەروەها پێیوایە پێویستە دەسەڵاتی دنیایی ئامرازی چاکسازی بێت و چاوەدێری هەر ڕیفۆرمێك بکات کە ئەنجام دەدرێت. «لۆتەر» بەو پێیەی پشتی بە میر و پادشاکان دەبەست بۆ سەرخستنی چاکسازی لە ئەڵەمانیادا، ئاسایی بوو پابەندی ئەو بۆچونە بێت کە دەڵێت: (لەسەر خەڵك

و خوایە گوێڕایەڵی بێ قەید و شەرتی فەرمانەکانی فەرمانڕەوایان بن)٠ «مارتن لۆتەر» بایەخێکی ئەوتۆی بە سیاسەت نەدەدا، ئەگەر ناچار نەبوایە و یەخەی نەگرتایە٠ یەکێکیش بوو لەوانەی ڕێزێکی زۆری بۆ دەسەڵاتی مەدەنی هەبوو٠ هاوکات دژی ئەوە بوو لە ڕێی ئاشوب و توندو تیژیەوە فشاری سیاسی دروست بکرێت٠ هەرچەندە ڕێزی لە دەسەڵاتی مەدەنی دەگرت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕوپامایی بۆ دەسەڵاتدارانی دنیایی نەکرد و لێیان نزیك نەبووەوە٠ لە شوێنێکدا دەربارەی فەرمانڕەوایان دەڵێت: (ئەوانە گەورەترین گەمژە و بەدترین خراپەکارن لەسەر ڕووی زەوی)٠

کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە (ڕێزی لۆتەر بۆ خاتری حوکمڕانەکان نەبووە، بەڵکو لە پێناو پلە و پایە و پێگەی فەرمانڕەوادا بووە)٠ لەلایەکی ترەوە هەرچەندە ڕێزی لە فەرمانڕەوایان نەگرتووەو بە شایەنی ئەوەی نەزانیون، ئەوەندەش بێمتمانە بووە بە جەماوەری خەڵك٠ (میرو پادشای ئەم جیهانە خودان، خەڵکانی ئاسایش ئەهریمەنن، بۆیە هەندێ جار یەزدان لە ڕێی ئەوانەوە ئەو شتانە دەکات کە لە ئان و ساتی تردا ڕاستەوخۆ بە شەیتانی دەکات)[٦]٠ هاوکات لە شوێنێکی تردا دەڵێت: (من ئەوەم پێ چاترە تەحەمولی میرو پادشایەك بکەم کە هەڵە دەکات، نەك هی میللەتێك کە کاری ڕاست و دروست ئەنجام دەدات)[٧]٠

## دووەم/ جۆن کاڵڤن ( 1509 - 1564 ):

«جۆن کاڵڤن» تەواو وەکی «مارتن لۆتەر» باوەری بە ملکەچی و گوێڕایەڵی خەڵك و خوا هەبوو، هەروەها باوەڕی زۆری بە شەرعیەت و دەسەڵات هەبوو٠ بەڵام لە تەفسیرکردنی ئینجیلدا بۆچونی جیاواز بوو، واتە بڕوای بەوە نەبوو تاکە کەس مافی لێکدانەوەو شرۆڤەکردنی کتێبی پیرۆزی هەبێت، هاوکات دەترسا لەوەی کۆمەڵگە لە بزوتنەوەی ریفۆرمی ئاییندا پرکێشی بکات و زۆر بڕوات٠ سەبارەت بە پەیوەندی کڵێساش بە دەوڵەتەوە، ئەوا دژی ئەو بۆچوونە بوو کە دەسەڵاتی دنیایی و کڵێسا لەیەك سستمدا کۆدەکاتەوە، چونکە ئەو بڕوای وا بوو بواری کارکردنی هەریەکەیان جیاوازە٠ هەروەها پێیوابوو دەبێت کڵێسا ئازاد و دەست کراوە بێت، لەوەی چ جۆرە مۆراڵ و ئایدزایەك دەسەپێنێت٠ دەبێت دەسەڵاتی دنیایش پشتیوانی تەواو لە کڵێسا بکات، بۆ ئەوەی دنیابینیەکانی خۆی بەسەر ئەوانەدا بسەپێنێت کە فەرمانەکانی جێبەجێ ناکەن و ڕێنومایەکانی بەهێند ناگرن٠

لەلایەکی ترەوە ئەرکی دەسەڵاتی دنیایی ئەوەیە، گرنگی بە پێداویستیە مادیەکانی مرۆڤەکان بدات و ئارامی و ئاسایش دابین بکات و مافی موڵکایەتی بپارێزێت و سەرپەرشتی و چاودێری ئایین و چاکسازی بکات[٨]٠ یەکەمین ئەرکی دەسەڵاتی دنیایی ئەوەیە، خودا پەرستی بپارێزێت و ئاگاداری بکات٠ لەگەڵ ئەم جیاکردنەوەیەی نێوان دەسەڵاتی دنیایی و کڵێساش، بەڵام هەر پەیوەندی ئایینی پێکەوەیان دەبەستێتەوە، لەبەرئەوەی ئەرکی چاودێریکردنی بیروباوەڕ و پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئایینی بە دەسەڵاتدارانی دنیایی سپارد٠ لێرەوە «کاڵڤن» بڕیار دەدات کە دەبێت مەسیحیەکان هاریکاری حوکمڕانەکان بکەن لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانیاندا، واتە خزمەتکردنی دەسەڵاتی دنیایی بووبە ئەرکێکی ئایینی وا کە تاکە کەس بۆی نەبێت لێی لا بدات، یاخود بەگژ ئیرادەی دەوڵەتدا بچێتەوە٠ کەواتە گرنگترین بیرو بۆچوونەکانی «کاڵڤن» بەشێوەیەکی گشتی، جەختکردنەوەیەتی لەسەر ئەرکی گوێڕایەڵی بێ چەند و چوون، لە مەشدا تەواو کۆك و هاوڕا بوو لەگەڵ «مارتن لۆتەر»دا٠ بەو پێیەی دەسەڵاتی دنیایی ئامرازێکە بۆ سەرفرازی و ڕزگاربوون، ئەوا پلەو پایەی فەرمانڕەوا بە وتەی «کاڵڤن» پیرۆزترین پلەو پایەیە، چونکە ئەو جێگرەوەی یەزدانە لەسەر زەوی و بەرەنگاربوونەوەو بەگژا چونەوەشی وەك بەرەنگاربوونەوەی یەزدان دایە٠

بەدبەختیە کەسی ئاسایی کە ئەرکی فەرمانڕەوایەتی نازانێ و لەو ئاستەدا نییە، باس لە کاروباری دەوڵەت بکات. ئەو کەسە گەر پێیوایە شتێك هەیە و پێویستی بە ڕاست کردنەوە هەیە، ئەوا با ئەو کارە بۆ ئەوانە ڕون بکاتەوە کە لە سەروخۆیەوەن و خۆی ئەوە نەکات، چونکە ئەو نابێت بەبێ ڕێنومایی و فەرمانی ئەوانەی لەسەروخۆیەوەن هیچ شتێك بکات.

بە بۆچونی «کالڤن» فەرمانڕەوای خراپ و بەد، سزایە بۆ خەڵکانێك لەسەر گوناه و هەڵەکانیان، لەم حاڵەتەشدا دەبێت خەڵك و خوا ملکەچ و گوێڕایەڵی ئەو فەرمانڕەوایە بن، وەك چۆن ملکەچی و گوێڕایەڵی حوکمڕانێکی پیاو چاك دەکەن. لەبەرئەوەی ملکەچی و گوێڕایەڵی ئەوان بۆ کەسەکە نییە، بەڵکو بۆ پێگەو پلەو پایەکەیەتی، پلەو پایەش شکۆ و مەزنی خۆی هەیە و ناکرێت پێشێل بکرێت. ئەوەی ڕاستی بێت «جۆن کالڤن» وەك سەرجەم ئەوانەی لە سەدەی شازدەهەمدا بەرگرییان لە ماف یەزدانی پادشاکان کردووە، بیروڕای زۆر کۆنکرێتی لەمەڕ ئەرکی فەرمانڕەوایان بەرامبەر بە هاوڵاتیان و خەڵك و خواخستۆتە ڕوو: بۆ نمونە یاسای یەزدان کە یاسایەکەو ناکرێت دەستکاری بکرێت، پێویستە پادشاکان و خەڵك و خوا پابەند بن پێیەوە. حوکمڕانی خراپ و بەدکاریش تاوانی یاخی بوون لە خوا و گومڕایی ئەنجامی دەدات.

«کالڤن» پێی وابوو یاسای مەدەنی بڕیاری سزادان بەسەر شتێکدا دەدات کە هەڵەیە، بەڵام سزادانی فەرمانڕەوا کارێکە بەدەستی یەزدانەو خەڵك و خوا بۆیان نییە ئەو کارە بکەن. ئەمە بۆ خۆی هەڵوێستێکی ئاسایی بوو کە «کالڤن» وەریگرتبوو، بەهۆی ئەو دەسەڵاتەی لە شاری (ژنێف)دا هەیبوو، هەروەها بەهۆی ئەوەی کە ئومێدی ئەوەی هەبوو پرۆتستانتیەتی کالڤنی ببێتە ئایینی پادشاکانی فەرەنسا.

لە ناوەڕۆکی تیۆریاکەی «کالڤن»دا دەربارەی بەرخوردی سیاسی هاتووە کە هەندێ برگەی دەستووری هەیە، کاربەدەستانی خوارەوە سەرپشك دەکات بەئەرکی بەرگرتن لە ستەمکاری سەرۆکی دەوڵەت و پاراستنی خەڵك لە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتەکانی هەستن. لە حاڵەتێکدا ئەگەر هاتوو دەقێکی دەستووری بڕیاری لەسەر دانانی ئەو جۆرە کاربەدەستانەی خوارەوەدا، ئەوا مافی بەرخوردکردن و بەگژاچوونەوەی دەسەڵات دەبێت لە یەزدانەوە بێت و خەڵك و خوا مافی ئەو کارەیان نییە. لە ناوەڕۆکی ئەو تیۆریایەی «کالڤن»ەوە تێدەگەین کە لە پراکسیس کردنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتیدا، چەند لایەنێك بەشدارن و هەریەك لەوانەشی بەشدارن پێویستە یەکتری بپارێزن و بەتەنگ یەکەوە بێن.

بیروبۆچوونی سیاسی «کالڤن» رووەو ئۆرستۆکراتیەت چوو، لەبری ئەوەی بەرەو پاشایەتی بڕوات. هاوکات ئەو تیۆریایەی ئەو دایڕشت بونیادێکی ناجێگیرو فشەڵی هەبوو، چونکە لەلایەك کالڤینیزم جەختی لەسەر بەدی و خراپی هەموو بەرخوردو بەگژاچوونەوەیەکی دەسەڵات دەکردەوە، لەلایەکی دیکەش پرانسیپی سەرەکی ئەوە بوو کە کڵێسا مافی جاڕدانی ئایینزای بێگەردو بێ غەلو غەشی هەیەو دەتوانێت بە پشت بەستن بە دەسەڵاتی دنیایی، کۆنترۆڵێکی سەرتاسەری بسەپێنێت. لێرەوە دەبوو کڵێسای کالڤینیزم لە دەوڵەتێکدا کە فەرمانڕەواکانی ڕێبازەکەی ناسەلمێنن و ڕێنوماییەکانی پەیڕەو ناکەن، دەستبەرداری ئەوە بێت گوێڕایەڵی کردنی فەرمانڕەوایان ئەرکەو دەبێت جێبەجێ بکرێت، بەڵکو لە بەرامبەردا دەبوو جەخت لەسەر مافی بەرخوردو بەگژاچوونەوەی دەسەڵاتداران بکاتەوە.

## پەراوێزو سەرچاوەکان:

١- د.علي عبدالمعطي محمد: الفكر السياسي الغربي– دار الجامعات المصرية، ص١٨٩.

2- Marcel Prelot et Georges Lescuyeer.Ibid.p.226

٣– جورج سباين: تطور الفكر السياسي– الكتاب الثالث، ص٥٠٠.

٤- جورج سباين: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩٩.

5- Marcel Prelot et Georges Lescuyeer.Histoire des idees Politiques

٦– جورج سباين: تطور الفكر السياسي– الكتاب الثالث،ص٥٠٢.

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠٢.

٨– د.علي عبدالمعطي محمد: الفكر السياسي الغربي- سەرچاوەی پێشوو،ص٢٠١.

## سەرچاوە:

الدكتور مهدي محفوظ: اتجاهات الفكر السياسي في العصر الحديث– المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت– الطبعة الثالثة، ٢٠٠٧.

پیتەر موولێر
لە فارسییەوە: مستەفا زاهیدی

# قوتابخانەی فرانكفۆرت:
# لە سەرەتاوە تا هابرماس

تئۆدۆر ئادۆرنۆ و ماكس هۆركهایمەر، دوو بیرمەند و كۆمەڵناسی نیو ماركسیستی ئاڵمانی، ساڵی ١٩٣٠ قوتابخانەی فرانكفۆرت و تیۆری رەخنەگرانەی دیالكتییان دامەزراند كە بە فەلسەفەی كۆمەڵایەتی رەخنەگرانەش ناوی دەركردوە، ئەوان بە هەوڵ و كۆششی خۆیان لە دامەزراوەی لێكۆڵینەوەی شاری فرانكفۆرت و ئەنجامی لێكۆڵینەوەكان و نووسینی بەرهەمە رەخنەییەكانیان (قوتابخانەی فرانكفۆرتیان) دامەزراند.

لە ماوەی دەسەڵاتدارێتی نازییەكاندا لە ئاڵمان ئەم دامەزراوەیە بە كردەوە گوێزرایەوە بۆ شاری ژنێڤ و دواتر نیۆیۆرك و لوس ئەنجلوس. بەڵام كاركردن لە سەر بونیادە فەلسەفییەكانی ئەم قوتابخانەیە، بەتایبەت تیۆری رەخنەگرانە هەر درێژەی هەبوو. لە راستییدا ناوی تیۆری رەخنە گرانە دەگەرێتەوە بۆ نووسینی گەڵاڵەدار و سیستماتیكی وتارێ بە ناوی « تیۆری نەریتی و تیۆری رەخنەگرانە» لە نووسینی ماكس هۆركهایمەر كە دواتر لە چوارچێوەی كتێبێكدا هەر بەم ناوە چاپ و بڵاوبۆوەو بە جۆرێ لە تەنیشت گرنگترین بەرهەمی فەلسەفی ئەم قوتابخانەیە، واتە «دیالەكتیكی رۆشنگەری» لە راستییدا وەك مانیفێستێكی سەرەتایی قوتابخانەی فرانكفۆرت ناوی دەركردوە. بیردۆزانی قوتابخانەی فرانكفۆرت، پێرەوكەری نەریتی فەلسەفی هێگل و لە هەندێ روانگەی لاوەكیدا پێرەوكەری كانتن. لە هەمان كاتدا خاڵی هاوبەشی سەرجەم ئەو روانگانەی بە قوتابخانەی فرانكفۆرت دەناسرێن، رەخنەگرتنە لە هەلومەرجی زاڵ و پێوەندییە كۆمەڵایەتییە باوەكان بوو وای لە بیردۆزانی ئەم قوتابخانەیە كرد، لە لقە جۆراوجۆرەكاندا و هەر كامەیان لە بوارێكی زانستی و فەلسەفیدا كە شارەزان، رەخنە لەم بارودۆخە بگرن.

لەم ناوەدا هۆركهایمەر دەیەویست، بە یارمەتی زانستی كۆمەڵایەتی ئەزموونی و

فەلسەفەی کۆمەڵایەتی، بەسەر ئەو قەیرانەدا زاڵ بێت کە مارکسیسم لە دەیەکانی ٢٠ و ٣٠ زایینی لە ئاڵمان تووشی ببوو. لە راستییدا یەکێك لە سەرەکیترین رەوانگەیەك ئەوە بوو کە پەچە لەسەر ئەو نادروستی و قەیران و کەمووکورییە کۆمەڵایەتییانە دابماڵێ کە ماوەیەك لە پشت ئوستووره و گوتارە ئاینییەکاندا خۆیان حەشار دابوو، بۆ ئەوەی بتوانێ بە یارمەتی ئەو زانستانەی ناوی لێ براو دامەزراندنی یاسای کۆمەڵایەتی نوێ و پێشکەش کردنی رێکاری زانستی، بە سەریاندا زاڵ بێت.

ئەو خاڵانەی کە بیرکردنەوەی قوتابخانەی فرانکفۆرتی لەسەر دامەزراوە دەکرێ بەم شێوەیە کورت بکەرێنەوە: عەقڵانییەتێ کە سەردەمانێك دەوری رۆشنگەری هەبوو، لە جیهانی مۆدێرندا گۆڕاوە بە جۆرێ عەقڵانییەتی ئامرازی و بە شوێن لەدەستچوونی رۆژ لە دوای رۆژی تاك بوون لە رەوتی بە پێشەیی بوونی کۆمەڵگادا، مرۆڤەکان لە جیهانی برۆکراسیدا بوون بە ئامرازگەلێك بۆ زاڵبوونی زانستی تەکنۆلۆژیا بەسەر سروشتدا.

بە پێچەوانەی رەوتگەلێکی وەك پۆزەتیڤیسم، فەلسەفەی راڤەیی و بۆچوونی پۆپەری، ئەوەی لە شێوازی فەلسەفەی ئەم قوتابخانەیەدا گرنگی هەیە، هەمان چەمکی دیالەکتیکە کە یەکێکە لە خاڵە گرنگەکانی پێوەندی ئەم قوتابخانەیە لەگەڵ باوکی دیالەکتیکی مۆدێرن، واتە هێگل. لە راستییدا ئێمە لە بەرهەمی بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا لەوانە، ئادۆرنۆ، مارکۆزە، هۆرکهایمەر، فرۆم و تەنانەت هابرماس، گەشەپێدان، راڤە و دۆزینەوەی پێوەندی نێوان مارکس و دەروونشیکاری فرۆید دەبینین و هەر ئەم شتە خاڵی ناکۆکی نێوان ئەم قوتابخانەیەیە لەگەڵ مارکسیسمی لینین لە رووسیا.

لێرەشدا لێکدانەوەی رەخنەگرانەی کۆمەڵگا بەم بەڵگاندنەی کە فەلسەفە دەبێ مانایەکی زانستی هەبێت بۆ کۆمەڵگا، گرێ دەدرێتەوە، هەڵبەت بەو هیوایەی کە بەو رەخنانەی کە دەگیردرێ، لە داهاتوودا هەڵسووکەوتی کۆمەڵایەتی باشتر زاڵ بێت. هەر لێرەدا جیاوازییەکی تری قوتابخانەی فرانکفۆرت لەگەڵ رەوتگەلێکی وەك لۆژیك گەرایی و فەلسەفەی زمان و هەروەها جیاوازی بۆچوون لەگەڵ کەسانێکدا کە لەسەر ئەو باوەڕەن چاکبوونی کۆمەڵگا شتێکی بێ ئەگەرە یان لە دەرەوەی سەرێتیە فەلسەفیەکانەوەیە ( نیچە و شۆپنهاوەر) دەردەکەوێ.

هەڵبەت ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر، لە کۆتاییەکانی نووسینی بەرهەمەکانی خۆیاندا گۆڕانی پۆزەتیڤی کۆمەڵگایان بە شتێکی بێ ئەگەر دەزانی. ئادۆرنۆ بە گومانەوە لە بابەتی چاوەڕوانی کردنی گۆڕانی پۆزەتیڤی روانیوەو تەنانەت نووسەرانی دیالەکتیکی رۆشنگەر زۆرجار دژ بەوە بوون بەڵگاندنە فەلسەڤی و زانستییەکانیان شتێکی هەمەگیر و گشت پەسەند بێت.

بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرت لە ناوەڕاستی دەیەی ٣٠ەوە، سیستەمی سیاسی ستالینیان مەحکوم کرد و هیچ پێشکەوتنێکیان بۆ خەڵك لەو سیستەمەدا نەدی. هەر ئەم جیاوازییە، ئەوانی بە شێوەیەکی پۆزەتیڤ لە کەسانێکی وەك ئێرنێست بلۆخ و جۆرج لۆکاچ جیا دەکردەوە کە یەکیەتی سۆڤیەتیان بە هەند وەردەگرت . تیۆری رەخنەگرانە کە بێگومان دەسکەوتی قوتابخانەی فرانکفۆرت بووە، بوارگەلێکی وەك بونیادە ئابووری، کۆمەڵایەتی، گەشەی تاك بوون و بوارە کەلتوورییەکان دەداتە بەر باس و لێکدانەوە. هەڵبەت لێرەدا بوارگەلێك وەك سروشتی مرۆڤ، کە سەرچاوەی بەشێکی زۆر لە هەڵسەنگاندنە نادروستەکان بە شتێکی ریز پەڕ دەمێنێتەوە.

بزووتنەوە خوێندکارییەکانی کۆتاییەکانی دەیەی ٦٠ لە ئاڵمان تا رادەیەك کەڵکی لە تیۆرییەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت وەردەگرت. هەڵبەت ئادۆرنۆ و هۆرکایمەر هاوڕا نەبوون لەگەڵ ئەو خوێندکارە چەپ گەرایانەی کە لایەنگری شێوەی «پرۆسەی شۆڕشگێڕی» بوون و لە سەر ئەو باوەڕە بوون ئەم وتەزایانە لە «تیۆری رەخنەگرانە»ی ئەم دوو کەسە هەڵهێنجاوە و ئادۆرنۆ لە یەکێك لە وتووێژەکانی خۆیدا پێوەندی راستەوخۆی ئەم دوو چەمکەی رەت کردەوە. لە کۆتاییەکانی دەیەی ٦٠دا ئادۆرنۆ دژ بە جۆرێ خۆ بەزل زانین و هۆرکهایمەر دژ بە جۆرێ رەشبینی کەلتووریی هەڵوێستیان گرت و ئەمە هابرماس بوو، لەبەر پەیوەندیە رۆحییەکەی خۆی لەگەڵ

داوای خوێندکاراندا، کەوتە وتووێژ و دیالۆگ.

لەگەڵ شێوەکانی بیرکردنەوەی جیاوازی هۆرکهایمەر و ئادۆرنۆ، دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانەیە، هەردەم جیاوازی سروشتی، پێویست و هەڵبەت بەرچاو لە نێوان باوەڕی ئەندامانی تری قوتابخانەی فرانکفۆرتدا بوونی بووە. بۆ وێنە:

واڵتر بنیامین (١٨٩٢-١٩٤٠) فەیلەسوف و ئەدەبیاتناسی بە ڕەسەن جوولەکەش یەکێك لە فرانکفۆرتییەکان بوو کە لە کاتی هەڵهاتن لەدەست نازییەکان خۆی کوشت. ئەو نوێنەری جۆرێ فەلسەفەی دیالەکتیکی – ماتریالیستی بوو کە لەگەڵ چەمکی مەسیحییەتی باوەڕ بە مێژوو پەیوەندی هەبوو.

ئەریش فرۆم (١٩٠٠-١٩٨٠) دەروونشیکار و ئەمریکایی لە دوو دەیەی سەرەتای ژیانی پیشەیی خۆیدا سەر بە قوتابخانەی فرانکفۆرت بوو.

لێئۆ لوونتاڵ (١٩٠٠-١٩٩٣) کۆمەڵناسی ئەمریکایی-ئەڵمانیش لەم گرووپە بوو و لە فرانکفۆرت لەدایك بوو. ئەویش دوای بە دەسەڵات گەیشتنی نازییەکان بەرەو ئەمریکا هەڵهات و لە زانکۆی برێکلی و کالیفۆرنیا خەریکی وانە وتنەوە بوو.

فریدریش پوولاك (١٨٩٤-١٩٧٠) ئابووری ناس و کۆمەڵناسی ئەڵمانیش بە یەکێك لە نوێنەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەزانرێ. پوولاك لە زانکۆی فرانکفۆرت وانەی ئابووری دەوتەوە.

هێربێرت مارکۆزە(١٨٩٨-١٩٧٩) یەکێکی تر بوو لە نوێنەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت کە لە نووسینەکانی خۆیدا دیالەکتیکی هێگلی لەگەڵ فەلسەفەی مارکس و تیۆری دیالەکتیکی مێژوویی و هەروەها وانەکانی فرۆید سەبارەت بە حەزی سێکسی گرێی دابۆوە. ئەو بە بانگەوازکردن بۆ وەستانەوەیەکی بنەڕەتی دژ بە دۆخی هەبوو، بوو بە یەکێك لە رابەرە گرنگەکانی بزووتنەوەی چەپگەرای خوێندکاری لە دەیەی ٦٠ی زایینی.

یۆرگن هابرماس (١٩٢٩) ئەویش یەکێکە لە بیرمەندانی دیار و دواین و گرنگترین نوێنەری زیندووی ئەم قوتابخانەیە کە هەڵبەت بەڕای کۆمەڵێك لە کارناسانی فەلسەفە، هابرماس تەنها لە باری مێژووییەوە سەر بە قوتابخانەی فرانکفۆرتە و لەم ماوەدا لە ئامۆژە سەرەکییەکانی ئەم قوتابخانەیە دوورکەوتۆتەوەو سەربەخۆیە. ئەم گرووپە لەسەر ئەو باوەڕەن بەراوردکردنی هابرماس و ئادۆرنۆ وەك ئەوە وایە بڵێین ئەرەستوو، کە بۆ چەندین ساڵ قوتابی ئەفلاتوون بوو، کەسێکی ئەفلاتوونییە!

هەرچەن سەردەمی درەوشانەوەی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەگەڕێتەوە بۆ دەیەکانی ٦٠،٧٠، و ٨٠ی سەدەی بیستەم، لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٩٠وە ئەم قوتابخانەیە سەردەمی شکستی خۆی تێپەڕ دەکات، بەڵام دەبێ دەسکەوتەکانی ئەم قوتابخانەیە بە هەند وەربگیردرێن و بەهایان پێ بدرێت. ئەنجامی زۆر لە لێکدانەوەکانی ئەم قوتابخانەیە لەبارەی بۆرژوازی مۆدێرن، کۆمەڵگای مۆدێرن و مرۆڤی ئەمرۆیی نەك تەنها لای چەپەکان، بەڵکوو بۆ لیبراڵەکان و پاوانخوازانیش گشتی و هەمەگیر بووەو لە زۆر وردەکاری کۆمەڵناسی و دەروونناسیدا ناتوانین بە ئاسانی چاو لە ئاست ئەنجامە زانستییەکانی ئەم قوتابخانەیە بنوقێنین و باسیان لێوە نەکەین. هاودەردی کردنێك کە ئەنجامی شۆڕشێکی جێگای ڕێز بوو دژ بە فاشیزم و دواتر هەڵوومەرجی کۆمەڵایەتی تراژیك لە دەیەکانی ٤٠ و ٥٠ لە ئەڵمانیا، یەکێکی تر لە خاڵە بەرچاوەکانی قوتابخانەیەکە کە زۆربەی ئەندامانیان سەر بە توێژی دەوڵەمەندی کۆمەڵگا بوون !

لە لایەکی ترەوە دەسکەوتە دەروونناسی و کۆمەڵناسیەکانی ئەم قوتابخانەیە کە جۆرێ پەچە داماڵینە لە فریوکارییە دەمامکاویەکانی کۆمەڵگا، یارمەتیمان دەدات بۆ وەستانەوە دژ بە فریوکارییە شاراوەکانی کۆمەڵگا، هەر چەن ئەمرۆکە ڕەوتی زاڵی دەروونناسی تەنانەت لە بەشێك لە وڵاتە ئەورووپییەکان، ئەو قوتابخانانەن کە دەروونشیکارە ئەمریکییەکان خەریکی لێکدانەوەو پەرەپێدانیانن.

هاشم ساڵح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

# شانشینی عەرەبی سعودییە لە ئاوێنەی ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوادا

## بەشی سێیەم و کۆتایی

«داڤید ریگۆلی رۆز» یەکێکە لەو توێژەرە فەرەنسییانەی پسپۆڕە لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتیو شانشینی عەرەبی سعودییە بەتایبەتی، مامۆستای زانکۆیەو ڕاوێژکاری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانە. پێشتر دوو کتێبی لەسەر سعودییە بڵاوکردۆتەوە: یەکەمیان ساڵی ١٩٨١ بە ناونیشانی (عیملاقێك لە لم، خاڵە بەهێزو لاوازەکانی شانشینی عەرەبی سعودییە). دووەمیان ساڵی ٢٠٠٥ بە ناونیشانی (جوگرافیای سیاسی شانشینی عەرەبی سعودییە)، ئێمە بۆ خستنەڕووی بیروڕاکانی نوسەر سەبارەت بەم بابەتە، پشت بەم کتێبەی دووەمیان دەبەستین.

دانەر دەڵێ: ماوەیەکی دوورودرێژو بە درێژایی جەنگی سارد، سعودییە بە وڵاتێکی میانڕەوو هاوپەیمانێکی نەوتی گرنگی جیهانی ئازاد دادەنرا. سعودییە لە تێڕوانینی میللی ڕۆئاوادا بریتی بوو لە ڕوبارێك لمو لە ژێرەوەیدا ڕوبارێك لە نەوتی شاردۆتەوە. لەناکاو لێدانەکەی ١١ سێپتێمبەر ڕودەداو هەمو شتێ گۆرانی بەسەردادێت. لەپرێکدا سعودییە دوای ئەوەی دەوڵەتێکی دۆست بوو، دەبێ بە دەوڵەتێکی دوژمنو ڕای گشتی ڕۆژئاوا بەشێوەیەکی تەواو جیاواز وێنای دەکات، وەك دەوڵەتێکی تاریکبینی دەمارگیری مەترسیدار تەماشای دەکەن. سعودییە لە تێڕوانینی جەماوەری ڕۆژئاوادا دەبێتە وڵاتی «بن لادن»و لانکەی دەمارگیری ئیسلامیو جیهاد. دەبێتە ئەو وڵاتەی قوتابخانەو خوێندنگاو زانکۆکانی سەرقاڵی ئەوەن ڕقو کینە لە دژی ڕۆژئاواو شارستانییەتە مۆدێرنەکەی فێری

خەڵکی بکەن. تا وایلێهات هەموو ڕۆژئاوا لەو بڕوایەدا بن سەرجەم دانیشتوانی شانشینی عەرەبی سعودییە تیرۆرست بن!

«داڤید ریگۆلی رۆز» پێیوایە ئەم وێنەیە کە زیادەڕەوی تێدایە، بەشێك لە ڕاستی لەخۆگرتوو. سەبارەت بە فاکتەرە گرنگەکانی جیۆپۆڵەتیك یاخود جوگرافیای سیاسی سعودییە، دانەر لەو بڕوایەدایە ئەو فاکتەرانە لە دوو وشەدا کورتدەکرێنەوە: مەککەو نەوت. گەر ئەو دوو شتە نەبونایە، ئەوا سعودییە وڵاتێکی تابڵێی پەراوێزخراو دەبوو، هێزە گەورەکان هەرگیز ئاوڕیان لێنەدەدایەوە. هەروەها دانەر پێیوایە مێژوی شانشینی سعودییە کورتدەکرێتەوە بۆ چیرۆکی ئەو پەیمانە تیۆلۆژیا سیاسییەی لە سەدەی هەژدەهەمو لەنێوان هەردوو بنەماڵەی «ئال سعود»و «ئال عەبدولوەهاب»دا مۆرکرا. بەپێی ئەو پەیمانە ستراتیجییە بنەماڵەی «ئال سعود» لەسەرزەمینی شانشیندا، بێجگە لە مەزهەبی وەهابی، ئەرکی ڕیشەکێشکردنو لەناوبردنی هەموو مەزهەبەکانی تر یاخود فیکرەکانی دیکە دەگرنە ئەستۆ. لەهەمانکاتدا بنەماڵەی وەهابییەکانیش ڕەوایەتی ئاینی دەبەخشنە حوکمرانی «ئال سعود»و ملکەچکردنی موسڵمانەکانیان بۆ زامندەکەن. ئەم هاوپەیمانەتییەی نێوان ئەم دوو بنەماڵەیە، تاکو ئێستاش حوکمی سعودییە دەکات، گەرچی دوای ١١ سێپتێمبەر توشی لەرزینێکی گەورە هات.

«داڤید ریگۆلی» پێیوایە کێشەی سعودییە بریتییە لە باڵادەستی مەزهەبی حەنبەلی کە مەزهەبێکی توندڕەوی بە زەبروزەنگەو هەرگیز ئیعتراف بەو بیرۆکەیە ناکەن مرۆڤ وەك کەسێکی تاك ڕەخنە بگرێ، چونکە مرۆڤ لە تێروانینی ئەواندا بە سروشتی خۆی مرۆڤێکی ناتەواوەو گەر دەستبخاتە ناو پەیامە پاکژەکەی سەرەتای ئیسلام یاخود گەر بیەوێ لێکیبداتەوە، ئەوا ئەو پەیامە پاکژە دەشێوێنێت. لەبەر ئەوە حەنبەلیەکان هەمو دەستێوەردانێکی مرۆڤیان بۆ لێکدانەوەی دەق یاخود بۆ سەرلەنوێ خوێندنەوەی ڕەتدەکردەوە. لێرەوە لەلای حەنبەلیەکان خوێندنەوەی حەرفی باڵادەستە، بە پێچەوانەی موعتەزیلەی دوژمنیان کە لەنێوان مانای حەرفی قورئانو مانا مەجازییەکەیدا جیاوازیدەکەنو زۆرجار بۆ لێکدانەوەی دەق عەقڵ بەکاردەهێنن. ئاشکرایە وەهابیەت درێژکراوەی حەنبەلییە، بەڵام بەشێوەیەکی توندتر. هەروەها ئاشکرایە مەزهەبی حەنبەلی گومانێکی زۆر لە عەقڵ دەکاتو ڕەئی شەخسی ڕەتدەکاتەوە. بە پێچەوانەی مەزهەبی حەنەفی یاخود شافعی.

ئەوەی تایبەتە بە پەیوەندی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو سعودییە، دانەر پێیوایە گومانکردنی هەردولا لەیەکتر، سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش لێدانەکەی ١١ سێپتێمبەر، گەرچی ئەو دوانە لە ڕوکەشدا یان بە ڕەسمی هاوپەیمانی یەکترین. دوای ئەو تەقینەوانەی لە نێوان ساڵانی ١٩٩٥-١٩٩٦ لە سعودییەو دژ بە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا ڕوویاندا، ئیدارەی «کلینتۆن» داوای لە ناوەندی هەواڵگری ئەمریکا کرد، سعودییە بخەنەژێر چاودێریکردنێکی توندەوە، پێشتر ئەم حاڵەتی چاودێریکردنە زۆر بەدەگمەن خراوەتە سەر وڵاتێکی هاوپەیمانی ئەمریکا. چاودێریکردنی لەوشێوەیە خرابووە سەر دەوڵەتی عێراقی بەعس یاخود کۆریای باکور یان ئێرانی فێندەمێنتالیزم، تەنانەت خرابوەسەر ڕوسیای دوای کۆمۆنیستو چینی کۆمۆنیست. ئەو چاودێریکردنە پێیدەوترا لێکۆڵینەوە لە ئامانجێکی ستراتیجی مەترسیدار. ئەوە بەڵگەی ئەوەبوو تادەهات گومان لە دەسەڵاتدارانی سعودیە دەکرا یان لانی کەم مانای نەبونی متمانەی دەگەیاند.

«داڤید ریگۆلی» لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێو دەڵێ: دوای گەشتنی بنەماڵەی «ئال بۆش» بە کورسی دەسەڵات کە بەشێوەیەکی تۆکمە پەیوەستن بە (لۆبی نەوت)و بنەماڵەی «ئال سعود»ەوە، خەڵکی پێیان وابوو زەمەنی گومانکردن لەیەکتر لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا بەسەردەچێو پەیوەندییە تۆکمەو پتەوەکانی جاران دەگەڕێتەوە. بە دروستی تاکو لێدانەکەی ١١ سێپتێمبەر ئەو پەیوەندییە تۆکمەیە لەئارادابووە. دوای ئەو لێدانە پەیوەندییەکان بەشێوەیەکی ترسناك تێکچوو، ئیدی ئیدارەی ئەمریکی زۆر بەجدیی بیریان لە گۆڕینی

ڕژێمی سعودییه کردەوە، بەڵام دواتر لەترسی ئەوەی نەبادا ڕژێمێکی تونرەوترو دەمارگیرتر لەوەی ئێستا بێتە سەر حوکم، پەشیمان بونەوە. چونکە بەدیلی ئەم ڕژێمەی ئێستا تەنها ڕژێمێکی سەلەفی نزیك لە «بن لادن»و قاعیدەیە. بەڵام لەو بەروارەوە، واتە لە ١١ سێپتێمبەرەوە، لەناو خودی سعودییەو لەنێوان بنەماڵەی حوکمڕانو پیاوانی ئاینیدا، ململانێیەکی ڕاستەقینە هاتەئارا.

تویژەر «جۆرج جەودەت دوالیبی» بەشێوەیەکی وردو دوورودرێژ باس لەو ململانێیە دەکات.

ئایا ژماردنی پێچەوانە بۆ ئاوابونی وەهابییەت لە سعودییە دەستیپێکردووە؟

## تیۆرەکەی «جۆرج جەودەت دوالیبی».

بەم دوایانە لە پاریسو لە بڵاوکراوەکانی (بۆبلیبۆك) کتێبێکی تویژەر «جۆرج جەودەت دوالیبی» بڵاوکراوەتەوە، لەم کتێبەداو لە میانەی کۆمەڵێ شیکردنەوەی زۆر وردو چڕەوە، تێبینی ئەوە دەکەین کاتی ئاوابونی وەهابییەت نزیك بوبێتەوە. دانەر پێیوایە ناکۆکی نێوان «ئال سعود»و «ئال عەبدوڵڵا» یاخود نێوان ئەوەی یەکەمیانو عەقیدەی وەهابی، هەر لە سەرەتاوەو لەو پەیمانە سەرەکییەی سەدەی هەژدەهەم لەنێوان ئەو دوو لایەنەدا بەسترا، هەبووە. بۆچی؟ چونکە وەهابیەت دەیەوێ کۆمەڵگا بگەڕێنێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی زاینی، لەمەشدا گوێ ناداتە ئەو هەمو دەستکەوتو پێشکەوتنانەی بەدرێژایی ١٣ سەدە هاتونەتە ئاراوە. بەڵام دەوڵەتی سعودییە گەر بیەوێ بەردەوامبێتو بە زیندویی بمێنێتەوە، ناچارە ئەو پێشکەوتنانەی بەدەستیهێناوە لەبەرچاوبگرێ. کەواتە ئەسڵی ناکۆکیو پێکدادانی نێوان ئەم دوو لایەنە لێرەدایە.

لێرەوە وەك دەوترێ هەر لەسەرەتاوە کرم لە بەروبومەکەی داوە، پێکدادانی نێوان ئەم دوو لایەنە شتێکی چاوەڕوانکراوبوو، زیاد لە جارێکیش پێکدادان لەنێوانیاندا ڕویداوە. دەکرێ بڵێین ئەو پێکدادانە سێ جار زۆر بە توندی ڕویداوە، یەکەمجار لە ساڵی ١٩٢٩-١٩٣٠بوو، کاتێ وەهابییە لەخۆباییەکان بەسەرۆکایەتی «فەیسەڵ ئەلداویش» دژ بە شا «عەبدولعەزیز» یاخیبوون، ئەویش ناچاربوو بەیارمەتی فرۆکەکانی ئینگلیز زۆر بەتوندی سەرکوتیان بکات. گەر شا «عەبدولعەزیز» ئەوەی نەکردایە، ئەوا نەیدەتوانی دوای ئەو مێژووە بە دوو ساڵ دەوڵەتەکەی دابمەزرێنێ. جاری دووەم ساڵی ١٩٧٩ ڕویدا، کاتێ «جەهیمان ئەلعەتیبی»و «محەمەد ئەلقحتانی» لە هێرشێکدا کە سەرنجی هەمو جیهانی بەلایخۆیدا ڕاکێشا، دەستیانگرت بەسەر (المسجد الحرام) لە مەککە. دەوڵەت نەیتوانی ئەو هێرشە لەناوببات، تەنها ئەو کاتە نەبێ پەنایبردە بەر هێزە نێودەوڵەتییەکان بەتایبەتی فەرەنسا. جاری سێیەم ئەوەی ئێستایە کە لە دوای ١١ سێپتێمبەرەوە لەنێوان هێزەکانی دەوڵەتو تاقمەکەی «بن لادن» کە نوێنەری ڕاستەوخۆی نەوەی «فەیسەڵ ئەلداویش»و وەهابییە توندڕەوەکانن، دەستیپێکردووە. لەبەر ئەم هۆیەیە «جۆرج جەودەت دوالیبی»ی تویژەر ئەم ناونیشانەی خوارەوەی بۆ ئەو کتێبەی داناوە کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێکردووە: (مونافەسەی نێوان پیاوانی ئاینیو بنەماڵەی حوکمڕان لە شانشینی عەرەبی سعودییە).

دانەر دەڵێ شا «عەبدولعەزیز»ی دامەزرێنەر، بۆ ئەوەی پیاوانی ئاینی ڕازی بکات داهێنانە تازەکانی وەك تەلەگرافو ئۆتۆمۆبێلو تەلەفۆنو هەندێ ئامێری دیکە بێنێتە سعودییەوە، ناچاربوو ئەم پاساو بڕوبیانوانەی خوارەوە بەکاربێنێت. سەبارەت بە تەلەفۆن پێی وتن یارمەتی گواستنەوەی خوێندنەوەی قورئان دەدات بۆ مەسافەیەکی دوورودێژ. ئەوکات پیاوانی ئاینی پێی ڕازیبوون. هەمان ئەم سیناریۆیە لە سەردەمی نەوەکانی شا «عەبدولعەزیز» سەبارەت بە ڕادیۆو تەلەفزیۆنو ئەنتەرنێتو مۆبایل..هتد دووبارەبووەوە. هەمو جارێك بۆ ڕازیکردنی پیاوانی ئاینی دەبوا بیانویەك بهێنرێتەوە بەوەی ئەو شتانە کاری شەیتان نییە. تەنانەت پیاوانی ئاینی لەناونانی وڵات بە شانشینی عەرەبی سعودییە، بەو ئاراستەی شا «عەبدولعەزیز»ڕازینەبونو دەیانوت لە ئیسلامدا

شتێك نییە ناوی شانشینو ناوی شا بێت، ئەوەی هەیە ئیمارەتە یان خەلیفەیە یاخود ئیمامە یان شێخە. وەلێ شا «عەدبولعەزیز» دواجار توانی ڕەئی خۆی بسەپێنێ.

«جۆرج جەودەت دوالیبی» پێیوایە ڕوبەڕوبونەوەی ئێستای نێوان هەردوو لایەنەکە، لە هەمو ڕوبەڕوبونەوەکانی پێشتر مەترسیدارترەو چارەنوسی سعودییەو گەلەکەی لەسەر ئەو ڕوبەڕوبونەوەیە ڕاوەستاوە. لەبەر ئەم هۆیەیە خودی شا «عەبدوڵڵا» دوای ئەوەی هەستیکرد ڕۆژئاوا تەواو تورەبووە، بۆیە ئەمجارەیان بۆخۆی بەشدارە لەو جەنگەی دوای ١١ سێپتێمبەر هاتووەتەئارا. ئەو لەبەر ئەوەی هەیبەتو شانوشکۆیەکی گەورەی لای پیاوانی ئاینی هەیە، بۆیە هەر بە تەنها ئەویش لەتوانایدا هەبوو ڕەخنەیان لێبگرێو شتێکی ئاوای پێوتن: پێویستە لەسەرتان میانڕەوبن، چونکە ئێوە ئەمڕۆ بونەتە ئامانجی هەمو ئەوانەی پەلاماری ئیسلام دەدەن.. لەسەرتانە ئاگاداری قسەکانتان بنو هەر وشەیەك، هەر پەرەگرافێك پێش ئەوەی دەریببڕن، بەباشی بیری لێبکەنەوەو هەڵیسەنگێنن.. ئێوە چاودێری دەکرێنو ئێمە لە حاڵەتێکی سەختی ئەوتۆداین، پێویستی بە وریاییو حیکمەتێکی زۆرە..

دەسەڵاتدارانی سعودییە تەنها هەر بەوەوە نەوەستان، بەڵکو بۆ جڵەوکردنی ڕەگەزە زۆر توندڕەوەکان، هەندێ بڕیاریان دەرکرد، لەوانە ئەو کۆمەڵە خێرخوازە ئیسلامیانەی کۆمەكو هاوکاری تیرۆریان دەکرد، خرانە ژێر چاودێرییەوە. لە هەمانکاتدا شازادە «سعود فەیسەڵ» لە ڕاگەیاندنێکدا وتی: ئێمە ناتوانین پارەی زەکات قەدەغەبکەین، چونکە ئەوە فەریزەیەکی ئاینییەو شەریعەت ڕێگەی پێداوە، لێرەوە ئێمە نازانین گەر بڕێ لە پارەی زەکات چوبێتە گیرفانی قاعیدەوە یان نا؟ لە هەمان ئەو کاتوساتەدا دەسەڵات نزیکەی دوو هەزار مامۆستای توندڕەوی خانەنشین کرد. هەروەها ڕێگەی نەدا دەیان ئیمامی توندڕەو لە مزگەوتەکاندا وتاری هەینی بخوێننەوە. شازادە «نایف کوڕی عەبدولعەزیز» هێرشی کردە سەر ئیخوان موسلمینو بەوە تۆمەتباری کردن کە ئەوان هۆکاری هەمو کێشەو گیروگرفتەکانی جیهانی عەرەبینو وتی: دوای ئەوەی «عەبدولناسر» لە میسر دەریکردن، ئێمە دەستی یارمەتیمان بۆ درێژکردن، کەچی ئەوان لەدژی ئێمە هەڵگەڕانەوە. ئەو دەستەیان گەست کە یارمەتی دابوون. لێرەوە ئەو پەندەیان بەسەردا دەسەپێ کە دەڵێ: لەو کەسە بترسێ چاکەت لەگەڵدا کردووە. شێخ «عەبدولمحسن ئەلعبیکان» کە سەرەتا شێخێکی توندڕەوبوو، پاشان تۆبە دەکاتو لە دەسەڵات نزیکدەبێتەوە، ئیعتراف دەکاتو دەڵێ: ئاقاری ڕابونی ئیسلامی لە سعودییە، لە سەرەتادا ڕابونێکی سیاسی نەبوو، بەڵام ئیخوان موسلمین کە لە دەرەوە هاتن، ئەوان بوون ئەو بەرگی سیاسەتەیان کردەبەرو سعودییەکانیان خراپ کرد.

دواتر «جۆرج جەودەت دوالیبی» لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەیدا دەڵێ: لە واقیعدا فێندەمێنتالیزمی سعودی لەژێر فشاری ڕوداوەکاندا بۆ دووبەش دابەشبوو: بەشێکیان هەر بەتوندڕەویو پاشکۆی قاعیدە ماونەتەوە، بەشەکەی دیکەیان بونەتە میانڕەو، ڕەوتێکی مامناوەندیان پێکهێناوەو لەلایەن دەسەڵاتەوەو بەپێی ئەم ئایەتەی خوارەوەی قورئان پشتگیریو کۆمەك دەکرێن: (وكذلك جعلناكم امة وسطا). دواتر ڕەوتی سێیەم سەریهەڵدا کە ڕەوتێکی تازەگەرترو نەرمترەو بریتین لە ڕەوتی موسڵمانە لیبراڵەکان کە لە ڕۆژنامەکانی سعودییەدا وەك ڕۆژنامەی (الوطن)، (الرياض)، (الجزيرة)، (الشرق الاوسط) بەڕوونو ئاشکرایی ئیدانەی توندڕەوی کوێرانە دەکەن. دیارترین ئەو ڕۆشنبیرانە بریتین لە «مشاری ئەلزایدی، مەنسور ئەلنقیدان، خالد ئەلغانمی، تورکی ئەلحمد، عەبدوڵڵا ئەلمەتێری»و زۆرێکی دیکە، ئەو ڕۆشنبیرانە زۆر بەتوندی ڕەخنەیان لە ڕەوتی وەهابی گرت، چونکە ئەو ڕەوتە پەنابردن بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی دژ بە خەڵکانی غەیرە موسڵمان، بگرە دژ بە خودی موسڵمانەکان حەڵاڵکرد.

لێرەوە ناکرێ سعودییە وەك یەك بارستایی کەڕو لاڵو کوێرو توندەڕەو تەماشابکەین، وەك ئەوەی میدیاکانی ڕاگەیاندن لە ڕۆژئاوا، بەتایبەتی دوای ١١ سێپتێمبەر دەیکەن. سعودییە پڕە لە ڕەوتی ناکۆكو دژبەیەك. وەلێ ئەو

قسەیە ڕاستە کە دەڵێ ڕەوتی وەهابی تاکو ئێستاش بەهێزترین ڕەوتەو بەهۆی دەسەڵاتو توندوتیژییەکەیەوە هەموان لێی دەترسن. ئێمە ئەمە دەڵێین گەرچی هەندێ لە ڕۆشنبیران هەنوکە سڵ لەوەناکەنەوە ڕەخنەی لێبگرن، دەکرێ بۆ نمونە (خالد ئەلغانمی) بێنینەوە کە پێشتر ڕۆشنبیرێکی توندڕەوبووە، بەڵام لە هەڵوێستەکانی پێشوتری خۆی پاشگەزبووەتەوەو بووە بە ڕۆشنبیرێکی ڕیفۆرمخوازی ڕۆشنفکر. کار گەشتە ئەو ئاستەی ئەم ڕۆشنبیرە بە ڕاشکاوی ڕەخنە لە ڕێنماییەکانی «ابن تیمیە» بگرێ، ئاشکرایە ئەو ڕێنماییانە بنەمای عەقیدەی وەهابییەت پێکدەهێنێت. هەر ئەم ڕەخنەگرتنەشە ڕۆشنبیرانی وەك «مەشاری ئەلزایدی»، «عەبدوڵلا ئەلمەتێری»، «تورکی ئەلحمد»، «جەمال خاشقچی»و زۆرێك لە ڕۆشنبیرانی ڕۆشنفکری دیکە، پێیهەڵدەستن.

پاشان توێژەری فەرەنسی بەردەوام دەبێو دەڵێ: هەندێ مژدەی دیکە لەناو شانشینی عەرەبی سعودییەوە دەبیستین، لەوانە لەڕێگەی فەرمانێکی شا «عەبدوڵلا»وە، دەرگاکانی گفتوگۆی نیشتیمانی کراونەتەوە. بۆ یەکەمجارە هەمو پێکهاتەکانی کۆمەڵگای سعودی لەوانە شیعەو ئیسماعیلیو سۆفی، لەژێر یەك بنمیچدا کۆدەبنەوە، تاکو گفتوگۆ دەربارەی کێشە چارەنوسسازەکانی کۆمەڵگا بکەن. هەروەها بۆ یەکەمجارە کۆبونەوەی (عەسیر) بۆ دیالۆگی نیشتیمانی داوای کرد وشەی (ئەوی تر) یان غەیرە موسڵمان، جێگەی وشەی کافر لە وتاری ئاینی سعودیو لە گوتاری ڕاگەیاندنو ڕۆشنبیریو پرۆگرامەکانی خوێندن..هتد بگرێتەوە. بۆ یەکەمجارە شیعە دەوێرن لە سێبەر بێنەدەرەوەو داوای مافی هاوڵاتیبوون بکەن. بۆ یەکەمجارە ئافرەت ناسنامەی تایبەت بەخۆی بدرێتێ. بۆ یەکەمجارە داوای گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندن دەکرێو سوکایەتیو قسەپێوتن بە جوولەکەو مەسیحییەکانو بگرە بە موسڵمانانی شیعە لە پرۆگرامەکانی خوێندندا نەمێنێو لابرێن. لێرەوە هەندێ شت هەیە لە کۆمەڵگای سعودیدا دەستی کردووە بە جووڵە.. هەندێ شت لەقبووە، هەندێ ژان هەیە.

بەڵام ئەو قسەیەش ڕاستە کە دەڵێ لەگەڵ ئەو هەموو دەستکەوتو گەشەکردنانەدا، هێشتا ترسێك لە ئایندە هەیە. هۆکارەکەشی بەپێی بۆچونی توێژەری فەرەنسی دەگەڕێتەوە بۆ ئەمەی خوارەوە: ناکرێ ئەوەی عەقیدەی وەهابی لەماوەی حەفتا ساڵدا چاندویەتی، بە نوکە قەڵەمێ یاخود لەنێوان شەو ڕۆژێکدا بسڕێتەوە. کێشە گەورەکەی سعودییە ئالێرەدایە. نە کۆنگرەو کۆڕوکۆبونەوەکانو نە یاسا تازەکان کە بە ئاراستەیەکی ڕاستو دروست دەچنەپێشێ، تەنانەت نە کتێبو نە هەڵمەتی هوشیارکردنەوەو نە پڕوپاگەندە ڕێکخراوەکان، ناتوانن ئەو بیروڕا توندڕەوانەی بەدرێژایی چەندین دەیەیە، ئەمە گەر نەڵێین چەندین سەدەیە، وەك حەقیقەتێکی ڕەها لەناو دڵو دەروونەکاندا چێنراون، دەریانبکێشێت. لێرەوە کێشەکە لە گۆڕینی ئەو عەقڵیەتە چەقبەستووەیە کە هەمو گۆڕانێك ڕەتدەکاتەوەو بە کوفر یان بە دەرچونو لادان لە عەقیدەی دادەنێ. ئێمە ئەمە دەڵێینو دەزانین جوڵاندنی شاخەکان لە گۆڕینی عەقڵیەتەکان ئاسانترە.

ئاشکرایە «جۆرج دۆبی» کە یەکێکە لە گەورە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی مێژویی لە فەرەنسا، دەڵێ: لەوانەیە واقعیی مادیی لە دەوروبەرت بگۆڕدرێت، بەڵام عەقڵیەتت نەگۆڕدرێ. هەمیشە گۆڕینی عەقڵیەتەکان زۆر لەسەرخۆیەو پێویستی بە ماوەیەکی دوورودرێژە... ئەمەش پێچەوانەی تێزە ڕوکەشەکەی «مارکس»یزمە کە دەڵێ بۆ ئەوەی سەرخانی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بگۆڕدرێ. هێندە بەسە ژێرخانی کۆمەڵگا هەڵگەڕێنینەوە. ئەزمون سەلماندی مەسەلەکان زۆر لەوە ئاڵۆزترن. ژێرخانی کۆمەڵگای سعودییە لەم ساڵانەی دوایدا هەڵگێڕدرایەوە، تەماشای فرۆکەخانە گەورەکانو شەقامە پانوپۆڕەکانو تەلارە جوانەکانو بانكو دامودەزگاکانو قوتابخانەکانو خەستەخانەکانو زانکۆکان..هتد بکە. لێرەوە تازەکردنەوەی مادییو تەکنەلۆژی وڵات، تارادەیەکی زۆر هاتووەتەدی، بەڵام بەبێ ئەوەی عەقڵیەتەکان گۆڕانی بەسەردابێت. لەبەر ئەمەیە کۆمەڵگای سعودییە پێویستی بە ساڵانێکی دووردرێژە لە ڕۆشنگەری فیکری یاخود ئاینی، هەروەها پێویستی بە هەوڵو توانایەکی گەورەیە لە بواری پەروەردەو خوێندنی مۆدێرن، تاکو بتوانێ جلەوی ڕەوتی وەهابی بکات

که کۆمەڵگای پاوانکردووەو خۆی وەك حەقیقەتێکی ڕەها سەپاندووە، حەقیقەتێك بە هیچ گفتوگۆو مشتومڕێك ڕازی نییە. ئەرکی گەورەی نەوەکانی داهاتوو، نەك بە تەنها نەوەیەك، ئالێرەدایە.

دواتر توێژەر بەردەوام دەبێ‌و دەڵێ: کاتێ لە ساڵی ١٩٢٩ شا «عەبدولعەزیز»و وەهابییەکان بەیەکداهەڵپژان، شا لەڕێگەی چارەسەری سەربازییەوە بەتەواوی تێکیشکاندن، بەڵام بیروراکانیان وەك خۆی بەباڵادەستی مایەوە. کاتێکیش لە ساڵی ١٩٧٩ نەوەکانی شا «عەبدولعەزیز» جارێکی دیکە لەگەڵ وەهابییەکان لەمیانەی پەلامارەکەیان بۆ سەر (المسجد الحرام) بەیەکداهەڵپژانەوە، دیسانەوە ڕێگای چارەسەری سەربازییان بۆ سەرکوتکردنی یاخیبووەکان گرتەبەر. کەچی بۆ تەنها ساتێك چییە بیریان لە چارەسەری ڕۆشنبیری نەکردەوە کە خۆی لە گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندندا دەبینییەوە، ئەوە خوێندنی ئەو جۆرە پرۆگرامانەیە عەقڵیەتی توندڕەوی لەو شێوەیە بەرهەمدەهێنێ. بەپێچەوانەوە، دوای ئەوەی وەهابییەکان لەڕێگەی سەربازییەوە تێکشکان، کەچی دەستیانکرد بە جێبەجێکردنی هەمو بەرنامە دەمارگیرییەکەیان، ئیدی هەستان بە ئیسلامیکردنی کۆمەڵگا زیاد لەوەی کە خۆی کۆمەڵگایەکی موسڵمانە. ئەنجامەکەشی ئەوەیە کە ئەمڕۆ پێیگەیشتوین، ڕوبەڕوبونەوەیەکی سەرتاپاگیری نێوان دەسەڵات لەلایەك‌و هێزە توندڕەوە کوێرەکانی دیکە لەلایەکی ترەوە. لێرەوە جارێ زووە بڵێین وەهابییەت لە سعودیەدا لەئاوابوندایە. بگرە بەم دوایانە بیستمان وەهابییەکان لە میانەی پێگەیەکی ئەنتەرنێتییەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ شێخ "ساڵح ئەلفوزان"، هەستاون بە دژە هێرشێك‌و بەشێوەیەکی ڕوون‌و ئاشکراو ڕاشکاوانە، هەڕەشەیان لە لیبراڵە سعودیەکان کردووە، لەوانە بیرمەندو ڕۆماننوس "تورکی ئەلحەمد"و بەوە تۆمەتباریان دەکەن گوایە ئەوانە لە ئیسلام لایانداوەو چونەتەدەرەوە. ئەمەش تۆمەتێکی مەترسیدارەو ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەیەکی نێگەتیڤی دەبێ لەسەر ئەو خەڵکە ڕۆشنبیرە سعودییانەی لە بارودۆخێکی زۆر زەحمەت‌و سەختدا، بەوپەڕی بوێرو هەستێکی بەرزی بەرپرسیارێتییەوە، جەنگی سەرفرازبوون بەڕێوەدەبەن. من ئەمە دەڵێم‌و بیر لە ڕۆشنبیرە گرنگەکان دەکەمەوە، لە نمونەی «عەبدوڵڵا ئەلمەتێری، مەشاری ئەلزایدی، محەمەد بن عەبدولەتیف ئال شێخ، تورکی ئەلدەخیل، عەبدولڕەحمان ئەلراشد، عەبدوڵڵا ئەلغزامی، محەمەد ئەلعلی، عەلی ئەلدمینی، خالد ئەلدخیل، سعود ئەلبلوی، قینان ئەلغامدی، نجیب ئەلخنیزی، متروك ئەلفالح، محەمەد سەعید تیب، مەنسور ئەلنقیدان، محەمەد مەحفوز، زەکی ئەلمیلاد، جەعفەر ئەلشایب، حەسەن ئەلمالکی، عابد خەزنەدار، ڕائد قاسم، عەلی ئال غراش، عوسمان ئەلعمیر»و دەیانی دیکەی لەوانەی ناوەکانیان دەزانم یاخود نازانم. بێگومان داوای لێبوردن دەکەم لەوەی ناوی زیاترم نەهێنا کە هیچیان لەوانەی ناویانم هێناوە کەمترنییە، بەتایبەتی ئافرەتە ڕۆشنبیرەکانی سعودییە. لە ئێستادا سعودییە بە ئافرەت‌و پیاوی ڕۆشنبیر، نوسەرانی بلیمەت‌و ڕۆژنامەنوسانی بوێر دەوڵەمەندە. دروستکردنی دواڕۆژێکی ڕووناك‌و پرشنگداریش هەر لەئەستۆو لەسەر شانی ئەوانە.

## مەبەستی قووڵی 11 سێپتێمبەر لەژێر ڕۆشنایی فەلسەفەی مێژوودا.

بۆ ئەوەی سەرجەم ئەوانەی پێشتر باسیان لێوەکرا، لەناو چوارچێوە فراوان‌و سەرتاپاگیرەکەیدا دابنێم، ئەمەی خوارەوە دەڵێم: گەر ١١ سێپتێمبەر نەبوایە، هیچ کەسێ نەیدەوێرا یەك پرسیار چییە سەبارەت بە وەهابیەت یان فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی بەگشتی بخاتەڕوو. هیچ کەسێ نەیدەوێرا بانگەوازی ریفۆرم یاخود گۆڕان لە پرۆگرامەکانی خوێندندا بکات، هیچ کەسێ نەیدەوێرا کێشەی ئازادی ئاینی یاخود نەبونی ئازادی ئاینی لە سەرزەمینی ئیسلامدا بخاتەڕوو. من خودی خۆم بۆ نمونە نەمدەوێرا پرۆژەکەی «محەمەد ئارکۆن» بەناونیشانە ڕوون‌و ئاشکراکەی (ڕەخنە لە عەقڵی ئیسلامی) وەربگێرم. من پێشتر مەسەلەکانم تارادەیەك بەڕێگای پێچاوپێچ دەگەیاند، بۆ نمونە قسەم لەسەر بەمێژوویی بوونی فیکری عەرەبی ئیسلامی دەکرد.

لێرەوە سوپاس بۆ ١١ سێپتێمبەر! بەڵێ هەزارجار سوپاس بۆ ١١ سێپتێمبەر. گەر ١١ سێپتێمبەرو قوربانییەکانی نەبونایە کە بە هەزارانیان لە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەداو لە ماوەی تەنها چەند دەقیقەیەکدا گیانیان لەدەستدا، ئەوا نەماندەتوانی بچوکترین پرسیار سەبارەت بە ترادیسیۆنی ئاینی ئیسلام بخەینەڕوو. ئەو ڕوداوە کە لە ناوەڕۆک و شێوازیدا بروسکەئاسابوو، پێویستبوو ڕوبدات تاکو جیهان لە بێئاگاییەکەی هەستێنێت و لە کێشە گەورەکە ئاگاداری بکاتەوە، ڕەنگە ئەو کێشەیە کێشەی سەرتاپای سەدەی بیست و یەک بێت. من کاتێ ئەم قسانەم بەو ڕاشکاوییە تاڵە دەخەمەڕوو، لەهەمان کاتدا داوای لێبوردن لە خانەوادەی قوربانییە بێتاوانەکان دەکەم کە گیانیان لەدەستدا.

بەڵام فەلسەفەی مێژوو کە من تەبەنیدەکەم و ئیشی لەسەردەکەم، پێم دەڵێ (پێویستی دایکی داهێنانە-الحاجة هي ام الاختراع) و لەوانەیە هەندێجار ڕودانی کارەسات پێویست بێت، ئەمەش بۆ ئەوەی مێژوو بتوانێ یەک هەنگاو یاخود نیو هەنگاو بەرەو پێشەوە بڕوات. مێژوو بۆ ئەوەی ناوەڕۆکی خۆی ئاشکرابکات، بۆ ئەوەی ئەو کێشە قووڵەی لە هەناویدا گێنگڵدەداو هەراسانیکردووە بێتەدەرەوە، پێویستە بومەلەرزەیەک ڕوبدات، بورکانێک بەڕوماندا بتەقێتەوە. وتنی ئەم قسانە تابڵێی بەئازارە، بەڵام ئا ئەوە حەقیقەتەکەیە. چی ئەزمونی دووردرێژی مێژوش هەیە ئەوەی سەلماندووە. ئێمە هیواداربوین مێژوو بەشێوەیەکی هێمن و لەسەرخۆ پێشبکەوێ یاخود کێشەکانی چارەسەربکات، پێش ئەوەی باجەکەی بە گران بدرێ. وەلێ زۆر بەداخەوە مێژووی مرۆڤایەتی ئەوە بە مەحاڵ دادەنێت. ئێمە هیواداربووین کێشە گەورەکەی فێدەمێنتالیزمی تاریکبین، پێش ١١ سێپتێمبەر یاخود بەبێ ڕودانی ١١ سێپتێمبەر بۆ هەموان ئاشکرابوایە. ئێمە هیواداربوین مەترسییە بینراوەکە، بە ماوەیەکی درێژ پێش ئەو مێژووە، بۆ سەرکردە سیاسییەکان و ڕۆشنبیرەکان دەرکەوتایە، پێش ئەوەی کارەساتی ١١ سێپتێمبەر ڕوبدات. بەڵام پێدەچێ مرۆڤ تەنها لە (نەگبەتییەکانی) خۆیەوە شت فێردەبێ. ئێمە هیواداربوین ڕوداوەکانی جەزائیر کە تێیدا بە دەیان و سەدان ڕۆشنبیر لەژێر زەبری لێدانی (موجاهیدینە مەزنەکان) گیانیان لەدەستدەدا یاخود هەندێجار لەبەردەم منداڵەکانیاندا سەریان لێدەکرایەوە، سەرنجی جیهانی بۆ مەترسی بابەتەکە ڕابکێشایە. وەلێ نا، نا، هیچ کەسێ نەجوڵا. بگرە هەندێ لایەنی ئەمریکی بیریان لەوە کردەوە گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردەکانی ئەوەی پێی دەڵێن (بەرەی ڕزگاری ئیسلامی) بکەن، بەو پێودانگەی گوایە ئەوانە نوێنەری میللەتن...

بەڵام ئەوەی وتم تەنها تایبەت نییە بە جەزائیر، گەرچی ئەزمونی جەزائیر تابڵێی ئەزمونێکی تاڵ و کارەساتباربوو، بەڵکو زۆربەی وڵاتانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامیش دەگرێتەوە. لەو وڵاتانەشدا تیرۆرکردنی ڕۆشنبیران بووە مۆدەیەکی باو، تەنانەت هەندێ لە خودی ڕۆشنبیران یاخود بەناو ڕۆشنبیرەکان چەپڵەیان بۆ ئەو کارە تیرۆرستیانە لێدەدا، زۆرینەی ئەو بەناو ڕۆشنبیرانە دەستوپەنجەیان لەگەڵ ئەو شەپۆلە تاریکبینەدا نەرمکردو نەفرەتیان لە خۆیان و لە ڕابردوی خۆیان دەکرد، بەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان «مارکس»ی یان عەلمانی یاخود پێشکەوتوخواز بوون. ئیدی لێرەوە لەوێ تۆبەکردن و پاشەکشەکردن تادەهات زیاددەبوو. بەناو ڕۆشنبیرەکان لە هەموو شوێنێکدا زۆردەبوون و خەتاکەیان دەخستە گەردنی (مۆدێرنەی ڕزیو) کە لەناویبردین و بارودۆخەکەمانی تێکوپێکدا. وەلێ کەلتوری ڕزیو کەس ناوێرێ ڕەخنەی لێبگرێ یاخود کەس بۆی نییە تەنها بە سەری پەنجەش ئاماژەی بۆ بکات... ئەو کەلتورە پیرۆزەو مەعسوم و بێ خەوشە، گەرچی بەناوی ئەوەوە هەزاران مرۆڤ تیرۆربکرێت... ئەمە فیکرەیەکمان لەسەر فشۆڵی مۆدێرنەو پێشکەوتنخوازی لە جیهانی عەرەبیدا پێدەدات، مۆدێرنە لای زۆربەی ڕۆشنبیران لە توێکڵێکی تەنک زیاتر هیچیتر نییە. پاشان ئەو ڕۆشنبیرانە سڵناکەنەوەو بەناوی مافەکانی مرۆڤەوە قسەدەکەن یاخود لەپێناو دیموکراتیدا بەیاننامە دەنوسن! لێرەوە ١١ سێپتێمبەر بەو مەزنییەی خۆیەوە، تاقە بەرپرس نییە لە ئاشکراکردنی ڕاستی ئەو نەخۆشییە درێژخایەنەی بەشێوەیەکی نهێنی و بەبێ ئەوەی هیچ کەسێ ئاگای لێبێت، هەناوی واقعی عەرەبی و ئیسلامی لەناوەوە وێرانکردووە. هەندێ شت هەیە پێش ١١ سێپتێمبەر ئەو نەخۆشییەیان ئاشکراکردووە. هەندێ قەسابخانە و کوشت و کوشتار لەناوخۆی خودی

جیهانی ئیسلامیدا ڕوویاندا نەك لە دەرەوەی، ئەوە جیهانی عەرەبی یان ئیسلامی بوو یەکەمجار باجی ئەو کوشتو کوشتارەی دا. وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قسەیە هەر بە ڕاستی دەمێنێتەوە گەر ١١ سێپتێمبەر نەبوایە، ئەوا کێشەکە هەمو ڕەهەندە نێودەوڵەتیەکانی لەخۆنەدەگرت و بۆ نمونە «عەبدولوەهاب ئەلموئەدەب» نەیدەوێرا کتێبێك بە ناونیشانی (نەخۆشییەکەی ئیسلام) بنوسێ. کێ دەوێرێ وشەی ئیسلام ببەستێت بە وشەی نەخۆشییەوە؟ کێ دەیتوانی قسە دەربارەی بەربەریەتی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی یاخود فاشیزمە تۆقێنەرەکەی بکات، وەك چۆن «ڤۆڵتێر» لە وکتێبەی سەرەوەدا باسی لە بەربەریەتی مەسیحی کردووە؟ گەر ١١ سێپتێمبەر نەبوایە، ئەوا ڕۆشنبیرە لیبراڵەکانی سعودییە نەیاندەتوانێ دەنگیان، گەر تۆزقاڵێکیش بێت بەرزبکەنەوە. ڕاستە ئەو ڕۆشنبیرانەی سعودییە لە ئیسلام لاياننەداوەو دژ بە بەها ئەخلاقیو ڕۆحییە بەرزەکەی نەوەستاون، بەڵام ئەوان بە ڕاستی دژ بە لێکدانەوەی تاریکبینی تایفەگەری سەرکوتکەر ڕاوەستان، نەك تەنها لە سعودییە، بەڵکو لە هەمو جیهانی ئیسلامیشدا.

من ئەمە دەڵێمو بیر لە ناوە پرشنگدارەکانی وەك «عەبدوڵڵا ئەلمتێری، تورکی ئەلحەمەد، عەلی ئەلدمینی، ئەمەل زاهد، وەجیهە ئەلحویدر، سعود ئەلبلوی، مەها فەهد ئەلجیلان، مەشاری ئەلزایدی، حەسنا ئەلقنیعیر، حەمزە بن قەبلان ئەلمزینی، ئیمان ئەلقەحتانی، جەمال خاشقجی، حسێن شەبکشی، رائید قاسم، مەحمود عەبدولغەنی صەباغ، عەلی ئال غراش»و دەیانی دیکە دەکەمەوە کە لەبیرمدان یاخود لەبیرمدا نین. ئەم شتە پێش ١١ سێپتێمبەر شتێکی مەحاڵ بوو. کەواتە سوپاس بۆ قوربانییەکانی ١١ سێپتێمبەرو سەرجەم قوربانییەکانی دەستی فێندەمێنتالیزمی تاریکبین لە هەمو جیهانی عەرەبیو ئیسلامیدا. ئەوان بەخوێنی خۆیان ڕێگای ڕاستیان پیشاندان، بە ئێشوئازارەکانیان دەروازەکانیان بۆ ئێمە خستەسەرپشت، کێشە بنەڕەتییەکەی سەردەمو مێژوویان پیشاندا. لەمڕۆ بەدواوە خوێنیان بەفیڕۆ ناڕوات. هەروەها سوپاس بۆ قوربانییەکانی ١١ مارسی مەدریدو ٧ تەموزی لەندەن. لەندەن شاری ڕۆشنگەری لە هەمو جیهان، ئەم شارە مەزنە کە "ڤۆڵتێر" دوای ئەوەی سەردانی دەکاتو بۆ ماوەیەکی درێژ تێیدا دەمێنێتەوە، ستایشێکی زۆری دەکاتو سەرسام بووە بە پێشکەوتنەکەیو لێکبوردەییەکەیو ئازادییەکەی، هیواداربووە هەر هەموو ئەوانە یەکسەر بگوازرێنەوە بۆ فەرەنسا. ئەمە لە چارەکی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا بووە، واتە نزیکەی ٣٠٠ ساڵ لەمەوبەر! کاتێ سەرتاپای جیهان لە تاریکیو دواکەوتوییو نەزانینو دەمارگیری ئاینیدا نوقم ببوو، لێرە لە لەندەنو لە ئەمستردامو هۆڵەندا بەگشتی، خۆری ڕۆشنگەری هەڵدەهات. لەبەر ئەوەیە "ڤۆڵتێر" لە نامە بەناوبانگەکەیدا بەناوی (نامە ئینگلیزییەکان) کە دواتر دەبێتە (نامە فەلسەفییەکان) سەرزەنشتی فەرەنسییە تاریکبینەکان دەکاتو داوایان لێدەکات بۆ ئەوەی لە دواکەوتوویو دەمارگیریو ستەمکارییەکەیان بێنەدەرێ، لاسایی ئینگلیز بکەنەوە. "ڤۆڵتێر" سوێندی نەدەخوارد تەنها بە ناوی "جۆن لۆك"و "ئیسحاق نیوتن"ەوە نەبێت...

ئێستا لە جیهانی ئیسلامیدا کێ دەوێرێ بانگەشەی لاساییکردنەوەی ڕۆژئاوا بکات؟ دەمودەست بە بەکرێگیراو یان ناپاك یاخود هەڵگەڕاوە تۆمەتباری دەکەن، گوایە ئەوە کەسێکە لە دەرەوەی (ثوابت الامة)! سەیری ئەم زاراوە تۆقێنەرە بکەن، هەر کە دەیڵێم تەزوویەك بە لاشەمدا هەڵدەگەڕێت، ئەم زاراوەیە زیندانو گرتوخانەکانی ئومەتەو مێژوی هەموو سەرکوتکردنەکانیەتی. بەڵام «ڤۆڵتێر»ی ناپاكو بەکرێگیراوی ئینگلیز، دواتر دەبێتە نیشانەی نەمری فیکرو شارستانیەتی فەرەنسا. لەمڕۆبەدواوە چیتر فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی بەبێ لێپرسینەوە دەربازی نابێت، وەك ئەوەی پێشتر دەربازدەبوو. لەمڕۆبەدواوە زۆربەی ڕۆشنبیران سڵ لەوەناکەنەوە ڕەخنەی لێبگرنو لێی بپرسنەوەو حسابێکی زۆر توندی لەگەڵدا بکەن. لەمڕۆبەدواوە هەمو فاسیلەیەك، هەموو خاڵێك، هەمو دێڕێك لە دێرەکانی دەقە ئاینییەکان، لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێتو پاکدەکرێتەوە. من بەو شێوەیە بیرمدەکردەوە، کەچی یەکێك لە پسپۆرە گەورەکان، بەزەردەخەنەیەکی تارادەیەك گاڵتەئامێزەوە پێی وتم: برا تۆزێك لەسەرخۆ.. دەبینم زیاد لە پێویست خۆشبینی، ئایا لەو بڕوایەدای موسڵمانەکان، دوای هەموو ئەو

شتانەی کە ڕویداوە، ڕازیدەبن پرسیاری ڕاستەقینە دەربارەی ترادیسیۆنە ئاینییەکەیان بخرێتەڕوو؟ هاوڕێکەم تۆ بەهەڵەدا چویتو زیاد لەپێویست پەلە دەکەی. ئایا لەو بڕوایەدای موسڵمانان دەستدەکەن بە توێژینەوەیەکی مێژوییو زانستی بۆ ترادیسیۆنە (کەلتورە) درێژو پانو پۆڕەکەیان؟ تۆ ئەمە لەکوێدا دەبینی؟ تو زاتی خوا پیشانم بدە؟ منیش پێم وت ئەمە مانای ئەوەیە قوربانیانی ١١ سێپتێمبەر بە ڕاستی مردنو خوێنیان بەفیڕۆ ڕۆشت.. وەڵامی نەدامەوەو لەنێو بیرکردنەوەیەکی قووڵدا ونبوو..

بە بۆچونی من گەر ئەوە ڕاستبێت، ئەوا لە خودی ڕوداوی ١١ سێپتێمبەر مەترسیدارترە. ئێمە گەر دوای ڕودانی ئەو هەمو کارەساتە، نەتوانین هیچ پرسیارێکی ڕاستەقینە دەربارەی ترادیسیۆنی ئاینی بخەینەڕوو کە بەناوی ئەوەوە ئەم تاوانە ئەنجامدراوە، ئەمە مانای وایە مەسەلەکان بەڕاستی مەترسیدارنو هیچمان لەبەردەمدا نەماوە تەنها ئەوە نەبێت فیشەکی ڕەحمەت بە خۆمانەوە بنێینو بە کۆمەڵ خۆمانبکوژین.. هیچمان لەبەردەمدا نەماوە ئەوەنەبێت خۆمان بدەینە دەست قەدەرو سەلەفییەتو سەلەفییەکان. بەڕاستیش بۆم دەرکەوت دوای تێپەڕبونی شەش ساڵ بەسەر لێدانەکەی ١١ سێپتێمبەردا، لەترسی توڕەبونی فێندەمێنتالیستە ناحاڵییەکان، ناتوانم ناوی خۆم بخەمە سەر هەندێ لە وەرگێڕانو نوسینەکان. ئەی کەواتە ١١ سێپتێمبەر چ سودێکی هەبوو؟ ئایا بۆ ئەوەی بوێرین هەندێ پرسیاری جەوهەری دەربارەی ترادیسیۆنی ئاینی ئیسلام بکەین، پێویستمان بە سەد ١١ سێپتێمبەری دیکە هەیە؟ لەڕویی مێژوییەوە مەسحەف چۆن دروستبوو؟ کێ دروستیکردو لە چوارچێوەی کام بارودۆخی ململانێئامێزی نێوان سیاسەتو تیۆلۆژیادا هاتەئاراوە؟ شەریعەت کەی دروستبوو، واتە یاسای پیرۆزی ئیسلام چۆن چۆنی دروستبوو؟ ئایا دەکرێ لێکدانەوەیەکی مێژویی بۆ قورئان بکرێتو کەی بۆی بکرێت؟ بە دروستی لەچ کاتوساتێکدا مەزهەبە ئیسلامییەکان دروستبوون؟ ئەی چۆنو بە چ شێوەیەك لەسەر چەمکی ئیسلامی ڕاستەقینە، بەئاگرو ئاسن کەوتنە گیانی یەکتر؟ ئەی باشە ڕاستە تەنها یەك دەستەیان ڕزگاریان دەبێو ئەوانیتر کە دەمێننەوە هەر هەمویان بۆ دۆزەخ؟ باشە ئەی لەسەر چەمکی ئاینی حەق یاخود تاقە مەزهەبی پەسەند لای خودا، چۆن چۆنی ململانێیان کردووە؟ بگرە چۆن تاکو ئێستاو تاکو ئەم چرکەساتەش لەم پەڕی ئیسلامەوە بۆ ئەوپەڕی ئیسلام هەر لە ململانێدان؟ تەماشای کوشتوبڕی شیعەو سونە نەك تەنها لە عێراق، بەڵکو لە پاکستانو زۆر ناوچەی دیکەش، بکە.. ئایا دەکرێ لە دەرەوەی کەشوهەوای وشکهەڵاتوی چەقبەستوی ترادیسیۆن بیربکرێتەوە؟ ئایا وەك «ئارکۆن» دەڵێ دەکرێ لە دەرەوەی دیواری کۆن یاخود لەدەرەوەی سیاجی دۆگمای داخراو بیربکرێتەوە؟ ئایا ئەم شەوەزەنگە کۆتایی دێت؟

«ڤۆڵتێر» لە کاتو ساتی خۆیدا قوربانیانی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی ژماردو ژمارەیان گەشتە ملیۆنان کەس! ژمارەکە بەدروستی ٩٤٦٨٠٠٠کەس بوون. ئەوانە بەپێی گوزارشتی «ڤۆڵتێر» لەپێناو دەرخستنی خۆشەویستیان بۆ یەزدان، سەریانبڕین یاخود خنکێنران یان سوتێنران یان دەبەستران بە تایەوەو ئازاردەدران یاخود لەسێدارەدەدران. تەماشای ئەم کتێبە بکە کە بە فەرەنسییە (dictionnaire de la pensee de voltaire.Editdons com-plexe.p256.1994 ).

ئاشکرایە بزوتنەوەی ڕۆشنگەری ئەوروپی تەنها دوای کوشتوبڕی (سانت بارتیلیمی) بەناوبانگو کوشتوبڕە تایفەگەرییەکانی دیکە، کە لە هەمو لایەکی ئەوروپا ڕوویدەدا، جێگیربوو. هەروەها نابێ ڕۆڵی جەنگە مەزهەبییەکانی کاسۆلیكو پرۆتستانتەکان لە جێگیرکردنی ڕۆشنگەری لەبیربکەین. بەهۆی ئەو جەنگانەوە خوێن بە چەشنی ڕوبار ڕژا. هەرلایەکیش بانگەشەی ئەوەی دەکرد خۆی ئاینی حەقە یاخود خۆی مەسیحی ڕاستو دروستە. تەواو وەك ئەوەی مەزهەبە ئیسلامیەکانیش ئەنجامیانداوە. دەڵێن جەنگە مەزهەبییەکان، سێ بەشی دانیشتوانی ئەوسای ئەڵمانیای لەناوبردووە، ئەی ئاخو دەبێ حاڵی دەوڵەتەکانی دیکەی ئەوروپا چۆن بوبێت؟ دوای ئەوە "جۆن لۆك"و"سپینۆزا"و "لایبنتز"و "بییر بایل" دەرکەوتن، واتە دەستەی یەکەمی بیرمەندانی ڕۆشنگەری ئەوروپی.

ئەوانە وەك پەرچەكردارێكی توند دژ بە فێندەمێنتالیزمو فێدەمێنیتالیستە مەسیحییەكان دەركەوتن كە دنەی كوشتوبرە تایفەگەرییەكانیان دەداو میللەتی مەسیحی نەزانو هەژاریان دەخلەتاند. تەواو وەك ئەوەی شێخەكانی قاعیدە ئێستا لە عێراقدا ئەنجامی دەدەن. پاشان لەسەدەی هەژدەهەم دەستەی دووەم: "دیرۆ"و "بارۆن"و "دۆلباخ"و "دولامێتری"و "ڤۆلتێر"و "جان جاك رۆسۆ"و "لیسنغ"و "كانت"و دەیانی دیكە دەركەوتنو وتیان ئیدی لەمەولا هەڵدەستین بە توێژینەوەی عەقیدەی مەسیحیو لە وردو درشتی دەكۆڵینەوە. چونكە ئەو عەقیدەیە بوو پاساوێكی تیۆلۆژیا یاخود خواوەندانەی بەم هەمو كوشتوبرە دەبەخشی. ئیدی پیاوانی ئاینی دەخەینە سەر تەرازوی رەخنەیەكی توندی بێ بەزەییو دەمامكەكان لە سیمایان دەكەینەوە. ئاشكرایە "ڤۆلتێر" هەمو ژیانی خۆی بۆ دژایەتی كردنی (درەندە زیانبەخشەكە) تەرخانكرد، واتە فێندەمێنتالیزمی مەسیحی، بەتایبەتی كاسۆلیكی پاپاوی رۆمانیو وتی پێویستە لەسەرمان شورەییو نەنگی تێكبشكێنین. لەمرۆداو لەدوای ئەو هەمو كوشتوبرو تەقینەوە كوێرانەیەی فێندەمێنتالیزمی وەهابی لە عێراقو غەیری عێراقدا پێیهەڵدەستێ، گەر رۆشنگەرییەكی عەرەبی ئیسلامی سەردەرنەهێنێ، ئەوا دەبێ رۆشنبیریو هەمو رۆشنبیرانی عەرەب خوایان لێخۆشبێت.

ئەوەی ماوەتەوە بیڵێم ئەمەیە: بۆ ئەوەی هەڵوێستەكەم هەڵوێستێكی هاوسەنگ بێت، پێویستە دان بەوەدابنێین لەناوەندی راسترەوی توندرەوی ئەورووپیو ئەمریكیو ئیسرائیلیدا، رقێكی گەورە بەرامبەر هەمو عەرەبێك یاخود موسڵمانێك هەیە. مەیلێك هەیە دەیەوێ باشو خراپ پێكەوە تێكەڵ بكات، واتە مەیلێك هەیە دەیەوێ هەمو موسڵمانانو عەرەب لە یەك خانەدا دابنێ، ئەمەش هەڵەیەو پێویستە سەركۆنەبكرێ. لێرەوە ئەو توندرەوییەی ئاگری رقو كینە خۆشدەكات لەهەردولایەنەوە دێت، نەك تەنها لەیەك لایەنەوە. ئەو سیاسەتە فراوانخوازیو بەزۆرنیشتەجێكردنە دوژمنكارانەیەی لە فەلەستیندا پیادەدەكرێ، ئەویش بەرپرسیارە لە گەشتنی بارودۆخەكە بەوەی ئەمرۆ پێیگەشتوین. لە واقیعدا هێزی توندرەو لە هەردوو لایەنەوە، رێگە لەبەردەم نییەتە باشو ئاشتیخوازەكانی زۆرینەی عەرەبە موسڵمانەكان یاخود رۆژئاواییەكان سا مەسیحی بن یان عەلمانی كە پێیانخۆشە گفتوگۆیەكی شارستانی ئەنجامبدەن. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەوە لەبیرنەكەین، گەرچی توندرەوەكان لە هەردوولادا كەتەو زلن، كەچی هەمیشە وەك كەمایەتییەك دەمێننەوە.

**سەرچاوە:**

www.alawan.com

25/9/2007

مەحمود موسایی
لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

# مانای عەلمانیەت (سکۆلاریزم)

لە سەرەتای ئەم نووسراوەدا ئەبێ ئاماژە بەوە بکەم کە بە داخەوە ئەو کێشەیەی هەمیشە بەرۆکمان بەرنادات، تێگەیشتنی هەڵە لە مانای وشەکان بووە کە بوەتە هۆکارێك بۆ هەڵوێستی هەڵەی کەسانی دیکە. لەم نامیلکەیەدا نیازم وایە بە شیکردنەوەی مانای راستەقینەی عەلمانییەت بۆ خوێنەر، بڵێم سکۆلاریزم بە مانای بێ دینی و مەرگی دین نیە بەڵکوو شارێیەکە بۆ گەیشتن بە دیمۆکراسی.

## عەلمانیەت:

دەربارەی سکۆلاریزم ئەتوانین بڵێین: جۆرێکە لە بیرکردنەوە یاخود روانینێکە لەسەر بنەمای جیهان باوەری (گەردوونی) و دونیاگەری. ئەو فەلسەفەیە کە جەخت لەسەر جیاکردنەوەی دین لە سیاسەت و لە ئیدارەی دەوڵەت و کاروباری سیاسیدا دەکات. لای هەندێك ئەمە بە مانای جوڵەی تەریبی ئەم دوانەیە و لە روانگەی هەندێکی ترەوە بە مانای کۆنترۆڵ کردنی دینە لە رێگەی زانستی سیاسەتەوە.

بەڵام جیاکردنەوەی ئەم دوانە و رێگرتن لە تەداخولی ئەمانە لە کاروباری یەکتردا، بە تایبەت بەرگری کردن لە دەست تێوەردانی دین لە کاروباری سیاسیدا شتێکی لۆژیکیە. هەرچەندە ئەمرۆکە دیاردەی دین بەبێ زانستی سیاسەت نە کۆنترۆڵ ئەکرێت و نە پێشکەوتنێك بە خۆیەوە ئەبینێت.

سکۆلاریزم و کۆمەڵگای مەدەنی، چوار سەدە پێش ئێستە لە رۆژئاوا لەدایك بوو. سەرەتای عەلمانیەت ئەگەرێتەوە بۆ سەرهەڵدانی بزاوتێك بە رێبەرایەتی مارتن لوسەر کە دواتر ئایینی پرۆتستانتی لێکەوتەوە. عەلمانیەت لە واقیعدا، هاوسەنگییەك بوو

لە نێوان دوو دەسەڵاتی سیاسی و دینیدا، کە جۆری دەسەڵات و چلۆنایەتی کۆمەڵگای مەدەنی دیاری ئەکرد و هۆکارێك بوو بۆ پێشکەوتنی ئەخلاق لە مرۆڤ و لە کۆمەڵگادا.

سکۆلاریزم ئەو بیروباوەڕەیە کە جیهانی رۆژئاوا لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە و توانیویەتی پلە و رێزی کۆمەڵگا و مرۆڤ تا ئەو جێگەی بۆی ئەکرێت، رابگرێت (بپارێزێت). دەوڵەتە لائیکەکان بەمجۆرە توانیویانە سنووری کاروباری دین لە کۆمەڵگادا دیاری بکەن و توانیویانە لەم رێگەوە گەلێك سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

بە ئاوڕدانەوەیەك لە بارودۆخی وڵاتانی پەرەسەندوو، کاریگەریی پۆزەتیڤی سکۆلاریزم هەست پێئەکرێت و بە پێچەوانەشەوە، ئەو وڵاتانەی کە ئەمرۆکە لەسەر بنەمای دینی دانراون زۆربەیان لە شەڕ و بارودۆخێکی زۆر پەشێودان یاخود بەپێی زەرورەت خەریکی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتین.

هەلومەرجی نالەباری خەڵکی هەندێك لە وڵاتانی ئەفریقی و ئاسیایی وەکو ئەفغانستان و عێراق و.. دەرئەنجامی روانگەی دینی لە شێوەی سەدەکانی ناوەراستدایە. ئەم وڵاتانە جگە لە مەسەلەی جدی دین، سەرەرای ئەوەی فرە نەتەوەیین، لەگەڵ گێرەو کێشەی سەرسووڕهێنەردا رووبەروو بوونەتەوە لەبەرئەوەی لەم وڵاتانەدا دین و ئەوانەی لە حکومەتدا دەسەڵاتی دینیان بەدەستەوەیە، ئەیانەوێت سیاسەتەکانی خۆیان لە رێگەی دینەوە لە کۆمەڵگادا دابەزێنن.

(بەپێی یاسای بنەڕەتی تورکیا، کۆماری تورکیە لەسەر بنەماکانی ئوسوڵی دیموکراتیك، عەلمانی و کۆمەڵایەتی لە ژێر ناوی دەسەڵاتی یاسا و پێرەوکردنی ماف و ئازادیە بنەڕەتیەکان دامەزراوە، زۆرینەی خەڵکی تورکیا موسڵمانن لێ کەمایەتیە دینیەکانیش ئازادی تەواویان پێدراوە. هەلومەرجی ئێرانیش لە باری فرەنەتەوەیی، فرە ئایینی و فرە زەمانیەوە، زۆر لە تورکیا ئەکات. بەڵام هەموو خەڵکی تورکیە تا رادەیەك مافی وەکو یەکیان هەیە. ئازادی دەربڕین، بیروڕاو دین پێشاندەری بوونی دیمۆکراسیەو کۆمەڵگای بەرەو پێش رێگرتووی تورکیایە). بۆ روونکردنەوەی ئەم باسە پێویستە ئاماژە بە هەندێ شت بکرێت.

لە پێشدا، پێویستە جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان «دین» و «مەزهەب»دا دابندرێت. دین وەکو شتێکی ئاخیرەتی، رووی لە دونیای متافیزیکەو فری بە ژیانی رۆژانەوە نییە، هەربۆیە لە جەوهەردا ئایدۆلۆژی نیە، بە پێچەوانەوە «مەزهەب» بە گشتی ماهییەتێکی ئایدۆلۆژی ئەگرێتە خۆی و بە ژیانی رۆژانەوە بەستراوەتەوە. ئێمە دژایەتیەکمان لەگەڵ هیچ دین و ئایین و ئایدۆلۆژیەکدا نییە، بەڵام لەسەر ئەم بڕوایەین کە ئەبێ تێکرای ئەمانە لە دەسەڵاتی سیاسی جیابکرێنەوە تا دیموکراسی جیاوازی بیروڕا و ئازادی بەیان بپارێزرێت و کۆمەڵگا لە مەترسی داسەپاندنی بیرورایەك و رەفتارو گوتارێك، رزگار ببێت. مەسیحیەت دابەشکردنی ژیانی بەدوو بەش، دەسەڵاتی «خودا»و دەسەڵاتی «قەیسەر»ی بە ڕەسمیەت ناسی کە لە واقیعدا ئەمە قسەی حەزرەتی مەسیح بوو.

## عەلمانیەکان خوازیاری مەرگی دین نین:

عەلمانیەکان لایان وایە «تایبەتی بوونی دین» شتێك نیە وەکو تایبەت بوونی حسێبی بانکی. لەبەرەی «گشتی بوون»یشەوە سکولارەکان بەمانی «لە ژێر پاراستنی و خاوەن ئیمتیازی کۆمەڵایەتی بوون» بەکاری دەهێنن. بەم جۆرە حەزکردن بەوەی دین لە ژیانی گشتی بخرێتە لاوە بەمانای ئەوە نییە دنیا لەبەرچاوی زۆرینەی خەڵك بشاردرێتەوە، بەڵکو بە مانای سڕینەوەی پاراستنی گشتی لە دین یان دروستتر بڵێین دەوڵەت نابێت لایەنگری و پشتگیری لە دین بکات. کەوابوو بە خسووسی کردنی دین بە مانای سڕینەوەی دین نییە، بەڵکو ئەمە ئەمرێکی تاکە کەسی و حەزێکی شەخسییە. بەم جۆرە تێدەگەین کە ڕەوتی سێکولاریزاسیۆن

یا عەلمانیەت بە هیچ جۆرێك بە مانای مەرگ و كۆتایی دین نییە. عەلمانیەكان سەبارەت بە دەوری دین لە ژیانی رۆژانەدا بیروباوەری جیاوازیان هەیە. هەندێك لاسارانە لەسەر ئەو باوەرەن كە شەڕ و خراپەی دین زیاترە لە خێر و چاكەكانی. ئەمانە چاوەڕێی ئەوە ئەكەن دین هەنگاو بە هەنگاو لە ناو بچێت. زۆرێك لە عەلمانیەكان، بەو دەورەی دین لە ژیانی كۆمەڵایەتی و ئەخلاقی بڕواداراندا دەیگێڕێت دڵخۆشن. تەنانەت هەندێك لە سكۆلارەكان پشتگیری لەو رێكخراوە خێرخوازانە دینیانە ئەكەن و بڕوایان بە هەوڵ و تەقەلای كۆمەڵایەتیی ئەم رێكخراوانە بۆ كەم كردنەوەی هەژاری و نەداری جەماوەری خەڵك هەیە.

لە كۆمەڵگایەكی عەلمانیدا، رزگاری لە دەسەڵاتی دین و ڕێبەرانی دینی شتێكی چاوەڕوانكراوە. كەس بۆی نییە بە زۆر پێڕەوی لە دین یاخود بەها دینیەكان بكات، مەگەر ئەوەی خۆی حەزی لێبێت لە دین پێڕەوی بكات. ئەگەر زۆرینەی خەڵك دینێكی تایبەت هەڵنەبژێرن، رێكخراوە دینیەكان بەهۆی كەم بوونەوەی ئەندامەكانیەوە وردە وردە بەرەو لاوازی دەچن.

دژایەتی رێبەرانی دینی لەگەڵ عەلمانیەكان و عەلمانیەتدا، هەڵگری دوو هەڵەیە. هەڵەی یەكەم ئەوەیە ئەوان لەم كێشەیەدا، بەرپرسیایەتی ئەخەنە ئەستۆی سێكولارەكان. ئەوان لە جێگەی ئەوەی هێرش بكەنە سەر عەلمانیەكان كە بۆچی بە جەماوەر رێگە ئەدەن دین وەلا بنێن، دەبێ بزانن كە خەڵك بۆ پشت لە دین ئەكات.

هەڵەی دووهەم ئەمەیە: هەر هەوڵێك بۆ هێرش كردنە سەر عەلمانیەت لە بنەڕەتدا پیشاندەری ئەم ڕاستییە كە دەسەڵاتدارانی دینی بە پشت بەستن بە هەڵبژاردنی كەسی، تایبەتی و دڵخوازانەی خەڵك ناتوانن پاڵپشتی ئەوان وەدەست بهێنن و سەرنجی جەماوەر رابكێشن. ئەم شتە ئەتوانێت بە تەواوی دروست بێت، لێ قەبووڵكردنی ئەم واقیعەتە بۆ دەسەڵاتدارانی دینی ماڵوێرانكەرە، هەرچەند كە وادیارە تا هەنووكەش رێبەرانی دینی دوژمنی عەلمانیەت ئەم شتە تێنەگەیشتوون. ئەوان لەبەر هەندێ هۆ نایانەوێت لەم ڕاستیە تێبگەن كە دینێك كە بەلایەنگری و بەزۆر بەسەر خەڵكدا بسەپێنرێت بێ نرخە.

بە بیروڕای من عەلمانیەت پرۆسەو روداو و دیاردەیەكە كە دین لە خودی مەیدانی ژیان ئەخاتە پەراوێزەوە و بەم جۆرە نفووزی لە كۆمەڵگادا كەم ئەكاتەوە.

یەكەمین كەس كە وشەی سكۆلاریزمی بەكارهێنا «جۆرج یاكوب هالی ئۆك»ی ئینگلیزی بوو. هالی ئۆك لە ساڵی 1846 سكۆلاریزمی بەو مانایە بەكارهێنا كە «ئەمە بیروڕایەكە تەنیا بە پرسیار و كێشەگەلێكەوە خۆی خەریك ئەكات كە لە ژیانی رۆژانەدا ئەكرێت لە مەحەكی ئەزموونی بدەیت». هالی ئۆك چاكەخوازێكی سۆسیالیست بوو كە لەسەر ئەو بڕوایە بوو دەوڵەت ئەبێ لە خزمەتی دابینكردنی نیاز و پێداویستیە هەنووكەیەكانی چینی كرێكار و بێ دەرەتان بێت، نە نیازی ژیانی ئەو دونیایی و رۆحی خەڵك.

ئەمرۆ كاتێك وەك تێزێك باسی عەلمانیەت دەكەین بە گشتی مەبەستمان لە هەر جۆرە فەلسەفەیەكە كە ئەخلاق لەبەر چاو تەنگی و دۆگماتیزمی دینی جیا ئەكاتەوە و هەوڵ ئەدات پایەی زانیاری و تەكنۆلۆجی مرۆڤ بەرز بكاتەوە. ئەمەش ئاماژە بەم ئایدیایە كە ئەبێت تەركیزی دەوڵەت لەسەر ژیانی دونیایی خەڵك بێت، نەوەكو دەوڵەت كەڵكەڵەی ژیانی پاش مەرگی ئەوان بێت. هەرچەند سكۆلاریزم و سكۆلاریزاسیون پەیوەندییەكی مانایی نزیكیان بەیەكەوە هەیە بەڵام وەك یەك نین. جیاوازی ئەم دوو وشەش لە وەڵامی ئەو پرسیارەدایە كە دەوری دین لە كۆمەڵگادا هەیەتی. سكۆلاریزم، بڕوای بە پانتاییەكی ناسین و بەهاو كردار هەیە، كە لە دەرەوەی دەسەڵاتی دینن، بەڵام ئەمە بە مانای ئینكاری دەوری دین لە كاروباری سیاسی و كۆمەڵایەتیدا نییە. لێ سكۆلاریزاسیون بە مانای وەلانانی دین و دوورخستنەوەی لەم شتانەیە.

لە ڕەوتی سكۆلاریزاسیۆندا، بونیادەكانی ئابووری، سیاسی و كۆمەڵایەتی لە ژێر دەسەڵاتی دین دەرئەچن.

پێش سکۆلاریزاسیۆن، دین ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بونیادەکانی کۆنترۆڵ ئەکرد لە حاڵەتی زاڵ بوونی ڕاستەوخۆدا، بەڕێوەبردنی ئەم بونیادە کۆمەڵایەتیانە بەدەست ڕێبەرانی دینیەوە بوو. بۆ وێنە بەڕێوەبردنی قوتابخانەکانی ئەو سەردەمە بەدەست قەشەکانەوە بوو و لە کاتی دەسەڵاتی ناڕاستەوخۆشدا، بنەما دینییەکان پێوەرێك بوون بۆ کاروباری دینیی. بۆ وێنە کاتێك کە مافی هاوڵاتی خەڵك بە پێوەرە دینیەکان ئەپێوران. چ دەسەڵاتی دین ڕاستەوخۆ بێت یاخود ناڕاستەوخۆ، ئەتوانین بڵێین کاتێك سکۆلاریزاسیۆن ڕوودەدات کە دامەزراوەکان بە تەواوی لە ژێر کۆنترۆڵی دینیی ڕزگاریان ببێت و بدرێنە دەستی دەسەڵاتی سیاسی.

جیابوونەوەی بونیادی دین و دەوڵەت لە ڕەوتی سکۆلاریزاسیۆندا، مانای ئەوە ئەگەیەنێت کە بونیادەکانی تایبەت بە سیاسەت کە بە ڕێژەی جیاواز لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتدان، لە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی دین ئازاد ئەکرێن، واتا دوای سکۆلاریزاسیۆن، بونیادە دینیەکان مافی ئەوەیان هەیە دەربارەی مەسەلەی گشتی و سیاسی قسەیەك بکەن بەڵام بۆیان نییە خۆیان بەسەر کۆمەڵگادا بسەپێنن یان ڕەوتی سیاسەتە گشتیەکان دابڕێژن. لە پراکتیکدا دەوڵەت ئەبێ تا ئەو جێگەی بۆی ئەکرێت سەبارەت بە بیروڕا جیاوازەکانی دینی بێ لایەن بێت، واتا نە کۆسپ لەسەر ڕێگەی ئەواندا دروست بکات، نە بەڕێوەبەری ویست و خواستەکانی ئەوان بێت.

سکۆلاریزاسیۆن زۆرجار هاوکات لەگەڵ شۆڕشە سیاسیەکاندا بوون. لە فەرەنسادا کەنیسە و دەوڵەت پاش شۆڕشێکی خوێناوی لێك جیابوونەوە. لە ئەمریکا هەرچەند ئەم جیابوونەوە هێمنانەتر بوو بەڵام تەنیا پاش شۆڕش، دامەزراندنی دەوڵەتی تازە مەیسوور بوو.

ئامانجەکانی سکۆلاریزم هەموو کاتێك بێ لایەنانە نەبووە، پێویست ناکات هیچ وەخت سکۆلاریزم دژە دین بێت هەرچەند بەردەوام ئەبێ پشتگیری ڕەوتی سکۆلاریزاسیۆن بکات. ئەوەی لایەنگری سکۆلاریزم بێت، لایەنی کەم جگە لە دین ئەبێت هەرێمێکی زیادی بە پێویست بزانێت، هەرچەند چاکتر ئەوەیە کە ئەمانە هەر نەبێت لە بڕێك لە مەسەلە کۆمەڵایەتیە سنووردارەکاندا، بڕوایان بە بەرزبوونی سنووری سکۆلار ببێت. کەوابوو، جیاوازی ئەوەیە کە سکۆلاریزم زۆرتر هەڵوێستێکی فەلسەفی لەبارەی پێویست بوونی هەلومەرجی شتەکانەوە، بەڵام سکۆلاریزاسیۆن هەوڵێکە بۆ بەڕێوەبردنی ئەم فەلسەفەیە، هەرچەند ئەگەر بە زۆرەملێش بێت. لە کۆمەڵگای سکۆلاردا دەنگی بونیادە دینیەکان کپ ناکرێن و ئەتوانن بە ئاشکرا ئەم بونیادانە ڕای خۆیان سەبارەت بە کاروباری گشتی دەربڕن، بەڵام هیچ ئیمتیازێکی تایبەتیان پێ نادرێت و دەسەڵات و توانایی ئەوان لە بواری تایبەتیدا سنووردار ئەکرێت. ئەوانە کە لە ژیانیاندا بڕوایان بە بەها دینیەکان هەیە، لە هەڵبژاردنیدا ئازادن بەڵام دەوڵەت نابێت ئەمانە بە هیچ چەشنێك تەمبێ یا تەشوێق بکات.. مەبەستە بنەڕەتی و سەرەکیەکانی سکۆلاریزم ئەمانەن:

-چاك کردنی ژیانی دنیایی لە ڕێگەی کەرەستە مادییەکانەوە.

-عیلم (زانست) تەنیا پەرجو (مۆجیزە)ی زیندوو حازری ئەم جیهانەیە.

-خێر لە چاکە کردندایە چ دونیایەکی تر ببێت یا نەبێت.

-چاکە کردن لەم دونیایەدا و بەردەوام بوون لەم ڕێگەدا، خودی خێرە.

**سەرچاوە:**

WWW.ARMANS.COM

ماریۆن زیمەر برادلی
لە ئینگلیزییەوە: پشتیوان مبارك كریم

# كورتە چیرۆك چییە؟

كاتێك لەبارەی كورتە چیرۆكەوە دەدوێم، دەگەڕێمەوە بۆ كورتە چیرۆكی بازاڕی، یاخود ئەو كورتە چیرۆكانەی كە بۆ مەبەستی پارە پەیدا كردن دەنوسرێن نەك ئەو كورتە چیرۆكانەی كە لە نیویۆرك دەنوسرێن یان كورتە چیرۆكی ئەدەبی. من لە هونەری نوسین و فرۆشتنی ئەوەی كە بە چیرۆكی بازاڕی ناسراوە گەلێك شارەزام. من دەمێكە سورم لەسەر ئەوەی كە یەكێك بتوانێت ڕستەیەك لە رۆشنبیری ئینگلیزیدا بنوسێت، دەتوانێت فێری نوسین بێت و دەتوانێت نوسینێكی زیندوو هاكەزایی بەرهەم بهێنێت كە بمێنێتەوەو لەو بازاڕانەدا بیانفرۆشێت، بەڵام پێویستە هەندێك یاسای سادە و ساكار فێر ببێت.

دەتوانرێت لەم یاسایانە لابدرێت و بەردەوامیش لە چیرۆكە بازاڕیەكاندا دەشكێنرێن، بەڵام تەنها لەلایەن ئەو نوسەرانەوە كە بە ووردی شارەزایانن و بە تەواوی دەزانن چۆن و بۆچی لەجیاتی بەڕێوەبەر، ڕەگەزگەلێكی وەكو بریكار هەژمار دەكات.. بەڵێ، وتم بەڕێوەبەر.. ڕەگەزگەلێك كە پێویستە نوسەر لە هەموو چیرۆكێكدا بەرجەستەی بكات كە دەیانفرۆشێت.

لە ڕاستیدا هەموو جۆرەكانی چیرۆك، چ چیرۆكی زانستی بێت یاخود ڕۆمانسی، كۆمیدی، فانتازی، سەركەشی، خۆرئاوایی یاخود هەر جۆرێكی تری چیرۆك بێت.. هەمان چوارچێوەی هەیە لەبەرئەوەی بگونجێت بە «شێواز» دەناسرێت. ئەم ووشەیە مانایەكی زۆر نێگەتیڤی فەراهەم هێنا، بەڵام بە شێوەیەكی سەرەكی پوختەیەكی سادەی ئەو ئەزمونەیە كە نوسەران پێیگەیشتن كە پێدەچێت خوێنەر لە ناوەڕۆكی چیرۆكەكەدا مەبەستی بێت بیزانێت.

ئەو نوسەرانەی كە شارەزای ئەم شێوازەن سەرنوسەر ئاگادار دەكەنەوە لەوەی كە

خوێنەرەکانی دەیانەوێت لە هەرکوێیەك بن ژیانێکی سادە و ساکار دروست بکەن. هەروەها هەندێکیشیان برێکی خەیاڵیی پارەیان دەست کەوتووە.

ئەو نوسەرانەی کە ئەم شێوازەیان فەرامۆش کردووە، یان لە نەزانینیندایە یاخود لەبەرئەوەیە کە بەراستی باوەڕیان وایە کە کەسێك داهێنەری نوسین بێت پێویست ناکات بەسەر داخوازی جۆرەکانی چیرۆك یاخود شێوازدا تێپەڕێت یان باز بدات، بە گشتی بە برسی بوون و بێکاربوونی ئەو هونەرمەندانە کۆتایی دێت.. ئەگەر نا ئەوانە بەهرەمەندن، لە هەر کاتێکدا بێت پێویستیان بە چەشنەکانی هونەری نوسین نییە. بە کارەکانیان دەڵێن وێژە، بەسەر خەڵکییەوە بەردەوام دەبن کە شێوازە ئەدەبییەکان ناناسنەوە.

خوێنەری ئاسایی هەرچەندە بۆ ڕۆشنبیری ئەدەبی ناخوێنێتەوە، خوێنەری ئاسایی بوونی ڕۆشنبیری ئەدەبی نازانێت. خوێنەری ئاسایی.. توانای دووبارە کردنەوەی نییە ئەگەر خوازیاری مانەوەو نەمری بێت لە نوسینی چیرۆکدا.. بەڵکو تەنها بۆ ئەوە دەخوێنێتەوە کاتێکی خۆش بەسەربەرێت. هەروەها جۆری ئەو بابەتەی کە خوێنەر دەیەوێت بە وردی لێیکۆڵرابێتەوە تەنانەت داستانی ئۆدیسەی یۆنانیش بە ڕوونی دیارە کە زۆر هەمەجۆر نییە.

یەکەمین ڕۆمان کە هەیە، سێ هەزار ساڵ پێش ئێستا یان زیاتریش باسی چۆنیەتی کۆشش و ململانێی پاڵەوانێك دەکات کە بە چەندین مەترسیدا تێدەپەڕێت بۆ گەیشتنە ماڵەوە بۆ لای هاوسەر و خێزانەکەی و لە دەستی چەندین چەتەو ڕێگر هەڵدێت کە شوێنی دەکەون. لەبەرئەوە با ڕەگەزەکانی چیرۆکی بازاڕی تاقی بکەینەوە.

## ڕەگەزەکانی کورتە چیرۆك:

زۆربەی کورتە چیرۆکەکان ئیش لەسەر هەندێك لەم جیاوازیانەی خوارەوە دەکەن (لەوانەش زۆربەی ڕۆمانەکان، بەڵام ڕۆمان کار لە خێراییەکی جیاوازدا دەکات):

کارەکتەری ئێسك سوك کە سەردەکەوێت بەسەر زۆربەی گریمانە دژوارەکاندا بەهۆی هەوڵ و تێکۆشانی خۆیەوە ئامانجێکی بەسود بەدەست دێنێت. بە شێوەیەکی گشتی چیرۆکە ناکارامەکان نافرۆشرێن چونکە:

1-کارەکتەری سەرەکی وەکو پێویست ڕوخۆش و نەرم و نیان نییە.

خوێنەرەکەت دەیەوێت کارامە بێت لە دیاری کردنی ڕاستی و دروستی ئەو ڕێگایەی کە کارەکتەرە سەرەکیەکەت یان پاڵەوانەکەت کێشەکانی پێ چارەسەر دەکات. «لەم گرێیەدا جیاوازیەك هەیە کە ناکەس بە چەیەکی زۆردار هەرچییەك بێت بۆ لای دەیکوژێت و خوێنەریش چێژ لە چاودێریکردنی وەردەگرێت کاتێك کە دەکەوێتە خەم و پەژارەوە، بەڵام ئەمە بۆ دەستپێکەران نییە».

2-ئەگەرەکان وەکو پێویست چارەسەر ناکرێن یان خوێنەر باوەڕ ناکات کە بە تەواوی چارەسەر ناکرێن. ئەگەر ژنە پاڵەوانەکەت ڕۆشتە دەرەوە بۆ ڕاوکردنی ورچێك، پێویست ناکات بێچووە ورچێکی زۆر بچوکی ناکارامە ڕاو بکات کە بیخاتە گیرفانیەوە بیهێنێتەوە بۆ ماڵەوە بیداتە منداڵە بەناز بەخێوکراوەکەی. پێویستە خوێنەر کێشەیەکی ڕاستەقینەی هەبێت. هەروەها کێشەی ساختەو نادروستیش وەك پلانگێکی ئەفسانەی دەناسرێت کە لە ڕواڵەتدا بەهێز و ترسناکە بەڵام لە ڕاستیدا ئەفسانەییە و بوونی نییە.

3-کارەکتەری سەرەکی بەهەوڵ و تێکۆشانی خۆی کێشەکەی چارەسەر ناکات، بەڵکو کێشەکە بەهۆی فریاد ڕەسەکەیەوە لەباتی کارەکتەرەکە چارەسەر دەکرێت، بۆ نموونە لە دواهەمین ساتدا هێزی سوارەی سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکان بەسەر گردێکەوە دەردەکەون و دێن بە هانایەوە. بەم بێبەشکردنەی خوێنەر

لە چانسی هەوڵ و ماندوبوون، کێشمە کێش و ململانێ، خەمی شتێکی لەدەستچوو، هاوسۆزی، غەمگینی، بە پێچەوانەوە هەستدەکات هێز و توانای کارەکتەرەکە لە کاتێکدا شەڕی دەکرد لە پێناوی سەرکەوتندا تەنها ئەگەرێکی قورس و گران بوو.

4-ئەنجامی کۆتایی هەر لە سەرەتاوە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست پێشبینی دەکرێت، خوێنەر هەر لە سەرەتاوە دەزانێت کە بۆ نمونە پاڵەوانەکەمان تۆپی یاریەکە، کچەکە یان شەڕەکە دەباتەوە. چەندین گرێ هەیە کە پێی دەوترێت گرێ ناپەسەندەکان.. گرێ دەتوانێت بەردەوام بێت تەنها لەبەرئەوەی هەموو کەس هەر هەڵسوکەوتێکی ناپەسەندی هەیە. ئەو چیرۆکانە تیایاندا دەتوانرێت هەموو کێشەکان بە بەرپرسیارێکی سادەو ساکار چارەسەر بکرێت بۆ نمونە «بۆچی ئێوە ئەو پیاوەتان ماچ کرد؟» چونکە ئەوە خاڵە دڵسۆزەکەمانە. کۆتایی غەم و پەژارەیەکی ڕۆمانتیکییە. یاخود دیسانەوە چیرۆکی ئەوەی کە کچەکە نهێنییەك دەزانێت بەڵام بە پۆلیس ناڵێت چونکە یەکسەر دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە خۆشەویستەکەی بکوژەکەیە.

5-ئامانج یان مەبەستی چیرۆکەکە هێندە بە بایەخ نییە، یان خوێنەرە تایبەتەکان وای نابینن کە بە بایەخ بێت. بۆ نموونە خوێنەرە جیهانیەکان، ڕەنگە ئامادە نەبن بە کوڵ بگرین و خەم بخۆن بۆ ژنێکی ماڵەوە کە دزی دەکات، درۆ دەکات و دەستی خەڵکی دەبڕێت بۆ ئەوەی دۆشەکێکی تازەی بۆ قەنەفەکە دەست بکەوێت. ئەمە لە ڕۆژگاری فیمینزمدا بەردەوام زەحمەت دەبوو بۆ نوسەرە ڕۆمانتیکیەکان تاکو زۆرینەی ئەو خوێنەرانەیان قایل بکەن کە ئافرەت بوون چونکە ئافرەت هەموو جۆرەکانی شەرمەزاریان دەخستە ئەستۆی پیاو، چونکە وا دەردەکەوێت کە دەوڵەمەند و قۆز و ڕۆمانسیە. لەلایەکی ترەوە، دەتوانیت ئامانجەکەت زۆر بەرفراوان بێت: جۆن وایت هەموو جەنگی جیهانی دووەمی بە دەستی خۆی بردەوە، یان کاپتن کێرك بە تەنیا، بێ یارمەتی کەس کۆمەڵێك کەسی زیرەك و بلیمەتی ڕزگار کرد.

## دەست پێکردن بە چیرۆکەکەت:

لە یەکەمین جوت پەرەگرافدا.. بە دڵنیاییەوە لە یەکەمین لاپەڕەدا، تەنانەت چیرۆکەکەت بەڕادەی درێژی ڕۆمانێکیش بێت.. خوێنەر دەیەوێت ئەم شتانەی خوارەوە بزانێت:

*کارەکتەری سەرەکیت کێیە؟ نێر؟ مێ؟ کەروێشك یان ڕۆبۆت، پاشا یان کۆیلە، پاڵەوانێکە شانازی بە پیاوەتی خۆیەوە دەکات بەرامبەر بە ئافرەتان یان کەسێکی لاواز و بێ دەسەڵاتە. ژنێکی دڵڕفێنە یان ژنە سەربازێکی چاونەترسی توند و تیژە؟

*لە کوێ ئەم ڕووداوە ڕوودەدات؟ پێویستە بزانیت کە ئایا لە زیندانێکی تاریکی ژێر زەمینەکانی دەزگا سەرکوتکەرەکانی کاسۆلیکی ڕۆمانیدایت، یان نزیك نۆکەندەکانی مەریخ، بە ناو دارستانەکانی سەروی ئەمازۆندا گەشت دەکەین یان لە بیابانەکانی خواروی نیل، لە جەمسەری بەستەڵەکی باکور یان لە زەردەپەری خۆرئاوا یان لە ژوورێکی خۆگۆڕینی وەرزشی لە خوێندنگایەکی ئامادەیی ناوخۆی یان لە پشت پەردەی ئۆپێرای گەورە شارێکدا، یان لە بەلەمێکدا لەگەڵ خەڵکی ئینگلتەرای نوێدا.

*کەی ئەم ڕووداوە ڕوودەدات؟ ئەمە گرنگیەکی تایبەتی هەیە لە زانستی چیرۆك نوسیندا یان لە ڕۆمانی فەنتازیدا، بەڵام دیسانەوە پەیوەندییەکی مێژوویی هەیە بە باسەکەوە، گۆتیەکان، خۆرئاواییەکان.. ئەگەری هەموو شتێك هەیە، بەڵام ئاساییە کوڕێك لە ژووانێکدا کچێك ببینێت. بۆئەوەی دیمەنی چیرۆکێك لە ئەندێشەی خوێنەردا بخوڵقێنێت پێویستە دەسبەجێ بزانێت ئایا ئەم ژووانە ئەمڕۆ ڕوودەدات یان دوو ڕۆژی تر، پێش ئێستا ڕوویداوە، ڕۆژانی شا ئەرئەریان شۆڕشی فەرەنسی، پەنجا ساڵ لەمەوپێش، یان لە

دێر زەمانەوە لە کۆمەڵە ئەستێرەیەکی زۆر زۆر دوورەوە ڕوویداوە...»

*چ جۆرێکی چیرۆکە؟ یەکەمین لاپەڕە یان پەرەگراف، هیچکام لە بەرهەڵستیە ئێجگار زۆرەکانی گۆتیەکان لە سەرەتایی خۆرئاوایی بوونەوە نابێتە هەڵە بۆ یەکەمین لاپەڕەی ڕۆمانسی یان فەنتازی یان سەرکەشی شمشێر و جادووبازی، ئەمانە هەمووی کە جیاوازیەکی ئێجگار زۆری هەیە لە چیرۆکە زانستیە کرداریەکان و تەکنۆلۆژیا یان لە کتێبە منالانەکاندا. دیسانەوە دەبێت هەستێك یان مەزاجێك لە چیرۆکەکەتدا بنیات بنێیت لەبەرئەوەی یەکسەر خوێنەر بزانێت کە ئەم چیرۆکە گاڵتەئامێز یان هەجویەکی لاقرتێ ئامێز یان ڕۆمانسیەکی کاریگەرە یان گاڵتە بازاریە یاخود پەستی و دڵتەنگیە یان تراژیدیە. زۆربەی خوێنەران بە تەواوی دەزانن دەیانەوێت چی بخوێننەوە و کاتێك جۆرێکی تایبەتی گۆڤار دەکڕن چاوەڕێی جۆرێکی تایبەتی چیرۆك دەکەن.

خوێنەرانی لەم جۆرە زۆر پەست و تورە دەبن ئەگەر چیرۆکی شمشێر و جادوبازی لە گۆڤارەکانیاندا ببینن و ئەگەرچی پیشەی شازادە ئیلیری چاپکردنی چیرۆکی خەیاڵی زانستی بێت لەوانەیە یەکجار بێت لە ساڵێکدا، ئەو چیرۆکی خەیاڵی زانستییە پێویستە چیرۆکێك بێت، تایبەت بە دۆزینەوەی ئەندێشە زانستییە چاوەڕوان کراوەکان.

کاتێك کە خوێنەر گۆڤارێك دەکڕێت هیوایەکی زۆر دیاریکراوی هەیە بەو جۆرەی چیرۆك کە ئەو دەیەوێت بیخوێنێتەوە و ئەگەر بەدەستی نەهێنا ئەوا لە کڕینی گۆڤارەکە دەوەستێت، هەروەها ئەگەر سەرنوسەرەکە ئەم ئامانجە نەپێکێت، ئەوا بێکار دەبێت، ئەگەر خوێنەرەکەت وەڕس بوو یان نائومێد بوو لە یەکەمین لاپەڕە.. یان پەرەگرافدا.. هیچ شتێك لەسەر زەوی هانی نادات لاپەڕەی دووەم هەڵداتەوەو بیخوێنێتەوە. هەروەها ئەگەر سەرنوسەرەکە بێزار بوو یان بێ هیوا بوو لە لاپەڕەیەکدا، خوێنەری ئەو گۆڤارە نییە هەرگیز تەماشای چیرۆکەکە بکات.

## خود ڕەخنەسازی،
## چۆن چیرۆکەکەت شیکاردەکەی؟:

زۆربەی ڕەگەزەکانی کورتە چیرۆك (هەروەها نۆڤلێت یان ڕۆمان) بەم بنەما سادانەدا دەگوزەرێ. بە ئاشکرا دیارە زەحمەتە تێگەیشتن لەوەی بۆچی زۆر نوسەرە ناکارامەکان هەرگیز خۆیان بە لێکدانەوەی ئەم بنەما سادە و ساکارانەوە ماندوو ناکەن، یان لانی کەم هەڵوێستەیەکی لەسەر بکەن. من تاکو ئێستاش هەموو ڕۆژێك چەندین دەستنوسم دەست دەکەوێت کە نوسەرەکە ئاگاداری ئەو ڕێسا سادە و ساکارانە نییە یاخود فەرامۆشی کردووە، لەبەرئەوە خۆت چیرۆکەکەت شیکاربکە. کارەکتەرە ڕوخۆش و نەرم و نیانەکەت لەبیر بێت کە لە بەرامبەر زۆربەی گرێ کوێرەکاندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە. کێشەکەی بە هەوڵ و تێکۆشانی تایبەتی خۆی چارەسەر دەکات، ئامانجێکی بەنرخ و شایستە دەباتەوەو بارودۆخەکە دەگۆڕێت، بە هۆی ئەزمونەوە بەردەوام باشتر دەبێت. لە بیرت بێت کە سەرنوسەر پێویستی بە چیرۆکە باشەکانە. ئەگەر نەتوانێت بیاندۆزێتەوەو بە چاپی بگەیەنێت و بە خەڵکی بگەیەنێت، ووردە ووردە هەرەس دێنێت و بە جۆرێك توشی شکست دێت کە دەبێت بۆ کارێکی تر بگەڕێت. کەواتە لە خۆت بپرسە:

*کەسایەتی (کارەکتەر) سەرەکی چیرۆکەکەت چ جۆرە کەسایەتیەکە؟

ئایا خوێنەر دەتوانێت هاوسۆزی بێت؟ لەگەڵ ئەو کەسایەتیە تایبەتیەو بەو کێشانەیەوە ئایا خوێنەر دەیەوێت پشتگیری بکات؟

*چۆن دەتوانیت بە باشترین شێوە ئەو چیرۆکی کەسایەتیە پێشکەش بکەیت؟ ئایا یەکەمین کەسایەتیە؟ یاخود سێیەمین کەسایەتیە؟ ئایا چاودێرێکی زۆر بەتوانایە؟ ئایا چیرۆکەکە گاڵتەئامێزە یان تراژیدییە یان

خوێنەر سەرقاڵ دەکات بە بیرکردنەوەوە یان قۆشمەچێتییە؟

*لە کوێوە چیرۆکەکەت دەست پێدەکەیت؟ دەگمەنە لەگەڵ لەدایك بوونی کارەکتەری سەرەکیدا دەستپێکردنی چیرۆکەکە پەسەند بێت. پاڵەوانی چیرۆکەکە لە چ قۆناغێکی ژیانیدا ڕووبەڕووی ئەزموونێکی ڕەخنە ئامێز دەبێتەوە کە پەیوەندی بەو بابەتەوە هەیە کە تۆ هەڵت بژاردووە بۆ نوسین؟ هەروەها بۆچی هێندە گرنگی هەیە؟ بە شێوەیەکی گشتی، پێویستە بە شێوەیەکی گونجاو بچیتە ناو ڕووداوەکانەوە. ئەو چیرۆکانەی کە بە سێ لاپەڕە وەسفی کەش و هەوا دەست پێدەکەن، هەمیشە نوسەرەکەی لە دوای لاپەڕەیەك بێ بەش دەبێت. دروشمی «وێنای بکە» پیشانی بدە» نەك بیگێڕیتەوە» دروشمێکی جوانە.

*هەوڵ دەدەیت چی بڵێیت؟ لەم ڕۆژگارەدا کەس چیرۆکێکی ناوێت کە لە کۆتایدا نوسرا بێت «ئێستا پەند لەم چیرۆکەدا...» بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی، چیرۆکەکەت لەبارەی چییەوە بوو؟ گرێی چیرۆکەکەت چی بوو؟ بیر بکەرەوە لە سێ یان چوار چیرۆك کە خۆت پەسەندت کردووە و حەزت لێیکردووە بۆ خۆتی شیکار بکە، پاشان لە خۆت بپرسە بۆچی پەسەندت کردن؟ چی وای لێکردیت تا کۆتایی بیانخوێنیتەوە لەجیاتی ئەوەی بە نیوە ناچڵ دایانێیت و فەرامۆشیان بکەیت؟ نوسەرەکە چی ووت؟ ئایا چیرۆکەکە شایانی خوێندنەوە بوو؟ بۆچی یان بۆچی نا؟

### لە کۆتاییدا:

زۆربەی فرۆشتنی چیرۆك لە لاپەڕەی یەکەمدا لەکیس دەچێت، کاتێك کە سەرنوسەرەکە بە ئاسانی ناتوانێت هێندە تام و چێژ لە چیرۆکەکەت نابات تا وەکو لە خوێندنەوەی بەردەوام بێت، یان لە دواهەمین لاپەڕەدا، سەرنوسەرەکە هاورا نییە لەگەڵ لێکدانەوە یاخود بە ڕێگا چارەی کۆتایی چیرۆکەکە ڕازی نییە، دواهەمین بریاری یەکلاکەرەوە هێندە چڕو پڕو بەهێز نییە، هێندە باوەڕپێکراو نییە، یاخود وەکو پێویست بەتام و چێژنییە.

هەمیشە ئەوەت لەیاد بێت: ئیشی سەرنوسەر ئەوە نییە کە هەوڵ بدات تام و چێژ بدات بە دەستنوسەکەت، بەڵکو دەیەوێت چیرۆکە پەسەندەکان بدۆزێتەوە، هەروەها دەیەوێت ئەم چیرۆکە پەسەندانە بە جەماوەرەکەی بگەیەنێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئیشی تۆیە لەو چیرۆکەدا کە تۆ بڵاوی دەکەیتەوە، سەرنجی ڕابکێشیت تاوەکو سەرنوسەرەکە هەموو لاپەڕەکان هەڵبداتەوە هەتا دەگاتە کۆتایی، دەبێت ویستی بەرجەستە بکەیت تاوەکو هەموو لاپەڕەکان هەڵبداتەوە، ویستی ئەوەی بیەوێت بزانێت چیتر ڕوودەدات، تەنانەت ئەگەر بۆچونی جیاوازیشی هەبوو لەگەڵتدا، یان ئەگەر نەیتوانی ئەم چیرۆکەیانت بکرێت، ناوەکەتی هەر لەیادەو لە کاتێکی تردا بابەتی ترت دەبێت کە پێویستیەکانی پردەکەنەوەو ڕەنگە بیفرۆشیت.

ئەگەر سەرنوسەرەکە وەرس بوو، هیچ شتێك ئاسانتر نییە لەوەی لە خوێندنەوەی بوەستێت. دەست رادەکێشێت بۆ ڕۆژنامەکان و دەیخاتە سەر بەستەیەك بۆ سکرتێرەکەی بۆ فرێدان. هەمیشە چەندین چیرۆکی تر هەیە چاوەڕێی خوێندنەوەن. ئەگەر بێزار بوو لە خوێندنەوەی چیرۆکەکەت، دەشزانێت کە ڕەنگە خوێنەرەکانیشی دیسانەوە بێزاربن. ئەوە ئیشی ئەوە بزانێت خوێنەرەکانی چیان دەوێت، ئینجا پێیان بگەیەنێت لەبەرئەوە بەردەوام دەگەڕێنەوە بۆ گۆڤارەکەی بۆ مەبەستی هەندێك تام و چێژوەرگرتن پارەی سینەما یاخود هەندێك شتی تری بۆ تەرخان دەکەن. هەروەها ئەو کەسانە لە هەموو ئەو شوێنانەدان کە ئێمە ڕۆشتووین.

### سەرچاوە:

لە ئینتەرنێتەوە: سایتی نوسەر.

www.mzbworks.home.att.net/index.htm...

ئیزابێل ئەلێندی
لە ئینگلیزییەوە: ئەدیب نادر

# والیمای

ئەو ناوەی باوکم لێی ناوم والیمایە، کە بە زوبانی براکانی باکوورمان «با» دەگەیەنێت. دەتوانم پێتی ڕابگەیەنم، چونکێ ئێستا ئیدی تۆ وەکو کچی خۆم وایت و ئیزنی منت هەیە کە بە ناوی خۆمەوە بانگم بکەیت، ئەگەر چیش هەر تەنها ئەو کاتەی کە لە میانی خێزانداین، ناوی کەسان و بوونەوەرە زیندوەکان پەیجۆری ڕێز دەکەن، چونکە کاتێك کە لەگەڵیاندا قسە دەکەین دەست لە دڵیان دەدەین و دەبینە بەشێك لە هێزی ژیانیان. ئابەمشێوەیە ئێمەی پیاوانی خزمەخوێن پێشوازی لە یەکتری دەکەین، نایشتوانم لەو ئاسانییە حاڵی بم کە سپی پێستەکان بەبێ ترس و بیم ناوی یەکتری پێ بانگ دەکەن، ئەوەش نەك هەر تەنها بێ ڕێزی پیشان دەدات، بەڵکو هەروەها دەیشتوانێ بەرەو مەترسییەکی جیددی بڕوات. تێبینی ئەوەشم کردووە کە ئەو کەسانە بێ عەقڵانە داخێون، دەرك بەوەش ناکەن کە ئاخاوتن هەروەها بوونیشە. پەیڤ و هێما تێفکرینی مرۆڤن، نابێت بەبێ هۆ قسە بکەین، ئەمەم فێری کورەکان و کچەکانی خۆشم کردووە، وەلێ هەموو دەمێك گوێ قولاغی ئامۆژگارییەکانی من نین. سەردەمانی زوو، تابۆ و ترادیسیۆنەکان حورمەتیان دەگیرا. باپیرە گەورەکانی من و باپیرە گەورەی باپیرە گەورەکانم، سەرجەم زانیارییە زەرووریییەکانیان لە باپیرە گەورەکانیانەوە دەستگیر ببوو. هیچ شتێك نەگۆڕا بوو. پیاوێك کە خاوەنی یادەوەرییەکی چوست و چالاك بووایە دەیتوانی هەموو ئەو ڕێنماییانە بهێنێتەوە یاد کە دەستەبەری کردبوون و ئیدی ئەئاوایش دەیزانی لە هەر بارودۆخێکدا چی بکات. کەچی دوای ئەوە سپی پێستەکان هاتن و دژی حیکمەتی باپیرە گەورەکان قسەیان کرد و ئێمەیان لەسەرزەمینی خۆمان دوورخستەوە. ئێمەیش هەردەم قووڵتر بەرەو نێو جەنگەڵ بەڕێ دەکەوتین، بەڵام

هەمیشە پێمان دەگەیشتن، هەندێجار سالآنێك ڕادەبوردن، کەچی ئاکام هەمدیس دەهاتنەوە، ئێمەیش دەبوایە کێڵگە چێنراوەکانمان وێران بکەین و زارۆڵەکانمان بخەینە قەڵاندۆشکان و ئاژەڵەکانمان شەتەك بدەین و بڕۆین. لەوساوەش کە یادەوەریم هەیە هەروا بووە: هەموو شتێك بەجێ بهێڵە و مشك ئاسا هەڵێ — نەك وەکو جەنگاوەرە مەزنەکان و ئەو خواوەندانەی کە لە ڕۆژگارە دیرۆکەکاندا نیشتەجێی ئەم زەوی و زارانە ببوون. هەندێك لە گەنجەکانمان لەبارەی سپی پێستەکانەوە لا پڕە سەنن و ئەو کاتەی کە بەرەو نێو قووڵایی دارستان کۆچ دەکەین بۆ ئەوەی سەرومڕیی بەو ژیانە بدەین کە باوباپیرانمان ژیاون، ڕێگایەکی جیاواز دەگرنە بەر. ئەوانەی کە جیادەبنەوە بەشێوەیەك لێیان تێدەفکرین وەکو ئەوەی ئیتر مردبن، چونکە فرەکەمیان دەگەڕێنەوەو ئەوانەیش کە دەگەڕێنەوە فرە گۆڕاون بۆیە ئیدی ناتوانین وەکو خزم و خۆیش بیانناسینەوە. دەگێڕنەوە کە سالآنێك بەر لە هاتنە دنیای من خەڵکەکەمان بە ئەندازەیەکی ئەوتۆ کچیان بۆ نەهاتبووە دنیاوە، بۆیە باوکم بۆ سەنگوسووژ بەدوای ژنی خێڵێکی جیاوازدا دەبووایە ڕێگا دوور و درێژەکان ببڕێت. بە جەنگەڵەکاندا کۆچی کردبوو، دوای شوێنی ئەوانە کەوتبوو کە بەر لەو بۆ هەمان مەبەست بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتبوون و بەو ژنانەوە گەڕابوونەوە کە هاوخوێنی خۆمان نەبوون. پاش گەشتێکی زۆر و زەبەند، کاتێك کە باوکم خەریك ببوو لە پەیداکردنی هاوسەری ژیان ئومێدبڕە ببێت، لە تەنیشت هەشارێکی بەرزدا، لە تەنیشت ڕووبارێك کە لە ئاسمانەوە دادەڕژایە خوارەوە، کیژێکی ڕاوەستاوی بینی بوو. لە مەودایەکی تا ڕادەیەك دوورەوە ڕاوەستابوو بۆئەوەی نەیترسێنێ، بەو تۆنە دەنگەی کە ڕاوچییەکان بۆ هێوراندنی نێچیرەکەیان بەکاری دەهێنن لەگەڵیدا قسەی کردبوو و بۆ خواستنیشی ئاتاجی خۆی بۆی ڕاڤە کردبووەوە. ئەویش هەندێك هێمای ئەوەی بۆ کردبوو هامانا دەتوانێ لێی بێتە پێشەوە، ئینجا بە ڕاشکاوی لێی خوردببووەوەو دەکرێ بە ڕووخساری گەشتیارەکە خۆشحاڵ بوویێت، چونکە بڕیاری دابوو کە بیرۆکەی هاوسەرگیریی بیرۆکەیەکی هەڵەشە نەبوو. بۆیە باوکم دەبوایە هەتاکو بەهای ئافرەتەکەی تەواو دەکرد بۆ خەزووری کار بکات. پاش ئەوەیش کە ڕیتواڵەکانی هاوسەرگیرییان وەدی هێنابوو، گەشتی گەڕانەوەیان بۆ گوندەکەمان دەست پێکردبوو.

من لەگەڵ برا و خوشکەکانمدا لەژێر چڵ و پۆی درەختە بەرزەکاندا گەورە بووم و هەرگیزیش هەتاوم نەبینی. جاروبار دارێکی بریندار دەکەوت و چۆڵاییەکی لەنێو چڕوپڕیی پۆپەی جەنگەڵەکەدا بەجێدەهێشت، هەر تەنها لەو کاتانەدا چاوی شینی ئاسمانمان دەبینی. باوك و دایکم کۆمەڵێ حیکایەتیان بۆ دەگێڕامەوە، کۆمەڵێ گۆرانیان بۆ دەچڕیم و فێریان دەکردم کە پیاو بۆ ئەوەی بە تاق و تەنیایی و بەبێ هیچ شتێك بێجگە لە کەوانەکەی و تیرەکانی بە زیندوویی بمێنێتەوە، پێویستە چی بزانێت. من ئازاد و ڕەها بووم. ئێمەی زارۆڵەکانی مانگ، ئەگەر ئازاد و ڕەها نەبین ناتوانین هەڵبکەین. کاتێك کە زیندانی نێو دیوار یاخود شیشبەندەکانین لە ناخەوە هەرەس دەهێنین، کوێرو کەڕ دەبین و لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا ڕۆحمان خۆی لە ئێسقانەکانی سینەمان دادەبڕێت و دەستبەردارمان دەبێت. ئا لەو ئانوساتانەدا چەشنی گیانەوەرە مەینەتبارەکانمان لێ دێت و لە ڕاستیشدا هەمیشە ئەوەمان پێ باشە کە بمرین. لەبەرئەوەیە کە خانووەکانمان دیواریان نییە، هەر بە تەنها ساپیتەیەکی لاریان هەیە بۆ بەرگرتن لە هەواو دابڕاندن لە باران، لە ژێریدا بە پاڵ یەکەوە جۆلانە خەوەکانمان هەڵدەواسین، چونکە حەز دەکەین گوێ لە خەونی ژن و منداڵەکان بگرین و هەست بە هەناسەی ئەو مەیموون و سەگ و بەرازانەش بکەین کەوا لە ژێر هەمان پەناگەدا دەنوون. لە زەمانە زووترەکانیشدا، بەبێ ئەوەی کە بزانین جیهانێك لەودیو کەندەلاّن و ڕووبارەکاندا هەیە و لە ناوجەرگەی جەنگەڵدا دەژیاین. هاوڕێکانمان لە هۆزەکانی ترەوە بۆ سەردانی دەهاتن و بەند و باویان لەبارەی بووا ڤێستا و ئێل پلانتانالەوە، لەبارەی سپی پێستەکان و خووخدەکانیانەوە پێ دەووتین، بەلاّم ئێمە

لەو بڕوایەدا بووین کە ئەم شتانە هەر تەنها چیرۆک گەلێک بوون بۆ ئەوەی بە پێکەنینمان بخەن. ئینجا گەیشتمە قۆناغی پیاوەتی و بۆ پەیداکردنی هاوسەر نۆرەی من هات، بەڵام من بڕیاری چاوەڕوانیم دا، چونکە ئارەزووی ئەوەم دەکرد لەگەڵ زگورتییەکاندا بم، خۆشحاڵ بووین و بە خۆشی دەژیاین. لەگەڵ ئەوەشدا، پێم نەدەکرا وەکو ئەوانی دی تەواو خۆم بۆ گەمە بازی و حەسانەوەکان تەرخان بکەم، لەبەر ئەوەی کە ماڵباتەکەی من زۆر گەورە بوو، براکان و خوشکەکان، ئامۆزاکان، خوشکەزاکان و برازاکان، چەندین زار هەبوو بۆ دەرخوارد دان و کارێکی زۆر و زەبەندیش بۆ تاقە ڕاوچییەک. ڕۆژێک دەستە پیاوێکی ڕەنگپەڕیوو بۆ گوندەکەمان هاتن. بە هۆی پۆدرەوە[1] دوور بە دوور بەبێ سەلیقە و ئازایەتی شکاریان دەکرد، نە دەکاران بە درەختدا هەڵگژێن یاخود لەنێو ئاودا بە ڕم لە ماسی بدەن، گەوجانە لە میانی جەنگەڵەکان دەجووڵانەوە، سەروملیش لەنێو بارەکانیاندا، لە نێو چەک و تفاقەکانیاندا، هەتاکو لە نێو قاچەکانی خۆیشیاندا گرفتار و گیرۆدە بوون. ئەوان وەکو ئێمە بە هەوا خۆیان نەپۆشی بوو، بەڵکو جلوبەرگی نەرموشل و بۆن بۆگەن لێهاتوویان دەپۆشی، پیس و پۆخڵ بوون و یاساکانی ڕەووشتجوانیان نەدەزانی، بەڵام لەسەرئەوە پەیگیر بوون کە هەموو شتێکمان دەربارەی زانیارییەکان و خواوەندەکانی خۆیان بۆ بگێڕنەوە. ئێمەیش ئەمانەمان لەگەڵ سەرجەم ئەوانەدا بەراوورد دەکردەوە کە دەربارەی پیاوە سپییەکان پێمان ووترا بوو، هەقیقەتی ئەو دەمگۆیەشمان ئاوا سەلماند. دەستبەجێ درکمان بەوە کرد کە ئەم پیاوانە مژدەهێن، یاخود سەرباز یان مەتات کۆکەرەوە نەبوون، بەڵکو کۆمەڵە شێتێک بوون.

زەوی و زارەکەیان دەویست، دەیانویست دارەکان بگوازنەوە، هەروەها بەدوای بەردی بەنرخیشدا دەگەڕان. ئێمە ئەوەمان بۆ ڕاڤە کردنەوە کە جەنگەڵ شتێکی ئەوتۆ نییە بدرێتە سەر شانتان و چەشنی باڵندەیەکی مردوو بگوێزرێتەوە، بەڵام ئەوان نەیاندەویست گوێبیستی مشتومڕەکانی ئێمە بن. لە تەنیشت گوندەکەماندا ئۆردووگایان دروست کردبوو. هەریەکێکیان وەکو بای ئافات وا بوو، دەستی لە هەرچی شتێک بدابایە نوغرۆی دەکرد، بەدوای خۆیشیدا جێپێیەکی خاپووری بەجێدەهێشت و خەڵک و ئاژەڵەکانی شپرزەو نیگەران دەکرد. لە سەرەتادا ئێمە ملکەچی یاساکانی خۆش مەشرەبی و نەزاکەت بووین و خۆشحاڵمان دەکردن، چونکە میوانی ئێمە بوون، وەلێ قەتاوقەت خۆشنود نەبووین، هەردەم شتی زیاتریان دەویست، هەتا ئەو کاتەی کە لە یارییەکانیان شەکەت و بێزار بووین و هەنگین بە هەموو سرووتە سووننەتییەکانەوە جاری جەنگمان دا. ئەوان جەنگاوەری باش نەبوون، بە ئاسانی دەترسێندران و ئێسکە ناسکەکانی کاسەی سەریان بەرگەی ئەو تێلایەیان نەدەگرت کە پیاماندا دەکێشان. پاش ئەوە گوندەکەی خۆمان بەجێهێشت و بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشتین کە جەنگەڵ تیایدا لە سمین و تێپەڕاندن بەدەر بوو، لە میانی پۆپەی درەختەکانەوە بە مەودای دوور و درێژدا دەڕۆیشتین بۆئەوەی هاودەمەکانیان نەماندۆزنەوە. ئەوەشمان پێ ووترا بوو کە کیناوی و تۆڵەسێنن و بۆ هەر یەکێکیان کە دەمرێت، هەتا ئەگەر لە شەڕێکی ڕەوایشدا بێت، ئەوا دەتوانن سەر لە بەری تیرەیەک، تەنانەت بە منداڵەکانیشەوە لەناوبەرن. لەوێ جێگایەکمان دۆزییەوە بۆ ئەوەی گوندێکی تازە بونیاد بنێین. وەکو ئەوێمان باش نەبوو، چونکە ژنەکان بۆ ئەوەی ئاوی پاقژ بدۆزنەوە دەبوایە بە سەعات بڕۆن، لەگەڵ ئەوەشدا لەوێ ماینەوە و جێگیر بووین چونکە لەو بڕوایەدا بووین کە هیچ کەسێک بۆ گەڕان بەدوامانندا ئەمەندە دوور ناکەوێتەوە. ساڵێک دواتر، من لە گوندەکەمانەوە دوور بووم و جێ پێی پوومایەکم[2] هەڵگرتبوو، کاتێکم بە خۆ زانی کە زۆر لە ئۆردووگایەکی سەربازان نزیک بوومەتەوە. ماندوو بووم و ماوەی چەند ڕۆژێک دەبوو نانم نەخواردبوو، لەبەر ئەو هۆیە ڕاوبۆچوون و داوەرییەکی لاوازم بەکارهێنا. کاتێک کە چاوم بە بێگانەکان کەوت لەبریی ئەوەی بگەڕێمە دواوە، کەچی بۆ حەسانەوە ڕاکشام. سەربازەکانیش گرتیانم. ناوی ئەو پیاوانەیان نەبرد کە تا مردن دارکاریمان کردبوون. لە هەقیقەتدا هیچ

شتێكیان لێ نەپرسیم، لەوانە بوو ئەو پیاوانەیان نەناسیبێ یاخود نەیانزانیبێ كە من والیمایم. بۆ كاركردن لەگەڵ مەتات كۆكەرەوەكاندا فشاریاندام، لەگەڵ چەندین پیاوی تیرەو هۆزەكانی تردا، پیاوانێك كە پانتۆڵیان لەبەركردبوو بەبێ ئەوەی لە ویستەكانیان بیر بكرێتەوە بۆ كاركردن پێش خۆ درابوون. مەتات پەیجوری ئاگاییەكی زۆری دەكرد و خەڵكێكی ئەوتۆیش لەوێدا نەبوون كە كارەكە راپەرێنن، جا بەو هۆیەوە بوو كە زۆریان لە ئێمە دەكرد. ئەوە كاتێك بوو بێ ئازادی و نایشمەوێ لە بارەیەوە باخێوم. هەر تەنها لەبەر ئەوەیش مامەوە كە بزانم داخۆ دەتوانم هیچ شتێك فێربم، بەڵام هەر لە نواوە ئەوەم زانی كە بۆ قەومەكەی خۆم دەگەڕێمەوە. چونكە هیچ شتێك ناتوانێت جەنگاوەرێك دژ بە حەزو ویستی خۆی بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ دەست بەسەر بكات.

هەر لە هەڵهاتنی خۆرەوە هەتا ئاوابوونی كارمان دەكرد، هەندێكمان درەختەكانمان دەدۆشی بۆ ئەوەی دڵۆپ بە دڵۆپی ژیانیان خاڵی بكەینەوە، ئەوانی دیش شلەكەیان دەكوڵاند بۆ ئەوەی پەیت و خەستی بكەنەوەو بیكەن بە كۆمەڵە تۆپێكی گەورە. هەواكەی دەرەوە لە بۆنی بۆگەنی شیرەو ئاووگی سووتاوی درەختان تەژی بوو، هەواكەی ناوەوەی جێ خەوەكانیش بە ئارەقەی پیاوەكان ناخۆش و قێزەوون ببوو. هیچ كەسێك نەیدەتوانی ئا لەو جێگایەدا هەناسەیەكی قووڵ هەڵبكێشێ. بۆ خواردن گەنمەشامی و مۆز و ناوەڕۆكی سەیر و سەمەرەی هەندێك قتوویان دەدایێ كە من هەرگیز تامم نەدەكرد، چونكە هیچ شتێكی باش و بەكەڵك بۆ مرۆڤ لە نێو قتوودا نەشونما ناكات. لەسەرێكی ئۆردووگاكەدا كۆختێكی زەبەللاحیان بنیات نابوو ئا لەوێدا ئافرەتەكانیان گل دابووەوە. پاش ئەوەی كە دوو هەفتە بە مەتاتی خاو سەرقاڵ بووم، سەركارەكە پارچە كاغەزێكی دایە دەستم و بۆ ئەو شوێنەی كە ئافرەتەكانی لێ بوو رەوانەی كردم. هەروەها كووپە شەرابێكیشی دامێ، كە من بەسەر عەرزەكەدا رۆمكرد، چونكە بینیبووم كە چۆن چۆنی ئەو ئاوە هەست و هۆشی ماقووڵی مرۆی وێران دەكرد. لەگەڵ ئەوانی تردا لەسەرەدا وەستام. من دوا كەس بووم و كاتێك كە گەیشتە سەر نۆرەی من بۆ ئەوەی بچمە نێو كۆختەكەوە، هەتاو ئاوا ببوو و شەویش ئیدی بە دەنگی ژاوەژاوو سەرو سەدای بۆق و تووتییەكانییەوە دەستی پێكردبوو. ئافرەتەكە لە تیرەی ئایلا بوو، تیرەی خەڵكانێكی ناسك میهرەبان، كە زۆربەی زۆری كیژە ناسك و زەریفەكانی لێوە دەهاتن. هەندێك پیاو بۆ دۆزینەوەی تیرەی ئایلا چەندین مانگی سەروەر سەفەریان دەكرد، لەگەڵ خۆدا دیارییان بۆ دەبردن و راویان بۆ دەكردن بە هیوای ئەوەی كە یەكێك لە ئافرەتەكانیان بە دەست بهێنن. ئا لەوێدا هەلاژاو هەر بە مارەسەمەندەر دەچوو، لەگەڵ ئەوەشدا من هەر ناسیمەوە چونكە دایكیشم هەر ژنە ئایلایی بوو. بە رووتی لەسەر رایەخە كاییەكەیدا راكشابوو، بە هۆی قولەپێیەكییەوە بە زنجیرێكی بەسندم بە زەوییەوە داكوتراو شەتەك درابوو، وروگێژ، وەك بلێیت یۆپۆی[3] ئەكاسیای هەڵمژیبێت، بۆنی سەگە نەخۆش و دەغەزارەكانی لێوە دەهات و بە شەونمی سەراپاش ئەو پیاوانەش تەڕ ببوو كە بەر لە من لەگەڵیدا جووت ببوون. قەبارەی كوریژگەیەكی هەبوو و ئێسكەكانیشی وێنەی بەردە بچووكەكانی نێو رووبار قرتە قرتیان لێوە دەهات. ژنانی ئایلایی هەموو مووەكانی بەدەنیان دادەماڵن، هەتاكو برژانگەكانیشیان دادەماڵن، گوێچكەكانیان بە پەڕو گوڵ دەرازێننەوە، چیلكەی لووس و بریقەدار دەئاخننە نێو لووت و گۆناكانیانەوە، لە سەرانسەری جەستەیاندا بە رەنگە سوورەكانی ئەناتتۆو[4] رەنگی ئەرخەوانیی تۆخی دار خورما و رەنگی سیای رەژوو كۆمەڵێ نیگار دەكێشن. بەڵام ئەو هیچ یەكێكی ئا لەو شتانە نەبوو. قامەكەم لەسەر عەرزەكەدا داناو وەكو ئەوەی خوشكێك بێت بە لاسایی كردنەوەی خوێندنی باڵندە و دەنگی رووبارەكان سڵاوم لێكرد. بەڵام ئەو پاكۆی نەدایەوە. هەندێكم بە سینەیدا كێشا، بۆ ئەوەی بزانم داخۆ هێشتا رۆحی لەنێو قەفەزبەندی سینەیدا لێدەدا، كەچی هیچ سەدایەكی نەبوو، رۆحی زۆر لاواز بوو و نەیدەتوانی بەرسڤم بداتەوە. لە تەنیشتیدا چۆكم

داداو ئاوم پێیدا تا بیخواتەوەو بە زوبانی دایکیشم لەگەڵیدا ئاخاوتم. چاوەکانی داپچڕاند، بۆ قەدەرێکی درێژخایەن لێم ڕاما. منیش تێگەیشتم. بەر لە هەر شتێك، بێئەوەی ئاوە پاکەکە بە فیڕۆ بدەم خۆمم شوشت. قومە ئاوێکی باشم لە نێو زارم ناو بە داچۆڕاندنەوەی چك چك بەسەر دەستەکانمدا ڕۆم کرد، بە ئاگا و دیقەتەوە بەیەکدا ساوییانم و دوای ئەوەیش کە تەڕ بوو دەموچاوی خۆمم پێ خاوێن کردەوە. لەگەڵ ئەویشدا، بۆ پاك کردنەوەی شەونمی پیاوەکان لە نێو گیانیدا هەمان شتم ئەنجام دا. ئەو پانتۆڵەم داکەند کە سەرکارەکە پێیبەخشیبووم. بەو گوریسەی ناو قەدمەوە ئەو لقە دارو چیلکانەی ئاگر کردنەوە و نووکی تیرەکانم و پەڕەی سیغارەکانم و ئەو چەقۆ دارینەم کە دانی جرجێك لە نووکەکەیدا بوو و تووڕەکەیەکی چەرمینی پتەویش کە هەندێك کیورارییم[5] تیایدا هەڵگرتبوو، هەڵواسرا بوون. نەختێکم لەو ماجوونە بەسەر نووکی چەقۆکەمدا هەڵساوی، بەسەر ئافرەتەکەدا نووشتامەوەو بەو ئامرازە ژەهراوییە، زامێکی بچکۆلانەم لە گەردنیدا ئاوەلا کردەوە. ژیان دیاری خواوەندەکانە. ڕاوچی بۆ تێرکردنی خێزانەکەی خۆی ڕاو دەکات و نێچیر دەکوژێت، هەوڵیش دەدات گۆشتی نێچیرەکەی خۆی نەخوات، وەلێ پێی چاکە ئەوە بخوات کە ڕاوچییەکی دیکە پێشکەشی دەکات. هەندێجار، بە شێوەیەکی تراژیدیانە، پیاوێك لە جەنگدا پیاوێکی تر دەکوژێت، بەلام هەرگیز ئازاری ژنێك یاخود زارۆڵەیەك نادات. کیژەکە بە دووچاوی گەورەی زەردی هەنگوین ئاساوە تەماشای کردم و وای بۆ چووم کە هەوڵی دەدا سوپاسگوزارانە زەردەخەنە بکات. لە پێناوی ئەودا، یەکەمین تابۆی زارۆڵەکانی مانگم شکاند بوو، دەیشبوایە بە چەندین ڕەنجدان و زەحمەتکێشان کفرانەی ئەو شوورەیی و نەنگەم بدەم. گوێچکەم لەلای دەمییەوە ڕاگرت و بە چرپە ناوی خۆت ووت. منیش بۆئەوەی زۆر دڵنیابم لە هزری خۆمدا دوو کەڕەت دووبارەم کردەوە، بەلام بە دەنگی بەرزەوە نەمووت، چونکە باش نییە ناوی مردووان بهێنیت و ئاسوودەییان لێ تێك بدەیت، لەگەڵ ئەوەیشدا کە هێشتا دڵی لێی دەدا، بەلام بە مردوو حیساب بوو.

دەستبەجێ ماسوولکەی سك و سنگ و قۆڵەکانیم بینی بە کەنەفتی و کرەکییەوە ڕەق و ووشك هەڵگەڕان و ئەوسا دەستبەرداری پشوودان بوو و ڕەنگیشی گۆڕا. ئاهێکی لێوە دەرپەڕی و جەستەی بەبێ کێشمەکێش کردن هەروەکو مردنی بوونەوەرە بچکۆلەکان گیانی سپارد. دەستبەجێ، هەستم کرد ڕۆحی لە کونە لووتەکانییەوە هاتە دەرێ و خۆی ئاخنییە کونە لووتەکانی منەوەو لە نێو کۆڵەکەی سنگمدا لەنگەری خۆی خست. هەموو قورساییەکەی کەوتە سەر من و دەبوایە بۆ کەوتنە سەرپێ کۆشش بکەم. زۆر بە هێواشی جوولامەوە، هەروەکو ئەوەی لە ژێر ئاودا بم. جەستەیم لە باری دوا ڕاکشان و حەسانەوەیدا بە چەشنێك ڕێك خست، کە چۆکەکانی لە چەناگەی بدەن. بە چەند ڕیشاڵێکی ڕایەخەکەی خۆی بەستمەوە، ئینجا بە بەرماوەی کایەکە کەڵەکەیەکم پێکەوە ناو بۆ ئاگرکردنەوە چیلکەکانی خۆمم بەکارهێنا. کە دیتم ئاگرەکە وا بە چڕ و پڕییەوە کڵپەی سەندووە، بە هێوری کۆختەکەم بەجێهێشت و بە تەقەللاو زەحمەتەوە بە تەیمانی ئۆردووگاکەدا هەڵگەڕام — چونکە ئەو هەر لە قورس کردن و ڕاکێشانم بەردەوام بوو — و چوومە نێو دارستانەکەوە. تازە گەیشتبوومە درەختەکانی دامێن و سەرەتای دارستانەکە کە گوێم لە دەنگی زەنگەکانی ووریاکەرەوە بوو. تەواوی یەکەمین ڕۆژ بەبێ وەستان ڕۆیشتم. لە دووەمین ڕۆژدا کەوانێك و کۆمەڵە تیرێکم چێ کرد هەتا بتوانم ڕاو بۆ ئەو و خۆیشم بکەم. ئەو جەنگاوەرەی کە قورسایی ژیانی مرۆیەکی دیکە هەڵدەگرێت دەبێ بۆ ماوەی دە ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت، بەو شێوەیە ڕۆحی کەسە مردووەکە بێ هێز دەبێت و لە ئاکامدا دەردەپەڕێت و بەرەو سەرزەمینی ڕۆحەکان دەڕوات. ئەگەر جەنگاوەرەکە ئەمە ئەنجام نەدات، ئەوا ڕۆحەکە بەو خواردنەی کە دەرخواردی دەدرێت قەڵەو دەبێت و لەناو دەروونی پیاوەکەدا گەورەتر دەبێت هەتا خەفەی دەکات. پیاوانی گەلێك بەجەرگ و ئازام بینیووە بەم جۆرە مردوون. بەلام من بەرلەوەی ئەو

مەرجانە بهێنمە دی، دەبووایە ڕۆحی ژنە ئایلاییەکە بۆ نێو چڕوپڕترین جەنگەڵ بەرم کە تیایدا هەرگیز نەدۆزرێتەوە. زۆر کەمم دەخوارد، بە زۆرە ملێ بەشی ئەوەی دەکرد کە بۆ جاری دووەم نەیکوژمەوە. هەموو بابۆڵەیەك چێژی گۆشتی گۆشتی بۆگەنی دەداو گشت قومە ئاوێکیش تاڵ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرم لە خۆ دەکرد قووتی بدەم، بۆئەوەی هەردووکمان بژییێنم. بۆ خولێکی تەواویی مانگ قووڵ بە نێو جەنگەڵدا گوزەرم کرد، لە ناخیشمدا ڕۆحی ئەو ئافرەتەم هەڵگرتبوو کە هەموو ڕۆژێك قورساییەکەی زیادی دەکرد. زۆر جار پێکەوە دەدواین. زوبانی ئایلایی جلّەونەکراوەو بە سەدایەکی دوور و درێژیش لە ژێر درەختەکاندا دەنگ دەداتەوە. بە گۆرانی ووتن، بە جەستەمان، بە چاوەکانمان، بە کەمەرمان، بە قاچەکانمان، تەماسمان لەگەڵ یەکدا بەرقەرار دەکرد. ئەو ئەفسانانەم بۆ دەگێڕایەوە کە لە دایك و باوکمەوە فێریان ببووم، ڕابردووی خۆمم بۆ دەگێڕایەوە و ئەویش بەشی یەکەمی ژیانی خۆی بۆ دەگێڕامەوە کاتێك کە کیژۆڵەیەکی شاد حاڵ بووە و لەگەڵ خوشك و براکانیدا یاری کردووە، لە ناو قوڕ و چڵپاودا گەوزاوەو بە لقە دارە بەرزەکاندا جۆلانەی کردووە. هەر بۆ پاراستنی نەزاکەتی دەموو دوو، باسی ئەو ڕابردووە نزیکەی بەدبەختی و داماوی خۆی نەدەکرد. باڵندەیەکی سپیکەلەم گرت، جوانترین پەڕیم هەڵکێشا و کردمە ڕازانەوەو ئارایشتی گوێچکەکانی. شەوان ئاگرێکی بچکۆلانەم بە داگیرساوی دەهێشتەوە بۆئەوەی سەرمای نەبێت و بۆ ئەوەیش کە جاگوەر[6] و مارەکان نووستنەکەی لێ تێك نەدەن. لە ڕووبارەکەدا بە دیقەت و لەسەرەخۆ شوشتم و خۆڵەمێش و ووردە گوڵم لێ هەڵساوی هەتا یادەوەرییە خراپەکانی لێ دوور بخەمەوە.

سەرەنجام ڕۆژێك گەیشتینە ئەو جێگا شایان و گونجاوەو هیچ بیانووی ترمان نەما بۆ بەردەوامبوون لە ڕۆیشتن. لەوێدا جەنگەڵەکە ئەمەندە چڕ و پڕ بوو کە لە هەندێ شوێندا دەبوایە بە قامەکەم و بە دانەکانیشم گژوگیاو درەختۆکەکان هەڵپاچم و ڕێگا ئاواڵە بکەمەوە، دەیشبوایە بە دەنگێکی نزمەوە باخێوین بۆئەوەی بێدەنگی کات نەگۆڕین. ئینجا جێگایەکم لە نزیك جۆگەلە ئاوێکەوە هەڵبژارد، ساپیتەیەکم لە گەڵا و پۆپ چێ کرد و جۆلانەیەکم لە سێ دانە شریتی درێژی توێکڵدار بۆ ئەو دروست کرد. بە چەقۆکەم، سەرم تاشی و ڕۆژووەکەم دەست پێکرد.

لە میانەی ئەو کاتەوەی کە پێکەوە ڕێمان کردبوو من و ژنەکەیش هاتبووینە سەر ئەوەی هێندە یەکترمان خۆشبوێت کە ئیدی نەتوانین لێکدی جیابینەوە، بەڵام پیاو ژیان بەرزەفت ناکات و تەنانەت ژیانی تایبەتی خۆیشی بەرزەفت ناکات، بۆیە دەبووایە ئەرك و بەڵێنەکەی خۆم بهێنمە دی. بۆ چەندین ڕۆژ، لە چەند قومە ئاوێك بترازێ، هیچ شتێکی ترم نەخستە نێو زارمەوە. کاتێکیش کە لاواز و بێ تاقەت بووم، لە ئامباز بوونم بووەوەو ڕۆحیشی، کە لە هەموو دەمێکی تر ئاسمانی تر بوو، وەکو پێشوویش قورسایی نەدەخستە سەرم. پاش پێنج ڕۆژ، کاتێك کە لە خەوە نۆچکەدا بووم، یەکەمین هەنگاوی خۆی هەڵنا، بەڵام هێشتا ئامادەی ئەوە نەبوو کە گەشتەکەی خۆی بە تاق و تەنیا تەواو بکات و بۆ لای خۆم گەڕایەوە.

لە چەند فرسەتێکدا ئەو ڕۆشتنە کەم خایەنەی دووپات کردەوە، هەر جارەیش بوێریی نەختێك زیادی دەکرد. خەمی جیابوونەوەشی بەقەدەر سووتانێکی قووڵ ئازاربەخش بوو، دەبوو هەموو ئەو ئازایەتییەیش بهێنمە ئاراوە کە لە باوکمەوە فێری ببووم بۆ ئەوەی ناوی بە دەنگی بەرز بانگ نەکەم و بۆ هەمیشە بۆ لای خۆم نەیهێنمەوە. پاش دوازدە ڕۆژ خەونم بینی وەکو تووکانێك[7] بەسەر پۆپەی درەختەکاندا دەفری و، کە بەخەبەریش هاتم، هەستم کرد گەلێك بێ کێشم و دەمەوێت بگریەم. بەڵام ئیدی ئەو ڕۆیشتبوو. چەك و تفاقەکانی خۆم هەڵگرت و بۆ چەندین سەعات ڕۆیشتم تا گەیشتمە زێی ڕووبارێك. هەتا ناو قەدم چوومە ناو ئاوەکەوە، بە دارێکی تیژ لە ماسییەکی بچکۆلانەم داو هەروا بە تەواویی بە پوولەکەکان و کلك و سەر لە بەرییەوە قووتم دا. ئەوسا دەستبەجێ بە تۆزقاڵە خوێنێکەوە هەڵم هێنایەوە، هەروەك دەبوو چۆن بێت

ئه ئاوا. ئێستاکه ئیدی خەمگین نەبووم، ئیتر فێری ئەوە ببووم کە هەندێجار مردن زۆر لە خۆشەویستی بەهێزترە. ئەوسا بەرەو شکار چووم، بۆ ئەوەی بەدەست بەتاڵی بۆ گوندەکەی خۆم نەگەڕێمەوە.

## پەراوێزەکان:

1-Powder:

باروت.

2-Puma:

شێری نێو شاخ و کێو.

3-yopo

4-Annatto

5-curare:

ماددەیەکە لە هەندێ ڕووەکی ئیستیوایی دەردەهێنرێت و هیندییەکانی ئەمەریکای باشوور بۆ ژەهراوی کردنی سەری تیرەکانیان بەکاری دەهێنن.

6-Jaguar:

یۆز پڵنگ. جۆرە پڵنگێکە.

7-Toucan:

باڵندەیەکی دەنووك زلی گەورەیە.

## سەرچاوە:


Isabel Allende
The stories of Eva Luna
Translated by: Margaret sayers peden
London _ Hamish Hamilton _ 1991

فرانز كافكا
له عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

# سێ کورتە چیرۆکی (فرانز کافکا)

## 1-دروشمی شار

له بەراییدا، بۆ دروست کردنی بورجی بابل، هەموو شتێك لەسەر ئاستێکی بەرز و دوای ماندوبوونێکی زۆر ڕێکخرا، دەتوانین بڵێین کە کارەکان زۆر له پێویست زیاتر بوون. گەلێك بە وردی ڕێگاکان دروست کران، دەلاّل و وەرگێڕ و خانووی نیشتەجێبوون بۆ کرێکارەکان ئامادەکرا، وەك لە بەرانبەری کارێکی زۆر مەزندا بین وابوو کە بەدیهاتنی سەدان ساڵ دەخایەنێت. ڕای باوی ئەوکاتە وا بوو کە زۆر لەسەرخۆ و بە هێوری پڕۆژەکە ئەنجام بدرێت، بێ ئەوەی زیاد بخەینە سەر ئەم ڕایە لە دانانی بەردی بناغەدا وەستاین: لەم پڕۆژەیەدا ئەوەی زۆر گرنگ بێت بیرۆکەی دروستکردنی بورجێکە کە بگاتە ئاسمان، ئیدی شتی تر گرنگ نییە. کاتێك کە بڕوا بە گەورەیی ئەم بیرۆکەیە دەکرێت ئیدی لەناو ناچێت. مادامەکو مرۆڤیش هەیە، کەواتە ئارەزوویەکی بەهێزیش بۆ تەواوکردنی بورجەکە لە ئارادایە. لێرەوەیە کە چ پاساوێك بۆ نیگەرانیی لە ئایندە نیە، بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە. لەبەرئەوەی کە زانیاریی مرۆڤایەتی لە گەشەکردن ناوەستێت، هونەری بیناسازییش بەردەوام لە پێشکەوتندایە، ئەگەر کارێك هەبێت ئێمە بە ساڵێك ئەنجامی بدەین، لەوانەیە دوای سەدەیەك بە نیو ساڵ ئەنجام بدرێت و چاکتر و قایمتریش بێت. کەواتە بۆ ئێستا ئەوپەڕی توانامان بەکار بەرین؟ ئەم توانایە تەنیا کاتێك بەردەدات کە هیواداری ئەوە بین لە تەنیا نەوەیەکدا بورجەکە تەواو بکەین، وەلێ ئەمە ڕوونادات. بەڵکو ئەوەی چاوەڕێ دەکرێت ڕوو بدات ئەوەیە کە نەوەی

داهاتوو بە هۆی پێگەیشتنی تەواوی زانستیەکانیەوە ساختمانەکە بە خراپ دابنێت. بۆیە دەیڕوخێنێت بۆ ئەوەی بینای تازە دروست بکاتەوە.

ئەم جۆرە بیرۆکانە تواناکانی ئیفلیج کرد، ئیدی خەڵکیی لەباتی دروستکردنی بورجەکە گەڕەکێکیان بۆ نیشتەجێکردنی کرێکاران بنیات نا. لەبەرئەوەیش کە هەر گروپە و دەیویست باشترین خانووی دەست بکەوێت، ناکۆکیەکان تەقینەوە، تەنانەت هەندێك جار گەیشتە خوێن ڕشتنێکی بەردەوام، ئەمەیش بوە بەهانەیەکی نوێی دەست سەرۆکەکان تا تەمەڵیی لە دروست کردنی بورجەکەدا بکەن، بۆیە کەوتنە بانگەشەکردنی ئەوەی کە تا ئاگربەستێکی گشتی دەکرێت وا چاکە واز لە دروستکردنی بورجەکە بهێنن. بەڵام خەڵکەکە هەر بە ناکۆکیەکانەوە سەرقاڵ نەبوون، بەڵکو لەکاتی حەوانەوە و پشوودا شارەکەیان جوان کرد، ئەمەیش ئیرەییەکی وای نایەوە کە ناکۆکی تر دروست بکات. بەم جۆرە سەردەمی یەکەم نەوە تێپەڕی، چارەنووسی نەوەکانی دوایی لەوان باشتر نەبوو، نەوە دوای نەوە بەهرەیان زیاتر بوو، بە هەمان پلەیش حەزیان لەشەڕ کرد، لەگەڵ ئەمەیشدا نەوەی دووەم و سێیەم گەیشتنە ئەوە کە دروستکردنی بورجێکی ئاسمانی کارێکی بێ هوودەیە. بەڵام ئەم نەوەیە هێند گونجاوبوون کە نەیانتوانی شارەکە بەجێبهێڵن.

هەموو ئەو چیرۆك و گۆرانیانەی لەم شارەدا نووسران سۆزی ڕۆژێکیان تیا دەردەبڕا کە دێتە دی، لەو ڕۆژەدا مشتەکۆڵەیەکی زۆر پتەو بۆ وێرانکردنی شارەکە پێنج جار لەسەر یەك لێی دەدات. هەر لێرەوەیە کە دروشمی شارەکە وێنەی مشتەکۆڵەیەکی پێوەیە.

## 2-دوو ڕەگ

من لە باوکمەوە، بە میراتی، گیاندارێکی سەیرم بۆ ماوەتەوە، نیوەی ئەم بوونەوەرە پشیلەیە و نیوەکەی تری بەرخۆلەیە. لەم دواییەدا لە پێگەیشتن و گەشەسەندندایە، چونکە جاران زیاتر لەبەرخۆلەوە نزیکتر بوو تا پشیلە، بەڵام ئێستا هەردووکیان وەك یەك، سەر و چرنووکی لە پشیلە دەکات و جەستەیشی بەرخۆلەیە، چاویشی ئاکاری هەردوو ئاژەڵەکەی تێدایە: نیگایەکی کێویانەی پشیلە و درەوشانەوەیەکی سادەی بەرخۆلەیش.

ئەم بوونەوەرە خوریەکی ناسك و نەرمیی زۆر کورتی هەیە، کە بە ناو ماڵەکەدا هاتوچۆ دەکات هەنگاوی لە نێوان بازدان و رویشتنێکی بە پارێزدایە. کە خۆریش هەڵدێت لای پەنجەرەکەوە رادەکشێت و دەپرخێنێت.

هەندێك جار لەگەڵیدا بۆ گەڕان دەچم بۆ ناوباخ و مێرگوزار. لەوێ بەجێم دێڵێ و ئەوەندە خێرا دەڕوات ناتوانم بیگەمێ. هەر کە پشیلەیەك دەبینێت هەڵدێت، کە بەرخیش دەبینێت پەلاماری دەدات. لە مانگەشەودا دەڕواتە بەر چۆڕاوگەکان، ئەو ناتوانێت وەك پشیلە بمیاوێنێت و زۆریش ڕقی لە مشکە. بە سەعات لای قەفەزی مریشکەکانەوە خۆی مات دەکات بێ ئەوەی لە دەرفەتی ڕەخساودا پەلاماریان بدات.

من خووم پێوەگرتووە ماستی خۆماڵی بدەمێ، وا دیارە پێی دەکەوێت. کە لە پێشی دەفری ماستەکەدا ڕادەوەستێت و زۆری لێ دەخوات، چنگە تیژەکانی دەردەخات، لەو کاتەدا منداڵان بۆ تەماشاکردنی لە هەموو لایەکەوە دێن، بۆیە بە ناچاریی ڕۆژانی یەك شەموانم بۆ ئەو دیدەنیانە تەرخان کردووە. هەموو ڕۆژێکی یەك شەموان لە ماڵەکەی خۆمدا و لە ناوەڕستی منداڵەکاندا دادەنیشم و ئەم گیاندارە لە ئامێز دەگرم. منداڵەکان پرسیاری وام لێ دەکەن هیچ مرۆڤێك توانای وەڵامدانەوەیانی نیە. لەو پرسیارانە: چۆن ئاژەڵێکی ئاوا هەیە و بۆچیش بەتایبەتی من هەمە؟ ئایا لە ڕابووردوودا نموونەی لەم جۆرە ئاژەڵە هەبووە؟ ئایا هەست بە تەنیایی دەکات، ئەی بۆ بێچووی نیەو ناویشی چییە؟.. هتد..

من لای خۆمەوە هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەم نییە، بێ هیچ روونکردنەوەیەك ئەوەی هەمە پیشانیان دەدەم، هەندێك جار لەگەڵ خۆیاندا پشیلەو بەرخۆلە دێننەماڵەکەم (دووجار ئەمە روویداوە) حەز دەکەن پشیلە و بەرخۆلەکانیان لەگەڵ ئەم بوونەوەرەدا کە ئێستا لە ئامێزمدایە نزیك بخەنەوە، بەڵام چارەنووسی زوربەی ئەو هەوڵانە شکستیان هێناوە. لەباتی نزیك کەوتنەوەی ئەم گیاندارانە لە یەکدی، بە چاوێکی ئاژەڵیەوە لە یەکتری دەروانن و گەلێکیش بەوە قایلن کە بوونیان هەقیقەتێکی خودایییە.

کە ئەم گیاندارە لە باوەشمدا دادەنیشێت هەست بە ترس ناکات، بەڵکوو ئەوپەڕی دڵنیایە، لەبەرئەوەی هەست بە پەیوەست بوونی خێزانێکەوە دەکات کە پەروەردەکردنی ئەمی لە ئەستۆدایە. نابێت ئەمە وا لێك بدەینەوە کە دڵسۆزییەکی لە یاسا بەدەرە، بەڵکو هەستێکی زگماکیی گیانداریێکە رەنگە لە ڕێی ژن و ژنخوازیەوە هەندێك خزمی لەسەر ئەم زەویە بۆ پەیدا بووبێت، بێئەوەی لە ڕێگای خوێنەوە پەیوەندیی بە هیچ بوونەوەرێکی ترەوە هەبێت. بۆیە بەلای ئەوەوە وایە کە پارێزگاری کردنی ئێمە لەو کارێکی پیرۆزە.

هەندێك جار ناچارم پێ بکەنم، ئەو کاتانەی لمۆزی دەخاتە سەر شانم بۆ ئەوەی بۆنم پێوە بکات و وایش لە باوەشمدا ڕاکشاوە کە ناتوانم خۆمی لێ رزگار بکەم. وەك ئەوەی هەر ئەوە بەس نەبێت کە لە یەك کاتدا بەرخۆلە و پشیلەیە و دەیەوێت ببێت بە سەگییش.

ڕۆژێك لە ڕۆژان، ئەمەیش شتێکی ئاساییە هەر مرۆڤێك بەسەری بێت، تووشی نائومێدیەکی سەخت بووم، تا ئەو ڕادەیەی ویستم واز لە هەموو شتێك بهێنم. ئەویش ئەو کاتە بوو کە لەسەر کورسیەکی بزۆك دانیشتبووم و ئەو گیاندارەم لە ئامێزدا بوو، بە ڕێکەوت تەماشای ناوچاویم کرد. چەند دڵۆپێك فرمێسك بەڕوویدا دەهاتنە خوارێ. نازانم فرمێسکەکان هی من بوون یان هی ئەو؟ ئایا ئەم پشیلە بەرۆح بەرخۆلەیە هەستی مرۆڤایەتی تیایە؟ من لە باوکمەوە هیچی وام بۆ نەماوەتەوە کە شایانی وتن بێت، بەڵام شانازیی بەم میراتیەوە دەکەم کە بۆی بەجێهێشتووم. ئەم گیاندارە پڕ لە هەستەی لە ناوەوەیدا دوو شتی دژ بە یەکی کۆکردۆتەوە: نیگەرانی پشیلە و نیگەرانیی بەرخۆلە.

هەندێك جار بەسەر سنگما هەڵدەزنێ و چنگ لە شانم گیر دەکات. لووتی لە گوێم نزیك دەخاتەوە وەك ئەوەی شتێکم پێ بڵێت، پاشان دادێتەوەو لە دەم و چاوم دەڕوانێت، بۆئەوەی بزانێت قسەکانی کاریان تێکردووم، منیش بۆ ڕازیی کردنی سەر ڕادەوەشێنم. ئەوسا وازم لێ دێنێت و لەسەرخۆ دەڕوات، ڕۆیشتنەکەی لە سەما دەچێت.

ڕەنگە چەقۆی قەساب تاقە فریادڕەسێك بێت بۆ ئەم گیاندارە، بەڵام من ڕێگا نادەم چونکە ئەم گیاندارە تاقە بۆماوەی منە. بۆیە تا مردن دەبێت چاوەڕێ بکات، هەندێك جار وەك مرۆڤ تەماشام دەکات، وەك ئەوەی بپاڕێتەوە کە من شتێك بکەم.

## 3-بەدحاڵی بوونێکی ڕۆژانە

ڕووداوێکی ئاسایی دەبێتە هۆی بەدحاڵی بوونێکی ڕۆژانە، Aدەیەوێت گرێ بەست (سەفقە)یەکی گرنگ لەگەڵ Bدا بکات کە نیشتەجێی H ە. بۆ گفتوگۆکردنی سەرەتایی A دەڕوات بۆ H کە چوون و گەڕانەوەی بیست دەقیقە دەخایەنێت. کە دەگاتە ماڵەکە هەست بە شانازیی دەکات، چونکە بە ماوەیەکی کەم ڕێگاکەی بڕیوە، دوای ئەوەی لەگەڵ B دا ڕێکەوت کە بۆ ئیمزاکردنی کۆتایی لەسەر گرێبەستەکە ڕۆژی دوایی بگەڕێتەوە، لەبەرئەوەی دەیزانی لەوانەیە کارەکە چەند سەعاتێك بخایەنێت.

بەیانیی زووی رۆژی دواتر A لەماڵ دەردەچێت، هەرچەندە تەواوی هەلومەرجی ئەو رۆژەیش وەك رۆژی پێشوتر وایە، هیچ نەبێت بەڕای خودی A. کەچی ئەمجارەیان رێگای H دە سەعات دەخایەنێت. کە ئێواران دەگاتە ئەوێ هەواڵی B دەپرسێت، پێی دەڵێن کە B بەهۆی دواکەوتنیەوە زۆر تووڕە بووە، بۆیە پێش نیو سەعات بڕیاری داوە بڕوات بۆ گوندەکەی تا لەوێ بیبینێت. دەبوو لە رێگادا بیدیایە. کە یەکێك ئامۆژگاری A دەکات بۆئەوەی چاوەڕوانیی هاتنەوەی B بکات. A وای لا چاکە لە ترسی ئەوەی گرێ بەستەکە لەدەست نەدات بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ.

ئەمجارەیان A رێگاکە زۆر خێرا دەبڕێت کە لە چرکەساتێك تێناپەڕێت بێئەوەی هیچ شتێك سەرنجی رابکێشێت. کە دەگاتە ماڵەوە وای بەرگوێ دەکەوێت کە بەیانی لای دەرگای ماڵەوە B دیوەو باسی گرێبەستەکەی کردوە، بەڵام ئەو وەڵامی داوەتەوە کە کاتی کەمەو دەبێت بەپەلە بڕوات.

لەگەڵ ئەم رەفتارە سەیرەیشدا B بڕیاری دا چاوەڕێی هاتنەوەی بکات. پێش ئەوەی لە ژوورەکەیدا چاوەڕێی بکات چەند جارێك هەواڵی ئەوی پرسی. دوای بیستنی ئەم هەواڵە A هەست بە خۆشی دەکات چونکە گرێبەستەکەی لەکیس نەچووە، بۆیە دەیەوێت هۆی دواکەوتنەکەی بۆ بگێڕێتەوە، وا ئێستا A زۆر خێرا بە پلیکانەکاندا سەردەکەوێت ، پێش ئەوەی بگاتە ژوورەکەی هەڵدەنووتێت و ئازارێکی زۆر دەداتە ژێکانی ماسولکەی. بەجۆرێك کە توانای هاوارکردنی نامێنێت، هەر لەناو تاریکیەکەدا بەدەنگی نزم دەناڵێنێت. لەم کاتەدا دوورو نزیك گوێی لە دەنگی هەنگاوەکانی B دەبێت کە بە تووڕەییەوە بە پلیکانەکاندا دەڕواتە خوارێ بۆئەوەی بە یەکجاریی لە چاو ون بێت.

**سەرچاوە**

سایتی ئیلاف: 19 نۆڤەمبەری 2007

ویلیام فۆکنەر
لە فارسییەوە: جەبار سابیر

# دوو سەرباز

منو پیت دەچووین بۆ ماڵی کیلگروی پیر، لەدوای نانی ئێوارەوە لەپشت پەنجەرەی ژوورەکەیەوە دەوەستاینو گوێمان لە رادیۆکەی دەگرت... هەر لەوێدا گوێمان لە دەنگی رادیۆکە دەبوو، چونکە ژنی کیلگروی گوێی گران بوو کیلگروش تا ئەو جێیەی دەکرا دەنگی رادیۆکەی زیاد دەکرد. ئەوکاتە لەگەڵ ئەوەی پەنجەرەکەیش داخرابوو وابزانم منو پیت وەك ژنەکەی کیلگروی چۆن دەیبیست ئێمەیش دەمانتوانی گوێمان لێی بێت.

ئەو شەوە من وتم: (چی؟ ژاپۆن؟ ئەو پێرل هاربۆرە ئیتر چییە؟)و پیت وتی: (وس!). ئێمە هەر لەوێداو لەبەر سەرماکەدا وەستاینو گوێمان لە قسەی گۆیندەی رادیۆکە گرت. بەڵام من هەرم لەبری نەدەکردەوە. ئەو کاتەیش کابرا وتی چەند خولەکێکی تر هەواڵەکان تەواو دەبن. منو پیت گەراینەوە ماڵێ. پیت بابەتەکەی تێگەیاندم. چونکە ئەو ئێستا بیست ساڵەو مانگی حوزەیرانی رابوردوو خوێندنی تەواوکردو زۆر شارەزای ئەم قسەو باسانە بوو، ژاپۆنییەکان پێرل هاربۆریان بۆمباباران کردو پێرل هاربۆریش نزیك زەریا بوو.

من وتم: (نزیك کام ئاو؟ نزیك ئاوی ئەمبارکراوی دەوڵەتی، ئەو بەرزییەی نزیك ئۆکسفۆرد؟) پیت وتی: (نا، نزیك ئاوی گەورە، ئوقیانووسی ئارام).

دواتر گەیشتینە ماڵێ. دایكو باوکمان نووستبوون. منو پیتیش چووینە سەر تەختی خەوتنو راکشاین. بەڵام هێشتا من تێنەگەیشتبووم پێرل هاربۆر کوێیە. پیت دووبارە پێی وتم ـ ئوقیانووسی ئارام.

پیت وتی: (چیتە؟ ئێستا ئیتر نۆ ساڵی. لە سپتامبەرەوە تا ئێستا دەچیتە

قوتابخانە، هێشتا هیچ فێر نەبووی)٠ من وتم: (وابزانم هێشتا نەگەیشتووینەتە ئوقیانووسی ئارام)٠

ئێستا ئێمە خەریکبوو سەوزەمان دەچاندو دەبوو تا پازدەی نۆڤەمبەر تەواوی کەین، چونکە باوکمان هێشتا دواکەوتبوو٠ وەك هەمیشە، لەو کاتەوەی منو پیت ناسیومانە لەدواوە بووە٠ دەبوو داریش بێنین، بەڵام هەموو شەوێ منو پیت دەچووینە بەر پەنجەرەی کیلگرو گوێمان لە ڕادیۆ دەگرت٠ پاشان دەهاتینو گوێمان دەگرتو دەخەوتینو ئەوکاتە پیت پێی دەوتم مەسەلەکە چییە٠ بەو مانایەی کەمێکی دەوتو ئیتر نەیدەوت٠ وەك ئەوەی حەز نەکات لەباری ئەو مەسەلەیەوە قسەی زیاتر بکات٠ بەمنیشی دەوت ئیتر قسە نەکەمو بخەوم٠ بەڵام ئەو هیچ کاتێ نەدەخەوت٠

بەو شێوەیە بێ جووڵە، لەو کاتانەی کە لە خەودابوو بێ جووڵەتر، ڕادەکشاو من هەستم دەکرد ئەم ماستە موویەکی تێدایە٠ وەك ئەوەی لەمن تووڕە بووبێت، بەڵام تێگەیشتم کە منی بیرنییە٠ یا وەك ئەوەی لەبیری شتێکدا بێت٠ ڕەنگە ئەوەش نەبووبێ، چونکە شتێك نەبوو تابیری لێبکاتەوە٠ هەرگیز وەك باوکم کە دوادەکەوت پیت دوانەدەکەوت٠

کاتێ خوێندنی تەواوکرد، باوکم دە(ئۆلك) زەوی دایەو منو پیت هەردووکمان بیرمان کردەوە کە شەکر لەدڵی باوکماندا تواوەتەوە، کەلانیکەم خۆی لەشەڕی دە ئۆلك زەوی نەجات داوەو ئیتر بیرو خەیاڵی کەمتر دەبێت٠ ئێمەیش تەواوی ئەو زەوییەمان کردە سەوزەو کیێمانو ئامادەمان کرد بۆ زستان٠٠٠٠٠ کەواتە پیت بیری لای زەوییەکەیش نەبوو٠ بەڵام دواجار شتێك هەر هەیە٠ نابێ هیچ شتێك نەبێ٠

ئێمە ڕێكو پێك دەچووینە پشتماڵەکەی کیلگرو دەوەستاینو گوێمان لە ڕادیۆ دەگرت٠٠٠ ئەو کەرەتە ئیتر بابەتەکە لەمەڕ فلیپین بوو، ژەنەراڵ مەك ئارتۆر لەناوا بوو٠ پاشان گەڕاینەوە ماڵێو لەسەر سیسەمەکە ڕاکشاینو ئیتر پیت هیچی بە من نەوتو هەرگیز قسەی نەکرد٠ وەك شیش دەخەوتو کاتێ دەستم لێدەدا وەك ئاسن لووس بوو٠ ئەو کاتە، کەمێ دواتر، منیش خەو دەیبردمەوە٠

ئەوکاتە شەوێکیان، دوای ماوەیەك کە پیت هیچی بە من نەدەوت جیالەوەی کە بەهێندەی پێویست دار نەبڕیو لەم جۆرە قسانە، وتی:

(دەبێ من بڕۆم٠)

وتم: (بۆ کوێ بڕۆی؟)

وتی: (بڕۆم بۆ جەنگ٠)

وتم: (دەڵێی بەڕاستی دارەکەمان تەواو نەکەین بڕۆین؟)

وتی: (دارەکانمان بەدۆزەخ٠)

وتم: (زۆرباشە٠ کەواتە کەی بەڕێکەوین؟)

بەڵام پیت گوێی لە قسەکانی من نەبوو٠ هەمان شێوە لە تاریکییەکەدا وەك ئاسن لووسو بێ جووڵە خەوتبوو٠ پاشان وتی: (دەبێ بڕۆم٠ چۆن لێدەگەڕێن ئەو میللەتە لەگەڵ ئەم وڵاتەی ئێمەدا بەم جۆرە ڕەفتار بکات؟)

وتم: (بەڵێ٠ داری دەوێ باشە، دەیەوێ نییە٠٠٠ وابزانم دەبێ بڕۆم٠)

ئەو جارە پیت قسەی منی بیست٠ دووبارە بێ جووڵە نووست٠ بەڵام ئەو جارەیان جۆرێکی تر بوو٠ دواتر وتی: (تۆ؟ تۆ دێی بۆ جەنگ؟)

وتم: (چاکە تۆ لە گەورەکان دەدەیت، منیش لە بچکۆلەکان٠)

بەڵام پیت پێی وتم کە من ناتوانم بڕۆم بۆ جەنگ٠ سەرەتا من خەیاڵم دەکرد کە نایەوێ من شوێنی کەوم، وەك ئەو کاتانەی دوای کچان دەکەوت٠٠٠ بەڵام دواتر وتی: کە لەشکر ڕێگە بە من نادات، چونکە من

زۆر بچووکم. تێگەیشتم کە ڕاست ئەکاتو ناکرێ من بەرێ بۆ جەنگ. بەڵام وەك ئەوەی هێشتا هەر باوەڕم نەکردبێ، تا ڕۆژێك کە پیت ڕێگەی گرتەبەر. ئەو کاتە بینیم دواجار نەیهێشت منیش بڕۆم بۆ شەڕ.

وتم: (من ئاوو دار بۆ هەمووتان دەهێنم.. ئاخر ئێوە ئاوو دارتان دەوێ.)

ئێستا پیت دەیویست گوێم لێگرێ. ئێستا وەك ئاسن نەبوو. ئەو کاتە وەرسووڕاو دەستی خستە سەر سنگم، چون ئەو کەڕەتە من بووم کە وەك ئاسن نووستبووم.

پیت وتی: (نا، دەبێ تۆ لێرە وەمێنیو یارمەتی بابە بدەیت.)

وتم: (یارمەتی چی؟ خۆ لەمە زیاتر دواناکەوێ کە ... ئێمە تا دەچینە ژاپۆنو، ئەوان لێرە دەمێننەوەو بە کێڵگەکە رادەگەن. منیش دەبێ بڕۆم، ئەگەر تۆ دەبێ بڕۆی، ئیتر منیش دەبێ بڕۆم.)

ئەو وەختە پیت وتی: (نا!) پاشان وتی: (چاکە، بەسە ئیتر.)و من تێگەیشتم کە بەڕاستییەتی. لە نیگای تێگەیشتم. ئیتر منیش هیچم نەوت.

دواتر وتم: (چاکە، کەواتە ئێستا ناکرێ من بێم؟)

پیت وتی: (نا ناکرێ.. یەکەم تۆ زۆر بچووکی، دووەم لەوان...)

منیش وتم: (چاکە، باشە... لێگەڕێ ئیتر بخەوم.)

ئەو کاتە پیت قسەکانی بڕیو دەمەو روو خەوتم. بەجۆرێك خەوتم کە یەعنی ئیتر خەوتووم. پیت بەڕاستی بەزوویی خەوت. من تێگەیشتم ئێستا ئیتر خۆی یەکلاییکردۆتەوەو بڕیاری خۆی داوە، ئیتر خەیاڵی ئاسوودەیە.

سبەی بەیانی، پیت بڕیاری خۆی بە باوكو دایكم وت.

دایکم گریا: (نا. نامەوێ بڕوا. خۆزگە گەر بکرایە من لەبری بڕۆیشتمایە. من نامەوێ وڵات رزگار بکەم، زۆرە؟ ئەگەر ژاپۆنییەکان کاریان بەسەر منو ماڵو مناڵەکانمەوە نییە، بابێن وڵات بۆ خۆیان داگیرکەن..... بیرمە مارشی برام لە جەنگی یەکەمدا نۆزدە ساڵ بوو. بردیان بۆ شەڕ. دایکمان ئەوسایش هیچ کاتێکی تریش لەوەی کە ئێستا من تێدەگەم، ئەویش نەیدەزانی بۆ. بەڵام بە مارشی وت ئەگەر ناچاری بڕۆی، بڕۆ... بەڵام ئیتر داوام لێمەکەن تێبگەم بۆچی.)

ئەو کاتە نۆرەی بابە هات:

(بڕۆی بۆ جەنگ؟ بڕۆی بۆ جەنگ بۆچی؟ ئەگەر منم کە یەك تۆز سوودمەند نابم.. تازە هێشتا تۆ بۆ سەربازی بچووکی. هێشتا وڵات شکستی نەهێناوە. خودی سەرۆك کۆمار لە واشنتۆن ئاگاداری بارودۆخەکەیە. گەر هەواڵێك هەبێ بێگومان ئەوا پێمان دەگەیەنێت... تازە لەوەی کە ڕابردووە، لە جەنگی یەکەم کە دایکت هەر ئێستا وتی، من خۆم رۆیشتم بۆ قشون. رەوانەی تەکساسیان کردم. هەشت مانگ لە تەکساس بووم تا سەرەنجام جەنگ تەواوبوو. بە باوەڕی من، هەموو ئەمە، سەرباری کێشەی مارشی خاڵت کە لەبەرەی فەرەنسا بریندداربوو، بۆمنو حەوت پشتم بەسە. تازە، ئەوە رابردووە، ئەگەر تۆ بڕۆی، من بە تەنها چی لە کشتوکاڵ بکەم؟ دیسان خراپتر دوادەکەوم.)

پیت وتی: (تۆ لەو کاتەوەی من بەبیرم دێ هەر لەدواوە بووی. بەکورتی من دەڕۆم. من دەبێ بڕۆم.)

من وتم: (هەڵبەتە دەبێ بڕۆی. ئەو ژاپۆنیانە.....)

دایکم بەگریانەوە تێکەڵی قسەکانم بوو: (تۆ دەمت داخە ئیتر. کەس لەگەڵ تۆی نییە. بڕۆ باوەشێ چیلکەو دار بێنە ئێرە، تۆ هەر ئەو کارەت پێدەکرێ.)

من چووم دارم هێنا. رۆژی دواتر منو پیتو باوکم تا ئەو جێیەی توانیمان دارمان گردکردەوەو هێنامانە ماڵەوە. چونکە پیت دەیوت کە بە باوەڕی باوکم ئەگەر یەك پارچە داریش کە هێشتا دایکم نەیخستۆتە

کوورەکەوە مابێت دیسان خۆی زۆرە.

دایکم خەریکبوو پیتی بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکرد. جلوبەرگەکەی شووشتەو پینەو پەڕۆی کردو بەقەدەر سندوقێکی پێیەو خواردنی بۆ دروستکرد. ئەو شەوە منو پیت لەسەر سیسەمەکە خەوتبووینو گوێمان شلکردبوو کە بوخچەکەی پیتی گرێدەدا دەگریا. تا ئەوەبوو پیت بە چاکەتو بیجامەوە هەستاو چووە لای. من دەنگیانم دەبیست کە قسەیان دەکرد. تا لە کۆتاییدا دایکم وتی:

(چاکە. ئێستا کە هەر دەبێ بڕۆی بڕۆ. بەڵام لە هۆکارەکەی نەگەیشتمو هیچ کاتێکیش نامەوێ تێبگەم. ئیتر چاوەڕوانی تێگەیشتنی من مەبە.)و دووبارە پیت گەڕایەوە سەر جێگەکەی، سارد وەك ئاسن ویستی بخەوێت. پاشان وتی: (دەبێ من بڕۆم. دەبێ...) بەڵام لەگەڵ منی نەبوو. لەگەڵ کەسی نەبوو.

من وتم: (هەڵبەتە دەبێ بڕۆی. ئەو ژاپۆنییانە...) بەڵام پیت کەوتە سەر لاو لە تاریکییەکەدا سەیری کردم. پاشان وتی: (تۆ خراپ لە ئاو دەرنەهاتووی.... من چاوەڕوانی ئەوەبووم تۆ زیاتر لەوان دەردەسەریم بۆ دروست بکەیت.)

من وتم: (وابزانم ئیتر من چارەیەکم نییە. بەڵام ڕەنگە چەند ساڵێکی تری بوێت تا من بتوانم بێم. ڕەنگە سەرەنجام ڕۆژێك بێم بەدواتا.)

پیت وتی: (خوانەکا. پیاو خۆ بۆ خۆشی ناڕوات بۆ شەڕ. لە شەڕدا حەڵوا نابەخشنەوە. مرۆڤ تەنها بۆخۆشی خۆی لێناگەڕێ دایکی بگری.)

وتم: (کەواتە بۆچی دەڕۆی؟)

وتی: (من دەبێ بڕۆم. ناچارم. چاکە، ئێستا ئیتر بخەوە. دەبێ من سبەی زوو سواری ئۆتۆبۆس ببمو بڕۆم.)

وتم: (زۆرباشە. باشە. ڕاستی، دەڵێن مەمفیش شارێکی گەورەیە، تۆ چۆن سەربازەکان دەدۆزیتەوە؟)

وتی: (لەیەکێ دەپرسم... بخەوە ئیتر.)

پرسیم: (تەنیا ئەم پرسیارە: (دەبێ بچی بۆ کوێ بۆ سەربازی؟)

پیت وتی: (بەڵێ.) دواتر دووبارە وەرگەڕاو بەپشتدا خەوتو وتی: (بەسە، دەڵێم بخەوە.)و ئەوکاتە من خەوبردمییەوە.

سبەی بەیانی لەبەر چرادا نانمان خوارد، چونکە ئۆتۆبۆسەکە کاتژمێر شەش تێدەپەڕی. ئیتر دایکم نەدەگریا، تەنیا گێژو وێژ بووبوو خەریکبوو نانی لەسەر مێزەکە دادەنا تا بیخۆین. دواتر بوخچەکانی پیتی ئامادەکرد. پیت نەیویست شتێك لەگەڵ خۆی بەرێت. بەڵام دایکم پێی وت کە مرۆڤی وریا هیچ کاتێ بێ بارو بنەو بە جلوبەرگی نەگونجاوەوە بۆ هیچ جێیەك تەنانەت بۆ جەنگیش ناڕوات. سندوقێك مریشکی سوورەوەکراو و کولیچەی کردە باروبنەکەی پیتەوە. ئینجیلێکیشی تێکرد. ئەوکاتە ئیتر کاتی ڕۆیشتن بوو. تا ئەو کاتە، ئێمە هیچمان نەدەزانی کە دایکم نەیویست تا بەردەم ئۆتۆبۆسەکە بێت.. کێوو پاڵتۆکەی پیتی هێنا. ئێستا نەدەگریا. تەنها هەمان شێوە وەستابوو دەستەکانی خستبووە سەر شانی پیتو نەدەجووڵا. بەڵام وەك ئەوەی کاتێك شانەکانی پیتی گرتبوو بەو شێوەیە سەختو زبربوو، وەك دوێ شەو، کاتێ پیت لەسەر تەختە خەوەکەی بەرەو من وەرسووڕاو پێی وتم من خراپ لە ئاو دەرنەهاتووم.

دایکم وتی: (وەڵا من ڕازیم بڕێن وڵات داگیرکەن بۆ خۆیان، بەمەرجێ کە هەقیان بەسەر منو کەسو کارمەوە نەبێت.) پاشان وتی: (هیچ کاتێ خۆت فەرامۆش نەکەیت. بیرت بێت کێی. تۆ نە دەوڵەمەندی نەشتێك... لەم دنیایەدا، لەو لای گوندی فرنچمەن هەرگیز نازانن ناوت چییە. بەڵام خوێنت لەگەڵ خوێنی ئەوانی تر جیاوازی نییە. ئەگەر خوێنی ئەوان ئازیزە، خوێنی تۆش هەر ئازیزە. هیچ کاتێ ئەمەت لەبیرنەچێت.)

دواتر دایکم پیتی ماچکردو ئێمە لەماڵ دەرچووین. باوکم پێی خۆش بێت یا پێی ناخۆش بێت، بنەو بارگەکەی پیتی هەڵگرتبوو. هێشتا گزنگی نەدابوو. تەنانەت پاش ماوەیەك لە وێستگەکە، لەتەنیشت سندوقی پۆستەکەوە وەستامو هێشتا هەتاو نەکەوتبوو. پاشان لایتی ئۆتۆبۆسەکەمان بینی کەلە دوورەوە دەهات. من سەیری ئۆتۆبۆسەکەم دەکرد تا گەیشتە لای ئێمەو پیت بە دەست ئاماژەی بۆ کرد دواتر بینیم دنیا رووناك بۆوە. ئاگام لێی نەبوو کە کەی هەتاو کەوتبوو. ئەو کاتە منو پیت چاوەڕێ بووین کە دووبارە باوکم وەك سەرەتا مینگە مینگێك بکاتو بڵێ: کە بۆ نمونە خاڵەگیان (مارش) لە فەرەنسا بریندداربوو، یاخود ئەو سەفەرەی کە خۆی لە ساڵی (1918) رۆیشتبوو بۆ تەکساس بۆ رزگارکردنی وڵات لە ساڵی (1942) بەسە... بەڵام بینیم هیچی نەوت. ئاخر ئەویش هەر خراپ لەئاو دەرنەهاتبوو، تەنها وتی: (خوات لەگەڵ! هەمیشە بیرت بێت دایکت چی پێ وتی. هەرکاتێ بۆت کرا نامەیەکی بۆ بنووسە.) پاشان تەوقەی لەگەڵ پیت کردو پیتیش تۆزێ سەیری منی کردو دەستێکی بەسەرمدا هێناو نەوازشی کردمو ئەوەندە دەستی بە ملمدا هێنا تا گەرم بوو. پاشان چووە ناو ئۆتۆبۆسەکەوەو کابرای شۆفێر دەرگای داخستو ئۆتۆبۆس دەنگێکی لێوەهاتو کەوتە رێو تایەکانی جووڵانو دەنگی بەرزترو خێرا بوو. دواوەی ئۆتۆبۆسەکە دوو لایتی سووری پێوەبوو نەدەکوژایەوە، بەڵام ئەوەندە لە یەکتر نزیك دەبوونەوە وەك ئەوە وابوو هەر ئێستا بگەنە یەكو تێکەڵ بن، بەڵام هیچ کاتێ نەبوونە یەك. ئەوکاتە، ئیتر ئۆتۆبۆس رۆیشتبوو من گەر بمویستایە دەمتوانی بگریم.

منو باوکم گەڕاینەوە ماڵێ. هەموو ئەو رۆژە لەسەر دارەکە کارمان کردو من هەلێکی باشم بۆ هەڵنەکەوت. بەڵام دواتر رۆیشتم تیروکەوانەکەم هەڵگرت. حەزم دەکرد هەرچی هێلکەی باڵندەیە فرێیدەم، چونکە هەرچی پیت کۆی کردبۆوە دابویە من. پیت لەگەڵ ئەوەی بیست ساڵ بوو حەزی لێ بوو هێلانەی پڕ هێلکەی باڵندە بەرداتەوەو سەیری بکات. بەڵام هێلانەی باڵندەکان ئەوەندە گەورەبوون نەدەکرا مرۆڤ لەگەڵ خۆی بیانبات. منیش هێلکە داڵەکەرخۆرەیەك کە لەوانی تر گەورەتر بوو خستمە قاوغە شقارتەیەکەوەو باش پێچامو، لەگەڵ تیروکەوانەکەم بردم لە گۆشەیەکی ئەنباری کێڵگەکە دامنا. پاشان نانی ئێوارەمان خواردو چووینە سەر تەختە خەوەکان، بیرم کردەوە کە ئیتر تەنانەت بۆ یەك شەویش ناتوانم لەم ژوورەداو لەسەر ئەم تەختەخەوە بمێنمەوە.

دواتر دەنگی بۆڵە بۆڵی باوکمم بیست، بەڵام هیچ دەنگێك لە دایکمەوە نەدەهات کە ببیستریو تێبگەیت بێدارە یا خەوتووە. بەڵام وابزانم نووستبوو. منیش پێیەوەکانم هەڵگرتو لە پەنجەرەکەوە فرێمدانە دەرێ. پاشان خۆیشم لە پەنجەرەکەوە هەڵداو وەك ئەو کاتانەی کەدەمبینی پیت خۆی هەڵدەدایە دەرێ..... ئەو رۆژانە هێشتا پیت گچکە بوو نەیاندەهێشت شەوان تادرەنگ لە دەرەوە بمێنێتەوە. ئەوکاتە پێیەوەکانم لەپێکردو رۆیشتمە ناو ئەنبارەکەوە، تیروکەوانو هێلکە داڵەکەرخۆرەکەم هەڵگرتو چوومە سەر جادەکە.

دنیا سارد نەبوو. تەنها ئەوەبوو ماڵ کاولە زۆر تاریك بوو. جادەکە لەپێشمەوە پان دەبووەوە. عیبادەل بەشەری لەسەر نەبوو. وەك پیاوێك کە ڕاکشابێت، درێژ درێژ لەسەر زەوی خەوتبوو، بیرمکردەوە بەرلەوەی بیستو دوو میل رێگە تا جفرسۆن تەیکەم، هەتاو دەکەوێت.

کاتێ لە گردەکەوە سەرکەوتمو چوومە ناو شارەوە، گزنگی بەیانی کەوتبوو. لە ژوورەکانی شارەوە بۆنی نانی بەیانی دەهاتە دەرێ. بەخۆمم وت خۆزگە ئەقڵم پێبشکایەو لەگەڵ خۆم کولیچەیەکم بهێنایە. بەڵام ئیتر تازە زۆر درەنگ بوو. پیت پێی وتبووم کە مەمفیس کەمێك لە سەرو جفرسۆنەوەیە. بەڵام من نەمزانی لەگەڵ جفرسۆن هەشتا میل لێك دوورن.

من هەر لەوێدا لە گۆڕەپانی خاڵیو خامۆشی شاردا وەستام. رۆشنایی بەیانی تادەهات زیاتر دەبوو

گڵۆپی شەقامەکان هێشتا داگیرسابوون و پاسەوانێك سەیری کردم و من هێشتا هەشتا میل لە مەمفیس دووربووم و تەواوی شەو کە بەرێوەبووم هەموو بیست و دوو میل ڕێگەم بڕی بوو لەم کاتەدا کە من بە مەمفیس دەگەیشتم بێگومان پێت بەرەو پێرل هاربۆر کەوتۆتەڕێ.

پاسەوانەکە وتی: (لەکوێوە دێی؟)

منیش پێم وت: (من دەبێ بڕۆم بۆ مەمفیس، براکەم لەوێیە.)

پاسەوانەکە وتی: (یەعنی دەڵێی هیچ کەس و کارێکت لەم ناوە نییە؟ باشە گەر براکەت لە مەمفیسە تۆ لێرە چی دەکەی؟)

دووبارە پێم وت: (دەبێ من بڕۆم بۆ مەمفیس. کاتم نییە قسەی زیاتر بکەم. کاتیشم نییە بەپێ بڕۆم. دەبێ هەر ئەمڕۆ بگەمە ئەوێ.)

پاسەوانەکە وتی: (وەرە ئێرە ببینم.)

پێکەوە ڕۆیشتین بۆ شەقامێکی تر. لەوێ ئۆتۆبۆسێك وەستابوو، عەینی ئەو ئۆتۆبۆسەی دوێنێ بەیانی پێت سواری بوو. جگە لەوەی کە لایتێکی نەبوو کەسیشی لەناودا نەبوو. گەراجی ئۆتۆبۆسێکیشی لێبوو، وەك گەراجەکانی ڕێگەی ئاسن، مێزێکی بلیت فرۆشیش، کەسێك لەپشتییەوە دانیشتبوو.

پاسەوانەکە وتی: (بڕۆ لەوێ دانیشە.)

منیش چوومە ئەوێ لەسەر کورسییەك دانیشتم و پاسەوانەکە بە کابرای بلیت فرۆشی وت: (دەمەوێ تەلەفۆنێك بکەم.)و پاشان خولەکێك بە تەلەفۆن قسەی کردو تەلەفۆنەکەی دانایەوەو بە کابرای پشت مێزەکەی وت: (ئاگاتان لەمە بێت، من تائەو کاتەی کە خانم هابرشام بێدار دەبێتەوەو خۆی دەگۆڕێت دەگەڕێمەوە.)و دواتر چووە دەرێ.

من هەستام و چوومە بەردەم مێزەکەو وتم: (من دەمەوێ بڕۆم بۆ مەمفیس.)

کابرا وتی: (دەقیقەیەك بڕۆ لەسەر کورسییەکە دانیشە، هەر ئێستا مستەر فوت دێت.)

وتم: (من مستەر فوت و ئەمەو ئەوە ناناسم. من دەمەوێ سواری ئۆتۆبۆس ببم و بڕۆم بۆ مەمفیس.)

وتی: (پارەت پێیە؟ حەفتاو دوو سەنت کرێکەتە.)

منیش قاوغە شقارتەکەم دەرهێنا، هێلکە داڵەکەرخۆرەکەم دەرهێناو پێم وت: (ئەمە بە بلیتێکی مەمفیس دەگۆڕمەوە... دەیکەی؟)

وتی: (چی بکەم؟)

وتم: (هێلکەی داڵەکەرخۆرە. تائێستا نەتدیوە. دەیدەم بە حەفتاو دوو سەنت.)

وتی: (نا. خاوەن ئۆتۆبۆسەکان پارەی کاشیان دەوێت. ئەگەر من بلیتی ئۆتۆبۆس بە هێلکەو شتی لەم بابەتە بگۆڕمەوەو مامەڵەی پێوەبکەم، ڕۆژێك فڕێم دەدەنە دەرێ. ئێستا بڕۆ لەسەر کورسییەکە دانیشە، ببینم مستەر فوت. . . . . )

ڕامکردە دەرێ، بەڵام کابرا گرتمی. دەستێکی لەسەر مێزەکە داناو خۆی هەڵداو دەستێکی درێژکرد کراسەکەم بگرێ. منیش چەقۆکەی گیرفانم هەڵکێشا، دەمەکەیم کردەوەو وتم: (گەر دەستم لێوەدەی، کارت تەواو دەکەم!) دواتر ویستم لەناو دەرگاکەدا خۆم لە دەستی ڕاپسکێنم، بەڵام ئەو زۆر چاپووك بوو. تائێستا هیچ پیاوێکم بەو چاپووکییە نەبینیبوو. تەقریبەن لە پێت دەچوو. لێم هاتە پێشەوە، چووە پشت دەرگاکەوە وەستاو قاچێکی بەرزکردەوە. ئیتر جگە لەوە دەرگایەکی تر نەبوو لێوەی بچیتە دەرێ.

وتی: (بڕۆ جێگەی خۆت و لەسەر کورسییەکە دانیشە.)

جگە لەو دەرگایە، ڕێگەی تر نەبوو کە بڕۆمە دەرێ. ئەو پشتی کردبووە دەرگاکەو وەستابوو، منیش

چووم لەسەر کورسیەکە دانیشتم. ئەو وەختە گەراجەکە پڕ بوو لە خەڵك، دووبارە سەرو کەللەی پاسەوانەکە پەیدابوو ، لەگەڵ دوو خانم کە پاڵتۆی چەرمیان لەبەردابوو ماکیاژی تەواویان کردبوو. بەڵام دیاربوو کە بەزۆر لەخەو هەستاون. بە دەموچاوی تێکترشاوەوە سەیریان دەکردم.

پیرەکەیان وتی: (پاڵتۆیشی لەبەردا نییە. چۆن خۆی تاقو تەنیا هاتووە بۆ ئێرە؟)

پاسەوانەکە وتی: (منیش دەمەوێ ئەوە لە ئێوە بپرسم. من هیچ سەر لە کاری دەرناکەم، جگەلەوەی کە براکەی لە مەمفیسەو خۆیشی دەیەوێ بچێت بۆلای براکەی.)

خانمە پیرەکە وتی: (هەڵبەتە دەبێ خۆت بگەیەنیتە ئەوێ. لەو باوەڕەدایت ئەگەر بڕۆی بۆ مەمفیس بتوانی براکەت بدۆزیتەوە؟)

وتم: (وابزانم دەتوانم. برایەك زیاترم نییە. هەمیشە دەیناسمەوە. وابزانم گەر دووبارە بشیبی بیبنمەوە هەر دەیناسمەوە.)

خانمە پیرەکە وتی: (بەڵام وەك ئەوەیە خۆیشیماڵی لە مەمفیس بێت.)

پاسەوانەکە وتی: (منیش گومانم نییە. مەعلوم نییە. بێگومان دواجار ماڵی لە شوێنێکە. ئەم رۆژانە، ئەمانە هەموو شەوێ بە ئومێدی ئاشنایەك یا شتێك کورو کچ وێڵ دەبن. هێشتا نازانن بەرێدا برۆن لەشاردا وێڵ دەبن. ئێمە چوزانین، رەنگە ئەمە دوێنێ لە تەکساس یا لە میسۆری بووبێ. بەکورتی بەباوەڕی من دەبێ رەوانەی مەمفیسی بکەین، لەوێ بۆ براکەی بگەرێت.)

خانمە پیرەکە وتی: (بەڵێ.)

خانمە گەنجەکە لەسەر کورسییەکە دانیشت، جانتاکەی دەستی کردەوە، قەڵەم جافێك و پارچە کاغەزێکی دەرهێنا.

پیرەکە وتی: (چاکە، کورەکە گیان. ئێستا دەمانەوێ کارێك بکەین کە بتوانی براکەت بدۆزییەوە. بەڵام سەرەتا دەبێ دۆسێیەکت بۆ دروستکەم. ئێستا بڵێ بزانم ناوت چییە؟ ناوی خۆت، ناوی براکەت، لەکوێ لەدایك بووی، باوك و دایکت کەی مردوون؟)

وتم: (من دۆسێ و ئەم جۆرە شتانەم پێویست نییە. من تەنها دەمەوێ بڕۆم بۆ مەمفیس. هەر ئەمڕۆ دەبێ خۆم بگەیەنمە ئەوێ.)

پاسەوانەکە وتی: (یارمەتی هەیە؟)و وەك ئەوەی کەیفی بەقسەکەی خۆی بێت: (من کە پێم وتن. . .)

کابرای ئۆتۆبۆسەکە وتی: (خانم هابرشام! ئێوە شانستان هەبوو. کە کابرا حەو تیرێکی پێنەبوو. هەر بجوولێی ئەو چەقۆ هەڵدەکێشێ.)

بەڵام خانمە پیرەکە هەمان شێوە وەستابوو سەیری منی دەکرد. دواتر وتی: (چاکە، وەڵا من نازانم چیبکەم.)

کابرای ئۆتۆبۆس وتی: (من دەزانم. من لە گیرفانی خۆم بلیتێکی دەدەمێ کە لێرە شەڕ نەکات و چەقۆ هەڵنەکێشێ. پاشان مستەر فوتیش بابەتەکە بەخەڵك بڵێ، نەك تەنیا پارەکەم دەدەنەوە بەڵکو نیشانەیەکیشم دەدەنێ. . . . بەڵێ مستەر فوت؟)

بەڵام کەس شوێنی چۆڵ نەکرد. خانمە پیرەکە هێشتا هەمان شێوە وەستابوو سەیری منی دەکرد. پاشان دووبارە وتی: (چاکە)و دواتر دۆلارێکی لە جانتاکەی دەرهێناو دای بە کابرای ئۆتۆبۆس و وتی: (بەبۆچوونی من دەبێ بلیتێك بۆ ئەم منداڵە دابینکەین، وانییە؟)

کابرای ئۆتۆبۆس وتی: (رەنگە گەر تێبگەن بێچارەم بکەن. بەڵام باشە، گرفتێك نییە. هەرچی دەبێ بابێ.)

دواتر هەموویان ڕۆیشتن. پاشان پاسەوانەکە بە ساندویچێکەوە گەڕایەوەو دای بە منو وتی: (بێگومان دەتەوێو دەشتوانی براکەت بدۆزیتەوە؟)

وتم: (هیچ هۆیەك نییە کە نەتوانم. ئەگەر منیش ئەو نەبینم، ئەو من دەبینێت. بەو جۆرەی کە من ئەو دەناسم ئەویش من دەناسێت ئیتر.)

پاشان سوپاس بۆ خودا پاسەوانەکە ڕۆی‌و منیش ساندویچەکەم خوارد. ئەو وەختە یەك دنیا خەڵکی تر هاتن بۆ بلیت کڕین. دواتر کابرای ئۆتۆبۆسەکە وتی کاتی ڕۆیشتنە. منیش سواری ئۆتۆبۆسەکە بووم، وەك پیت کە دوێنێ سواربوو. بەڕێکەوتین.

هەموو شارەکان، هەرچی شاربوو، من بینیم. کاتێ ئۆتۆبۆس خێرای کرد، بینیم خەوم دێ. بەڵام زۆر شت هەبوون کە پێشتر نەم بینیبوون دەبوو بیانبینم. لە جفرسۆن دەرچووین‌و بەناو دارستان‌و دەشتەکاندا تێپەڕین. دواتر چووینە شارێکی ترەوە کە ئەنبارى گەورەو کرێنی زۆرو تانکی ئاوی هەبوو. پاشان تۆزێك لە تەنیشت هێڵی ئاسنەوە ڕەت بووین‌و نیشانەی بروسکەنامەم بینی، دواتر شەمەندەفەرم بینی. پاشان چەند شارێکی ترم بینی‌و کە خەوم دەهات وەك فافۆن قورس بووبووم، بەڵام نەدەخەوتم.

دواتر مەمفیس دەرکەوت. وادەهاتە بەرچاو زۆر دوورە. وام بەخەیاڵدا هات کە چەند تەلارو ئەنبارو ئەو شتانە تێدەپەڕێنین‌و ئۆتۆبۆسەکە دەوەستێت. بەڵام ئەوێ مەمفیس نەبوو. دیسان لە تانکی ئاو دووکەڵکێشی ئاشە ئاوی تر تێپەڕین. ئەگەر ئەوە هەموو کرێن‌و ئاش بوو، من کە تا ئەوکاتە ئەوەندە زۆرو بەو گەورەییە نەمدیبوو. ئاخری هەر تێنەگەیشتم ئەو هەموو دارە لەکوێ دەهێنن کە ئەوان ڕێگە دروستکەن.

دواتر خودی مەمفیسم بینی..... ئەم جارە زانیم کە بەهەڵەدا نەچووم. شار، ڕاست لە هەوادا وەستابوو. وەك ئەوە وابوو کە دە دوازدە شاری وەك جفرسۆن پێکەوە بلکێنن‌و ڕاست لە هەوادا دایانبنێن. دواتر چووینە ناوشار. ئۆتۆبۆسەکە وەك ئەوە وابوو هەنگاو بەهەنگاو بوەستێت‌و لەهەردوو لایەوە ئۆتۆمبیل بەخێرایی تێدەپەڕین. شەقامەکان پڕبوون لە خەڵك‌و من نەمدەزانی کە بۆچی لە میسیسیپی هیچ کەس نەمابوو کە تەنانەت یەك بلیتی ئۆتۆبووس بەمن بفرۆشێت‌و دۆسێیەکی رابردووم بۆ دروست بکەن. پاشان ئۆتۆبووس لە گەراجەکە وەستا. یەك دنیای گەورەتر لەوەی جفرسۆن. وتم: (چاکە. باشە ئەو شوێنەی خەڵکی لێدەبەن بۆ سەربازی لەکوێیە؟)

ئەوسا وتی: (ها.........)و پاشان پێی وتم کە دەبێ چۆن بڕۆمە ئەوێ.

سەرەتا ترسام کە لەناو شارێکی گەورەی وەك مەمفیسدا، نەزانم دەبێ چیبکەم. بەڵام دواجار تێگەیشتم. زیاتر لە دوو کەڕەت لە کەسێك نەپرسم. دواتر گەیشتمە ئەوێ‌و خۆشحاڵبووم کە لەناو ئەم هەموو ئۆتۆمبیل‌و خەڵکەدا کە خێرا خێرا دەڕۆیشتن‌و دەهاتن، بەکورتی گەیشتم. بیرمکردەوە کە ئیتر زوو پیت دەدۆزمەوە. پاشان بیرمکردەوە کە ئەگەر لێرە ئەو هەموو خەڵکە ڕۆیشتوون بۆ سەربازی بەمجۆرە قەرەباڵغە، چیبکەم؟ وابزانم بەر لەوەی پیت ببینم، پیت من دەدۆزێتەوە. ئەوسا ڕۆیشتمە ژوورێکەوە. پیت لەوێ نەبوو. سەربازێك لەوێ بوو شتێکی گەورە بەسەر قۆڵییەوە بوو خەریکی نووسین بوو. دوو کەسی تر لەبەردەمی وەستابوون. وابزانم چەند کەسی تریش لەوێ بوون. وەك ئەوەی بیرم بێت چەند کەسی تر لەوێ بوون.

چوومە بەردەم ئەو مێزەی کە سەربازەکە خەریکبوو شتێکی لەسەر دەنووسی‌و وتم: (کوا پیت؟)

سەربازەکە وتی: (چی؟ وتت کێ؟)

منیش پێموت: (دوێنێ هاتووە بۆ سەربازی. دەیویست بڕوات بۆ پێرل هاربۆر. خۆیشم هەروەها. دەمەوێ بگەمە لای‌و پێکەوە بڕۆین. بۆ کوێتان برد؟) ئێستا ئیتر هەموو خەریکبوون سەیری منیان دەکرد. بەڵام من گوێم پێنەدان. پاشان وتم: (یاڵڵا، بڵێ بزانم لەکوێیە؟)

سەربازەکە وازی لە نووسین هێنا، هەردوو دەستی خستە سەرمێزەکەو وتی: (ئۆهۆ! تۆیش دەتەوێ بڕۆیت، وایە؟)

وتم: (بەڵێ، ئاخر ئەوان ئاویان دەوێ، داریان دەوێ، من دەتوانم بۆیان بێنم، یاڵڵا پێم بڵێ بابزانم پیت لە کوێیە؟)

سەربازەکە لەجێی خۆی هەستاو وتی: (ئەسڵەن کێ ڕێگەی بە تۆ داوە بێیتە ژوورەوە؟ بڕۆ، بڕۆ ونبە!)

وتم: (خۆت بڕۆ ونبە، تۆ بڵێ پیت....) ئامادەم گرەو بکەم کە ئەو سەربازە لە کابرای ئۆتۆبۆسیش چاپووکتر بوو، نەهاتە پێش مێزەکەوە، لە تەنیشتییەوە هات، تا من ویستم تێبگەم گەیشتە سەرم، منیش هەرئەوەندە هەلم دەست کەوت خۆم هەڵدەمە دواوەو چەقۆکە لە گیرفانم دەربهێنم، دەمەکەی بکەمەوەو بەر چەقۆی دەم، ئەو هاواری کردو چووە دواوەو دەستێکی بەدەستەکەی تری گرت، من چەقۆم بۆ داوەشاند، بەڵام بەری نەکەوت، دواتر دوو کەس لەدواوە منیان گرت، پاشان سەربازێکی تریش لەپشت دەرگاکەوە هاتە ژوورێ، نیتاقی بەستبوو خەتێکی بەسەر شانەوە بوو.

وتی: (ئەمە چ بێماناییەکە ئیتر؟)

سەربازی یەکەم هاواری کرد: (ئەم منداڵە بەچەقۆ دەستی بڕیم.)

کاتێ ئەوەم بیست دیسان هەوڵم دا خۆم هەڵدەمە سەری، بەڵام دووانەکەی تر ئاگایان لە من بوو، ئەو سەر بازەی خەتەکە بەسەر شانییەوە بوو، وتی: (ئەهای، ئەهای، چەقۆکەت دانێ، دەبینێ کە ئێمە هیچمان تفەنگمان پێ نییە، پیاوی پیاوانە چەقۆ لە خەڵکی بێ تفەنگ هەڵناکێشێ.)

ورده ورده خەریکبوو قسەکانیم وەردەگرت، دەنگی کتومت وەك دەنگی پیت بوو کە قسەی لەگەڵ دەکردم، پاشان وتی: (چاکە، ئیتر وازی لێبێنن.) ئەوان بەریاندام، وتی: (باشە شەڕەکە لەسەر چییە؟)و منیش پێموت، وتی: (ڕاستە! ئێستا هاتووی بزانی پێش ڕۆیشتن حاڵی باشبووە یا نا.؟)

وتم: (نا، من هاتووم کە.........)

بەڵام ئەو رووی کردبووە سەربازێك کە خەریکبوو دەسڕێکی لە دەستی دەئاڵاند.... ئەوسا وتی: (دۆزیتەوە؟)

سەربازی یەکەم چووە سەر مێزەکەو سەیری چەند پەڕە کاغەزێکی کرد، پاشان وتی: (لێرەیە، دوێنێ ناو نووسی کردووە، بەیانی ئەمڕۆ لەگەڵ دەستەیەکدا ڕەوانەیان کردوونو بەرەو لیتڵ ڕاك ڕۆیشتن.)

سەربازەکە کاتژمێرێکی زنجیری لەدەستدابوو، سەیری کاتژمێرەکەی کردو وتی: (نزیکەی پێنج خولەکی تر شەمەندەفەرەکە دەڕوات، ئەگەر درۆم نەکردبێ، خۆبەخشە گوندییەکان دەبێ ئێستا لە وێستگەکە بن.)

ئەو سەربازەی خەتەکەی هەبوو، وتی: (تەلەفۆن بۆ وێستگە بکەن، بە باربەری وێستگەکە بڵێن تاکسییەکی بۆ بانگ بکات، تۆیش لەگەڵ من وەرە.)

ژوورێك لەپشت ژووری یەکەمەوە بوو کە تەنها مێزێكو چەند کورسییەکیان لێ دانابوو، ئێمە لەوێ دانیشتینو سەربازەکە جگەرەیەکی داگیرساند، زۆر درێژەی نەکێشا، من کە دەنگی پێی پیتم بیست ناسیمەوە، ئەوکاتە سەربازی یەکەم دەرگای کردەوەو پیت هاتە ژوورێ، جلی سەربازی لەبەرنەکردبوو، هەر بەو جۆرەی دوێنێ بوو کە سواری ئۆتۆبۆسەکە بوو، لە دوێنێوە تا ئێستا، بە هەفتەیەك دێتە بەرچاوم، چونکە ئەم هەموو کێشەیە ڕوویدابوو ئەو هەموو ڕێیەم بڕیبوو.

پیت هاتو سەیری کردم، دەتوت هەرگیز لەماڵ نەڕۆیشتبوو، بەڵام ئیتر ئێستا لە مەمفیس بوو خەریکبوو دەڕۆیشت بۆ پێرل هاربۆر.

پیت وتی: (ئەوە تۆ لێرە چی دەکەی؟)

وتم: (ئاخر خۆ ئێوە ئاو و دارو چێشت لێنەری باشتان دەوێ. من دەتوانم بۆتانی بکەم.)

وتی: (نا، تۆ بگەڕێوە بۆ ماڵێ.)

وتم: (نا، پیت، دەبێ من هەر بێم. ئەگەر نەمبەی دڵم دەشکێنی ها!)

پیت وتی: (نا.) پاشان سەیری سەربازەکەی کردو پێی وت: (گەورەم! نازانم ئەم منداڵە چییە. تا ئێستا هیچ کاتێ چەقۆی لە کەس هەڵنەکێشاوە.) دواتر سەیری منی کردو وتی: (بۆ واتکردووە؟)

وتم: (من چووزانم. من تەنیا ویستم بێم بۆ ئێرە. تەنیا ویستم تۆ بدۆزمەوە.)

وتی: (چاکە، کەرەتێکی تر کاری وا نەکەیت ها! گوێت لێبوو؟ چەقۆکە بخەرە گیرفانتەوەو ئاگات لێی بێت. ئەگەر ئیتر ببیستم چەقۆت لە کەسێك هەڵکێشاوە، لە هەرکوێ بم بۆت دێمو تەمبێت دەکەم، ها! گوێت لێیە؟)

وتم: (گەر دەمزانی بەچەقۆ هەڵکێشان تۆ دەگێڕنەوە ماڵێ، هەڵبەتە چەقۆم هەڵدەکێشا. نەك هەر چەقۆ هەڵکێشان؟ مرۆڤیشم سەردەبڕی.)

پیت وتی: (نا.) بەڵام ئیتر دەنگی سەختو توند نەبوو. دەنگی لەسەرخۆبوو، من تێگەیشتم کە ئیتر سوودی نییە لاساری بکەمو پێبکەمە کەوشەوە.

پاشان پیت وتی: (دەبێ تۆ بگەڕێیتەوە ماڵێو یارمەتی بابەو دایە بدەیت. من ئومێدم بەتۆیە کە ئاگات لە زەوییەکەم بێت. دەمەوێ هەر ئەمڕۆ بگەڕێیتەوە ماڵێ. گوێت لێیە چیدەڵێم؟)

وتم: (بەڵێ، گوێم لێیە.)

سەربازەکە وتی: (ئینجا دەتوانێ بەتەنیا بگەڕێتەوە ماڵەوە؟)

پیت وتی: (ئەی ئەوە نییە خۆی بەتەنیا تا ئێرە هاتووە).

وتم: (وابزانم دەتوانم. هەمووی خانوویەك زیاترمان نییەو، باوەڕیش ناکەم ئەویش لەجێی خۆی جوولابێ.)

پیت دۆلارێکی لە گیرفانی دەرهێناو دای بە منو وتی: (ئەوە پارەی بلیتەکەت تا پەنا سندوقی پۆستەکەی لای خۆمان. قسەی مولازم لەگوێبگرە. دەتگەیەنن تا سواری ئۆتۆبۆسەکە بیت. بگەڕێوەو برۆ ماڵێ یارمەتی بابەو دایە بدە. ئاگات لە زەوییەکانی من بێت. چەقۆکە بخەرە گیرفانتەوە.... گوێت لێیە؟)

وتم: (بەڵێ.)

وتی: (زۆرباشە. ئێستا ئیتر دەبێ من برۆم.)

ئەوکاتە دووبارە دەستی بەسەرمدا هێنا. بەڵام ئەم جارەیان ئیتر ملم گەرم دانەهات. تەنها کەمێك دەستی خستە سەر سەرم. پاشان داهاتەوەو ماچی کردم. دواتر دەنگی پێیو دەنگی دەرگاکەیشم بیست. سەرم هەڵنەبڕیو ئەمەیش هەمووی تەواوبوو. دانیشتبوومو دەستم بەو شوێنەدا دێنا کە پیت ماچی کردبوو، سەربازەکەیش پشتی بە کورسییەکەوە دابوو لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی دەکردو خیزەی سنگی دەهات. پاشان دەستی خستە گیرفانییەوەو بەو جۆرە بەبێ ئەوەی سەیر بکات شتێکی دا بە من، پارچە بنێشتێك بوو.

وتم: (زۆر سوپاس. چاکە، ئێستا ئیتر دەبێ من برۆم. رێگەم دوورە.)

سەربازەکە وتی: (ئارام بگرە. پاشان تەلەفۆنی کرد. دیسان پێموت کە دەبێ زوو برۆم.)و دووبارە وتی: (ئارامت بێ، بیرتە پیت چی پێ وتی.)

ئەوکات ماوەیەك ئارامم گرت. پاشان ژنێك هاتە ژوورێ. پیربوو. پاڵتۆیەکی چەرمی لەبەرابوو، دۆسێو قەڵەم جافی پێنەبوو.. کاتێ هاتە ژوورەوە، سەربازەکە لەبەری هەستا. خانم خێرا چاوێکی بەژوورەکەدا گێڕا

تا چاوی بە من کەوتو دەستی خستە سەرشانم. دەستی سووك و چاپووك و نەرم بوو. وەك دەستی دایکم بوو. ئەوسا وتی: (هەستە بڕۆینە ماڵێ نان بخۆین.)

وتم: (نەخێر خانم. دەبێ من سواربم بڕۆم بۆ جفرسۆن.)

خانمەکە وتی: (دەزانم. کاتی زۆرمان هەیە. سەرەتا دەڕۆینە ماڵێ نان دەخۆین، پاشان....)

ژنەکە ئۆتۆمبیلی پێبوو. ئەوسا سواربووین و چووینە ناو ئۆتۆمبیلەکانی ترەوە. وەك ئەوەی چووبینە ژێر ئۆتۆبۆسەکانەوە تێپەڕین. لە نزیك نزیك خەڵکەوە تێدەپەڕین بەجۆرێ کە گەر بمناسیایە دەمتوانی قسەیان لەگەڵ بکەم... تۆزێ دواتر خانم ئۆتۆمبیلەکەی راگرت و وتی: (فەرموو)و من سەیری دەرەوەم کرد. ئەگەر ئەو تەلارە هەمووی هی خانم بێت، بێگومان دەبێ خێزانێکی زۆر گەورە بن. بەڵام ئەو تەلارە هەمووی ماڵی ئەوان نەبوو. پێکەوە چووینە هۆڵێکەوە داریان تیا چاندبوو، تێپەڕین و چووینە ژوورێکی بچووکەوە هیچی تێدانەبوو جگە لە نۆکەرێکی رەش کە جلی فەرمی لەبەرابوو. جلە فەرمییەکەی لە جلی سەربازەکان زۆر تازەتر بوو. نۆکەرە رەشەکە دەرگاکەی داخست. ئەوسا من خۆم راپسکاندو هاوارم کرد: (خێرا! خێرا!) بەڵام هیچ چاری نەبوو. یەکسەر هەموو ژوورەکە بەرەو سەرەوە رۆی و وەستا. دەرگا کرایەوەو ئێمە چووینە هۆڵێکی ترەوە. لەوێ سەربازێکی پیر دانیشتبوو کەخەت لەسەر شانەکانی بوو و دوو باڵندەی زیویش لەسەر هەردوو شانی بوو. خانم وتی: (فەرموون. ئەمەیش بەڕێز عەقید مەك کیلۆگە... ئێستا بۆ ئێوارە چی دەخۆیت؟)

وتم: (وابزانم هەر تەنیا تۆزێ باسترمەو هێلکەی مریشك و قاوە دەخۆم.)

خانم کە تەلەفۆنی هەڵگرتبوو، یەکسەر دەستی راتەکاندو وتی: (قاوە؟ لەکەیەوە بوویتە قاوە خۆر؟)

وتم: (چووزانم. وابزانم لەو کاتانەوەی یادم نییە.)

وتی: (تۆ نزیکەی هەشتساڵی، وانییە؟)

وتم: (نەخێر خانم. هەشت ساڵو دە مانگ، پێدەنێمە یازدە مانگەوە.)

ئەوسا خانم تەلەفۆنی کرد. پاشان من دانیشتم و بۆم باسکردن کە چۆن بەیانی ئەو رۆژە پیت بۆ پێرل هاربۆر چووەو چۆن ویستم لەگەڵی بڕۆم، بەڵام ناچاربووم بگەڕێمەوەو کۆمەکی باوك و دایکم بکەم و ئاگاداری زەوییەکانی پیت بکەم. خانمەکە وتی: منداڵێکی بەقەد منی هەیەو لە رۆژهەڵاتی ئەمریکا خستوویانەتە بەر خوێندن. دواتر نۆکەرێکی تری رەش کە نیوکۆتێکی لەبەرابوو هاتە ژوورەوە. مێزێکی تایەداری پێش خۆیدابوو لە هۆڵەکە داینا. گۆشت و هێلکەکەی من و کوپێك شیرو پارچەیەك کولیچەی لەسەر بوو.

وامزانی برسیمە، بەڵام هەر کە پارووی یەکەمم خستە دەممەوە بینیم ناتوانم قوتی بدەم. ئەوسا خێرا هەستام و وتم: (دەبێ بڕۆم.)

ژنەکە وتی: (ئارام بگرە ببینم.)

وتم : (دەبێ بڕۆم.)

وتی: (دەقەیەك بوەستە. تەلەفۆن دەکەم ئۆتۆمبیل بێت. هەمووی دەقەیەك زیاتر درێژە ناکێشێ. ناتوانی شیریش بخۆیتەوە؟ ئەی قاوە؟)

وتم: (نەخێر خانم. برسیم نییە. کاتێ چوومەوە ماڵێ دەیخۆم.)

ئەوسا زەنگی تەلەفۆن لێی دا. بەڵام خانم وەڵامی تەلەفۆنەکەی نەدایەوەو بەمنی وت: (ئەوە، ئۆتۆمبیلەکەیە.)

پاشان دووبارە لە هەمان ئەو ژوورەی کە سەرەوخوار دەڕۆی و نۆکەرێکی رەشی بەجلی فەرمییەوە لێبوو رۆیشتینە خوارێ.

ئەمجارەیان ئۆتۆمبیلەکە گەورەبوو کە سەربازێك لەپشت سوکانەکەیەوە دانیشتبوو. چوومە پێشەوەو لەپەنا شۆفێرەکەدا دانیشتم. ژنەکە دۆلارێکی دا بە شۆفێرەکەو وتی: (رەنگە لە رێگە برسی بێت. لە شوێنێکی باش دایبنێ.)

شۆفێرەکە وتی: (بەسەرچاو، خانمی مەك کیلۆگ.)

دواتر دووبارە کەوتینەرێ. مەمفیس لە رووناکی هەتاودا دەرکەوت. ئێمە لێی دوورکەوتینەوەو یەکەمین شتێك کە من تێیگەیشتم ئەوەبوو کە گەراینەوە لای ئەنبارو کرێنو ئاشەکان. مەمفیس زۆر دووربوو. کەم کەم دیار نەدەما. پاشان دووبارە بە دارستانو دەشتەکاندا تێپەرینو ئەگەر شۆفێرەکە نەبوایە وادەهاتە بەرچاوم کە هەرگیز نەچووبوومە مەمفیس. خەریکبوو بەخێرایی دەرۆیشتن. لەبەر ئەوەی پێش ئەوەی تێبگەم دەگەیشتمە ماڵەوە. واهاتە بەرچاوم کە وەك ئەوەی لەناو ئەم ئۆتۆمبیلە گەورەیەدا کە سەربازێك لەپشت سوکانەکەیەوە دانیشتبوو، بەلای گوندی فرنچمەن تێپەرین. من یەکسەر دەستم کرد بەگریان. تێنەگەیشتم بۆ، بەڵام بەدەست خۆم نەبوو. لەپەنا شۆفێرەکە دانیشتبوومو خەریکبوو خێرا دەرۆیشتین.

### سەرچاوە


یك گل سرخ برای امیلی

ویلیام فاکنر

ترجمە: نجف دریا بندری

چاپ پنجم: 1385

انتشارات نیلوفر



ئامادەکردنی: هادی محەمەدی

# گفتوگۆ لەگەڵ مەحمود دەوڵەت ئابادی

**سەرەتا:**

بێگومان زۆربەی روناکبیرانی کوردستانی رۆژهەڵات رۆمانی «کلیدر»، بەرهەمی نووسەری گەورەی ئێرانی «محمود دولت ابادی» یان خوێندۆتەوە، نووسەر لەم بەرهەمەیدا بەوپەڕی پسپۆڕی و لێزانیەوە تیپۆلۆژی هەموو جۆریك لە مرۆڤەکان لەڕووی دەروونناسی و کۆمەڵناسییەوە ئاراستە دەکات، کلیدر هەموو جۆرە تیپێکی سایکۆلۆژیك و سۆسیۆلۆژیکی تێدایە: «گوڵ محەمەد» سەمبوڵی ڕێبەرێکی جەماوەری و کاریزماتیکە، «سەتار پینەچی» هێمای شۆڕشگێڕێکی پڕۆفیشناڵە، «خان عەمو» کەسێکی رندە، «قوربان قووچ» کەسێکی خاراو و سارد و گەرم چێشتووە، هەروەها هێمای سۆز و ئەمەکناسییە، «قەدیر» و «نادعەلی» نموونەی دوو کەسێتی نادەربەست و هەرچی و پەرچین، «شەیدا» کەسێکی بەرەڵا و بێ ئەخلاق و شواڵ پەڵیتە، «بۆلقەیس» شێرە ژنێکی خاراو و بەئەزموونە، «ماراڵ» شۆڕەژنێکی شۆخ و دڵتەڕە، «باب قولی» کەسێکی فێڵباز، بەرژەوەندخواز، شەریکی دز و رەفیقی قافڵەیە، «عەباسجان» کەسێکی ئێجگار بێ شەخسییەت، خوێنتاڵ، نەفرەت لێکراو، جاسووس و سیخورە.

لە ناسکترین دۆخ (لە زەماوەندی ئەسلان بوندار)دا، کاتێ دوو گرووپ، دوو سوپای روناکی و تاریکی تێکەڵ دەبن و لە مامەڵە و دانوستاندان، ئەگەری هەرجۆرە بۆسە و خەیانەتێك لە ئارادایە، لەم دۆخەدا کاتێ کە «قوربان قووچ»پاسەوانە و کێشك دەدات، متمانە سەقامگیرە و دڵنیایی لەنگەر دەخات. بەڵام هەر کە عەباسجان سەرهەڵدەدات، دڵنیایی دەرەوێت و دڵەڕاوکە و دڵپیسی سێبەری قورسی دادەخات.

پێویسته ئاماژه بەوەش بکەین کە ڕۆمانی کلیدر بەستێنی بەسەرهات و گێڕانەوەی شۆڕشی جەماوەری ساڵەکانی ١٣٢٧-١٣٣٠یە کە لە کوێستانەکانی خۆراسان ڕوودەدات و بە شکستێکی تراژیك کۆتایی دێت.

خاڵی جێگای سەرنج ئەوەیە کە ئەم ڕۆمانە تەنیا تایبەت بە کولتورێك و نەتەوەیەك نییە، بەڵکوو لەودا زۆربەی نەتەوەکانی ئێران دەوری گرنگ و بنەڕەتی دەگێڕن. جگە لەوەی کە قارەمانانی سەرەکی ڕۆمانەکە (بنەماڵەی گوڵ محەمەد) کوردن، سەتار پینەچی تورکێکی ئازەربایجانیە و قوربان قووچیش یەکێ لە بەلوچەکانی سیستانە، و ...

ئەم ڕۆمانە لە چەندین دۆخی تیپیك و کەسێتی تیپیك پێکهاتووە و نووسەر توانیویە سەرەڕای شەڕ و کێشە و ململانێی توخمە جیاواز، دژوار و ناکۆکەکان، پێکهاتەیەکی ئێجگار تۆکمە و گونجاو بخولقێنێ. کە تەنیا بە پێوەری جوانیناسی کلاسیکی ئاڵمانیا بەوردی پێناسە دەکرێت. کلێدەر هەم بەپێی پێناسەی لوکاچ، کە ڕۆمان بە پیشاندەری دۆخی تیپیك و بەسەرهاتی کەسایەتی خاوەن کێشە (پرۆبلماتیك) دەزانێ، ڕۆمانێکی مۆدێرنە و، هەم بەپێی پێناسەی باختین، کە ڕۆمان بە دەقێکی فرەدەنگی کەرنەڤاڵی دەزانێ، ڕۆمانێکی مۆدێرن و سەرکەوتووە.

بە مەبەستی دیالۆگ و ئاشنایی زیاتر لەگەڵ نووسەری کلیدەر، م. دەوڵەت ئابادی، بەهاری ساڵی ١٣٨٠ لە تاران گفتوگۆیەکمان لەگەڵی سازدا.

* * *

*** لوسیەن گوڵدمەن دەنووسێ: "هەر بەوجۆرەی کە بۆ بنەمایەکی زانستی هەبوونی هەقیقەت پێویستە، بۆ بەرهەمێکی هونەری ئەدەبیش بوونی ڕاستیەکان پێویستە"، ئەم وتەیەتان چەندە قەبووڵە؟**

- پێم وایە ئەمە وتەیەکی زۆر بەنرخ و وردبینانە و جێگای بڕوایە، چونکە هیچ بەرهەمێکی هونەری نیە، کە بنەمای واقعی نەبێت، تەنانەت خولیایی ترین بەرهەمەکانیش بە چەشنێك پێوەندیان لەگەڵ ڕاستیەکان هەیە، جا لێرەدا ئەم ڕاستیانە ڕەنگە بەرهەست و فیزیکی بن، یان ڕەنگە دەرهەست و فانتزی بن. کەوابوو ئەم وتەیە زۆر ڕاست و وردبینانەیە، جگە لەمەش من بڕوام بە فاکتی یادەوەری لە»ژێن/gene"دا هەیە کە بەڕواڵەت ناسەلمێندرێ، بەڵام من بڕوام پێ هەیە.

*** لە کۆمەڵگەی بورژوازی لەنێوان هونەرمەند و خەڵکدا گەلێ لەمپەر و نێوەنجی پێکهاتووە، وەك سەرمایە و شتی تر... بەجۆرێك کە ج. لوکاچ هونەرمەند بە کەسێکی ئیزولە و خاوەن کێشە(پرۆبلماتیك) دەزانێ، چونکە لەئاست کۆمەڵگەی بورژوازی ئەوەندە هەست بە نامۆیی دەکات کە لە هیچ بڕگەیەکی مێژوودا ئاوا دیاردەیەك نابینین، بەڕای ئێوە لە وەها دوخێکدا هونەرمەندان دەبێ چ بکەن؟**

- زۆر ڕاستە، لە کۆمەڵگەی بورژوازییدا نووسەران و هونەرمەندان تووشی دابڕانێکی مەرگاوی دەکرێن، بەڵام پێویستە ئەمەش بڵێین کە کۆمەڵگەی ئێمە هێشتا سیستەمی بورژوازی ئەزموون نەکردووە، کێشەی نووسەران و هونەرمەندانی وڵاتی ئێمە لە چەشنێکی ترە، لە چەشنی ڕژێمێکی سیستماتیکی بۆرژوازی نیە، کەوابوو ئەو شتەی لوکاچ دبێژێ بەجۆرێکی تر نووسەران و ڕۆشنبیرانی وڵاتانی جیهانی سێهەم دەگرێتەوە، کە بەداخەوە بەوردی تۆژینەوەی لەسەر نەکراوە، هۆکارەکەشی ڕوون و ئاشکرایە، چونکە لە کۆمەڵگەی ئێمە هێشتا بیرمەندانێك وەك لوکاچ هەڵنەکەوتوون.

*** بیرمەندانی قوتابخانەی بوداپێست و هەروەها ل. گوڵدمەن پێیان وایە کە کاری گەورەی مێژوویی**

**– کۆمەڵایەتی و شاکاری بەرزی هونەری - کولتوری بەرهەمی کردیار(سوژە)ی کۆیی یە، گوڵدمەن لە تۆژینەوەیەك لەمەڕ بەرهەمەکانی پاسکال و راسین دروستی ئەم وتەیەی سەلماندوە، ئایا دەکرێ بڵێین فاعلێکی کۆیی کلیدری خولقاندوە، یان بەرهەمی مەحمودی دەوڵەت ئابادی یە؟**

- بەڕای من نە تەنیا کۆمەڵگەی ئێستا، بەڵکوو کۆمەڵێکی مێژوویی لە ناخی نووسەردا کۆدەبێتەوە، کەوابوو نووسەر دەبێتە کەژاوەی ئەم یادەوەرییە کۆییە لە جڤاتی رابردوو و ئێستاوە بۆ جڤاتی سبەینێ و داهاتوو. ئەمەش وتەیەکی گونجاوە، بەڵام من ئەم پرسە لەمەش قووڵتر دەبینم، من پێم وایە هەر بەرهەمێکی هونەری، تەنیا بەرهەمی کۆمەڵگەی ئێستا نیە، بەڵکوو بەرهەمی ئەم کۆمەڵگە و جڤاتانی پێشووی دێرینی لەمێژینە و لەڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ یادەوەری کۆیی کە من بڕوام پێ هەیە. بەڵام لەمەڕ ئەزمونی خۆم کە ئاماژەتان پێکرد، دەبێ بڵێم: ئەم بەرهەمە من خولقاندوومە، بەڵام من جیاواز لە کۆمەڵگە و جیاواز لە مێژوو و بارودۆخ نەبووم، ئەرکەکەی لەسەر شانی من بووە و... سەرئەنجام دەبێ ئەوەش زیاد بکەم کە من بڕوام بە یادەوەری لە«ژێن»دا هەیە و لە درێژەی کارەکانمدا بەم ئاکامە گەیشتووم.

*** یەکێ لە سەرەکیترین قەیرانەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست کێشەی باوك سالاریە لە دەسەڵاتدا، لە کۆمەڵگە، لە بنەماڵە و لە حیزبەکاندا، لە فەرهەنگی رۆژئاوادا کوڕ باوك دەکوژێ، لەوانە دەکرێ ئودیپ و برایانی کارامازۆڤ ناوببەین، بەڵام لە فەرهەنگی رۆژهەڵاتدا باوك کوڕ دەکوژێ، بۆ نموونە لە شانامەدا سوهراب بە دەستی رۆستەم دەکوژرێ، ئەم فەرهەنگە هەتا ئەمرۆش هەروا درێژەی هەیە: لە رۆمانی کلیدردا عەباسجان کە دەیەوێ باوکی خۆی (کەربەلایی خودادا) بکوژێ ئەوەندە درەنگی دەخا تا باوکی بۆ خۆی دەمرێ، یان لە رۆمانی حەسار و سەگەکانی باوکمدا (بەرهەمی شێرزاد حەسەن نووسەری ناسراوی کورد) کاتێ کوڕ باوکی دەکوژێ، خەڵکی حەسار تووشی وەها پشێوی و پەرێشانیەك دەبن کە خۆزگە بە سەردەمی باوك دەخوازن. ئایا دەکرێ لەئاست ئەم فاکتانە گەشبین بین و ئەمە بە سەرەتای مەرگی باوك و پرۆسەی رۆشتن بەرەو دیموکراسی و پلۆرالیزم بزانین؟**

- ئەمەش بۆچوونێکە، بەڵام پێکهاتەی باوکسالاری لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ئێجگار کۆن و لەمێژینە... بۆ خۆم پێم خۆشە ئەگەر بکرێ لە وڵاتی ئێمە ئەم کێشە مێژووییە ئاشتیانە چارەسەر بکرێ، هەر وەك گوتتان لە شانامەدا باوك کوڕ دەکوژێ، یان لە«برایانی کارامازۆڤ»دا کوڕ، یان باشتر بڵێم کوڕی ناشیاو، باوك دەکوژێ، ئەگەر بمانەوێ بە دیدی سەمبۆلیك سەیری ئەم قەیرانە بکەین، زۆر رەهەندی تریش دەگرێتەوە، بەڵام من پێم خۆشە کێشەی باوکسالاری لە وڵاتی ئێمە بە خۆشی و ئاشتی و بە عەقڵ و لۆژیك چارەسەر بکرێ و گەشەی کۆمەڵایەتی جێگای شیاوی باوك دیاری بکا و کوڕیش جێگای تایبەت و شیاوی خۆی هەبێت، بەبێ ئەوە کە لەسەر یەکتر زەخت و زۆری زاڵمانەیان هەبێت.

هەروەك دەزانین سەرئەنجام ئەمپراتۆری ساسانی بە کوژرانی باوك لێکهەڵوەشا. یانی کوڕی ناشی و باوکی زاڵم بوون بە هۆی لێکترازانی وڵاتی ئێران. بەهەرحاڵ هەردوو لایەنی کێشەکە، یانی هەم چارەسەری رۆژهەڵاتی و هەم شێوازی رۆژاوایی هەر دوویان جۆرێك لە بێ ڕەحمی و دڵڕەقییان تێدایە. رۆشنە ئەگەر بە دیدی مێژوویی سەیری ئەم فاکتانە بکەین یانی کوڕ بە نوێنەری بەرەی نوێ و، باوك بە نوێنەری بەرەی کۆن بزانین، هیچ جۆرە ئاشتی و میهرەبانیەك چاوەڕوان ناکرێ. بەڵام بۆوەی من مرۆڤێکی دڵناسکم لە رۆمانی کلیدردا عەباس جان ناتوانێ باوکی بکوژێ ـ پێم خۆشە هیچ کەس نەبێتە لەمپەری گەشە و پشکووتنی کەسێکی تر، باوك پێش بە کوڕ نەگرێ و خۆشی بەتەواوی رەت نەکرێتەوە.

*** له رۆمانی کلیدردا، لەلایەکەوە "گوڵ محەممەد"مان هەیە کە ناکرێ بەتەواوی بە کەسێکی کاریزماتیکی بزانین، بەڵام بەستێنی کۆمەڵگەی قارەمان پەرستی ئێمە گوڵ محەممەدی ساویلکە و عەشایەر دەکاتە قارەمان و چاوەڕوانی موعجیزەی لێدەکا و دەیەوێ رزگاری بکات، ساویلکەیی و سازشکاری گوڵ محەممەد لەئاست خان و ئاغاکان هێند بەرینە کە "سەتار"ی ژیر و وردبین جگەرخوێن دەکات، بەڵام تەنانەت ئەم رۆشنبیرە چەپەش وەدوای گوڵ محەممەد دەکەوێ و لەگەڵ ئەو دەکوژرێ، ئەم دیاردەیە سەرەتای شۆڕشی ساڵی 57 سەرلەنوێ دووپات دەبێتەوە، ئێوە ئەم دیاردە کولتوری و کۆمەڵایەتیە چۆن راڤەدەکەن؟**

- هەر بەو جۆرەی کە لە کلیدردا هاتووە و لە جێگایەك بەرۆشنی ئاماژەی پێکراوە: لەمەڕ پێوەندی کۆمەڵانی خەڵك لەگەڵ «شەمەل». خەڵك لە ترس و سامدا قارەمان و پەرسگە سازدەکەن، یانی لە ترسان کەسەکان ستایش دەکەن، ئەمە کێشەیەکی زۆر ئاڵوزە و چارەسەر بوونی پێویستی بە زەمەنێکی درێژ هەیە، لەڕاستیدا کۆمەڵانی خەڵك زۆرجار واهەست دەکەن کە دەبێ کەسێك بۆ خۆ هەڵبژێرن، بیکەن بە قارەمان و بیپەرستن، بێگومان ئەم کێشەیە لە درێژەی پرۆسەیەکدا چارەسەر دەبێ و پێویستی بە گەشە و پشکووتنی فەرهەنگی و سیاسی کۆمەڵگە هەیە، یانی دەبێ هەر کەسێك لە جێگەی تایبەتی خۆی جێگیر بکرێت، تێکرای ئەم پرسانەش بناغەیان لە کار و بەرهەمهێناندایە، کە بەداخەوە ئاستی تەکنەلۆژی و پیشەسازی لە وەڵاتی ئێمە زۆر دواکەوتووە، مرۆڤ تا کار نەکاو لە هەرێمی دڵخوازی خۆیدا تێنەکۆشێ و وزە و توانای دەرونی خۆی نەدۆزێتەوە و بە کۆمەڵگەی نەناسێنێ و کۆمەڵگەش بایەخی کارەکانی ئەو نەزانێ، ئەم پرۆسەیە چارەسەر نابێ. ئەمە رەوتێکی دوولایەنەیە و بناغەی لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدایە، یانی تا بواری ئابووری و کۆمەڵایەتی چارەسەر نەکرێ ئەم قەیرانە چارەسەر نابێ.

*** کەسانێك وەك رەزا بەراهەنی و گوڵشیری پێیان وایە لە نووسینی کلیدردا زێدەبێژی کراوە و چەند بەرگێکی زیادەیە، رای خۆتان چیە؟**

- من ئەم روانگەیەم قەبوڵ نیە، پێویستە رەخنەگران سەرنج بەم خاڵە بدەن، یانی پێوەری نرخاندنی هەر بەرهەمێکی هونەری لەو بەرهەمەدا بدۆزنەوە و لە خودی بەرهەمەکەدا بۆی بگەڕێن، ئەگەر بێجگە لەمە بێت، رەخنەگر تووشی هەڵە و چەواشە دەبێ. دیسان پێداگری دەکەم کە رەخنەگر دەبێ بەرهەم بە وردی و بە تەواوی بخوێنێتەوە و ئەمەش کارێکی دژوارە، چونکە هەندێ کەس توانای خوێندنەوە و تێگەیشتنی هەندێ بەرهەمیان نیە و گەشانەوە و پرشنگی بەرهەمێك کوێریان دەکات.

*** پێتان خۆشە کام بەرهەمتان بکرێتە کوردی؟**

هەر کامیان وەرگێڕ هەڵیبژێرێ و بە باشی وەریگێڕێ بۆ من جێگەی شانازییە، بەڵام کلیدر و «جێگەی بۆشی سلوچ»م پێ باشترە.

**سەرچاوە:**

تاران، زانکۆی خواجە نەسیر.

١٣٨٠/٣/٥

له فارسییەوە: سەروەر عومەر

# وەڵامەكانی پاولۆ كۆییلیۆ دەربارەی ڕۆمانی زاهیر

***هزری سەرەكی لە كتێبی "زاهیر"دا چییە؟**

-لە پڕێكدا ڕوودەدات و هەمیشە ئامادەی ئەوە نین. تەواو كاتێك كە لە ژیانی ئێمەدا هەموو شتێك بەرنامە بۆ داڕێژراوو ڕێكخراو دێتە بەرچاو، مەترسی هەر لەوێدایە. لەبەرئەوەی ئەو شتەی كە بە «ڕێكخراوو ڕێك و پێك» ناوی دەبەین، لە ڕاستیدا تەنها چیرۆكێكە كە بۆ ئێمەیان گێڕاوەتەوەو ناتوانێت لە خودی خۆیدا بەردەوامی هەبێت. لەم كتێبەدا هەوڵمداوە بەشوێن ئەو چیرۆكەدا بگەڕێم كە بۆ ئێمەیان نەگێڕاوەتەوە، كەسایەتی سەرەكی چیرۆكەكە نووسەرێكی سەركەوتووە كە لە ناكاو هاوسەرەكەی بەجێیدەهێڵێت و نووسەر دەبێت ژیانی خۆی دووبارە بدۆزێتەوە، بەڵام لەجیاتی ئەوەی هەنگاو بۆ پێشەوە بنێت و دەرفەتی تازە بدۆزێتەوە، لێدەگەڕێت ئەم پرسیارە بوونی داگیر بكات: «بۆچی هاوسەرەكەی بەجێی هێشت؟» ئەمە دەبێتە زاهیری ئەو.

***زاهیر چییە؟**

-بەڕی خۆرخە لویس بۆرخیس، چەمكی زاهیر لە ترادسیۆنی ئیسلامییەوە دێت و وای دەخەمڵێنێ پەیوەست بێت بە كۆتاییەكانی سەدەی هەژدەوە. زاهیر، بە زمانی عەرەبی، واتە دیار، ئامادە، شتێك كە ناكرێت لەبەرچاو نەگیرێت. شتێك یاخود كەسێك كە یەكجار لەگەڵیدا پەیوەندی دروست بكەین، ئیدی كەم كەم هزرمان داگیر دەكات، تا ئەوەی كە ئیدی ناتوانین باری سەرنجمان لەسەر هیچ شتێكی دیكە چڕ بكەینەوە. ئەمە دەكرێت بە تەندروستی یاخود بە شتێتی، بزانرێت.

***چیرۆکی زاهیر تا چ ئەندازەیەك ژیاننامەی خودی ئێوەیە؟ لەم چیرۆکەدا تا چەندێك خۆت دەدۆزیتەوە؟**

-ئەم چیرۆکە لەسەر ئەزموونە زۆرەکانی من وەك نووسەرێك و مرۆڤێك پابەندە. تەواوی کتێبەکە لایەنی ژیاننامەی خودی هەیە، لەبەرئەوەی ناتوانین جگە لە ئەزموونی خۆمان شتێك بۆ ئەوانی دیکە بگوازینەوە. بەڵام من بە خۆشی و شادی لەگەڵ هاوسەرەکەمدا دەژیم. هاوسەرەکەم نیگارکێشە و کتێبەکەم پێشکەش بەو کردووە.

***لە ڕۆمانی زاهیریشدا، هاوسەری نووسەرەکە زۆر سەرکەوتوو و ناسراوەو پیشەی سەربەخۆی خۆی هەیە، بەڵام دیسان ئەو بەجێدێڵێت. بۆچی؟**

-یەکێك لە گەورەترین داوەکانی بەرپێی مرۆڤ. «گەڕانە بەشوێن خۆشبەختیدا». ئستەر، هاوسەری نووسەرەکە، هەرچەندە لە تەواوی بوارەکاندا سەرکەوتووە، بەڵام خۆشبەخت نییە و لەجیاتی ئەوەی وەك زۆربەی مرۆڤەکان، زۆر سادە تەنها خۆی فریو بدات و سەری خۆی قاڵبکات تا ناچار نەبێت بیر لە مانای ژیان بکاتەوە، بڕیار دەدات بە شوێن شتێکدا بڕوات کە ناوی لێدەنێن «خۆشبەختی».

***لەم ساتەدا بڕیار دەدات بێتە پەیامنێری جەنگ.**

-ڕاستە. جەنگ هەمیشە ئەزموونێکە کە مرۆڤ دەگەیەنێتە سنوورەکانی –بوون-ی و بە هەر کەسێك خراپترین و باشترین بەشەکانی بوونی خۆی پێدەناسێنێت. ئەم واقیعییەتە لە جەنگەکانی ئەمڕۆدا کە بەداخەوە دونیاش پشتیوانییان لێدەکات، دەبینم.

***ئایا بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە دەبێت لە مەیدانی جەنگدا ئامادەبین؟**

-نا، مەیدانی جەنگ هەموو ڕۆژێك لە ڕێگەی تەلیڤزیۆنەوە دێتە ماڵەکانمانەوە، و ئەمە هیچ کۆمەکێك بە تێگەیشتن لە مانای ژیانمان ناکات. لە ڕاستیدا مرۆڤ کۆمەڵێك بەهای وەك (پارە، دەسەڵات، جوانی) بۆ خۆی بەدیهێناوە کە بۆ بەدەستهێنانی ئەوانە ناچارە تەواوی بوونی خۆیان بۆ تەرخان بکات، تا ئەم بەهایانە جەنگ و ژیانی ئەو ئاڕاستە بکەن، و هەموو ئەم کارانە دەکات تا لە خۆی نەپرسێت: «ئایا من خۆشبەختم؟» مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە چارەنووسی خۆی، دەبێت ڕابوەستێت و لە خۆی بپرسێت ئایا لەو کارەی کە دەیکات ڕەزامەندە یان نا، و خەریکە ڕۆژگاری لەگەڵ چ کەسێکدا دەگوزەرێنێت. بەڵام ئەمە ئەرکێکی زۆر دەبات، ئازایەتییەکی زۆریشی دەوێت. لەم کتێبەدا، ژن و مێرد پەیوەندییەکی بەرز و کراوەیان هەیە، بەڵام ژنەکە مێردەکەی بەجێدێڵێت. بەڕاستی بناغەی هاوسەرگیریی چییە؟ هەوڵ دەدەم ئەم بابەتە لە گۆشەنیگای ئەزموونەکانی خۆمەوە وەك مرۆڤێك بخەمە بەر لێکۆڵینەوە.

***بەڕای ئێوە، زاهیر بەشێکە لە ئەزموونی جیهانی ئێمە وەك مرۆڤ؟**

-زاهیر دەکرێت کەسێك، کارێك، ئامانجێك بێت، لەجیاتی بەخشینی شادی بۆ هەوڵدان بۆ گەیشتن پێی، ئێمە بەرەو لای ڕاڕاییەکی نەخۆشی ئاسا ئاڕاستە دەکات. بە داخەوە هەموو خەڵکی ئەم ئەزموونەیان هەبووە.

***ئێوە لەم کتێبەدا بە سووربوونەوە لەم بابەتە نزیك دەبنەوە کە ئێمە چارەنووسێکمان هەیە کە بۆیان باسکردووین و چارەنووسێك کە بۆیان باس نەکردووین.**

- بێگومان. دەتوانم نموونەش بهێنمەوە: خراپترین ئەشکەنجەکان، لە خاچدانە. لەبیرم دێت کە لە دەقێکی سیسرۆدا وەك «سزادانێکی خراپ» ناوی لێبراوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمڕۆ خەڵکی بەسینەدا هەڵیدەواسن. لە چوارچێوەی دەگرن و وەك سیمبولێکی دینی لێی دەڕوانن. لەبیریان چۆتەوە کە لە بەرامبەر ئامرازێکی ئەشکەنجەدا ڕاوەستاون. نموونەیەکی مەسیحی دیکەش بهێنمەوە. بۆنیفیکاسی قەشە بڕیاریدا مەراسیمێك کە بە شانازی ئۆدین (خودای ئەسکەندەنافی)یەوە سازدەکرا، بکاتە مەراسیمێکی مەسیحی. هۆزە ئەڵمانییەکان ساڵی جارێك لە دەرەوەی درەختێك کۆدەبوونەوەو چەند دیارییەکیان پێوە هەڵدەواسی تا منداڵەکان ئەو دیارییانە بدۆزنەوە، پێیان وابوو بەم کارە خودای خۆیان شادومان دەکەن.

هەر ئەم مەراسیمە بوو بە درەختی سنەوبەری کریسمس.

***ئایا دەکرێت کەسێك لە ژیانیدا زیاتر لە زاهیرێکی هەبێت؟**

-وەختێك ناکامی کۆدەبێتەوە، زاهیر دەردەکەوێت و ئیدی نابێت بیر لە چارەسەری کێشە بکەینەوە و تەنها بە پەیکەری کێشەکەوە دەنووسێین.

***زاهیر دەتوانێت ئێمە بەرەو ئامانجێك ڕێنوێنی بکات یا تەنها خۆزگەیەکە؟**

-ڕۆیشتن بە شوێن خەونەکاندا و باوەڕبوون بە ڕێنمای ڕێگا شتێکی دیکەیە: لەم شێوەیەدا ئامانجێکی دیاریکراومان هەیە و لەم ڕێگایەدا چێژ وەردەگرین. بەڵام سەبارەت بە زاهیر، لە هەر هەنگاوێکدا کە هەڵیدەگرین، ئەم شادییە ئامادە نییە، تەنها ئەم پەرێشانییە بەسەر ئێمەدا زاڵە کە دەبێت بە ئارامگرتن و ئازار چەشتنەوە، شتێك کە پێمانوایە لە ژیاندا پێویستە، بەدەستبهێنین.

***بۆچی کەسێتی سەرەکی چیرۆکەکە بۆ کازاخستان دەڕوات؟**

-بەهۆی نەریتی تەنگری ئەم وڵاتەوە کە هەرچەندە زۆر کۆنە، بەڵام هێشتا دەتوانێت زۆر شت فێری ئێمە بکات. جۆرە مەعنەوییەتێکی نافەرمییە. ئەم نەریتە کە لە بناغەدا بە مانای قەبوڵکردنی پەرجووی ڕۆژانەیە، ڕێگە بە کۆچبەران و خەڵکانی ئەوێ دەدات کە لە بەرامبەر ئاینزا جێگیرەکاندا، بمێننەوە. بەم دواییانە لە ئیسپانیا ڕۆیشتم بۆ مەراسیمی «مەس» بەڵام لە کاتی ئامۆژگاریدا هاتمە دەرەوەو بە گۆشەنیگا تەماشای دەوروبەرم کرد. بۆم دەرکەوت کە تێگەیشتن لە پەیامەکانی خوداوەند کە لەلایەن ئامۆژیارەوە دەوترا، لەوێوە زۆر ئاسانتر بوو، لەبەرئەوەی لە بەرزایی چیایەکەوە ڕاوەستابووم و دونیا لەژێر پێمدا بوو، و لە پەرجووی زیندووبوون تێدەگەیشتم.

***پاولۆ کۆییلیۆ چۆن کتێبەکانی دەنووسێت؟**

-وەك خۆ فرێدانێکە بۆ نێو نائاگاییم. لێدەگەڕێم ئەو پرسیارانە ڕێنوێنیم بکەن کە ڕۆحم دەیانکات، بەڵام هێشتا لە زەینمدا تەرح نەکراون. لە پرۆسەی نووسیندا، وەڵامەکانی خۆم دەستگیر دەبێت.

***نزیکترین کتێبی ئێوە لە "زاهیر" کامەیە؟**

-هەر کتێبێك جودایە و لایەنێکی تایبەت لە ڕۆحی من پیشان دەدات. تایبەتمەندی کتێبەکانی من بابەتەکانیان نییە، بەڵکو شێوازی نووسینیانە! بەبێ ئەوەی رووکەشییانە بڕوانم.

***خۆشەویسترین نووسەرانی ئێوە کێن؟**

-ویلیام بلیك، هێنری میلەر، خۆرخە لویس بۆرخیس، ژۆرژە ئامادۆ.

***ئەزموونی ئێوە وەك یەکێك لە پڕ فرۆشترین نووسەرەکانی جیهان، چۆن تێگەیشتنی ئێوەی لە ئەدەبیات گۆڕیوە؟**

-کاتێك سەفەر دەکەم، ئیمەیڵی خوێنەرەکانم دەخوێنمەوە، کۆنفرانس دەگرم، پەی بەوە دەبەم کە ئەمڕۆکە، کتێب هەمان ئەو گرنگییەی هەیە کە مۆزیك بۆ نەوەی من هەیبوو.

***پێتوایە لە دونیای رۆژئاوادا لە قۆناغێکدا کە ناوبانگ دەپەرستڕێت، جێگایەك بۆ بیرمەندان ماوەتەوە؟**

-پێموایە بیرمەندیش دەتوانێت کەسێتییەکی بەناوبانگ بێت و دەبێت بەشێوەیەکی رێزدارانە لەگەڵ ئەم بابەتەدا رووبەڕووبینەوە، بەبێ پێشداوەری و دەبێت سوود لەم ناوبانگە وەربگیرێت بۆ گۆڕینی بارودۆخی هەنووکەیی دونیا. نموونەی دیاری ئەم بابەتە، پیت گابرێل یانوبە.

***ئایا دەکرێت لە ڕێگەی ئەدەبیاتەوە، کەلتوری گشتی لەگەڵ کەلتوری ئەکادیمیکدا پەیوەست بکرێت؟**

-کەلتوری گشتی ئەمڕۆکە، کەلتوری ئەکادیمیکی سبەینێیە.

**سەرچاوە:**

سایتی فەرمی «انتشارات کاروان»

WWW.KARAVAN.IR



لە فارسییەوە: دڵشاد خۆشناو

# گفتوگۆیەك لەگەڵ شێرکۆ بێکەس
# هەڵەبجە لە نەرویج و دەریاکانی ستوکهۆڵمدا

پێویست بە ناساندنی شێرکۆ بێکەس ناکات. بێگومان خوێنەرانی فارس وەکو شاعیرە بەناوبانگەکانی جیهان دەیناسن. لەو هەلەی کە بۆمان رەخسا، بە بیانووی دەرچوونی دوایین دیوانە شیعرەکەی(کورسی) ئەم گفتوگۆیەمان لەگەڵیدا کرد. ئەو بەردەوام لە دونیای شیعردا، چالاکە و وەکو خۆی گوتەنی هێشتا ئەو و شیعر لەیەك دانەبڕاون!

***ئەگەر مۆڵەتمان بدەیت، لەسەرەتادا لەبارەی دوایین بەرهەمتان(کورسی) قسە بکەین. ئایا کورسی درێژەی پرۆژەی شیعری (دەربەندی پەپولەیە) یان کۆمەڵەی (خاچ و مار و رۆژژمێری شاعیرێك)ە؟**

- نەخێر، بۆ دەبێ کورسی درێژەی دەربەندی پەپولە یان خاچ و مار و رۆژژمێری شاعیرێك بێت؟ لە کاتێکدا هەرکامێك لەو بەرهەمانە خاوەن کەش و بزوتنەوە و ئەزمونی جیاوازی خۆیانن، ئەگەر درێژەی پرۆژە بە مانای ئەڵقەکان یەك زنجیری بەیەکەوە بەستراو بن، دونیای دەربەندی پەپولە لە کوێ و دونیای کورسی لە کوێ، ئەو ئەزمونێکی دوورە وڵاتی لە کەشوهەوای تاراوگەی دوای کارەساتی هەڵەبجە و ئەنفال نووسراوە کە دواتر دەبێتە مانیڤێستێکی شیعری. مانیڤێستێك لە کوردستانەوە بۆ ئەوروپا، کورسی قەسیدەیەکی درێژە کە هەوڵم داوە بە تێکەڵکردنی ژانرە جیاوازە ئەدەبیەکان بە ئەزموونی جۆراوجۆر لەوانە شیعر و کورتەچیرۆك و پارچەی ئەدەبی و رۆژنامەنووسی فۆرمێکی تازە بدۆزمەوە، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئێوە لە ئەنجامی پرۆژە کۆمەڵە ئەزموونێکە کە من لە شیعردا ئەنجامی دەدەم، بەڵێ وایە تا شێوازێکی تایبەت

و تازە بدۆزمەوە، زۆر بە دەگمەن هەیە کە شاعیرێك خاوەن چەندین شێواز بێت، خۆشتان چاك دەزانن شاعیرێك خاوەن شێوازە کە ئەگەر تەنانەت ناویشی لەسەر کتێبەکەی نەبێت لە جۆری تێڕوانینەکەی دەتوانرێت بناسرێتەوە، ئەو مەسەلانەی وەکو زمان و بازنەی چەمکەکانی گێڕانەوە و هەوا، کە ئاشکرایە ئەم شتە گرنگەش دوای ئەزموونێکی درێژ بەدەستدێت. بۆ درکی ئەو بابەتانە وا باشترە نمونەیەك بێنینەوە:

هەستیار

لە شیعری گۆراندا ژن و سروشت بەشێکی زۆری پێکهێنانی شیعریان هەیە و هەردوکیان بە باسکردنێکی انەوە وەسف دەکرێن. ئەم بەرهەم و ڕوانینەیە کە گۆران لەگەڵ ژن و سروشت، جۆرە شێوازێکی شیعری بەدیهێنا کە ئەمڕۆ بەناوی گۆرانەوە دەیناسین، ئەو شێوازە لە شیعری شاعیرەکانی وەکو (ئیبراهیم ئەحمەد) و (پیرەمێرد) دا نییە. ئەزمونی ئێمە لە زمانی کوردیدا دایە، ئەم زمانە کۆمەڵێك مانا و چەمکی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام هەر شاعیرێك بە بەکارهێنان و ڕووبەڕووبونەوەی گونجاو گەیشتۆتە ئەفراندنێکی تازە.

***ئایا شێرکۆ بێکەس هەر ئەو دستەواژە و چەمکانەی کتێبەکانی ڕابردووی لەم کۆمەڵە نوێیەشدا دووبارە کردۆتەوە؟**

- لەبارەی ئەو پرسیارەی تۆوە، ڕەنگە لە چەندین شوێنی تریش گوتبێتم دەبێ بۆ یەك بابەت چەندین پەنجەرەمان هەبێت، هەروەك ئەوەی کە دەشێت کارەساتێك چەندین چیرۆکی لێ بکەوێتەوە. ڕەنگە من عەشقێکی مەزنم لە ژیاندا هەبێت بەڵام ئەم عیشقە تاقانەیە هەر جارە و بە دیمەنێك دێتەبەرچاو.

ژن و شیعر و خۆشویستن و عەشق و سروشت هەموویان چەمکێکی نەبستراکتی و جیاوازن، بەڵام لە کردەوەدا ئەوانە پێکەوە دەبنە شتێکی گشتی بەناوی ژیان، هەبوونی ئەم چەمکانە لە ژیاندا بێ کۆتاییە، لە ئەدەبیاتیشدا شێوازی جۆراوجۆر بۆ یەك بابەت هەیە و تاقیکراوەتەوە و دیسان تاقی دەکەینەوە و کۆتاییشی نییە.

ڕوونتر بڵێم ئەو چەمکانەی کە لە (کورسی)دا دەیانبینین وەکو سروشت، بیرەوەری، خۆم، ئازاری شار، تراژیدیا تاڵەکان و ...هتد کە لە بەرهەمەکانی تری مندا هەر هەن، بەڵام ئایا ئەو (هەڵەبجە)یەی کە لە دەربەندی پەپولەدا هەیە هەر ئەو (هەڵەبجە)یەیە کە لێرە هەیە، زمان و وێنەکان و مۆسیقا و نۆستالۆژیاکەی کە لەویدا دەبینین ئەو وێنانەیە کە لە (خاچ و مار و ڕۆژژمێری شاعیرێك)دا هەیە، ئەوە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی لەگەڵ هەلومەرجی کاتی و ڕۆحی منەوە هەیە، هەڵەبجە لە دەربەندی پەپولەدا هەڵەبجەیەکە کە لە ئەوروپا لەگەڵیدا ژیاوم، هەڵەبجەیەکە کە لە دەریاکانی نەرویج و ستۆکهۆڵم، لە روخساری ژنێکدا دەبینم یان لە گوڵفرۆشێك، ئەم تێڕوانینە زۆر جیاوازترە لەو تێڕوانینەی کە لە هەڵەبجەدا بۆ هەڵەبجە هەیە، کەواتە ڕەنگە بابەت و چەمکەکان دووبارە ببنەوە، بەڵام نوسین و تێڕوانین شتێکی ترە، وەکو نمونە هێشتا لە ئەدەبی ئێمەدا جێگای هەزاران دیوانی شیعری و ڕۆمان بۆ دەربڕینی کارەساتی هەڵەبجە بەتاڵە.

***ئایا ئەم شیعرە درێژە نابێت بە چەند دیوانە شیعرێکی کورت و سەربەخۆ؟**

- نا، شیعر لە سەرەتاوە تا کۆتایی گێڕانەوەیەکە کە لە لەدایکبوونی کورسییەوە دەستپێدەکات و بە مردنی کورسی کۆتایی پێ دێت، تەواوی بەشەکانی بە زنجیرەیەك بیرەوەریی پێکەوە بەستراونەتەوە. بۆ نمونە لەو شوێنەی کە یەکێك لە پێچکەکانی کورسی دەگەڕێتەوە بۆ داوێنی سروشت وەکو درەختێك لە نەمامی خۆیەوە دەست دەکات بە بیرەوەری گێڕانەوە تا دارتاشێك دەیبڕێت و دواتر دەبێتە کورسی و لە چایخانەیەك دادەنرێت و لەوێوە دێتە ماڵەوە و ... بە شێوەیەك کە تۆ ئەگەر لە ناوەڕاستی دەقەکەوە دەست

بە خوێندنەوەی بکەیت، هەست بە کەموکووڕیەکەی دەکەیت. کورسی خۆی گێڕەرەوەی چیرۆکە و دەق بیرەوەرییە کە دەبێ لە سەرەتاوە تا کۆتایی بخوێندرێتەوە، ئەم پارچە پارچەکردنەی گێڕانەوەیە مەحاڵە. شتێکی تریش کە دەبێ ئاماژەی پێ بکەم ئەمەیە کە: دەقە درێژەکان خۆیان لە چەند دەقێکی کورت پێکهاتوون، وەکو ئەوەی کە کۆمەڵێك تابلۆ پیشانگایەك پێکدەهێنن، بەڵام لە کورسیدا ئەگەر هەر کام لەم تابلۆیانە هەڵگرین بۆشاییەکەی دیارە، تەواوی بەرهەمە دراماتیکیەکان لە گەیشتنە لوتکەی ڕوداوەکان و دابەزینیان دروست دەبن. ئاشکرایە کە منیش لە کورسیدا لەبەرچاوم گرتووە، ئەو شتەی کە تۆ ئاماژەی پێ دەکەیت ڕەنگە بتوانم بە ناوی ئامادەکاریەك یان تەکنیکێك سەیری بکەم بەڵام من لە کورسیدا ئەمەم نەکردوە.

کورسی لە سەرەتاوە تا کۆتایی گێڕانەوەیە. دەبێ دان بەوەدا بنێم کە نووسینی دەقی کورسی ئەزموونێکی تازە بوو لە پێرستی کارەکانم، پێموایە بۆ خوێنەرانیش ئەزموونێکی تازەیە، زەینی خوێنەری ئێمە ڕانەهاتوە کە شیعر و چیرۆك و شانۆنامە لە یەك کۆمەڵەدا بخوێنێتەوە، ئەم هەڵەیە تۆش دەیکەیت کە دەڵێیت دیوانی شیعری، ئەمە ڕاست نییە چونکە دەق لە ئاوێتەکردنی چەند ژانرێکی جیاوازی ئەدەبی پێکهاتوە. لە فۆرمێکی پتەوی جیاوازدا، کورسی دەجوڵێت، قسە دەکات، ئەمە تایبەتمەندی ژانری چیرۆکە، من هەوڵم داوە کە هەریەك لە ژانرە جیاوازەکان بە تێڕوانین و تایبەتمەندی تایبەت بە خۆیان پیشان بدەم و بەم ئاوێتەکردنە فۆرمێکم دەستبکەوێت کە هەمان فۆرمی کورسییە. ئێمە لە شوێنێك شیعر دەخوێنینەوە و لە پارەگراف دوای ئەو پەخشان و لەو شوێنەی کە پێویستیش بوە بۆتە چیرۆك، شیعر و شانۆنامە و چیرۆك و پەخشان لەم نووسینەدا لە هاتۆچۆدان.

***ئایا هەست ناکەیت لە کورسیدا زۆر لە دەستەواژەکان بەردەوام دووبارە دەبنەوە؟**

- پێموایە پێشتر لەمبارەوە قسەم کردوە، دووبارەکردنەوەی بە پێویست نازانم، تا ئێستا دوانزدە خوێندنەوەی جیاوازی بۆ کراوە. ئەم مەسەلەیە نیشان دەدات کە گێڕانەوەی کورسی نییە بۆ شیعر گوتن. من بەو باوەڕە گەیشتوم کە ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوون باشترە لە زۆرلەخۆکردن بۆ شیعر نووسین. دیسانیش دڵنیام کە درامای کورسی بەگشتی لە هەموو کارەکانی تری من جیاوازترە، چ لە لایەن فۆرمەوە چ لەلایەن بابەتەوە چ لە لایەن جۆری تێڕوانینەوە، لەو وتارانەی کە لەسەری نووسراون. لە وتارە نووسراوەکاندا، پێموایە عەرەبەکان نووسینی باشتریان لەسەر نووسیوە، خوێندنەوەی کوردی بۆ شیعرەکانی من، خوێندنەوەیەکی ناکامڵە. ئەوان شیعری شاعیرێك دەکەنە پێوەر و هەموو شیعرەکانی تری بەگوێرەی ئەو بەراورد دەکەن. بەڕای من ڕەخنە و خوێندنەوەی کوردی تووشی جۆرێك لە نەخۆشی بووە، ئەو قسەو باسانەی کە لە چاپخانەکان دەگوترێن بەناوی ڕەخنەوە لە چاپەمەنیەکانی ئێمەدا بڵاودەبنەوە، نووسینێکی وەکو ئەمەی کە:

-شیعر بۆ منداڵان- یان شیعری دەیەی حەفتاکان، ڕاستیت بوێ من حەزم دەکرد بمتوانیبایە چیرۆك بۆ منداڵان بنووسم، بەڵام ناتوانم. یان تاوانبار کردنم بە شیعری شاعیرانی دەیەی حەفتا، ئەمە لە حاڵێکدا من و تۆش دەزانین کە دەبێ شیعری شاعیرانی ڕابووردوومان بخوێنینەوە و لەوانەوە فێر ببین. هەرچەندە کە گێڕانەوەی کورسی گێڕانەوەیەکی کوردی و لە شارێك دەگێردرێتەوە کە سلێمانییە و لە هەمان کاتدا ئەمە دەقێکی مرۆییانەیە، بۆ نمونە کاتێ کە باسی گەلانی تری جیهان دەکرێت، باسی کورسی چیخۆف و دایستۆفیسکی و ناپلیۆن دەکرێت. ئەوەی کە جێگای سەرنجە ئەوەیە کە خوێندنەوەکانی ئێمە هیچ کام درکیان بەم مەسەلەیە نەکردوە. یان لە شوێنێکی تر گێڕانەوەی جەلادێکە دێتە چاپخانە و کورسی هەڵدەگرێت و دەیباتە شوێنێك و بۆ ئەشکەنجەدان بەکاریدەهێنێت، لێرەدا گێڕەرەوە دەڵێ کە دو پێچکەی

ڕەش هاتن، لە شوێنێکدا نووسیبوویان کە من باسی شوڤینیەتی بەعس دەکەم، من داوەرییەکەی بە هەمووان دەسپێرم. دیسانیش دووبارەی دەکەمەوە کە دەبێ یەك بابەت چەندین جار دووبارە ببێتەوە، هەرجارە و بە گێڕانەوەیەکی نوێ و نوێتر کە خوێنەر هەرجارە و شتێکی نوێ و تازەتر بدۆزێتەوە. دەبێ بابەتی چەمکەکانی ئازادی و ئازارەکانی خەڵك و خاك و شەڕ و ئاشتی هەزاران جار دووبارە بکرێنەوە بەڵام گرنگ ئەوەیە وەکویەك نەبن؟

***چ پێویستە کە شێرکۆ بێکەس هەر جارە چەند ژانرێکی جیاواز لە نووسینەکانیدا بەکاربهێنێت؟**

- من پێموایە کە لە ئەزمونەکانی ڕابردوومدا یەك یان چەند جۆرە ژانرێکم بەکارهێناوە، بەڵام شێوە گشتییەکەم لە گێڕانەوەی کورسیدا بەکارهێناوە. بەهەرحاڵ ئەم مەسەلەیە ئەزموونێکە بۆ دوورکەوتنەوە لە تاك فۆرمی یان فۆرمێکی تری ئەدەبیات. ڕەنگە ئەم ئەزموونە هێشتا ئەزمونێکی کامڵ نەبێت، یان لەوانەیە هێشتا کاتی پێویست بۆ درکی ئەو ئەزمونە ڕانەبوردبێت، من بەو ئەنجامە گەیشتووم کە ئەدەبیاتی ئێمە پێویستی بەو گۆڕانکارییانە هەیە، لەوانەیە یەکێکی تر لە هۆیەکانی نزیکبونەوەیە لە خەڵك، ئەگەرچی نوێگەری دونیای شیعری گۆڕی بەڵام زۆر مەسەلەی تر کە سادە بوون، ئاڵۆزی نیشان دا وەکو وەهم و نادیاری مەسەلەکان و پترکردنی قوفڵەکانی زمانەوانی و بەوەهمکردنی فەزای شیعری، بەشێوەیەك کە بۆتە دروستکردنی لێکترازان لە نێوان خوێنەر و بەرهەمدا. من بە پەنابردن بۆ گێڕانەوەی شیعری و سودوەرگرتن لەو هەلومەرجانەی هاتوونەتە ئاراوە لە ئاوێتەکردنی زمانی مەجاز و زمانی مەنتیق چومەتە شەڕی ئەو مەسەلانەوە، بەهەرحاڵ ئەم باسە بوار و کاتی زۆرتری دەوێت، لەوانەیە لە شوێنێکی تردا باسی بکەین.

***هەندێك لە ڕەخنەگران و شاعیران، ڕەخنە لە شیعرە وەرگێڕدراوەکانی تۆ دەگرن، زۆر بە کەمی وەڵام لە تۆ دەبینین، ڕیشەی ئەم مەسەلەیە لە کام هۆکاردایە؟**

- بەشێکی زۆری ئەو مەسەلانەی کە تۆ بە ڕەخنە ناوت بردن، جوێننامە بوون، شەڕی دەروونی بوون، من زۆر دەمێکە گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی کە پێویست ناکات کاتی خۆم بەو مەسەلانە بەفیڕۆ بدەم. پێم وابێ یەك دوو جار وەڵامی چەند وتارێکم داوەتەوە، ڕاستیت بوێت لەوانیش پەشیمانم، هاوڕێم وەڵامی چی بدەمەوە، ئەوانە لەجیاتی ڕەخنە لە هونەری شیعر بگرن، مەسەلە تایبەتییەکانی من دەنووسن، بێدەنگبوون باشترین وەڵامە. لەبارەی وەرگێڕانەکانەوە، ڕەخنەی باش و ڕێکوپێکم بینیوە، بەتایبەتی ئەو بابەتانەی کە هاوڕێی نووسەرم محەمەد موکری ئاماژەی پێ کردبوو. من ئەو ڕەخنانەم لەلای خۆم تۆمار کردوە، کە ئەگەر بەرهەمەکان لە نوێوە چاپ کرانەوە، بە دڵنیاییەوە تێڕوانینەکانیان لەبەرچاو دەگرم و سوپاسی هەموویان دەکەم، بەڵام لەبارەی ئەو زنجیرە جوێننامەیە، خۆزگە لەجیاتی خەریکبوون بەو باسانەوە کەمێك کاتی خۆیان بۆ خوێندنەوە تەرخان بکردبایە، زۆر باشتر بوو، من خۆم سەرم سوڕماوە لە حەوسەلەی ئەو جۆرە کەسانە کە چۆن کاتیان هەیە بۆ ئەوەی کە ... من زۆر کات خۆم ڕەخنەگری خۆم بووم، دەزانم کە بەشێك لە نووسینەکانم بەتایبەتیش نووسینەکانی سەرەتام میوەی کاڵ و پێنەگەیشتوون، من هەوڵی زۆرم داوە بۆ وەدەستهێنانی ئەزموون، کەوتوم و خلیسکاوم و دووبارە دەستم پێکردۆتەوە. من زۆر ماندوو بووم. حەز دەکەم ئاماژە بە بابەتێکی تریش بدەم ئەوەیش ئەوەیە کە ڕووەکەی تری جوێننامەکان لەوانەیە پێداهەڵگوتن بێت، ئەو پێداهەڵگوتن و مەدح کردنەش هیچ لە من زیاد ناکات، من ئەگەر ئەزمونێکم هەیە یان ئەزمونێکم کردوە بەتەنیا ئەزموونی من نییە، ئەزموونی شیعری کوردییە و زۆر کەسیش دەگرێتەوە.

***ئایا پێتوایە کە گەیشتویتە تەمەنێك کە ئیتر نابێت خەریکی کاروباری چاپ و بڵاوکردنەوەی (سەردەم) بیت؟**

تا ئێستا نا، هەستێکی وەهام نەبوە. هێشتاش من نەکەوتومەتە تەمەنەوە وەك ئەوەی دەزانیت کە کارەکانی چاپ و بڵاوکردنەوە جیاوازی لەگەڵ خواستی مندا نییە، یەکێکە لە ئەرکەکانی من. هەروەك دەزانیت من لە کەشی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەدا دەژیم، ئەمەش هۆکاری درێژەدانی کاری چاپ و بڵاوکردنەوەی منە و جگە لەوەش بۆتە هۆی پەیوەندیەکی نزیك و دۆستانە لە نێوان من و هاوڕێ و هاوکارانم لە دەزگا. کاتێ کە بیر دەکەمەوە دەبینم شوێنێك لێرە باشتر نادۆزمەوە. ئەمەش بەهۆی یەکبوون و لەگەڵ یەکتربوونە لە ئەنجامی کارەکان و بە هۆی چەند نووسینێکەوەیە کە چاپ دەبن و ئەمەش مانایەکی نوێی ژیانی منە.

***ئێستا شێرکۆ لە نووسین و چاپکردنی کام شیعری خۆی پەشیمانە؟**

- پێموایە ئەمە ڕستەیەکی مەحمود دەروێش بێت کە (شاعیر جارێك لەدایك نابێت، چەند جارێك لەدایك دەبێت) بەشێکی زۆری شاعیرەکان بەبێ لەبەرچاوگرتن و جیاکاری، لە سەرەتای شیعری خۆیاندا شیعری سادە، کرچ و کاڵیان هەبوە، پێموایە بەم هۆیەوە کە هەست ناتوانێت جێگای بەتاڵی تەکنیکی شیعری پڕ بکاتەوە، زمان وەك ڕوبارێکی مەزن وایە، لە یەك ساتدا ناتوانیت خۆت بگەیەنیتە هەموو کەنارەکانی. باس باسی پەشیمان بوون و پەشیمان نەبوون نییە. بەتایبەتی دوای چاپ و بڵاوبوونەوەی بەرهەمێك کە تۆ ئیتر خاوەنی نیت و بۆتە بەشێك لە کلتوری کۆمەڵگە. پەشیمان بوونەوە ئەنجامی نییە بەڵام دەکرێت پەند لەو هەڵانە وەربگرین بۆ گەیشتن بە کامڵ بوون. دیوانی یەکەم و دووەمی شیعری من وەکو ڕاهێنانی شیعری منن، لەو کاتەدا ئێمە هێشتا لەژێر چەتری شیعری گۆراندا بووین و فەرهەنگی زمانی ئێمە هەمان زمانی گۆران و پیرەمێرد و هەردی بوو. لە ساڵی ١٩٦٨دا یەکەمین دیوانی شیعری من چاپ و بڵاوبوەوە، هەر ئەو کاتە بڕیارم دا زۆربەی ئەو شیعرانەی کە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوببونەوە لەم دیوانەدا نەبن، ئەوانم لەبیرخۆم بردەوە. بەغدا و بزاڤی ڕۆشنبیری لە بەغدا، ئاسۆیەکی تازەی لە بەرچاومدا کردەوە، بێگومان ئێستا کە بیر لەو سەردەمە دەکەمەوە هەست دەکەم پەلەم کردوە لە بڵاوکردنەوەی هەندێ لە شیعرەکانم، بەڵام ئێستا سوودی نییە، ئەو شیعرانەش بەشێك لە ئەزموونی من پێکدەهێنن، ئەزموونی ئەو سەردەمەی منە، ئێمە دەتوانین بەردەوام بەخۆماندا بچینەوە و ئەمە باشە. تاقیکردنەوە لەو سەردەمەی ئێمەدا و فێربوون بە هۆی هەلومەرجی ئەوکاتە زۆر سەخت بوو. ئەگەر من لەو بارەوە کارێکم ئەنجام دابێت ئەوە هیچ، ئەگەرنا ئیتر ناتوانم، عەشقی شیعر وازم لێناهێنێت، چارەنووسی منە و دەبێ لەو ئاگرەدا بسوتێم.

***چ هەستێکت هەیە کاتێ کە هەندێ لە ڕەخنەگران تۆ بە لوتکەی شیعری کوردی باس دەکەن؟**

- تۆ بەدوای لوتکەوە مەبە و بیر لەوە مەکەوە. من پێموایە شاعیرێکم کە خەریکی نووسینی شیعری نوێی کوردیە، مێژوویەکم هەیە و ئەزموون و دەستمایەیەك. کەموزۆرەکەی نازانم بەڵام بەو یەقینە گەیشتووم کە بەرزکردنەوەی شاعیرێك و بە ئامادەگیی ئەو نە لوتکەیەك دروست دەبێت و نە بزوتنەوەی شیعریی. نوێگەری لە ئەدەبیاتی ئێمە نە بە جەمیل سائیب دروست بوە، نە بە پیرەمێرد، دواتریش نە بە گۆران و ئیبراهیم ئەحمەد و هیچ کەسێکی تر، بەڵکو هەموویان کاریگەری زۆریان هەبوە لەسەر دروستبوونی ئەو مەسەلەیە. لەوانەیە بوونی کەسێك لەوەی تر بەرجەستەتر و دیارتر نەبێت بەڵام نوێگەری ئێمە چرایەکە کە لە بەرەکەتی هەموو ئەوانەوە هەڵگیرساوە. بەڵام لەبارەی خوێنەرەوە، هەر شاعیر و نووسەرێك حەز دەکات زۆرترین خوێنەری هەبێت و کتێبەکانی بە تیراژی زۆر چاپ ببن و بفرۆشرێن، بەڵام لەبیرمان نەچێت

ئەمە هۆیەکی پتەو نییە بۆ بە شاعیر بوون و نووسەر بوون. بۆ نمونە لە مێژووی ئەدەبیاتی جیهان هەندێ نووسەر دەبینین کە لە سەردەمی ژیانی خۆیان بە هەر هۆیەك هەبێت کتێبەکانیان بە تیراژی زۆر نەفرۆشراوە، بەڵام دواتر بە پێچەوانەوە بووە. ئەگەر باسی هۆیەکەی ناکەم لەبەرئەوەیە کە پەیوەندی بە پرسیاری ئێوەوە نییە. رەنگە کاتێکی تر و هەلێکی تر لەبار بێت.

***ئایا چاوەڕوانی بەرهەمی نوێتر بین لە شێرکۆ بێکەس؟**

من و شیعر هێشتا لەیەکتر دانەبڕاوین. هەندێ جار ئەم پرسیارە بۆ خۆشم دێتە پێشەوە کە ئایا شتێکی تازەم هەیە بۆ نووسین؟ من زۆر نانووسم و ئەمەش خۆشحاڵیی تایبەت بە خۆی هەیە. دوایین بەرهەمی درێژم (کورسی) بوو، بە درێژایی نووسینی ئەم بەرهەمە، نووسینی کورتی تریشم هەبوو، کە دواتر لە دیوانی خۆیان چاپ و بڵاودەبنەوە، وەکو (لە گوڵ تا خۆڵەمێش) کەڵکەڵەی زەینی ئەم رۆژانەم ئەمەیە کە ساڵی ٢٠٠٧ بتوانم بەرهەمێکی درێژی تر بە ناونیشانی (ملوانکە) کە وەکو کورسی ئاوێتەیەکە لە چەندین ژانری ئەدەبی بڵاوبکەمەوە. جیهانی ملوانکە جیهانی ژنی میللەتی ئێمەیە، ئارەزوو و دڵتەنگیەکانی، هەموو شتێ لە جیهانێکە کە ژنێك وەکو قوربانییەك تێیدا ژیان بەسەر دەبات. ملوانکە خۆی کەسایەتی یەکەمی ئەم نووسینەیە و چیرۆکەکە لە زمانی ئەوەوە دەبیستین، بەردێکە لە قوڵایی دەریاکانەوە ڕاو دەکرێت و ملوانکەی لێ دروست دەکرێت و لە بازاڕ دەفرۆشرێت، لێرەوە هێرشی پیاوسالارانە دەبینرێت، زمانی چیرۆك و شانۆنامە و پەخشان هاوکات تێدا بەکارهێنراوە، بە مانایەکی تر گێڕانەوەی ملوانکە کۆمەڵێك یاداشتی رۆژانەی ملوانکەیەکە لە قاڵبی ژانری جۆراوجۆردا.

دواتر چ گۆڕانکاریەکی تێدا دروست دەبێت نازانم، بەڵام هەوڵێکی ترە بۆ ئەفراندنی بەرهەمێکی درێژی تر کە بڕیارم داوە بۆ ساڵی نوێ تەواوی بکەم.

**سەرچاوە:**

ئەم چاوپێکەوتنە لە بەهاری ساڵی ٢٠٠٦ دا ئەنجامدراوە ، لە گۆڤاری ـ گەوهەران ـ کە وەرزنامەیەکی تایبەتی شیعرە، لە ژمار(١٥)ی بەهاری ٢٠٠٧ کە تایبەت کراوە بە شیعری کوردی بڵاوکراوەتەوە.



سازدان و وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:
عەزیز ڕەئووف

# گفتوگۆ لەگەڵ جۆن ئیسپۆسیتۆ لە بارەی عەلمانیەت و فەندامێنتالیزمەوە

ئەم چاوپێکەوتنە لەڕێگەی ئیمەیڵەوە لەگەڵ نوسەر و پرۆفیسۆری ناودار جۆن ئیسپۆسیتۆدا ئەنجام دراوە. ئەم پیاوە لە ئاستی خۆرئاوادا گرنگی تایبەت بە تێزە فکری و ئاینیەکانی دەدرێت و خودی خۆیشی لە فەندامێنتالیزمی ئیسلامی و تێزە ئایینەکاندا بەتایبەتی ئاینی ئیسلام شارەزایی هەیە. ئێمە ئەم چاوپێکەوتنەمان تایبەت بۆ گۆڤاری سەردەم لەگەڵ ناوبراودا سازدا و هەردووکمان کۆك بووین لەسەر ئەوەی کە تەوەری «عەلمانیەت و فەندامێنتالیزم»، هەڵبژێرین بۆ قسەلەسەرکردن.

-عەزیز ڕەئووف-

***بەر لە هەر شت بەڕێز ئیسپۆسیتۆ، سەرەتای ئەم مشتومڕەمان لەبارەی باکگراوندی ژیانتەوە دەست پێدەکەم. دەکرێ سەبارەت بە ژیانی خۆت بۆ خوێنەری کورد بدوێیت؟ کەی و چۆن دەستت بە نوسین کرد؟**

-من پرۆفیسۆر و لێکۆڵەرم. لە هەمانکاتدا مامۆستای بواری ئایین و دیراساتی ئیسلامیم لە زانکۆی جۆرج تاون. هەروەها بەڕێوەبەری سەنتەری مەلیك بن تەلاڵم بۆ تێگەیشتنی ئیسلام و کریستیان لە WALSH SCHOOL OF FOREIGN SERVICE. ماوەیەکی زۆر سەرۆکی کۆمەڵەی دیراساتی خۆرهەلاتی ناوەڕاست بووم لە باکوری ئەمریکا و هەروەها لە دیراساتی کۆمەڵگەی ئیسلامی بووم لە ئەمریکا. ئیستا من سەرنوسەری THE OXFORD ENCYCLOPEDIA OF THE MODERN ISLAMIC WORLD. من خاوەنی زیاتر لە ٢٥ کتێبم لەوانە: (کێ قسە لەبارەی ئیسلامەوە دەکات؟)، ( شەڕی ناموقەددەس: تیرۆر بەناوی ئیسلامەوە)، (بۆچی هەموو

کەس دەخوازن لەبارەی ئیسلامەوە بزانن؟) ،( ئایین و گلۆبالیزەیشن) ،(ئیسلامی ئاسیایی لە سەدەی بیست و یەکەمدا). زۆرێك لە کتێب و گوتارەکانم بۆ زیاتر لە ٢٨ زمان وەرگێڕدراون.

***یەکێك لەو کتێبانەی کە باست نەکرد و بە کتێبێکی ناوازە ناوزەد دەکرێت کتێبی ( هەڕەشەی ئیسلامی: ئەفسانە یاخود ڕاستی) یە، دەکرێ لەبارەی ئەم کتێبەوە بۆمان بدوێیت؟ یان ئەگەر پرسیارەکەم بکەم بە دوو بەش، بۆچی تۆ چەمکی  فەندامێنتالیزم لە ئیسلامدا هەڵدەبژێریت بۆ قسەلەسەرکردن؟**

-من ئەو کتێبەم لە کاتی هەڵگیرساندنی شەڕی یەکەمی کەنداودا نوسی، لەبەرئەوەی من لەو کاتەدا گرنگیم بە ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت دەدا و پێم وابوو دوای کۆمۆنیزم ئیسلام دەبێتە هەڕەشەیەکی جیهانی. لەم کتێبەدا لەبارەی مێژووی پەیوەندی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت و جیهانی ئیسلام و خۆرئاوا وەستاوم. دوای ئەوە من ڕاڤەی نوێبوونەوەی ئیسلام و زیاد لە ڕۆڵێکی ئەم ئایینە دەکەم و ڕۆڵی موسوڵمان لە کۆمەڵگەدا دەخەمە بەر دیراسەکردنەوە. ئەم کتێبەم دیراسەیەکە سەبارەت بە توندڕەوەکان و بزوتنەوە ئاساییەکان. لە کۆتایی کتێبەکەمدا باس لە موسوڵمانی توندڕەو دەکەم کە هەڕەشەن بۆسەر کۆمەڵگە، بەڵام باس لە ئاینی ئیسلام دەکەم  و دەڵێم زۆرینەی موسوڵمان توندڕەو نین بەڵکو مرۆڤی ئاساین.

***فەندامێنتالیزم چەندین پێناسەی جیاواز لەخۆدەگرێت و ڕەنگە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر و لە ئاینێکەوە بۆ ئاینێکی تر بگۆڕێت، من دەپرسم بەبۆچونی ئێوە باشترین پێناسە بۆ کۆنسێپتی فەندامێنتالیزم چیە و مەبەست لە فەندامێنتالیزمی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی چییە؟**

-فەندامێندتالیزمی ئیسلامی لە باکوری ئەفریقاوە بۆ باشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا بونێکی یەکجار کاریگەری هەیە لە حکومەت و ئۆپۆزسیۆنی سیاسیدا. ئیسلامی سیاسی لە دەسەڵات و لە سیاسەتدا چەندین مەسەلە و پرسیار دەخولقێنێت:»ئایا ئیسلام دژ بە مۆدێرنەیە؟»،» ئایا ئیسلام و دیموکراسی بەیەکەوە هەڵناکەن؟» پێشنیاری حکومەتی ئیسلامی بۆ پلورالیزم و کەمینە و مافەکانی ئافرەت چییە؟»،» ئیسلامیستەکان پەیامەکەیان چۆن دەگەیەنن»،» ئایا ئیسلام نوێ دەبێتەوە؟»،» ئایا پێویستە خۆرئاوا لە نەریتی ئیسلامی و هەڕەشەکانی یاخود بەیەکدادانی شارستانیەتەکان بترسێت؟».

ئەتمۆسفێری ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامی وا خۆی دەردەخات کە دژ بە دەوڵەتانی ئیسلامی وەك « سعودیەی عەرەبی و ئێران و سودان»ە. دروستبوونی بزوتنەوە ئیسلامیەکان کە وەزیفەیان ئەوەیە وەك کارەکتەری سەرەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەناو سیستەمەکاندا بونیان هەبێت و لەڕێی توندوتیژی و توندڕەویەکی ڕادیکاڵانەوە بەرەنگاریەکی سیاسیانە بکەن. هەندێ جار بزوتنەوە ئیسلامیەکان خۆیان بە ئەلتەرناتیڤی دەسەڵاتێکی گەندەڵ و فاشیل و ڕژێمگەلێکی بێنرخ و لاواز دەزانن. هەندێکی تریان هێزی تەواو شڵۆق و نائاسودە و دیماگۆگن کە هەموو تاکتیکێك بەکاردەهێنن بۆ گەیشتن بە دەسەڵات. توندوتیژی و تیرۆریزم لەلایەن چەندین گروپ لە سعودیەی عەرەبی و عیراق و ئەفغانستان و ئەندۆنیزیاوە کۆمەك دەکرێن. ئیستا گەیشتن بە ڕاستی دوورە و زۆر ئاڵۆز و جیاوازە لەوەی کە خەڵك وێنای دەکات. زۆرینەی ڕێکخراوە ئیسلامیەکان لەناو سیستەمی سیاسیدان و لەخوارەوە لەڕێگەی پرۆسەیەکی هێواش و لەسەرخۆوە بەدوای ریفۆرمدا دەگەڕێن. ئەمڕۆ زۆرێك لە ڕێکخراوە ئیسلامیەکان پشتیوانی لە لیبرالیزەیشن و دیموکراتیزەیشن دەکەن. ئەندامەکانیان بەشداری لە هەڵبژاردنەکان دەکەن و لە هەمانکاتدا لە حکومەت و کابینەکاندا خزمەت دەکەن. ڕێکخراوە ئیسلامیەکان و ئیسلامیستەکان کورسیەکانی پارلەمانیان داگیرکردووە و لە کابینەکانی حکومەتدا خۆیان یەکخستوە و وەك ئۆپۆزسیۆن بۆ سەرۆکایەتی خۆیان دەرخستووە لە زۆرێك لە وڵاتاندا

لەوانە تونس، جەزائیر، مسر، تورکیا، لوبنان، ئەردەن، یەمەن، کوەیت و پاکستان.

چ پەیوەندیەك هەیە لەنێوان فەندامێنتالیزم و تیرۆریزمی جیهانیدا؟ دیارترین هۆکاری تیرۆریزمی جیهانی هەمیشە بە زمانی ئاینی و سیمبولەکانیەوە داپۆشراوە کە کارەکتەری توندرەو بەکاریدەهێنێت. باکگراوندەکان ( سیاسی و سۆسیۆئیکۆنۆمیك) پەیوەندیان بە تێکستە ئاینیەکانەوە نیە کە هەمیشە هۆکاری سەرەکین بۆ ئاراستەکردنی کارەکتەری توندرەو. لە زۆر کێشەدا رەخنە سیاسی و ئابووریەکان پاڵنەر و بزوێنەری سەرەکین، ئاینیش بۆتە مانایەك بۆئەوەی پشتیوانی جەماوەر بۆخۆیان دروست بکەن. وەك گەواهیەك لە پاکستان، عیراقی دوای سەددام ، ستراتیژی جیهانی ئوسامە بن لادن و رێکخراوی ئەلقاعیدە، هەمیشە دەسەڵاتی سیاسیان لە فراوانبووندایە بۆ کۆتایهێنان بە داگیرکەری خاکەکەیان لە هێزی بیانی لە وڵاتەکەیاندا، هەرچەندە لەهەمانکاتدا ئەوان ئامانجگەلێکی ئاینیان هەیە.

کێشەیەکی رەخنەئامێز لە شەڕ دژ بە تیرۆریزمی جیهانی ئەوەیە کە کێشەی رەواییە دژ بە نارەوایی، لەرێی بەکارهێنانی توندوتیژییەوە. کێشەکە تێکەڵکراوە لەگەڵ دەسەڵاتێکی ئاینیدا. ئیسلام چانسی بوونی دەسەڵاتێکی ناوەندی نییە، واتە دەسەڵاتێکی تاکرەوی ئاینی بوونی نیە، بەجۆرێك کە پیاوانی ئاینی بەتەمەن حوکمی بکەن. ئەوە دەتوانرێت ببێتە سەرچاوەیەك بۆ فرەیی و نەرمونیانی تەندروست لە کۆمەڵگەدا. بۆنمونە، پشتبەستن بە تەفسیرەکانی شارەزا لەبواری دەقەکان و کۆمەڵناس و موفتی دەتوانرێ بۆچوونە جیاوازەکان لەسەر زەواج و تەڵاق و گرەنتی کۆمەڵایەتی و هتد... بەدەست بهێنرێت. هەرچەندە ئەم نەبوونی ناوەندی دەسەڵاتە بەرەو شەڕی فەتوا پەلکێشمان دەکات. ئەم کێشەیە لە دەسەڵات و ململانێ جیاوازەکاندا دەبینرێت لەوانە بۆمبی خۆکوژی بەشێوەیەکی گشتی، وەك کردنی فەتوایەك بۆ خۆتەقاندنەوە لە ململانێیەکی نێوان ئیسرائیل و فەلەستین. جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان فەتوایەکی نەرم و نیانی ئایتەوڵا و سەرکردەیەکی ئاینی وەك سیستانی لە عیراق و کردەوە سەربازیەکانی وەك موقتەدا سەدر یان ئەبو موسعەب زەرقاوی. جیاوازی گەورە هەیە لە دەسەڵاتی موفتی سعودیەی عەرەبی لەگەڵ کردەوەکانی رێکخراوی ئەلقاعیدە لەو وڵاتەدا.

***لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا چ ئومێدێك هەیە بەوەی عەلمانیەت ببێتە سیستەم بەجۆرێك مافەکانی مرۆڤ و مافی ئافرەتان دەستەبەر بێت؟ مەسەلەی سێکولاریزم لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەمەش بە پشتبەستن بە باکگراوندی سیاسی و مێژوویی. لە زۆرێك لە کۆمەڵگە موسوڵمانەکاندا ئایین وەك فاکتەرێکی گرنگ ماوەتەوە. کۆکی لەگەڵم؟**

-تازەترین کتێبم « کێ لەبارەی ئیسلامەوە قسە دەکات؟»، کە پشتم بە شەش ساڵ دیراسەکردن و چاوپێکەوتن لەگەڵ زیاتر لە هەزار و پێنجسەد کەس کە لەناو 1.3 بلیۆن موسوڵماندا و لەناو زیاتر لە سی و پێنج نەتەوەی جیاوازدا ئەنجاممدابوو، زۆربەیان بەشێوەیەکی محافزکارانە جەغتیان لەسەر ململانێیەکی جیهانی دەکردەوە، ئەمەش رێك لەکاتێکدا بوو کە شەڕی عیراق و ئەفغانستان لەئارادابوو.

کاتێك پرسیارم دەکرد کە چ سۆزێك بۆ خۆرئاوا لەئارادایە، موسوڵمانان هەمیشە ئارەزووی سێ دیاردەی گرنگی خۆرئاوایان دەکرد: یەکەم/ تەکنەلۆجیا. دووەم/ بەهای سیستەمی خۆرئاوا، کاری قورس، بەرپرسیاری تاکەکەسی، رۆڵی یاسا و هاریکاری کردن. سێیەم/ سیستەمی رۆشنی سیاسی، دیموکراسی، رێزی مافەکانی مرۆڤ، ئازادی بیرورا و یەکسانی جێندەر. زۆرینەی موسوڵمانان بروایان بە هەنگاونان بەرەو حکومەتێکی دیموکراسی پێرفێکت هەیە، کە لە ئایندەدا هەنگاوی گەورەتر لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا بەخۆوە ببینێت.

لەلایەکی ترەوە زۆرێك لە موسوڵمانان کە چاوپێکەوتنم لەگەڵیاندا سازدابوو، نە سێکولاریزمیان

قبولّ بوو نە دەسەلاتی دینی، بەڵکو ئەوان ئازادی و ماف و دیموکراتییان دەویست. لە هەمانکاتدا ئەوان نەیاندەشاردەوە کە ئارەزوو دەکەن بەوەی کۆمەڵگە پێویستە لەسەر بەهاکانی ئاینی ئیسلام بنیاد بنرێت و شەریعەت سەرچاوەی یاسا بێت. زۆرینەی ژنان و پیاوانی موسوڵمان ئاین و مافیان دەوێت و مافەکان وەك شتێکی سروشتی نابینن بەڵکو لەڕوانگەی ئاینەوە تەماشای دەکەن.

ئەو باسەی من ئەوە دەخاتەڕوو کە ململانێی موسوڵمان و خۆرئاوا بوونی نیە و لەڕاستیدا ئەوە زیاتر دیاردەیەکی سیاسیە نەك ئاینی. هەرچۆنێك بێت باش یا خراپ بڕیاربەدەستەکان ڕاستەوخۆ گوێ لە خەڵك دەگرن و دەگەنە حەقیقەتێك سەبارەت بە تێنەگەیشتنیان بۆ ئەم دیاردەیە. بەڵام توندڕەوەکان لە هەموولایەکەوە دەیانەوێت سەرزەوی بۆخۆیان مسۆگەر بکەن.

***ئایا نارۆشنییەك و گومانێك لە فەندامێنتالیزمی ئاینیدا هەیە، بەجۆرێك کە شکست بەخۆوە ببینێت؟**

-بەڵێ. شکستەکانی مۆدێرنە، سیاسەت، ئابووری، پەیوەندی کۆمەڵایەتی و پەرچەکرداری بیروباوەڕ و ناسنامە، پاڵنەری سەرەکی زۆرێك باوەڕدارەکانن. ئاینی مەسیحی، جولەکە یاخود موسوڵمان زۆر بە جدی ئارەزووی گەڕانەوە و دووپاتکردنەوەی بیروباوەڕ و بەها ئاینیەکان دەکەن، نەك تەنها لە بوونێکی تاکەکەسیدا، بەڵکو بۆ ژیانی گشتی.

***حەز دەکەم بۆچونی ئێوە لەبارەی فەندامێنتالیزمی سێکولارەوە بزانم؟ ئایا دەکرێ بڵێین ئەوە دیاردەیەکی نوێیە؟**

-تێگەیشتن لە تەفسیر و ڕەخنەکان لەبارەی ئیسلامی سیاسیەوە بریتیە لە چەمکی» فەندامێنتالیزمی سێکولار»، دیدگای سێکولارێکی مۆدێرن کە تێکەڵکردنی ئاین و سیاسەت پێداویستیەکی تەواو نائاسایی و ئەبنۆرماڵە»بە پشتبەستن بە نۆرمی سێکولار»، بە مانایەکی تر تێکەڵکردنی ئاین و سیاسەت ناعەقڵانی و ترسناك و توندڕەوانەیە. هەرکەس ئەوە بکات فەندامێنتالیستە، « کریستیان، جولەکە یاخود موسوڵمان» بێت، یان بە مانایەکی تر دەتوانین بڵێین ئەوەی ئاین و سیاسەت تێکەڵ بکات کارەکتەرێکی ئاینی تەواو توندڕەوە. بۆیە، کاتێك خەڵکانی سێکولار(فەرمانبەرانی حکومەت، لێکۆڵەرەوە سیاسیەکان، ڕۆژنامەنوسان، کۆی گشتی خەڵك) لە خۆرئاوا و جیهانی ئیسلامیدا ڕووبەڕوو دەبنەوە لەگەڵ تاکە موسوڵمانەکان یاخود ئەو گروپانەی کە قسە لەبارەی ئیسلامەوە دەکەن، یەکسەر بە فەندامێنتالیست ناوزەدیان دەکەن و بە سادەترین شێوە بە هێزگەلی دواکەوتوو بانگهێشتیان دەکەن، یان بە شێوەیەکی تر کارەکتەرە فەندامێنتالیستەکان بە کۆسپ لەبەردەم گۆڕان و هەڕەشە بۆسەر ژیان دەبینن.

ئەو تیۆرەی باس لە پێویستی و شەرعیەتدان بە تێکەڵکردنی ئاین و سیاسەت دەکات بێشك بەرەو توندڕەوی و دەمارگیری پەلکێشمان دەکات، ئەمەش فاکتەری سەرەکییە بەوەی کە سەرجەم بزوتنەوە ئیسلامییەکان توندڕەون و وامان لێدەکات کە بڵێین ئیسلام و دیموکراسی پێکەوە هەڵناکەن. شکستی بزوتنەوە ئیسلامیەکان بۆ جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت لەنێوان ئەوانەی کە بڕوایان بە مۆدێرنە هەیە (وەك ئەوەی لە سیستەمە مۆدێرنەکاندا بڕوایان بە گۆڕان هەیە) یان ئەوانەی ڕادیکاڵن، تێنەگەیشتنێکی ڕیشەیی هەیە بەرامبەر بە ئاین و سیاسەت. کەمێك کۆنتاکت هەیە لای سەرکردە و گروپە جولەکە یان توندڕەوە مەسیحیەکان لەگەڵ کۆمەڵگەی جولەکە یاخود کریستیانیتی بەشێوەیەکی گشتی. هەروەها حکومەتی ئەمریکا دژ بە تێکەڵکردنی ئاین و سیاسەت نییە لە ئیسرائیل بۆ نمونە، بەهەمانشێوە لە پۆلەندا، ئەوروپای خۆرهەلات یان ئەمریکای لاتین. ئاستی جیاکردنەوەی کایەکان لە ئیسلامدا تەواو غایبە.

د. میجان رەویلی، د. سەعد ئەلبازعی
لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

# سەرەتایەك دەربارەی ڕۆشنگەری
# THE ENLIGHTENMENT

**دەروازە:**

زاراوەی رۆشنگەری، بەشێوەیەکی گشتی، ئاماژە بۆ چەشنێك لە بیرکردنەوە دەکات کە پشت بە ئەقڵ و ئەقلانییەت دەبەستێت، یان بڵێین رۆشنایی خۆی لە ئەقڵەوە وەردەگرێت. لەسەر چەند بەهایەك رادەوەستێت وەك ئازادی و دادپەروەری لەبری خورافات و زوڵم و ستەمگەری. ئەم تێگەیشتنە باکگراوندی سەرەکیی خۆی لە رۆشنگەریی فیکر و رۆشنبیریی خۆرئاواییەوە وەردەگرێت، بەو پێیەی یەکەمجار ئەم بیرۆکەیە لە فیکری خۆرئاواییدا پەرەی سەندووە، ئەگەرچی فیکری ئەقلانی و بانگەشەکردن بۆ ئازادی و دادپەروەری، لە کولتورێکی دیاریکراودا قەتیس ناکرێت.

سەرهەڵدانی رۆشنگەری وەك دیاردەیەك یان وەك بزاوتێکی رۆشنبیری و فیکری، لە کولتوری خۆرئاواییدا، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەیەم، ئەمەش لە ئاکامی پەرەسەندنی چەند بارودۆخێکی فیکری و کۆمەڵایەتی و ئابووری بوو لە مێژووی خۆرئاوادا (ئەوروپی و ئەمریکی) کە لە چەند گۆڕانکارییەکی بنچینەیی پێشوەختدا گەڵاڵە بوو، بۆیە پێویستە وەك ئەڵقەیەك لە زنجیرەی پێشکەوتنە مەعریفی و فیکرییە کاریگەرەکانی مێژووی شارستانیەتی خۆرئاوادا تەماشای رۆشنگەری بکەین.

ئەگەرچی رۆشنگەری یان هەندێ لە سیما و تایبەتمەندییەکانی رۆشنگەری گواسترایەوە بۆ کولتورەکانی تری دنیا، بەڵام نابێ پابەندبونی ئەم بزاوتە بەو رۆشنبیرییەو بەو قۆناغە مێژووییە لەیاد بکرێت کە تیایدا لەدایك بووە، بۆیە لێرەدا پێویست دەکات چوارچێوەیەکی مێژوویی بۆ رۆشنگەری بخەینەڕوو.

## چوارچێوەی مێژوویی ڕۆشنگەری:

مێژوونوسان سەرەتا و کۆتایی ڕۆشنگەرییان بەو قۆناغە دیاری کردووە کە لە چارەکی کۆتایی سەدەی حەڤدەیەمەوە دەست پێدەکات تا کۆتایی سەدەی هەژدەیەم. یەکێك لە ڕووداوە فیکرییەکانی ئەو سەردەمە، بریتی بوو لە بڵاوکردنەوەی کارەکانی ڕوناکبیری ئینگلیزی لۆرد چاڤستبێری و نووسەری ئینگلیزی جۆزیف ئەدیسۆن لە ساڵی ١٦٩٩دا، کارەکانی ئەم دوو نووسەرە سەرەتایەکی بەهێز بوون لە پێشکەوتنەکانی نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەم، بەتایبەتی لەلای ڕۆشنگەرانی فەرەنسی کە مۆنتسکیو (١٦٨٩-١٧٥٥) دیارترینیانە. بەڵام کۆتایی ڕۆشنگەری، بە مردنی هۆلباخ لە ساڵی ١٧٨٩ دیاری دەکرێت، هۆلباخ لە نەوەی سێیەمی ڕۆشنگەرانی فەرەنسی بوو، هەر لەو ساڵەشدا شۆڕشی فەرەنسی هەڵگیرسا کە ڕۆشنگەری لە ڕووی فیکری و ڕۆشنبیرییەوە کەش و زەمینەیەکی گونجاوی بۆ ئەو شۆڕشە خوڵقاند.

مێژوونوسی فەرەنسی پۆل هازار لە کتێبی «قەیرانی ویژدانی ئەوروپی»، کە لە ساڵی ١٩٣٥دا چاپی کردووە، بۆچوونێکی تری لەبارەی سەرەتا و کۆتایی ڕۆشنگەری هەیە، ئەو وای دەبینێت سەرەتاکانی ڕۆشنگەری دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی ١٦٨٠، ئەو پێشکەوتنە فیکری و ڕۆشنبیرییەی لەپاش ١٧٦٠ و ١٧٨٩دا ڕوویاندا، لە سەردەمی لویسی چواردەهەمیشدا ڕەواجیان هەبوو، واتە پێشتر زەمینە بۆ ئەو بزاوتە ڕۆشنگەرییە خۆشکرابوو.

لەڕاستیدا پێشکەوتنەکانی چەرخی ڕۆشنگەری دەرەنجامی ململانێ فیکری و ڕۆشنبیرییەکانی چەرخی ڕێنیسانس بوو، چونکە ڕۆشنگەری زنجیرەیەکە لە مێژووی عەلمانییەتی ئەوروپیدا کە دەرکەوتەکانی لەگەڵ چەرخی ڕێنیسانسدا، لەهەردوو ئاستی فەلسەفی و ڕۆشنبیریدا، بەدیارکەوت، بەتایبەتی لەگەڵ پرۆسەکانی ریفۆرمی ئاینیدا، کە لەتەك بڵندگەرایی کڵێسە و ڕۆحانییەتی ئایینی مەسیحیدا بەریەك کەوتن.

دیسان زەحمەتە لە ڕۆشنگەری تێبگەین بەبێ تێگەیشتن لە دەستکەوتەکانی ژمارەیەك بیرمەند و زانای ناودار کە بەدرێژایی سەدەی حەڤدەهەم دەرکەوتن، لەوانە: دیکارت لە فەرەنسە، سپینۆزا لە هۆڵەندە، جۆن لۆك و نیوتن لە ئینگلتەرە، لایبنتز لە ئەڵمانیا. تویێژەرێکی هاوچەرخ، لەمیانی گرنگیی فەیلەسەفی جولەکەی هۆڵەندی سپینۆزا، جەخت لەو قووڵاییە مێژووییەی ڕۆشنگەری دەکات، ئەو فەیلەسوفەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەمدا سەرەتا و بنەمای ڕۆشنگەریی دامەزراند.

## چەمك و سیماکانی ڕۆشنگەری:

ئەگەرچی لە زۆربەی زمانە جیاجیاکانی دنیادا و لە کایە مەعریفییە جیاوازەکاندا، بەڕادەیەکی زۆر زاراوەی ڕۆشنگەری و هاوواتاکانی بەکارهێنراوە، بەڵام ئەستەمە بتوانین پێناسێکی ورد و دیاریکراوی بۆ دابنێین، بگرە مێژوونوسانی ئەو بزاوتە ڕۆشنبیرییە گەورەیە، لە دیاریکردنی مانا و دەلالەتەکانی ڕۆشنگەریدا تەبا نین، یەکێك لەو خاڵە ناکۆکانە بریتییە لەوەی ئاخۆ ڕۆشنگەری دیاردەیە یان بزووتنەوە.

میشێل فوکۆی فەیلەسوفی فەرەنسی وایدەبینێت پرسیاری «ڕۆشنگەری چییە؟» پرسیارێکە تا ئەمڕۆش فەلسەفەی نوێ لە بەرامبەریدا دۆشداماوە. فوکۆ لە وەڵامی پرسیاری یەکێك لە گرنگترین فەیلەسوفانی ئەوروپادا، واتە ئیمانوێل کانت، ئەو قسەیە دەکات، وەك دەزانین پێشتر کانت وتارێکی بەهەمان ناونیشان، واتە «ڕۆشنگەری چییە؟»، بڵاوکردۆتەوە، دواتر فوکۆش لە وتارێکی تردا بە ناونیشانی کانت و شۆڕش، بۆچوونی خۆی دەردەبڕێت.

لە دیدی فوکۆدا دەبێ بە سیفەتی چرکەساتی (هوشیاریی رۆشنگەری) تەماشای وەڵامی کانت بکەین پتر لەوەی وەڵامێك بێت بۆ ئەو پرسیارە. بەو مانایەی کە وەڵامی کانت وەسفێکی تەواوی رۆشنگەری پێشکەش ناکات، وەك ئەوەی رۆشنگەری بریتی بێت لە کۆی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیرییەی لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا روویاندا. بەڵکو وەڵامی کانت -وەك فوکۆ دەڵێت- پتر وەك دۆکیومێنتێکی مێژوویی چاوی لێدەکرێت.

کانت لە پەرەگرافی یەکەمی وەڵامی ئەو پرسیارەدا «رۆشنگەری چییە؟» کە گۆڤارێکی ئەڵمانی لە ساڵی ١٧٨٤دا ئاراستەی کردبوو، دەڵێت: «رۆشنگەری بریتییە لە رزگاربوونی ئینسان لەو راسپاردە و فەرمانەی (الوصایە) کە خۆی بەسەر خۆیدا دەیسەپێنێت»، راسپاردە و فەرمان -الوصایە- لە دیدی کانتدا بریتییە لە بێتوانایی مرۆڤ لە بەکارهێنانی توانای خۆی بۆ تێگەیشتن، بێئەوەی رێنمایی لە کەسانی دی وەربگرێت. کانت دەڵێ: «با بوێرییەکی وات تیادا بێت بتوانیت توانای خۆت لە تێگەیشتندا پرۆسیسە بکەیت- ئەمەیە دروشمی رۆشنگەری»، لەراستیدا ئەم وتەیە یاخود ئەم دروشمە هەر لە سەرەتاوە بزوێنەری بزاوتی رۆشنگەری بوو.

هەندێ لە توێژەران وایدەبینن کە ئەم بزاوتە مێژووییە گرنگە، لە سەدەی هەژدەیەمدا سەرانسەری ئەوروپا و خۆرئاوای گرتەوە، بەڵام فەرەنسا شوێنی رەسەنی لەدایکبوونی رۆشنگەرییە، هەرلەوێشدا ژمارەیەك بیرمەند و فەیلەسوف بانگەشەیان بۆ کرد، لەوانە: مۆنتسکیو، ڤۆلتێر، هۆلباخ، دیدرۆ، رۆسۆ. بیروباوەڕی تازەی ئەم بیرمەندانە لەگەڵ دامەزراوە تەقلیدییەکانی سیاسەت و ئاییندا بەریەك کەوتن. ئیدی لەوێوە جەنگی رۆشنگەری دەستی پێکرد.

مۆنتسکیو لە فەرەنسەدا بە دوو کاری گرنگ پرۆسەی کاری رۆشنگەریی دەست پێکرد، یەکەمیان کتێبێکە بە ناونیشانی «نامە فارسییەکان» لە ساڵی ١٧٢١دا، دووەمیان کتێبێکی ترە بە ناونیشانی «رۆحی یاساکان» لە ساڵی ١٧٤٨دا. لە کتێبی دووەمیاندا مۆنتسکیو شیکردنەوەی بۆ چەند سیستمێکی سیاسی پێشکەش کردووە و داوای دامەزراندنی پاشایەتیی دەستوری لیبرالی دەکات وەك ئەو سیستمەی لە بەریتانیادا هەیە، شایانی باسە مۆنتسکیو لەنێوان ساڵانی ١٧٢٩ و ١٧٣١دا لە ئینگلتەرە ژیاوە و سەرسام بووە بە سیستمی سیاسیی ئەو وڵاتە.

لە کتێبی «نامە فارسییەکان»یشدا، رەخنەیەکی ناڕاستەوخۆی ئاراستەی دامەزراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی فەرەنسە کردووە، ئەو رەخنانەی لە میانی چەند نامەیەکی خەیاڵیدا دارشتووە کە گوایە پیاوێکی فارسی لە سەردانیدا بۆ فەرەنسە پێشکەشی کردوون. ئەو پیاوە فارسییە ناوی ئۆزبیکە و باوەڕی بە بێسنوریی مەعریفە و گەڕانی بەردەوام هەیە، بۆیە وڵاتی خۆی جێدەهێڵێت و بەدوای ئەو بەها فیکری و رۆشنبیرییانەدا دەگەڕێت کە بە رۆشنگەرییەوە پەیوەست بوون، وەك گەڕان بەدوای مەعریفەی پێشکەوتوو و سیستمی دەستوری و ژیانی دادپەروەری، هەروەها جەخت کردنەوە لە بیرۆکەی پێشکەوتنی بەشەری. ئیدی لەوێوە رەخنە لە گەندەڵی و سیستمی پاشایەتی ئایینی دەگرێت.

دیدرۆ لە ساڵی ١٧٥١ تا ساڵی ١٧٧٢ لەتەك مۆنتسکیو و ڤۆلتێر و هۆلباخ و جان جاك رۆسۆدا، فەرهەنگێکی گەورەیان دانا بەناوی (ئینسایکلۆپیدیا)، ئەم فەرهەنگە قەبەیە، لەتەك چەندین دەستکەوتی دیکەی رۆشنگەراندا، بە دەستکەوتێکی مەعریفی و فیکریی گرنگ دادەنرێت لە بەرزکردنەوەی بەهاکانی رۆشنگەری و لە بەرجەستەکردنی بواری تری وەك مێژوو و سۆسیۆلۆژیا و یاسادا.

هەندێ لە توێژەران وایدەبینن کاتێك بۆ ناسینەوەی روخسارەکانی رۆشنگەری تەنها تەرکیز دەکرێتە سەر فەرەنسە، ئەمە لەراستیدا دەبێتە مایەی غافڵگیری لەو دەستکەوتە گرنگانەی لە دەرەوەی فەرەنسا

بەدەست هاتوون، چونکە لێرەدا ئینگلتەرە و ئیسکۆتلەندە و هۆڵەندە و ئەڵمانیا رۆڵێکی گەورەیان لە بەرەوپێشبردنی گۆڕانکارییەکانی سەدەی هەژدەیەمدا هەبوو. بۆ نموونە لە ئینگلتەرەدا رۆشنگەری سیمایەکی دیکەی هەبوو جیاواز لەو سیمایانەی لە فەرەنسەدا دەرکەوتن.

لە ئینگلتەرەدا، لەتەك جەختکردن لە پرەنسیپە بنچینەییەکانی رۆشنگەری (ئازادی، دادپەروەری، پێشکەوتن، بیری زانستی...تاد)، بەڵام لەوێدا بیرمەندان و زانایان نەکەوتنە ناو ململانێوە لە دژی دامەزراوە ئایینی و سیاسییەکان، کە ئەمە لە فەرەنسە و ئەڵمانیادا روویدا، بەڵکو لەوێدا رۆشنگەری لەتەك ئایینداری و کۆنەپارێزیی سیاسەتی ئینگلیزیدا پێکەوە دەژیان، چونکە ئینگلیز پێشتر لە ساڵی ١٦٨٠دا شۆڕشی خۆیان هەڵگیرساندبوو، لەناو ئەو گۆڕانکاریانەدا ژیابوون کە دیموکراسیەت قووڵتر دەکەنەوە، بەڵام رۆشنگەریی ئینگلیزی هەروا بێ کێشە رێگەی نەدەبڕی، بەڵکو لەوێشدا دوچاری چەندین بەرەنگاری بۆوە، لەوانە چۆن بتوانن کۆشش بەرەو ئازادی و خۆشگوزەرانی و بەختەوەری، پێکەوە کۆبکەنەوە، بێئەوەی بکەونە نێو بازنەی ئاژاوەگێڕییەوە. وەك دەزانرێ مێژووی ئینگلیزی کە باسی سەدەی هەژدە دەکات، وەك سەدەی رۆشنگەری ناوی نابات، بەڵکو بە «سەدەی ئەقڵ» ناوی دەبات، یان بەسەدەی ئۆگستین ناوی دەبات وەك ئاماژەیەك بۆ ئۆگستینی ئیمپراتۆری رۆمانی کە چەندین بلیمەتی مەزنی تیادا هەڵکەوت لە بواری ئەدەبی لاتینیدا.

لە ئیسکۆتلاندەشدا رەوتی رۆشنگەری تا ئەندازەیەکی زۆر لە رۆشنگەریی ئینگلتەرە دەچوو، ژمارەیەك بیرمەندی ئیسکۆتلاندی وەك دیڤید هیوم-ی فەیلەسوف و ئادەم سمیت-ی ئابووریناس، رۆڵێکی دیاریان لە پێشخستنی بیروباوەڕی رۆشنگەریدا هەبوو، بەڵام ئیسکۆتلاندییەکان بەهۆی یەکگرتنیان لەگەڵ ئینگلتەرەدا، خواستە سیاسییەکانیان سنوردار بوو، لەڕوی ئابوورییەوە کتێبەکەی ئادەم سمیت بە ناونیشانی «سامانی گەلان» کە هاوکات لەگەڵ راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکادا لە ساڵی ١٧٧٦دا چاپکرا، بە نموونەیەکی جوانی شیکردنەوەی فیکری کۆمەڵایەتی ئابووری دادەنرێت، ئەوەبوو لەدوای سەدەیەك، بیری ئابووری مارکسیزم هات بۆ ئەوەی نەك تەنها مێژووی ئابووری شیبکاتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی سەرانسەری ئەو مێژووە لە رێگەی شۆڕشی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە، بگۆڕێت.

لە ئەڵمانیاشدا رۆشنگەری پەیوەست بوو بە بیروڕای تیۆلۆژیست و یاساناس کریستیان تۆماسیوس (١٦٥٥-١٧٢٨) کە بانگەشەی بۆ ئازادیی بیرکردنەوە دەکرد لەتەك گەڕان بەدوای راستیدا بەبێ سڵەمینەوە لە هیچ دەسەڵاتێك، هەروەك بانگەشەی بۆ لێبکوردنی ئایینی و رەتکردنەوەی خورافات دەکرد. ئەو زانا تیۆلۆژیستە پێداگریی لەسەر ئەوە دەکرد کە نابێت تاکەکەس بەبێ بیرکردنەوە باوەڕ بە هەموو قسەیەك بهێنێت، سا ئەو قسەیە لە سەرکردەکانیەوە دەرچووبێت یان لە مامۆستا و باوك و بەرپرس.

دواتر هەندێ لە فەیلەسوفانی ئەڵمانی وەك کانت و هێردەر کەوتنە ژێر کاریگەریی بیروراکانی تۆماسیوسەوە، ئەم زانا تیۆلۆژیستە پێی وابوو باوەڕی ئایینی باوەڕێکی باڵایە و خاڵییە لە هەڵە، خودی مرۆڤیش سەرچاوەی حەقیقەتە، ئەم بۆچوونانە رێك لە کەلەپووری پرۆتستانتی ئەڵمانیدا هەیە. ئەم هەڵوێستە فیکرییە لەلای کانتیش رەنگی داوەتەوە، بەتایبەتی کە قسە لەبارەی رۆشنگەری دەکات و داوا دەکات لە بیرکردنەوەی ئازادانەدا پەنا بۆ ئەقڵ ببردرێت.

## رەخنە لە رۆشنگەری:

### 1-هەڵوێستی رۆمانسیزم:

زۆر کەس وایدەبینن کە مۆدێرنەی هاوچەرخ درێژەپێدانی رۆشنگەرییە، بەو پێیەی رۆشنگەری و مۆدێرنە چەند بەهایەکی لیبراڵیی وەك: ئازادیی تاکەکەس و دادپەروەری و سەروەریی ئەقڵ، لەخۆ دەگرن. بەڵام

مۆدێرنە، کە دیاردەیەکی مێژوویيە و ڕیشەیەکی قووڵی هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە قۆناغی ڕۆشنگەریش، هەروەك پەیوەستە بەو بزوتنەوانەی لە چەندین ڕووەوە لەگەڵ ڕۆشنگەریدا ناکۆك بوون، بەو پێیە مۆدێرنەیش لە پێکهاتەدا هەڵگری چەندین جیاوازییە لەگەڵ ڕۆشنگەریدا و دژی هەندێ لە پرەنسیپ و بیروڕاکانیەتی.

وەك دەزانین ڕۆمانسیزم، لەڕووی مێژووییەوە، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا سەریهەڵداوە و بەشداریی لە شکڵگرتنی مۆدێرنەدا کردووە، بەڵام لە چەندین ڕووەوە جیاواز بووە لە پرەنسیپەکانی ڕۆشنگەری.

ڕۆمانسیزم یەکەمین بزووتنەوە بوو کە لەڕووی ئەقڵ و ئەقڵانییەتەوە دژی ڕۆشنگەری بوو، لە بایەخی ئەقڵانییەتیان —وەك لۆجیکێکی کۆنکریتی- کەم کردەوە، لە بەرامبەردا ئاستی خەیاڵ و ویژدانیان بەرز ڕاگرت. ڕۆمانسیستەکان دیدێکی جیاوازیان بۆ سروشت هەبوو، لە زۆربەی ئەدەبیاتی ڕۆمانسیزمدا مێژووی بەشەری مەحکوم نییە بەو پێشکەوتنەی ڕۆشنگەری باوەڕی پێهێنابوو، بە پێچەوانەوە ئەمان وایان دەبینی بەشەرییەت لە باشترەوە بەرەو خراپتر دەڕوات، مرۆڤ لە پاکژیی سروشتەوە بەرەو پیسی و گەندەڵیی شار هەنگاو دەنێت.

دواتر چەندین ڕێبازی دیکەی وەك سیمبۆلیزم و دادایزم و سوریالیزم ڕاستەوخۆ ڕەخنەیان لە پرەنسیپەکانی ڕۆشنگەری گرت و لە بەرامبەریدا پایەی ئیلهام و ئەقڵی ناوەکی و نائاگاییان بەرز کردەوە.

## 2-ڕەخنەی ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر:

لە سەدەی بیستەمدا و بەدیاریکراوی لە چلەکاندا، هەندێ لە جەمسەرە گرنگەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆتر ڕەخنەیان لە ڕۆشنگەری گرت.

لە ساڵی ١٩٤٤د ماکس هۆکهایمەر و تیۆدۆر ئادۆرنۆ کتێبێکیان بڵاوکردەوە بە ناونیشانی «دیالێکتیکی ڕۆشنگەری» کە تیایدا ڕەخنەیەکی توندیان ئاراستەی ڕۆشنگەری کرد، لە دیدی ئەم دوو بیرمەندەدا، گرفتی ڕۆشنگەری لە چەند خاڵێکدا کۆدەبێتەوە، لەوانە: تۆتالیتاریزم یان سەرجەمگیری لە باسکردنی دیاردە سروشتی و مرۆڤایەتییەکاندا، گرتنەبەری میتۆدێکی ماتماتیکی ئیمبریقی و ماتریالیی سادە، ئەمە جگە لەوەی کە ڕۆشنگەری، سەرباری ئەوەی بانگەشەی ئەقڵانییەت و زانستگەرایی دەکات، بەڵام نەیتوانیوە خۆی لە قورسایی نەریتی ئەفسانەیی و سیحری ڕزگار بکات، هەروەها ڕۆشنگەری وەك هەر سیستمێك، تۆتالیتارییە.

ڕەخنەی ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر بەشێکە لەو پێشکەوتنە فیکرییانەی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، لە فۆرمی پۆست مۆدێرنەدا، شێوەیان گرت و بڵاوبوونەوە، ئادۆرنۆ لە هەندێ لە نووسینەکانیدا گومان لە ئەقڵ و لە لۆجیك دەخاتەڕوو، هەروەها گومان لەوەی فەلسەفە بتوانێت لە ڕێگەی ئەقڵەوە بگات بە حەقیقەت. وەك دەزانرێت باوەڕهێنان بە تواناکانی ئەقڵ و ئەقڵانییەت بۆ بەدیهێنانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی، سیمایەکی دیاری ڕۆشنگەری بوو.

## 3-ڕەخنەی پۆست کۆلۆنیالیزم:

لە پەیوەندییەکی نزیك لەو بابەتانەی ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر وروژاندویانە، ڕەخنەی پۆست کۆلۆنیالیزم لە ڕۆشنگەری هاتە ئاراوە، بەو پێیەی ڕۆشنگەری پێکهاتەیەکی بنچینەیی کولتوری هاوچەرخی خۆرئاواییە، کە ئەمە دواتر دەبێتە مایەی داگیرکاری و سێنترالیزمی خۆرئاوایی لە فیکری هاوچەرخدا.

یەکێك لەو لێکۆڵینەوە دیارانەی دەچنە ئەم بوارەوە، لێکۆڵینەوەیەکی راجانی کانیپاڵیە کە لە ساڵی ١٩٩٧دا لە کتێبێکدا بە ناونیشانی «دابڕان لەگەڵ رۆشنگەریدا» چاپی کرد، ئەم کتێبەش رەخنە لە تۆتالیتاریزمی خۆرئاوایی دەگرێت کە دەیەوێت هەژموونی خۆی لە هەموو ئاستەکاندا بسەپێنێت، ئەم نووسەرە دوورتر دەڕوات و دەڵێ پێویستە سێ سەدەی رابردووی ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنەی خۆرئاوایی فڕێ بدرێتە نێو زبڵدانی مێژووەوە. دیسان ئەم نووسەرە پێی وایە زانستی نوێ کە لە چەندین رووەوە پەیوەستە بە فەیلەسوف و زانای رۆشنگەری فرانسیس بیکۆن، زانستێکە تا رادەیەکی زۆر هەڵگری مۆرکی کورتکراوەییە، چونکە ئەم زانایە زانستی لە چالاکییەکی دەستەبژێرانەدا کورت کردۆتەوە و دایبڕیوە لە چالاکیی مرۆڤی ئاسایی، سەرباری ئەوەی بیکۆن میتۆدی مەعریفیی کولتورەکانی دیکە رەتدەکاتەوە.

### رۆشنگەری لە کولتووری عەرەبیدا:

رۆشنبیریی عەرەبی لە ماوەیەکی زوودا کەوتە ژێر کاریگەریی کاریگەریی رۆشنگەریی ئەوروپییەوە، ناپلیۆن لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا و بەدیاریکراوی لە ساڵی ١٧٩٨دا، نامەیەکی رۆشنگەرانەی ئاراستەی وڵاتی میسر کرد، هەندێ لە بیر و دەستکەوتەکانی رۆشنگەریی فەرەنسیی لەگەڵ خۆیدا هێنا، بۆ ئەوەی میسر و سەرانسەری وڵاتانی خۆرهەڵات بهێنێتە سەر رەوتی گۆڕانکارییە گەورەکانی رۆشنبیریی فەرەنسی و ئەوروپی، تا دواتر بتوانێت بەئاسانی کۆنترۆڵیان بکات. میسر لە سەردەمی محەمەد عەلی پاشادا پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆوە بینی، محەمەد عەلی لە سەدەی نۆزدەهەمدا چەندین کەسی نارده وڵاتانی ئەوروپا و بەتایبەتی فەرەنسا، یەکێك لەوانە رەفاعە تەهتاوی بوو. ئەم ناردنە دەرەوەیە بەردەوام بوو تا ساتەوەختی داگیرکردنی وڵاتانی عەرەبی لەلایەن فەرەنسە و بەریتانیاوە، کە لەگەڵ خۆیاندا پێشکەوتنە رۆشنبیرییەکانی ئەوروپایان  هێنا، بەتایبەتی ئەو لایەنانەی پەیوەست بوون بە پرەنسیپەکانی رۆشنگەری لە بوارەکانی پەروەردە و فیکر و زانستە جیاجیاکان.

کەواتە رێنیسانسی عەرەبی لە سەدەی نۆزدەهەمەوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، لە ئاکامی کاریگەرییەکانی رۆشنگەریی ئەوروپییەوە، هاتە ئاراوە، بەو سیفەتەی سەدەی بوژانەوەی عەرەبی بریتی بوو لە کارلێکی نێوان رۆشنبیریی عەرەبی و رۆشنبیریی هاوچەرخی خۆرئاوایی.

پەیوەندی کردنی ژمارەیەکی زۆری رۆشنبیرانی عەرەبی، بەتایبەتی لە میسر و لوبنان، بە کولتوور و رۆشنبیریی ئەوروپی و فەرەنسییەوە، هەنگاوەکانی ئەو بوژانەوەیەی خێراتر کرد. ئەحمەد شەوقی و تەها حسێن لە لایەنگرانی رۆشنگەری بوون و بانگەشەی دیموکراسی و ئازادی و ئەقڵانییەت و عەلمانییەتیان دەکرد، رۆشنگەرانی عەرەبی داوایان دەکرد سیفەتی پیرۆزگەرایی لەسەر کەلەپووری ئایینی لاببرێت و روانینێکی عەلمانییانە لە هەموو ئاستەکانی ژیاندا بخولقێنرێت، بەشێوەیەکی ئیجابی تەماشای رۆشنبیریی خۆرئاوایی بکرێت.

توێژێکی بەرفراوانی رۆشنبیران و نووسەرانی عەرەب، لەو سەردەمەدا، داوایان دەکرد ئازادیی تاکەکەس و دیدی عەلمانی فەراهەم بکرێت و دابڕان لەگەڵ کەلەپووری ئایینی و تێڕوانینی غەیبانیدا بهێنرێتە ئاراوە، سەلامە موسا و عەبدولرەحمان بەدەوی و محەمەد ئارکۆن و ئەدۆنیس و سادق جەلال عەزم و عەلی وەردی و مەحمود ئەمین ئەلعالیم و جابر عصفور و زۆری تریش، ئەمانە لەو رۆشنبیرانەن هەوڵ بۆ مۆدێرنیزەکردنی فیکری عەرەبی و نوێکردنەوەی کۆمەڵگە عەرەبییەکان دەدەن.

جابر عصفور لە کتێبی (چەند پەراوێزێك لە دەفتەری رۆشنگەریدا) دەڵێت: بوژانەوەی ئەدەبی و فیکری،

بەبێ ئازادیی فیکر و دەرچوون لە تاریکی و چوونە نێو ڕۆشنکردنی ئەقڵ و کردنەوەی دەرگای ئیجتیهاد، نایەتە دی. یەکەم هەنگاوی ڕۆشنگەری بریتییە لە بەدیهێنانی دادپەروەری و ڕەخساندنی ئازادییەکان، ڕۆشنگەری کوڕی سەردەمە و پەیوەندیی بە رابردوو و کەلەپورەوە نییە، چونکە لێرەدا ناکۆکی هەیە لەنێوان مەعریفەی ئایینی و مەعریفەی ئەقلانیدا.

هەندێ لە نووسەرە ئیسلامییەکانی وەك سەید قوتب و محەمەد غەزالی و مستەفا سەباعی جەختیان لە دەلالەتە ئیسلامییەکانی ڕۆشنگەریی عەرەبی کردۆتەوە و هەوڵیان داوە گونجانێك دروست بکەن لە نێوان پێدراوەکانی کولتووری ئیسلامی و پێدراوەکانی فیکری خۆرئاوایی، بەتایبەتی لەلای پێشڕەوانی بوژانەوەی عەرەبیی وەك ئەفغانی و محەمەد عەبدە و دواتریش لەلای عەباس مەحمود عەقاد و ئەمین خولی و مالك بن نەبی و محەمەد عەمارە و عەبدلوەهاب مسیری و تەها عەبدولرەحمان.

### سەرچاوە:

د.میجان الرويلي و د.سعد البازعي، دليل الناقد الادبي، المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء—المغرب، الطبعة الخامسة، ٢٠٠٧.

حسێن عەلی نوزەری
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

# ڕۆشنگەری (سەردەمی عەقڵانیەت)

### 1-زەمینە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکانی پەیدابوونی ڕۆشنگەری:

بزوتنەوەی فیکری لە ئەوروپا لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٧ و سەدەی ١٨دا کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەژێر کاریگەری بیریارانی سەدەی حەڤدەهەمی وەك دیکارت، لۆك، و نیوتن و بیریارانی دیدایە کە بەشێوەیەکی گشتی ئاماژە بۆ بیروڕاکانیان دەکەین. ڕۆشنگەری بزوتنەوەیەکی فیکری و ڕابونێکی کلتوری-کۆمەڵایەتی- سیاسیە کە باوەڕبوون وەك کلیلی سەرەکی زانین، ناسین و پێشکەوتنی مرۆڤ، چەمکی لێکبوردنی دینی و خەبات دژی هەموو جۆرە خوارفەپەرستیەك...هتد، بە تەوەرە سەرەکیەکانی دەژمێرێن. ڕۆشنگەری لەئەڵمانیادا بە بیروڕای نوسەران و فەیلەسوفانی وەك لایب نیتز، کانت، گۆتە، شیلەر و لە فەرەنسا بە بیروڕاکانی ڤۆڵتێر، ژان ژاك ڕۆسۆ، مۆنتیسیکۆ و نوسەرانی ئەنسکلۆپیدیا (دیدرۆ و دالامبێر)دا دەناسرێتەوە. لەکاتێکدا لە بەریتانیادا ئەم بزوتنەوەیە بەشێوەیەکی تایبەتی لە سکۆتلەندادا لەلایەن بکەرانی نوسینی ئەنسکلۆپیدیای بەریتانی و کەسایەتی وەك ئادام سمیس و دیڤید هیومەوە هێنرایە ئاراوە.

دەکرێ بیروڕاکانی ڕۆشنگەری بە بەردەوامی لۆژیکی دەستکەوتەکانی ڕینسانس و بزوتنەوەی ریفۆرم بزانرێت. بۆ نمونە ڕەخنەکانی ڕۆشنگەری لە حکومەت و کەنیسە بووە بە ئیلهامبەخشی بیروڕا شۆڕشگێڕەکان لە فەرەنسا و ویلایەتە یەککگرتوەکان، و بووە هۆی بەهێزبوونی ئەم بیروڕایانە و کاریگەرییەکی قوڵی لەسەر نوسەران و سیاسەتمەدارانی وەك جفرسۆن و پین بەجێهێشت. لەو پێناسە باوەدا کە بۆ ڕۆشنگەری

دەکرێت، بەگشتی بە بزوتنەوەیەکی فیکری دەزانن کە باسی چەمکگەلی پێکەوە گرێدراو و خاوەن پەیوەندی دولایەنەی وەك خودا و عەقڵ، سروشت و مرۆڤ و هاوچەشنەکانی دەکات کە لەناو رۆشنبیرانی ئەوروپای سەدەی حەڤدەهەمدا زۆر باو بوو. رۆشنگەری هێرشی دەکردە سەر شێوەی ژیانی ئەوروپییەکان و بە باوەڕبوون بەوەی عەقڵی تەندروست توانای دۆزینەوە و پێشکەشکردنی زانین و ناسینی سودمەندی بۆ مرۆڤەکان هەیە، دەیویست بە رەخساندنی پانتایی گونجاو بۆ ئازادی، بتوانێت خۆشبەختی و شادی مرۆڤەکان بهێنێتە دی.

دەکرێ سەرچاوەکانی رۆشنگەری لە تەفسیرێکی وردا بگەڕێنینەوە بۆ رۆژگارە دێرینەکان، واتە بۆ کاتێك کە فەیلەسوفە یۆنانیەکان توانیان بوونی رێکخستن و یاساڕێژی لە سروشتدا بدۆزنەوە و بەو دەرئەنجامە گەیشتن کە عەقڵی ئەرگۆمێنتکار، بنەمای باڵادەستە بەسەر سروشتدا، ئەو کاتەی کە بەهاندانی بەردەوامی سوقرات، پێگە و بەهایەکی بەرزیان بۆ مرۆڤ و دەسەڵاتە فیکرییەکانی دانا.

فەیلەسوفان و لقە فەلسەفیە بێ ئەژمارەکان، یۆنانیان بە مەزنێتی و جێگەیەکی درەوشاوە گەیاند، بەڵام ئەم شکۆمەندی و مەزنێتیە هێواش هێواش رووی لە کزی کرد و رۆم وەك میراتگری کلتور و شارستانێتی یۆنان سەریهەڵدا. رۆمیەکانیش هەوڵیاندا ئەم دەستکەوتانە پەرەپێبدەن، بەشێکی زۆر لەو میراتەیان بەدەست لێنەدراو هێشتەوە و بەشێکیشیان بەپێی گونجانی لەگەڵ کلتوری خۆیاندا گۆڕی. بەمشێوەیە دیاردەی ناسراو بە کلتوری یۆنانی-رۆمی دروستبوو، بەڵام بە دەرکەوتنی مەسیحیەت و دەرکەوتنی وەك دەسەڵاتێکی فیکری و باوەڕی بەهێز، هێواش هێواش کلتوری ناوبراو رووی لە لەناوچوون کرد.

مەسیحیەت لە ململانێ لەگەڵ ئەم کلتورە تێکەڵەی یۆنانی-رۆمیدا، سەربەرز هاتە دەرەوە و تا پێش سەدەی چوارهەمی میلادی وەك تاکە دینی پاوانکەری سەرتاسەری ئیمپراتۆریەتی رۆمی لێهات. وەك دەزانین مەسیحیەت لە فەزایەکدا لەدایکبوو کە بە تەواوی لە فەزای فیکری، کلتوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابوری یۆنان و رۆم جیاواز بوو. بەڵام بەشی زۆری ئەوانەی بوون بە مەسیحی، یۆنانی و رۆمی بوون، بەڵام ئامانجەکان و تێزەکانی مەسیحیەت لە کلتور و تێزەکانی شارستانێتی یۆنان و رۆمی دێرین جیاواز بوو. بەشێوەیەك زۆرێك لە مەسیحیە دەمارگیرەکان بڕوایان وابوو کە دەبێ هەموو بەرهەمەکان و نیشانەکانی کفری ئەم دوو شارستانێتیە فڕێبدرێن. لەلایەکی دیەوە بۆ یۆنانی و رۆمیەکان کە تازە ئەم دینە تازەیەیان وەرگرتبوو، پچڕانی پەیوەندی لەگەڵ نەریتە دێرینەکانی باوانی خۆیان زۆر ئەستەم بوو. لەلایەکی دیشەوە بۆ مەسیحیەکانیش ئەدەبیات، کلتور، و هونەر و تێزەکانی شارستانێتی یۆنان و رۆمی دێرین (کە زۆرجار وەك بەرهەمی کفرئامێز ناویان دەهێنا)، بەتەنیا سەرچاوەی نوسراوی هەبوو بۆ تێزە فەلسەفیەکان و کەرەسەی فێرکاری دەژمێرران. لەبەرئەوە مەسیحیەت ناچاربوو بۆ ئەوەی جۆرێك گونجان، گۆڕان و سازشکردنی کلتوری و فیکری دروستبکات، بەڵام لەپاڵ ئەمکارەدا هەوڵیدا سیما کفرئامێزەکان، بەتایبەتی لەبواری ئەخلاقیدا دەربکات و بەشەکانی تریش لەگەڵ دروشمەکانی مەسیحیەتدا بگونجێنێت. لەم ئاراستەیەدا گرنگترین دەستکەوتەکان لەسەدەی سیانزەی میلادیدا بەدەستهات، واتە کاتێك تۆماس ئەکیوناس بە بەدەستگەیشتنی دەستنوسێکی تازەی ئەرستۆ، بنەما فەلسەفیەکانی مەسیحیەتی لەسەر بناغەی بیر و تێزەکانی ئەرستۆ دارشت.

بەڵام جارێکی دی مێژووی گۆڕانە فیکریەکان هێواش هێواش شایەتی جوڵەیە لە لوتکە و مەزنیەوە بەرەو خوارەوە. وتوێژ و پێکدادانە توندە سکۆلائیستیەکان، ئەوەندە زیانی لە پەیکەری بیرە فەلسەفی و کەلامیەکاندا، کە دەستکەوتەکانی تۆماس ئەکیوناس و کەسانی دی وەك سن ئەگۆستین، سن ئەنسلم، سن جرۆم و...بەئاسانی کەوتنە ژێر تیشکی ئەم وتوێژە توند و زیانبەخشەوە. ئەگەرچی بیروڕای فەلسەفی

و کەلامی ئەم بیریارانەش بەشێکی گرنگی ئەم پێکدادانەی پێکدەهێنا و دەستیان لە گەرمکردنی ئەم پێکداداان و وتوێژە توندانەدا هەبوو.

دوابەدوای زیادبوونی وتوێژەکان کە دواتر جیاوازی و پێکدادانی توندتری لەگەڵ خۆیدا هێنا، بەهۆی فشار بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن حوکمڕانانی فەرەنساوە، بارەگای پاپا لەساڵی ١٣٠٩وە گوازرایەوە بۆ ئاوینیون لە فەرەنسا (شتێك کە مەسیحیەکان وەك خوازەیەك بە ناونیشانی سەردەمی «دیلێتی بابلی» ناویان دەبرد، کە ئاماژەیە بۆ دیلکردنی یەهودیەکان بەدەستی فەرمانڕەوای بابل بەخت ئەلنەسر). لەم ناوەدا لە هەمووی گرنگتر (بەدەربڕینی مەسیحیەکان لەهەمووی خراپتر) پەرەسەندن و گەشەکردنی بیرکردنەوە مادیەکان و بڵاوبونەوەی مەیلە دنیاییەکان (مادیەکان) و نادینی بەتایبەتی لە ئیتاڵیا لە سەدەی چواردەهەمی میلادیدا بوو. یەکێك لە دەرئەنجامەکانی ئەم ڕەوتە، دەرکەوتنی نوسەرانێکی وەك پترارك بوو کە دەیانویست دوبارە ئەدەبیات و کلتوری کلاسیك و سەردەمی دێرین بژێننەوە و هەوڵێکی زۆریشیان لەم ئاراستەیەدا دا. یەکێك لە ئامانجەکانی پترارك و پەیڕەوانی لابردنی ئەو بەرگ و لادان و سانسۆرانە بوو کە بەدرێژای چەندین سەدە مەسیحیەکان بەسەر بەرهەمی نوسەرانی سەردەمی دێریندا هێنابویان. ئەمانە (وەك پترارك) کە بە هیومانیست ناودەبران، خوازیاری دۆزینەوەی ڕۆحی کلتور و شارستانێتی یۆنان و ڕۆم بوون، و توانیان بەرهەمی مەزن و پڕ بەها لە بواری ئەدەبیات، هونەر، مێژوونوسی و زانستدا دابهێنن، کە دواجار سەردەمێکی شکۆمەندی لە مێژووی ئەوروپادا دروستکرد.

بەڵام پاش نزیك سەدەیەك ژیانی فیکری و مەعنەوی ئیتاڵیا کەوتە ژێر کاریگەری ئاژاوە و پێکدادانە سیاسیەکان و هیومانیزمیش ناچاربوو بەرەو باکور و کێوەکان ئالپ کۆچبکات، بەڵکو بتوانێت لە وڵاتانی وەك ئەڵمانیا و سویسرا یان لە شوێنەکانی تری ئەوروپادا، لە ئاسایشدا بژی و جێگەیەکی حەوانەوە بدۆزێتەوە. لەم وڵاتە تازەیەدا ئامانجی هیومانیزم خزمەتکردنی دین بوو. ئەم خاڵە بەتایبەتی لەبارەی ئەراسمۆسەوە ڕاست بوو، ئەو دەیویست فەلسەفی مەسیحی کامڵ بکات. ئەراسمۆس خوازیاری گۆڕین و ریفۆرمی زۆر شت و بابەت بوو، بەڵام کاتێك لە ساڵی ١٥١٧دا مارتین لۆسەر ئاڵای ڕاپەڕینی هەڵکرد، ئەراسمۆس لە ترسا کشایە دواوە.

لۆسەر بە هەنگاوی توند و ڕادیکاڵی خۆی زۆر زیاتر لەوەی چاوەڕێی دەکرد، تورەیی و ناڕەزایی گشتی وروژاند. سەدەیەك دوای ئەوە کەنیسەی جیهانی کاسۆلیکی ئەوروپا، توشی لەناوچوون و داڕمان بوو. پرۆتستانتەکان پشتیان بە بایەخ و دەسەڵاتی کتێبی پیرۆز دەبەست، و کاسۆلیکەکانیش بڕوایان بە دەسەڵات و بایەخی کەنیسەی ڕێکخراو و ڕێکخستنەکانی هەبوو. شورای ترنت (٦٣-١٥٤٥) دەرگای دانوستان و وتوێژی سودمەند و دروستکەری نێوان ئەم دوو مەزهەبەی داخست. جگە لەمەش ڕەوتی ریفۆرم یان چاکسازی دینی کێشە و گرفتی تایبەتی خۆی بەرهەمهێنا، وتوێژی زۆریش لەبارەی ڕێگە چارەسەری ئەم کێشانەوە، بۆتە هۆی بگرە و بێنە و قسەو باسێکی زۆر. لە سەدەی حەڤدەهەم لە ئەوروپادا ڕوبەڕوی کۆمەڵگایەکی یەك فیکر و تەبا نابینەوە. ڕێنسانس بەدرێژای دوو سەدە، لە سەدەی چوارادەهەمەوە تا سەدەی شانزەهەم بە دەستپێکردن لە ئیتاڵیا و بڵاوبونەوەی لە سەرتاسەری ئەوروپادا، بووە هۆی بڵاوبونەوەی ڕەوتی هەمەڕەنگ و جیاوازی فەلسەفاندنی یۆنانیەکان، و قوتابخانەی ئەفلاتۆنی، ڕەواقیەکان و قوتابخانەی ئەپیکۆریانیزم هەریەکێکیان هەوڵیاندەدا لایەنگر و پەیڕەوان بۆ خۆیان زیادبکەن، و لەم ڕێگەیشدا کەوتنە ململانێ لەگەڵ یەکدیدا. کاسۆلیکەکان و پرۆتستانتەکانیش هەریەکەیان بەدوای هەڵوێست و بیروڕا تایبەتیەکانی خۆیاندا دەچوون.

بڕیاری ڕێنسانس دروستکردن و پاراستنی تێکەڵە و پێکهاتەیەك بوو لەنێوان بەرهەمە ئەدەبیە

کلاسیکیەکان و باوەڕی مەسیحی، بەڵام وردەکاریەکانی روداوەکانی دوایی، ئەم ئۆمێدەیان لەناوبرد. پێویستی بە ئامێرەکانی پەیوەندی، بووە هۆی ئەوەی تاکەکان بگەڕێنەوە بۆ تێڕوانینەکانی کلاسیك، ئەو تێڕوانینانەی کە هەمیشە ناکۆك نەبوون بە مەسیحیەت، بەڵام لەهەمانکاتدا بە سەربەخۆ لەو دەژمێرران. یەکێك لە گرنگترین ئەو حاڵاتانەی کە لەم ئاراستەیەدا سەرنجی زیهنی ئەوروپیەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، دیدی رەواقیەکان بوو. هۆگۆ گرۆسێۆس (١٦٤٥ - ١٥٨٣) یاساناس و لێکۆڵەرەوەو هیومانیستی بەرجەستەی هۆڵەندی، هەنگاوی سەرەکی لەم بوارەدا نابوو. گرۆسیۆس لە ساڵی ١٦٢٥ لە کتێبی «یاساکانی جەنگ و ئاشتی» یاسا یان مافە سروشتیەکان وەك رێسای سەرەکی باڵادەست بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا پێناس دەکات. تا دوو هەزار ساڵ بوو کە کەس نکوڵی لە مافە سروشتیەکان نەکردبوو، بەڵام لە جەختکردنی گرۆسیۆسدا بۆ باڵاتربوونی مافە سروشتیەکان و سەربەخۆبونیان لە ئیلاهیاتی مەسیحی، تایبەتمەندی و گرنگیەکی تازە دەردەکەوێت. بە گوتەی گرۆسیۆس کە خۆی مەسیحیەکی باوەڕدار و بەوەفا بوو، ئەم مافانە هێندە سەقامگیر و نەگۆڕن کە تەنانەت خوداوەندیش ناتوانێت بیانگۆڕێت. دیارە کتێبەکەی بە یەکەم بەرهەمی نوسراو لە بواری یاسا نێو نەتەوەییەکاندا دەژمێرێت. گرۆسیۆس لەم کتێبەدا بە پشتبەستن بە کتێبی پیرۆز و مێژووی کلاسیك، رایدەگەیەنێت مافە سروشتیەکان رێسای رەفتار و کرداری نەتەوەکان و هەروەها تاکەکان دیاری دەکات. گرۆسیۆس لەکاتێکدا بەشێوەیەکی هەمەکی جەنگ رەدناکاتەوە، بەڵام بڕوای وابوو تەنها هۆکار و بەڵگەی دیاریکراو بۆ پاساوهێنانەوە و بەرگریکردن لە جەنگ هەیە. هەر لەبەر ئەمەش سەرنجی خۆی ئاراستەی جەنگی دادپەروەرانەتر و مرۆڤانەتر کرد.

### 2-زەمینە عەقڵانی و ئەزمونگەریەکانی پەیدابوونی رۆشنگەری، شۆڕشی زانستی:

روداوێکی گرنگی دیش کە لەم رەوتەدا رووی دا، پەیدابوونی چوارچێوەیەك یان قاڵبێکی بیرکردنەوەی تازەیە کە دەرۆیشت بۆئەوەی کاریگەری، دەرئەنجام و دەستکەوتی گرنگ بەجێبهێڵێت. ئەم چوارچێوەیە هیچ نەبوو جگە لە دەستپێکردن یان دەرکەوتنی زانستی تازە، لقێك یان باسێك کە زۆری پێنەچوو دژایەتیەکانی خۆی لەگەڵ باسە دینی و وەهمە یۆنانی و رۆمیەکاندا ئاشکرا کرد.

#### ا/ بیکۆن و دیکارت:

یەکێك لە گەورەترین پێشڕەوانی ئەم روداوە فکرییە فرەنسیس بیکۆن بوو، کە بە وێنەکێشانی دەوڵەمەندی ژیانی مرۆڤ لە رێگەی دۆزینەوەی تازەوە، بووە هۆی وروژاندنی هێزی خەیاڵی نەوەکانی دوایی. بیکۆن بە چەند گومانێك لە ماتماتیك کە لە حاڵەتی هەڵکشان و هەنگاونانی بنەڕەتیدا بوو، شێوازێکی ئیستقرائی گشتگیری پێشکەش کرد. لە بەرامبەر ئەمەدا رینێ دیکارتی فەیلەسوف و ماتماتیکناسی فەرەنسی بە فرێدانی هەموو شتێك لە زیهنی خۆی، جگە لەو بیرۆکە سادانەی کە راستبوونیان بێگومان و نکوڵی لێنەکراوە، هەوڵی دا بە شێوازی قیاسی دەستبکات بە دارشتن و وێنەکێشانی هەمەکی سیستەمی فەلسەفی خۆی. سەرەڕای ئەو جیاوازی و دورییەی لەنێوان ئەم دوو میتۆدەدا هەبوو، بەڵام بیکۆن و دیکارت لە ئامانجی سەرەکی و رەوتی کۆتاییدا هاوڕابوون. هەردوو فەیلەسوف دژی ئەو شتە بوون کە بە رابوردوو زیانبەخشیان دەزانی. هەردوکیان بیریان لە چاککردنی هەلومەرج و چارەنوسی مرۆڤ دەکردەوە و ئەمەشیان بە ئەرکی زانست دەزانی. هەر دوو فەیلەسوف زانستیان لە ئیلاهیات و باسە دینیەکان جیاکردبۆوە. هەردوکیشیان جەختیان لەسەر پێویستی ئەزمونی پراکتیکی و تاقیکردنەوەی بابەتی دەکرد.

**ب/ گالیلۆ:**

شانازی پێشڕەوی بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ گالیلۆی زانا و حەکیمی ئیتاڵی. گالیلۆ بە پشتبەستن بەو قسە کۆنەی کە خودا دوو کتێبی بۆ ڕێنمایی مرۆڤ ناردووە، یەکەمیان کتێبی پیرۆز و دووهەمیان کتێبی سروشت. بەتوندیش جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە زمانی کتێبی سروشت، ماتماتیکیە. گالیلۆ بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆی دنیای سروشتی جێی تێبینی خۆی، وەك کۆمەڵێك خەسڵەت و چونایەتی کە لەرووی ماتماتیکیەوە قابیلی تاوتوێکردن و شیکردنەوەن، تەماشا دەکرد. بەبڕوای گالیلۆ خەسڵەتی وەك کشان و جوڵە، لەو ڕووەوە کە دەکرێت بە زمانی ماتماتیکی تاوتوێ و شی بکرێنەوە، لێرەوە دەکرێت ئەم خەسڵەتانە لە چوارچێوەی یاساگەلێکی وردی سروشتیدا وەسف بکرێن و شیبکرێنەوە. گالیلۆ میتۆدی لێکۆڵینەوەکەی خۆی بەشێوەیەکی ناسك، بە دارشتنی یاسای کەوتنە خوارەوەی تەنەکان و بە یارمەتی شیکردنەوەی گریمانەکان بەپێی ڕێسا ماتماتیکی و تاوتوێکردنیان لەڕێگەی ئەزمون و تاقیکردنەوەوە، سەلماند.

ڕەنگە ئەگەری ناسین یان پەیبردن و گەیشتن بەم دەستکەوتانە بەئەندازەی پێویست بۆ هەموان هەبوایە، بەلام سەرکەوتنێکی دی چاوەڕێی گالیلۆی دەکرد. گالیلۆ وەك خاڵی دەست پێکردنێك بۆ گەیشتن بەم سەرکەوتنە بەرهەمەکانی ئەستێرەناسان و لیژنەی زانایانی وەك نیکۆلای کۆپرنیکۆس، تیکو براهێ، و یۆهانس کپلەری لەبەردەستدا بوو. لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانی ئەم زانایانە زیانێکی جدیان بە پەیکەری قوتابخانەی بەتلیمۆسی گەیاندبوو، کە بەپێی ئەم زانستە جیهانی بوون بەدەوری گۆی زەویدا دەخولێتەوە. بەلام زانایانی ناوبراو ئەگەرچی قوتابخانەی بەتلیمۆسیان خستبووە ژێر پرسیارەوە، بەلام گەلێك کاردانەوەی دەروونی وروژاندبوو، لەپاڵیشیدا گەلێك پرسیاری بنەڕەتیان بەبێ وەلام بەجێهێشتبوو. پاش ئەوەی گالیلۆ هەواڵی داهێنانێکی نوێی بەناوی تلسکۆپەوە بیست، دەستیکرد بە دروستکردنی تلسکۆپێك بۆ خۆی. بەدرێژای چەند شەوێك کە گالیلۆ بەهۆی تەلسکۆپەوە تەماشای ئاسمانی دەکرد، کۆمەڵێکی زۆری لە هەسارەکان و نەگۆڕەکانی بەچاوی خۆی بینی کە سەلمێنەری تێڕوانینەکانی کۆپرنیکۆس بوو کە پێیوابوو زەوی و هەندێك هەسارەیدا بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە، خاڵێك کە بۆ هەموان سەلمێنرا، جگە لە کۆمەڵێك کورتبین و دۆگمایی کە لایەنگری سیستەمی کۆن و قوتابخانەی بەتلیمۆسی بوون.

لەگەڵ بێبایەخبوونی قوتابخانەی بتلیمۆسیدا، سەرجەم فەلسەفەی سروشتی ئەرستۆیش بایەخی خۆی لەدەستدا و چیدی قابیلی بەرگریکردن نەبوو. گالیلۆ لە ساڵی ١٦٣٢دا کتێبێکی بۆ ڕەتکردنەوەی زانستی تازە لە بواری گەردونناسی، ئەستێرەکان و ڕەتکردنەوەی قوتابخانەی بەتلیمۆسی نوسی و پێشکەش بە پاپای کرد. بەلام ئەم هەنگاوە دڵسۆزانە و ڕێزگرتنە نەك هەر سودی بۆی نەبوو، بەڵکو بۆ دادگای پشکنینی بیروڕا بانگکرا. تاکو لەوێ لە بەرامبەر کۆمەڵێك پایەوپلەی ڕۆحانی وشك و دۆگمادا لەگەڵ داوای لێبوردن و تۆبەکردن لە ڕاگەیاندنی بیروڕا کفرئامێزەکانی، لە قسەکانی خۆی لەبارەی گەرانی زەمین و هەسارەکان بەدەوری خۆردا پەشیمان بێتەوە. بەلام گرنگی ئەم دادگا و دادگایکردنەی گالیلۆ لەو ڕووەوە بوو کە میتۆدە زانستیە تازەکەی گالیلۆ و ئەو بیرکردنەوە زانستیە تازەیەی پێشکەشی کردبوو، زۆر فراوانتر و بلاوتر لە سنوری میتۆدە بۆماوەیەکان و دێرینەکان ڕۆیشتبوو، وە چیدی ئەگەری کونترۆڵکردنی نەبوو. لەم ناوەدا تەنها کارێك کە کەنیسە دەیتوانی ئەنجامی بدات، پشتبەستن بوو بە تۆقاندن، ترس و دەرکرن و تەکفیرکردن.

## ج/ نیوتن:

کێشەیەکی دی هێشتا بە چارەسەرنەکراوی مابۆوە، پێویستی بیناکردن «سیستەمێکی گشتی میکانیک» بووی، کە بتوانێت بەشێوەیەکی گونجاو و ورد جوڵەی ئەستێرەکان بە زمانی رەفتاری بابەتی و هەستپێکراوی پەیوەندیدار بە جوڵەی مادە لە زەمیندا، ئاراستە و روون بکاتەوە. ژمارەیەکی زۆری لە زانایان لەم بوارەدا کاریان کردووە، بەڵام ئەوە ئیسحاق نیوتن بوو شانازی سەرکەوتنی لەم بوارەدا بەدەستهێنا. لە ساڵی ١٦٧٨دا ئەنجومەنی سەڵتەنەتی لەژێر چاودێری سامۆئیل پیپزدا، دەستیکرد بە چاپو بڵاوکردنەوەی کتێبی «بنەما ماتماتیکیەکانی فەلسەفەی سروشت» کە بەرهەمی نیوتنە. نیوتن لەم کتێبەدا بە پشبەستن بە بەڵگەی بەهێز و ماتماتیکی، یاسای راکێشانی گشتی پێشکەش کرد.

نیوتن بەخاکیبونەوە دان بەوەدا دەنێت کە پێشتر نەیدەزانی راکێشان چیە، تەنانەت کاتێك دەیگوت حسابکردنەکانی بوونی هەندێك نارێکی دەردەخات و راستکردنەوەیان پێویستی بە دەستێوەردانی راستەوخۆی خودا بوو، ئەوا لەرووی باوەڕ و پاکی دڵەوە ئەم قسانەی دەکرد. دیاری فەیلەسوف و زانای ئەڵمانی هاوچەرخی نیوتن، واتە گاتفرید ویلهلام لایبنیتیس کە لەبارەی لەپێشبوونی زەمانی داهێنانی حسابەوە لەگەڵ نیوتندا کێشەی هەبوو، بەتوندی رەخنە و هێرشی کردە سەر نیوتن لەو رووەوە کە خودای تا ئاستی کاتژێرسازێکی ئاسایی دابەزاندووە. بەڵام هیچ کەس سەرنجی لەم مەسەلە بچوکە ناگرنگانە نەدەدا. نیوتن دەستیکردبوو بە رونکردنەوە و شیکردنەوەی جیهان و عەقڵنیەتی سروشتی سەلماند، نیوتن وەك ڤۆڵتێر دەیگوت گەورەترین مرۆڤێك بوو کە تا هەنوکە جیهان بەخۆیەوە بینیویەتی. لەپاڵ ئەم حەماسەتە زۆرەدا بۆ نیوتن و بۆ فەلسەفەی سروشت، هێشتا مەسەلەیەکی جدی هەر مابۆوە. لێشاوی گشتگیری دۆزینەوەکان لە فیزیادا، بووە هۆی جوڵەیەك بەرەو سەربەخۆیی و بێلایەنی بەهایی و ئەخلاقی زانست. بەڵام رۆحی زەمانە نەیدەتوانی قبوڵی بکات زانست، ئەم ئامێرە کاریگەر و بەهێز و پڕبەرهەمە تازەیە، خۆی لە شانۆی ژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسی و بیرکردنەوە دور بگرێت. زانست گرنگترین ئامێری ناسین بوو کە تا هەنوکە مرۆڤ بەدەستی هێناوە. لێرەوە چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرا لەبارەی هەموو دیاردەکان و ئەو بابەتانەی کە پەیوەندی بە بوارە جیاوازەکانی ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە هەیە (بوارەکانی وەك ئەخلاق، سیاسەت، کۆمەڵگا، دین، ئابوری، کلتور، ئەدەبیات، هونەر، پەیوەندی خێزانی، پەیوەندی مرۆڤەکان بەیەکدیەوە، وتەزاگەلی وەك ئازادی، دەسەڵاتو...) رای خۆی هەبێت و لەرووی بەهاییەوە هەڵیانسەنگێنێت.

بەمشێوەیە یەکێك لەدەستکەوتەکانی زانست، لەناوبردن و دورخستنەوەی قەبارەیەکی زۆری هەڵەکانی سەدەکانی ناوەراست بوو. لەپاڵ ئەمەدا بڵاوکردنەوە و رەواجپێدانی ئەو بڕوایە بوو کە میتۆدە زانستیەکان و بەڵگاندنە عەقڵانیەکانی زانست، و هەروەها ئەو ئامێر و تەکنیکانەی لە زانستەوە بەدەست دێن، بۆ هەموو بوارەکان بەکاربهێنرێت، شتێك کە دواتر لەو زانستگەرییەوە (SCIENTISM) سەری دەرهێنا.

ئەوەی کە تائێستا باسمان کرد رونکردنەوەیەك بوو لەبارەی زەمینە مێژووییەکانی پەیدابوونی دیاردەیەکی گرنگ و کاریگەر کە دواتر بە رۆشنگەری ناسرا. لەم کورتەیەدا پاش باسکردنی سەرچاوەی زەمینە مێژووییەکانی رۆشنگەری لای فەیلەسوفانی یۆنانی دێرین و پاشان بە سەیرکردنێکی گشتی بۆ سەرەتای مەسیحیەت و پەیوەندی قوتابخانەی بەتلیمۆسی بە کەنیسەوە، بە بزوتنەوەی ریفۆرم گەیشتین. لە درێژەی ئەمەشدا بەشێوەیەکی خێرا ئاماژەمان بۆ پێشرەوانی شۆڕشی زانستیو دیدی کەسانێکی وەك بیکۆن، دیکارت، گالیلۆ و نیوتن کرد. هەنوکە پاش ئەم سەیرکردنە گشتیە، کاتی ئەوە هاتووە باسەکەمان کۆبکەینەوە....

گەرچی نیوتن و جۆن لۆك سەر بە سەدەی حەڤدەهەمی میلادین، بەڵام بە بڕوای زۆرێك لە تیورەسازان، ئەم دوو فەیلەسوفە بە باوکانی راستەقینەی رۆشنگەری دادەنێن. نیوتن وەك لە رونکردنەوەی بیرەکانیدا بینیمان، بە دەربڕینێك دوا بلیمەتی زانستی سەردەمی خۆی بوو، بەرهەمە گرنگەکەشی، واتە کتێبی «بنەما و بناغە ماتماتیکیەکانی فەلسەفەی سروشت» کە لە ساڵی ١٦٧٨ لەلایەن ئەنجومەنی سەڵتەنەتی ئینگلتەراوە بڵاوکرابۆوە، لەڕاستیدا لوتکەی پەرەسەندنی بزوتنەوەیەك بوو کە پێشتر بە کۆپرنیکۆس و گالیلۆ دەستی پێکردبوو. دەکرێت دەستکەوتەکەی نیوتن بە یەکەم سەنتزی فیزیایی یان مادی دەزانرێت کە پشتی بەکارهێنانی وردی ماتماتیك لە سروشتدا بەستبوو. بیری دەسەڵات و سەربەخۆی عەقڵ کە بەسەر کۆی رەوتی فەلسەفی سەدەی هەژدەدا فەرمانڕەوا بوو، لەڕاستیدا بە یەکێك لە دەرئەنجامە گرنگەکانی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەکانی نیوتن دەژمێرێت.

کۆپۆنیکۆس، کپلەر، بیکۆن، تیکوبراهێ، دیکارت، گالیلۆ و نیوتن –زانایان و شێوازناسانی زانست- وەك کەسانێك کاریان کرد کە بە سوربونەوە هەوڵیان دەدا سروشت ناچاربکەن نهێنیە دێرینەکانی خۆی کە لە سەرەتای خڵقەتەوە تا هەنوکە بۆ مرۆڤ نەناسراو بووە، ئاشکرا بکات. بەمشێوەیە بوو کە تامەزرۆیەکی مەزن لە هەموو بیریارانی سەدەی هەژدەدا لە لۆکەوە تا کانت بۆ عەقڵ و بەکارهێنانەکانی پەیدابوو. ئەم تامەزرۆییە تازەیە بۆ عەقڵ کە لە هەموو ئەم بیریارانەدا دەبینرێت، تەنها پشتی بە بیروڕاکانی دیکارت و لایب نیتز نەبەستبوو، بەڵکو بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر ئەو بڕوایە دامەزرابوو کە عەقڵ بۆ داگیرکردن و زاڵبوونی فکری بەسەر دنیای سروشتیدا، هاتۆتە مەیدانەوە.

### 3-ئەزمونگەری کلاسیکی ئینگلیزی و پەیامە سەرەکیەکەی:

تا سەدەی هەژدە دوو کێشەی سەرەکی فەلسەفی بە چارەسەرنەکراوی مابونەوە: یەکەم) لێکۆڵینەوە و گەڕان بۆ دۆزینەوەی خاڵی دەرچوونی سەرەکی عەقڵ کە سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەستهێنابوو. دوهەم) جێگۆڕکێ یا گواستنەوەی بابەتەکانی بەکارهێنانی عەقڵ لە سروشتی دەرەکیەوە بۆ مرۆڤ. کتێبەکەی جۆن لۆك، واتە «وتارێك لەبارەی تێگەیشتنی مرۆڤ»ەوە (١٦٩٠) لەڕاستیدا پشکنین و لێکۆڵینەوەیەك بوو لەبارەی کێشەی یەکەمەوە. وتارەکەی دیڤید هیومیش بەناوی «وتارێك لەبارەی سروشتی مرۆڤەوە» (٤٠-١٧٣٩) کە هەوڵێك بوو بۆ بەکارهێنانی بەڵگاندنی ئەزمونگەریانە لە مەسەلە ئەخلاقی و مەعنەویەکاندا، بۆ لێکۆڵینەوە و تاوتوێکردنی کێشەی دووهەم تەرخانکرابوو.

ئەم دوو وتارە سەرەکیە ئاشکراکەری ئاراستەی جوڵەیەکە کە لە کۆتاییەکانی قۆناغی رێنسانسدا لە بیرکردنەوەی فەلسەفی جیهانی رۆژئاوادا پەیدا بوو. کەڵکەڵەی سەرەکی قۆناغی رێنسانس سەبارەت بە دنیای سروشتی، دەربڕی جۆرێك ئاراستەگیری و دەمارگیری «واقیعگەرایانە»بوو. تۆماس هۆبز و باروخ سپینۆزا هەر کامیان میتافیزیکی تایبەت بەخۆیان داڕشت و پێشکەش کرد. هەردوکیان بەتایبەتی تێبینی بونیادی واقعی دنیای مادیان کرد. لەلایەکی دیەوە پارێزگاری رێنسانس لە ماتماتیك بەتایبەتی بووە هۆی ئەوەی بنەما عەقڵانی و ئایدیاکانی ناو فەلسەفەی لایب نیتز و دیکارت، سەرنجەکان رابکێشێت. لەلایەکی دیەوە رۆشنگەری لە سورانەوەی لە سروشتەوە بەرەو هەڵسەنگاندنی بونیادی زیهن یان عەقڵ کە بەدروستی دەیناسی، و هەوڵدان بۆ هەڵسەنگاندنی پێویستیەکانی ئەم زیهنە، جەختی لەسەر رەگەزە هەستیەکانی ناسین دەکرد تا لەسەر بنەماو رێسا ماتماتیکیەکان. لێرەوە قوتابخانەی ناسراو بە ئەزمونگەری ئینگلیزی (جۆن لۆك، جۆرج بارکلی و دەیڤید هیوم) تا سەردەمی کانت، پانتایی فەلسەفەی رۆشنگەریان لەژێر کۆنترۆڵدا

بوو. ئەم قوتابخانەیە زۆرتر بەپێی بیروڕاکان و لەبەرچاوگرتنی ئایدیا سەرەکییەکان، رووی لە فەلسەفاندن کرد. نە لەسەر بناغەی شتەکان و لە چوارچێوەی ئەزموندا کەوتە داڕشتنی بنەما فەلسەفییەکانی، نە لەسەر بناغەی بنەما زەروریە زاتیەکان. لەکاتێکدا فەلسەفەی سەردەمی رێنسانس لە کۆتاییەکاندا فەلسەفەیەکی میتافیزیکی و عەقڵگەر بوو، ئەوا فەلسەفەی سەردەمی رۆشنگەری فەلسەفەی ئەبستمۆلۆژی و ئەزمونگەری بوو.

## ٤-سەرچاوە و ماهیەتی عەقڵ لای لۆك و باركلی

### ا/ جۆن لۆك:

کتێبەکەی جۆن لۆك بە ناونیشانی «وتارێك لەبارەی تێگەیشتنی مرۆڤ» ئاشکراکەری ئاراستەوەرگرتنێکی تازە بوو لە فەلسەفەی مۆدێرندا، چونکە شتێکی هێنایە ئاراوە کە بووە هۆی پەیدابوونی پێوەرێکی تازە بۆ دۆزینەوەی هەقیقەت یان ناسینی هەقیقەت. نەخشەی سەرەکی کتێبەکەی یان وتارەکەی لۆك بریتی بوو لە «لێکۆڵینەوە لەبارەی خاڵی دەرچوون، و بڕاوەیی و پانتایی ناسینی مرۆڤ» بوو کە لەسەر بناغەی سێ ئەرك یان پەیام راوەستابوو:

ئەلف) دۆزینەوەی خاڵی دەرچونی بیرورا و باوەڕەکانی مرۆڤ.

ب) پیشاندانی ڕادەی بڕاوەیی و بەهای بیروڕاکانی مرۆڤ یان پێگەی ستاندارد‌ی بیروڕاکانی مرۆڤ: ئەوەی تا چ ئەندازەیەك دەکرێ بیروڕاکانی مرۆڤ وەك پێوەرێکی ناسین تەماشا بکەین، و ڕادەی بڕاوەیەتیان (واتە دڵنیابوون لەم بیروڕایانە) تا چ ئەندازەیەکە.

ج) لێکۆڵینەوەی بانگەشەکانی هەموو جۆرێکی ناسین کە کەمترە لە ئاستی یەقین. بەڵام ئەوەی بەلای لۆکەوە گرنگ بوو، ئەو خاڵە بوو کە پەیامی دوهەم  پشتی بە پەیامی یەکەم بەستبوو. لۆك بە پەیرەوی کردنی نەریتی رێنسانس، هەموو بیرۆکە یان بڕوایەکی بە ناوەڕۆکێکی زیهنی یان عەقڵی دەزانی، بەمانای ئەوەی «هەر شتێك کاتێك مرۆڤ بیری لێدەکاتەوە، دەبێتە بابەتی تێگەیشتنی». بەڵام لەکاتێکدا لە دیدی دیکارت و کۆی قوتابخانەی عەقڵگەرییەوە بڕاوەیی (قەتعی بوونی) بیروڕاکان دەگەڕایەوە بۆ بەدیهی بونیان —واتە بۆ روونی، ئاشکرای، و راشکاوی و دیاربونیان- ئەوا بەبڕوای لۆك بایەخ و بڕاوەیی بیروڕاکان، بە ڕاشکاوی بەسترابوو بە شێوە و جۆری خاڵی دەرچونیانەوە.

پێوەری راستگۆیی و بایەخی پێکهاتەیی، جێگەی راستگۆیی و بایەخی زاتی گرتەوە.

دەکرێت لێکۆڵینەوە دورودرێژەکانی لۆك لەبارەی ناوەڕۆکی زیهنیەوە، لە حاڵەتی داڕشتن و مامەڵەیەکی تازەدا سودمەند بێت. گەرچی لۆك جیاوازی لەنێوان بیرورا هەستیەکان (حسییەکان) و بیرورا ئەندێشەییەکان (تەئەمولیەکان)دا دەکات، بەڵام کۆی هەوڵی خۆی و پەیڕەوانی ئەزمونگەری لۆك، بریتی بوو لە کورتکردنەوەی بیرورا ئەندێشەییەکان بۆ بیرورا هەستیەکان و تا ئەوپەڕی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی داهێنەرانەی زیهن، لەبەرامبەر توانای بەرکارانەی زیهن لەبەردەم کارتێکردن و کاریگەرییە هەستیەکانی لە دەرەوە وەردەگیرێن.

پۆلێنکردنی بیروباوەڕەکان بەهۆی لۆکەوە بەسەر سادە و ئاڵۆزدا، هەوڵێك بوو بۆ جیاکردنەوەی ناوەرۆکە زیهنیە سادەکانی وەك شین بوون،  یان رەقی کە دەرئەنجامی یەك هەستی دیارکراون وەك بۆن یان لامیسە، بابەتی وەك ژمارە، فەزا، وێنە، داکشان، پشودان و جوڵە کە بەرهەمی پێکهاتەیی چەند هەستێکن لەلایەکەوە، لە ناوەڕۆکە زیهنیە ئاڵۆز و پێکهاتەییەکان (بیروباوەڕە ئاڵۆز و پێکهاتەییەکان) لەبارەی هەمەکیەکان و

هەندێك بابەتی گشتی وەك سێگۆشە، یان قەدەرناسی و چارەنوس، یان سەبارەت بە خود و جەوهەرەکان، یان سەبارەت بە پەیوەندی وەك شوناس، ناسینەوە، هەمەرەنگی، پەرشوبڵاوی، هۆ و هۆکار، لەلایەکی دیەوە.

پەیامی «وتارێك لەبارەی تێگەیشتنی مرۆڤ»ی لۆك هەوڵێك بوو بۆ دروستکردنی جیهانی هەمەکی ئەزمونی تێگەیشتنی مرۆڤ، لە ناوجەرگەی کۆمەڵێك رێگری هەستیی سەرەتایی، کە بەردەوام لە هەستەوە بۆ فیکر و لە سادەوە بۆ ئاڵۆز لەجوڵەدایە. لێرەوە دەرئەنجامەکانی ئەبستمۆلۆژیای لۆك بریتیە لە:

١/سەرچاوەی غائیی باوەڕ و بیروراکانی مرۆڤ، هەستە.

٢/سەرجەم کارکردن و چالاکیە زیهنیەکان، پێکهاتە و کۆمەڵەیەك کەرەسەی هەستی سادەن بۆ ئامێرەکانی چەمکێکی ئاڵۆز.

ئەم ئەبستمۆلۆژیایە لەسەر بناغەی جۆرێك ئۆتۆمیزمی هەستی دامەزرابوو، کە زیهن وەك هۆکارێکی دۆزینەوە دەبینێت تا داهێنان، باوەڕە زیهنیەکانیش بە شتگەلێك دەزانێت کە سەرچاوەی ئەو هەستانەن کە وەریدەگرێت. بەڵام پێدەچێت لە نێوان «چۆنایەتیە سەرەتاییەکان» وەك تەنێتی، داکشان، ئەندازە، بەردەوامی، جوڵە و لەم بابەتە شتانە کە خەسڵەتی سەرەکی یان واقعی شتەکانن، و «چۆنایەتیە لاوەکیەکان» وەك رەنگ، تام، بۆن و لەم بابەتە شتانە کە تەنها دەرئەنجامی دەرونی چۆنێتی کاریگەر وەرگرتنی زیهنن لەم شتانە، جیاکارییەکی گرنگ بکرێت. ئەم جیاکارییە گرنگەی لۆك (کە پێش ئەمەش لە تیورەکەی گالیلۆدا هەبوو) لە تیورەی ناسینی مادەکانی نیوتن کە هاوچەرخی تیورەکەی لۆك بوو، بە شێوەیەکی گشتی و تێپەڕ ئاشکرا کرابوو.

## ب/ جۆرج بارکلی ( 1675 - 1753 ):

ئەسقەفی کەنیسەی ئنگلیکان جێگری لۆك، بە وردی دەیویست بەسەر ئەم جیاکارییە دوالیزمیەدا کە لەلایەن زانستی ئەو سەردەمەوە بە گریمانە وەرگیرابوو، لەنێوان چۆنایەتیە سەرەتاییەکان کە سەر بە مادەن و چۆنایەتیە لاوەکیەکان کە بەستراون بە زیهنەوە زاڵ بێت. گەرچی بارکلی ئەسقەفی کەنیسەی ئنگلیکان بوو و لایەنگرانی خوازیاری ململانێ دژی «ماتریالیزمی بێدین» و بەهێزکردن و پاراستنی دەسەڵاتی خودا و مەعنەویەت بوون. بەڵام گرنگی بارکلی بۆ تیورەی ناسین بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوازەی کە تیایدا دەریخست دواجار چۆنایەتییە سەرەتاییەکان، قابیلی ئەوەن بگۆڕێن بۆ چۆنایەتی لاوەکی. ئەزمونگەری بارکلی دواجار بە نکوڵیکردن لە بیرورا ئەبستراکتەکان گەیشت. چونکە بڕوای وابوو وێنا گشتی و هەمەکیەکان، تەنها خەیاڵ و ئەفسانە یان دۆزراوەکانی زیهنن. بارکلی هەروەها ئەو ئەگەرەی بەتوندی رەت دەکردەوە کە بتوانرێ جیاوازی لەنێوان شتەکان و ئەو کاریگەرییە هەستیانەی لە زیهندا دروست دەبێت، بکرێت. بارکلی بڕوای وابوو دەکرێ بە ئاسانی واز لە چەمکی مادە بهێنرێت: سروشت شتێکە مرۆڤەکان بەهۆی هەستەکانی خۆیانەوە وەری دەگرن، ئەمەش بەو مانایەیە، دەکرێ زانیاری و دۆزراوە حسیەکان بە «شتگەلێك، یان بابەتەکانی سەر بە زیهن» بزانین، نەك چۆنایەتیەکی هەبوو لەناو مادە یان تەنێکدا. هەر شتێك کۆمەڵێك دوبارەبونەوەی چۆنایەتیە هەستیەکانە. بەم کورتکردنەوەی مادە بۆ چۆنایەتی، کە خۆی لەخۆیدا بە کورتکردنەوەیەکی زۆر گرنگ دەژمێرێت، دەکرێ بارکلی بە باوکی راستەقینەی هەڵوێستی ئەبستمۆلۆژیایەك بزانرێت کە بە دیاردەناسی یان فینۆمۆلۆژیا، بەناوبانگە. قوتابخانەیەك کە تا هەنوکەش لە زۆرێك لە وڵاتەکانی رۆژئاوائادا وەك روداوێکی کاریگەر لە فەلسەفەدا ماوەتەوە، لەوانە لە فەرەنسەی دەیەکانی ١٩٦٠تا ١٩٨٠، و لە فەلسفەی ئینگلیزیدا.

## 5-زانستە مرۆییەکان لە دیدی هیومەوە:

سێهەمین و لە هەندێك رووەوە بەناوبانگترین فەیلەسوفی ئەزمونگەری ئینگلیزی، دەیڤید هیوم (٧٦-١٧١١) بوو. نیەتی فەلسەفی هیوم بریتی بوو لە سودوەرگرتن لە بەرهەمەکانی فیزیای نیوتن و بەکارهێنانی میتۆدی زانستە سروشتیەکان بۆ (لێکۆڵینەوە لە) سروشت و ماهیەتی مرۆڤ، و بناغەدانان و دارشتنی زانستێکی بنەرەتی لەبارەی مرۆڤەوە. بەڵام دەرئەنجامی پارادۆکسیانەی ئەم ئامانجە مەزنە، دەرکەوتنی جۆرێك قەیرانی گومانکاری بوو کە چەندان جار لە قەیرانی گومانکاری لە قۆناغە سەرەتاییەکانی رێنسانس لە فەرەنسادا زیانبەخشتر بوو. دەرئەنجامێکی تری ئەمەش دارمانی دوبارەی متمانە و دڵنیایی مرۆڤ بوو بە هەلومەرجێك کە پێش دیکارت بە لوتکەی دۆگماییانەی خۆی گەیشتبوو.

هیوم لە روبەروبونەوەی کێشەی ناسیندا لە دیدێکی سایکۆلۆژییەوە، پەیرەوی لە تێروانین و بیروراکانی لۆك و بارکلی کرد. ئەویش سەرچاوەی زانینی بە کاریگەرییە هەستیەکان دەزانی، بەڵام لە کاتێکدا لۆك رێکخستنێکی بەرێژە سەقامگیری لە توانای پێکهاتەسازی زیهندا دەدی، و بارکلیش خودی زیهنیەتی بە دەربرینی جۆرێك دەسەڵاتی مەعنەوی دەزانی، ئەوا شیکردنەوەکانی هیوم ئاشکراکەری ئەگەری رودانی چەند حاڵەتێکی لێکچوو و یەکسان بوو چ لە زیهن و چ لە جیهانی دەرەکیدا (دنیای دەرەوەی زیهن). بەبڕوای هیوم کۆی یەکێتی و هاوشێوەیی لە ئەزمونی ئیدراکیدا، دەگەرێتەوە بۆ «کۆبونەوە و پێکەوەبەستی چۆنایەتی لە زیهندا». «کۆبونەوەی بیروباوەرەکان» شتێکی واقعیە. بەڵام پەیوەندیەکانی لێکچون، هاوسێیەتی و هۆ و هۆکاری کە «کۆبونەوەی بیروباوەرەکان» دروستی دەکات، خاوەن بایەخێکی زاتی نین، چونکە لەراستیدا ئەم پەیوەندیانە دەرئەنجامی جۆرێك «عادەتی زیهنین» کە قابیلی رونکردنەوە نین. لێرەوە بنەمای هۆیەتی (علی) کە بناغەی کۆی زانینەکان پێکدەهێنێت، دەربری پەیوەندی پێویست نیە لەنێوان شتەکاندا، بەڵکو تەنها دەرئەنجامی پەیوەندی بەردەوام و بەدواداهاتنیانە لەناو زیهنی مرۆڤەکاندا. جگە لەمە خودی زیهن بەرلەوەی هێزێکی سەربەخۆ بێت، تەنها «کۆمەڵێك لە وەرگیراوەکانە» بێ هیچ یەکێتی یان چۆنایەتیەکی رێکخراو و گونجاو. نەفیکردنی رێکخستنێکی پێویست لەناو سروشتدا لەلایەك، و لەلایەکی دیشەوە نەفیکردنی خودێکی جەوهەری و زاتی یان یەکگرتوو لەلایەن هیومەوە، بووە هۆی خێرابوونی رودانی قەیرانێکی فەلسەفی کە فەلسەفەی رۆشنگەری تا دەرکەوتنی کانت گیرۆدەی بوو بوو. تەنهاش پاش پرۆژە و پێشکەشکردنی رەخنە سەرەکیە سێ لایەنیەکانی کانت (رەخنە لە عەقڵی پەتی، رەخنە لە عەقڵی پراکتیکی، رەخنە لە داوەری) بوو کە فەلسەفەی رۆشنگەری توانی تا رادەیەك لەم قەیرانە فەلسەفیە رزگاری بێت.

## ٦-بزوتنەوە نائەبستمۆلۆژیەکان لە سەردەمی رۆشنگەریدا:

گەرچی میتۆدی ئەزمونگەری ئینگلیزی بە دەربری سەرەکی فەلسەفەی رۆشنگەری تا سەردەمە کانت دەژمێرێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەك تاکە فەلسەفەیەك نەبوو کە لەسەدەی هەژدەدا پێبگرێت. رۆشنگەری کە لەسەر بناغەی پانتاییەکی گەورە و مەزنی بیرورا و باوەرەکان دامەزرابوو- وەك گرنگیدان بە عەقڵ، باوەرهێنان بە پێشکەوتن، متمانەکردن بە سروشت وەك سەرچاوەی ئیلهام و بەها، هەوڵدان بۆ لێکبوردن و ئازادی لە دەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتیەکاندا، خۆی بووە هۆی دەرکەوتن و دروستبوونی چەندان روداوی فیکری و فەلسەفی.

## ١/ماتریالیزم و دۆزینەوەی زانستی:

کاریگەری قوڵ و فراوانی بیروراکانی لۆك تا فەرەنساش بڵاوبۆوە. لە فەرەنسا بیروراکانی لۆك لەلایەك ئەزمونگەرییە گومانکارییەکانی ڤۆڵتێری بەدوای خۆیدا هێنا، لەلایەکی دیشەوە بە پەیوەندی کردن بە رەهەندە میکانیکیەکانی تێزەکانی نیوتنەوە، رێبازێکی بەرهەمهێنا کە خۆی بۆ ماتریالیزمی هەستگەریانە تەرخان کرد. ژۆلیان دو لامارتی لە کتێبی «مەکینەی مرۆیی» دا یا «مرۆڤ، مەکینەیەك» کە لە١٧٤٧دا بڵاوکرایەوە، ئەتین دو کندیاك لە کتێبی «وتارێك لەبارەی ژیانەوە»پۆل بارون هۆلباخ لە کتێبی «سیستەمی سروشت»دا وێنەی جیهانبینیەکی سنورداریان کێشا کە بەپێی ئەم جیهانبینیە مادە لە کاتی جوڵەدا یان مادەی جوڵاو، بەتەنها واقعێکی هەبوو دەژمێرێت کە بە پشتبەستن بە یاسا ئاسنین و پێویستەکان، بەکارهێنان مێشکی مرۆڤ و هەستەکانی دیاری دەکات. ئەم هەڵوێستە یان تیورەیە تەنانەت لە زۆرێك لە وتارەکانی ئەنسکلۆپیدیای فەرەنسادا بەرچاو دەکەوت کە دینس دیدرۆ و ژان دالامبر دایانرشتبوو. ئەم ئەنسکلۆپیدیایە لەراستیدا بە کۆمەڵێکی کامڵی دەستکەوتەکان و چالاکیە پراکتیکی و هیومانیستیەکان لە بواری چالاکیە فیکری و فەلسەفیەکانی سەدەی هەژدەهەم دەژمێرێت.

گەرچی سەدەکانی ناوەراست و رێنسانس ناوێکی وایان لەخۆیان نەنابوو، بەڵام سەدەی هەژدەهەم بە جۆرێك غرور و دەمارگیری هوشیارانەوە ناونیشانی «سەردەمی رۆشنگەری» بۆ خۆی دانا. سەردەمی رۆشنگەری یان سەدەی هەژدە سەردەمی خۆشبینی بوو کە ئاوێتە بوو بە جۆرێك دیدگای تازە. گەلێك پێشکەوتنی سەرسورهێنەر لە زانستی فیزیا، کیمیا، ژیندناسی و...هتد رویدا. ژان باپتیست دولامارك، ژۆرژ لوئی لکرك (کۆنت دو بۆفۆن) دەستیان کرد بە پۆلێنکردنی گیانەوەران». لە ماوەی هەشت ساڵدا لەنێوان ١٧٦٦ تا ١٧٧٤ هێنری کاوندیش، هایدرۆژینی دۆزیەوە، دانیەل راترفۆرد نایترۆژین و ژۆزێف پریستلی ئۆکسجینی دۆزیەوە.

هەر لەم رۆژانەدا بوو کە بنەما و رەگەزە ژێرخانەکانی دەرونناسی، زانستە کۆمەڵایەتیەکان، ئەخلاقیات و ستاتیکا دامەزرێندرا و دارێژرا. ئان رابرت ژاك تورگۆ- مارکی دو کۆندرسە و مۆنتیسیکۆ لە فەرەنسا، جیان باتیستا ڤیکۆ لە ئیتاڵیا، و ئادەم سمیس لە ئینگلتەرا، هەموو ئەمانە قۆناغ و رەوتێکی تازەیان بە ئاراستەی پێناساندن و پێشکەشکردنی مێژوو، ئابوری، کۆمەڵناسی و مافە یاساییەکان، وەك زانستێك دەست پێکرد. هیوم و جرمی بنتام و فەیلەسوفە ئەخلاقیەکانی ئینگلیز، ئەخلاقیان کرد بە بوارێکی تایبەتی لێکۆڵینەوەی فەلسەفی، ئانتۆنی شلی، ئادمۆند برێك، یزهان گاتشە و ئەلکساندەر بۆمگارتنیش بناغە و پایەکانی ستاتیکایەکی سیستماتیکیان دارشت.

بەمشێوەیە دەکرێت رۆشنگەری سەدەی هەژدە بە یەکێك لە گرنگترین و بەرجەستەترین روداوەکان لە بواری کلتور و مێژووی کۆمەڵایەتی ئەوروپادا بزانرێت، کە لە هەمانکاتدا وەك دوو روداوە گرنگەکەی پێش خۆی واتە رێنسانس و ریفۆرم، بە جەمسەرە گرنگ و پایە سەرەکیەکانی بینایەکی مەزن دەژمێررێن کە ناوی «مۆدێرنە»یە.....

رۆشنگەری بە خەباتی بەردەوامی دژی دیسپۆتیزم، جەهل و خورافە، وێنەی دروشمگەلێکی کێشا کە بە رەگەزە سەرەکیەکانی دروستکەری مۆدێرنە دادەنرێن: باوەربوون بەعەقڵ، رەخنەو رەخنەگرتنی بەردەوامی بەهاکان و خەسڵەت و باوەرە باو و باڵادەستەکان، ئازادی بیر، ئازادی مەزهەب و ئازادی بەیان، بەها و پێگەی مەزنی زانست، گەرانی بەردەوام بەدوای پێشکەوتندا، گەشەسەندنی ئابوری-کۆمەڵایەتی-سیاسی و دواجار بەدیهێنانی خۆشبەختی مرۆڤ.

یەکێکی دی لە هەنگاوە سەرەکیەکانی بیریارانی رۆشنگەری، لاوازکردنی پایەکانی رژێمی کۆن بوو، هەنگاونانێك کە لەم ئاراستەیەدا ئەنجامدرا، بیرورِا و تیورە سیاسی و فەلسەفیەکان کە لەبارەی ئازادی، یەکسانی، دادپەروەری، مافەکانی تاك، مافی بەشداری کردنی خەڵك لە دیاریکردنی چارەنوسی سیاسی، کۆمەڵایەتی خۆیدا پێشکەش کرا، هەموو ئەمانە پێکەوە دەستیان خستە ناو دەست یەك و زەمینەیان بۆ دەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسی و هەروەها شۆڕشە سیاسی-کۆمەڵایەتیەکانی تری سەدەی نۆزدە خۆشکرد.

لەگەڵ ئەمەشدا ناکرێت رۆشنگەری بە بزوتنەوەیەکی سادە و یەکپارچە بزانرێت. وەك لە لێکۆڵینەوە قوڵ و بەربڵاوەکانی هاوچەرخدا دەردەکەوێت رۆشنگەران و مەشخەڵدارانی رۆشنگەری، بیریارانی وەك ڤۆڵتێر، دیدرۆ، هیوم، رۆسۆ، کانت بیروڕای زۆر جیاواز لە یەکدیان هەبوو. بەدرێژایی سەردەمی رۆشنگەری زۆرێك لە دروشمەکان و خاڵە گرنگەکان گۆڕانیان بەسەرداهات. جگە لەمەش رۆنگەی مەزهەبی رۆشنگەری و چالاکیەکان و خەباتە سیاسیەکانی ئەم سەردەمەش، لەهەر کۆمەڵگایەکدا شێوەی تایبەتی بەخۆی وەردەگرت و لە کۆمەڵگایەکی دی جیاواز بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك لە بیریارانی هاوچەرخ بڕوایان وایە هەنوکە چیدی ناکرێت دڵ بە دروشم و ئامانجەکانی رۆشنگەری خۆشبکرێت. رۆشنگەری سەرەرای دەستکەوت و رەهەندە روون و پۆزەتیڤەکانی، رەهەندی تاریکیشی هەبوو، بەرگری لە رەهاگەرێتی و دیکتاتۆری دەکرد (مەبەست بەرگریکردنە لە حوکمرانی توندرەوەکان و شۆڕشگێرەکان) و زەمینەی بۆ سوکایەتی پێکردنی خەڵکی سادە خۆش دەکرد. جگە لەمە رۆشنگەری چەندان دودڵیشی بەدوای خۆیدا هێنا: ئایا لە بنەڕەتدا دەکرێت رەوتی دورودرێژ و دێرینی شارستانێتی مرۆڤ بە پێشکەوتن بژمێرێت؟ ئایا دەبێ هەوڵ بۆ گەڕانەوە بۆ دۆخی سروشتی بدەین؟ ئەمانە ئاڵۆزییەکان و رەهەندە تاریك و رون و ئاشکرا و شاراوەکانی رۆشنگەرین کە زۆرێك لە بیریارانی هاوچەرخ هەوڵدەدەن دەست بە شیکردنەوە و تاوتوێکردن و رەنکردنەوەیان بدەن، لەوانە دەکرێت ئاماژە بۆ ناوی رۆی پرتەر بکرێت.

## ٧-فەلسەفەی کۆمەڵایەتی و سیاسی:

بەدەر لەو کاریگەری و گۆرانەی سەردەمی رۆشنگەری لە بوارەکانی ناسین، ئەبستمۆلۆژیا و ڕا فەلسەفیەکاندا ئەنجامی دا، یەکێك لە دەستکەوت یان هەنگاوە گرنگەکانی ئەم سەردەمە لە بواری سیاسی کۆمەڵایەتیدا بوو. لەم ناوەدا دوو بەرهەمی کلاسیکی و گرنگ توانیان زیاد لە بەرهەم و وتارەکانی دی رەوتی بیرکردنەوەی سیاسی-کۆمەڵایەتی ئەوروپای ئەو رۆژەیان گۆڕی، و کاریگەری قوڵیان لە ئاستی خەباتی سیاسی –کۆمەڵایەتی و ئابوری سەدەی حەڤدە و هەژدەدا دروستکرد. بەپێی تێروانین و شێوازەکانی لەم دوو بەرهەمەدا پێشکەشکراوە، زۆرێك لە روداوە سیاسی-کۆمەڵایەتیەکان توانیویانە دید و ئامانج و دروشمەکانی خۆیان لە قاڵبی ئەم دوو بەرهەمەدا دروست بکەن و روخسارگەلێکی تازە لە بواری سیاسەت، حکومەت و کۆمەڵگا دروست بکەن. ئەم دوو بەرهەمە نوسینی جۆن لۆك و ژان ژاك رۆسۆیە.

«دوو وتار لەبارەی حکومەتی مەدەنیەوە» (١٦٩٠)ی نوسینی جۆن لۆك و «پەیمانی کۆمەڵایەتی» (١٧٦٢) نوسینی ژان ژاك رۆسۆ بە پشتبەستن بە بیروڕا و تیورە تازەکانی بواری ئەبستمۆلۆژیا و بیرکردنەوەی فەلسەفی بەشێوەیەکی گشتی، دەستیان کرد بە رونکردنەوەی جۆرێك کۆمەڵگای سیاسی کە رەگی لە پێداویستیە سیاسیە تازەکانی ئەو سەردەمەدا هەبوو. فەلسەفەی سیاسی سەردەمی رێنسانس کە بەهۆی بیریارانی وەك مەکیاڤیلی، بۆدن و هۆبزەوە دارێژرا و پێشکەشکرا، سەرنجی سەرەکی خۆیان ئاراستەی دەسەڵاتی رەهای پاشا و فەرمانرەوایان و پێویستی پەیرەوی کردنی هاوڵاتیان لە دەسەڵاتی کامڵ و تەواویان، کردبوو. بەبڕوای ئەم بیریارانە پێویستی پاراستن، بەردەوامی و مانەوەی کۆمەڵگای سیاسی بەستراوە بە دوو

بنەمای سەرەکییەوە: ١) ناسینی دەسەڵاتی رەها و پێویستی پیادەکردنی کامڵی ئەم دەسەڵاتە لەلایەن پاشا یان فەرمانڕەوا لە هەموو بوارەکاندا و بەبێ هیچ رێگرییەک. ٢) پێویستی تەسلیمبوون و ملکەچی هاوڵاتیان بۆ دەسەڵاتی رەهای ناوبراو. بەڵام تیورەکانی سەردەمی رۆشنگەری لۆک و رۆسۆ بە پێچەوانەوە رویان لە کەمکردنەوەی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا، پێویستی چاکسازی لە دەسەڵاتەکانی پاشاکان و فەرمانڕەوایان، ئازادی و یەکسانی هاوڵاتیان و دروستکردنی کۆمەڵگایەک لەسەر بناغەی دەسەڵاتدارێتی یاسا و رەزامەندی هاوڵاتیان کرد.

بەڕاستی دەکرێت ئەم دەستکەوتانە بە گەورەترین گۆڕانی سروشتی مێژوویی بژمێرێت. تا سەدەکانی ١٧ و ١٨ شایەتی دەسەڵاتە دیسپۆتیزم و ستەمکارەکانین، لە سەدەکانی ١٦ و ١٧شدا سەردەمی رەهاگەری و پایەکانی حکومەتی رەها بەشێوەیەکی سیستماتیك دارێژرا. سەرەکیترین کێشەی سیاسی لە سەدەکانی ١٦ و ١٧دا مەسەلەی ئارامی و ئاسایشی ناخۆ و دروستکردنی سەقامگیری سیاسی بوو. زۆربەی کۆمەڵگا رۆژئاواییەکان بەدرێژایی ئەم دوو سەدەیە شایەتی نائارامی و ئاژاوەی سیاسی و گرفتاری جەنگ و شەڕی ناوخۆ بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی، یان لەگەڵ دراوسێکان و دەسەڵاتە دەرەکییەکاندا لەسەر کێشەی زەوی و زار، بوون. پێویستی لەناوبردنی ئەم نائارامیانە و دروستکردنی سەقامگیری سیاسی ناوخۆیی و ئاسایشی سنورەکانی دەرەکییەکان، بووە هۆی دارشتن تیورەگەلێك لەبارەی «دەسەڵاتدارێتی نەتەوەییەوە». بەڵام لە سەدەی هەژدەدا شایەتی چەندان شۆڕشی سیاسی و نەتەوەیی و شۆڕشی دیموکراتین و لەوانەش لە هەمویان گرنگتر شۆڕشی فەرەنسییە. کێشەی سەرەکی ئەم سەدەیەش مەسەلەی ئازادی و راپەڕین دژی نادادپەروەری و نایەکسانی بوو. تیورە سیاسیەکەشی لە چوارچێوەی «مافە سروشتیەکان» کە بە شتێکی بەڵگەنەویست و جیانەکراوە لە ژیانی مرۆڤ دادەنرا، دارێژرا و پێشکەشکرا.

تیورە سیاسیەکەی لۆك بریتی بوو لە نکوڵیکردن لە مافی خودایی پاشاکان و نەفیکردنی دەسەڵاتی رەهای فەرمانڕەوا بەو شێوەیەی کە لای هۆبز هاتبوو. بەبڕوای لۆك هەموو مرۆڤەکان خاوەن مافی سروشتی ئازادی و یەکسانین. «دۆخی سروشتی» کە مرۆڤەکان تیایدا دەژین، بە پێچەوانەی تێڕوانینی هۆبزەوە، دۆخێکی قابیلی تەحەمول نەکردن یان قابیلی پیادەبوون نییە، بەڵام کێشەی تایبەتی خۆی هەیە. لێرەوە مرۆڤەکان بۆ پێکهێنانی «کۆمەڵگا» لەدەوری یەك کۆدەبنەوە. دیارە بە تەعبیری ئەرستۆ « نەك تەنها بۆ ژیان، بەڵکو بۆ باشتر ژیان». هەرگیز ناکرێت دەسەڵاتی سیاسی بێ رەچاوکردنی مەبەست و دوا ئامانجی واتە «خێری هاوبەش» کاری پێکرێت. چونکە مرۆڤەکان بۆ پاراستن و پارێزگاریکردنی ژیان، ئازادی و موڵکایەتی خۆیان، مل بۆ پەیمان دەدەن و دەچنە ناو پەیمانەوە.

بەمشێوەیە لۆك یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی نەریتی لیبراڵی دامەزراند: واتە ئەو بنەمایەی کە پەیڕەویکردن لە دەسەڵات بەبێ رازیبوون هیچ مانایەکی نیە. ئەگەرچی کۆمەڵگای سیاسی پێشتر دروستکراوە و رەگوریشەیەکی مێژوویی دوورودرێژی هەیە، بەڵام تەسلیمبوون لە بەرامبەر بڕیاری زۆرینەدا بەرپرسیارێتیەکە کە لە کۆمەڵگایەکی سیاسی ئایدیالدا دەبێ هەمووان بیگرنە ئەستۆ، کۆمەڵگایەك کە خەڵکی یان هاوڵاتیان بە رەزامەندی خۆیان پەیڕەوی لە فەرمانڕەوا دەکەن. بەڵام مەرجەع و دەزگای بڕیاردەر کە لە ڕاستیدا بە ئاشکراکەری ئیرادەی گشتی و بڕیاری زۆرینە دەژمێرێت، یاسادانەر یان هێزی یاسادانان یان ئەنجومەنە یاساییەکان کە بە نوێنەرایەتی کۆی هاوڵاتیان بڕیار دەدەن. جگە لەمەش دوا دەسەڵات بۆ هەڵبژاردنی یاسادانەریش دەگەڕێتەوە بۆ خەڵك. خەڵك لەڕێی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاسادانان، بەشێك لە مافەکانی خۆی بۆ بڕیاردان بە نوێنەرانی خۆی دەبەخشێت، دیارە مەرجدار و بەشێوەی بازنەیی. لەلایەکی دیەوە دەسەڵاتی یاسادانەریش رەها و بڕاوە و نەگۆڕ نییە، چونکە یاساکانی سروشت (کە مافە سروشتیەکان

سەرچاوەیان لێوە وەرگرتووە) بەردەوام بە پێوەرێکی نەگۆڕ و هەمیشەیی دادەنرێن، و وەك بنەما و ڕێسا بۆ پارێزگاریکردن لە بەرامبەر هەر جۆرە دەسەڵاتێکی ستەمکارانەدا کاردەکەن.

لەلایەکی دیەوە بەر بیرورا و باوەڕەکانی رۆسۆ دەکەوین. لەڕاستیدا تێڕوانینە رادیکال و سیاسیەکانی رۆسۆ، لەسەر بناغە و بنەماکانی تیورەکەی لۆك دامەزرابوو. بەبڕوای رۆسۆش «پەیمانی کۆمەڵایەتی» بناغەی هەموو جۆرە دەسەڵاتێکی رەوا پێکدەهێنێت و بە بناغەی ڕەوایەتی سیاسی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا لەناو کۆمەڵگاکان و مرۆڤەکاندا دەژمێرێت. ئەگەرچی چەمکی هاوڵاتی لای رۆسۆ ئۆرگانیتر بوو لەوەی لۆك، بەڵام کەمتر لە تێڕوانینی لۆك تاکگەریانە بوو.

وازهێنان لە ئازادی سروشتی بۆ بەرژەوەندی ئازادی مەدەنی، بەمانای ئەوەیە هەموو مافە تاکەکەسیەکان (وەك مافی موڵکایەتی) ملکەچی ئیرادەی گشتی بێت. بەبڕوای رۆسۆ دەوڵەت کەسایەتیەکی ئەخلاقی و مەعنەوییە کە ژیانی بەستراوە بە یەکێتی ئەندامەکانیەوە، یاساکانیشی بەکارهێنانی ئیرادەی گشتییە ئامانجیشی ئازادی و یەکسانی هاوڵاتیانە. دەرئەنجامی ئەم قسانەش ئەوەیە هەرکاتێك حکومەتێك دەسەڵاتی خەڵکی داگیربکات، لەوکاتەدا یەکێتی و پێکەوە بەستراوی و پەیمانی کۆمەڵایەتی تێکدەشکێت، لە ئەنجامی ئەمەشدا هاوڵاتیان چیدی نەك هەر بەرپرسیار نین بۆ هیچ پەیڕەوی و دەستەمۆیەك، بەڵکو مافی یاخیبوونیان هەیە. کۆبەندی ئۆپۆزسیۆنخوازی رۆسۆ، لەڕاستیدا یاخیبوون و نەیارێتی بوو لەگەڵ تاکگەری سیستماتیکی لۆك. لە دیدی ئەوەوە وتەزای ژێرخان و بنەڕەتی «کەسی سروشتی نیە»، بەڵکو ئەوە «هاوڵاتیە» کە بە بناغەی کۆمەڵگا و حکومەت دەژمێرێت. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا گەرچی جیاوازیەکی بەرچاو لەنێوان تێڕوانینەکانی ئەم دوو بیریارە کۆمەڵایەتیەی رۆشنگەریدا هەیە، بەڵام دەکرێت تۆوی سەرجەم لقەکانی لیبرالیزمی مۆدێرنیش، لە بیروڕاکانی ئەم دوو بیریارەدا بدۆزرێنەوە: باوەڕ بە دیموکراسی نوێنەرایەتی، بە ئازادییە مەدەنیەکان، و بە شەریفی و مەزنێتی سەرەکی مرۆڤ.

### ا/ پسپۆڕیبوونی فەلسەفە:

ژان دالامبر ماتماتیکزان و هاوڕێیانی ئەنسکلۆپیدیای فەڕەنسا لە سەدەی هەژدەهەمدا، لە کتێبی»رەگەزەکانی فەلسەفە»دا (١٧٥٩) دەنوسێت:

«سەدەی ئێمە سەدەی فەلسەفەیە لە کامڵترین دۆخی خۆیدا، ئەگەر کەسێکیش بێ دەمارگیری هەلومەرجی هەنوکەیی زانست تاوتوێ بکات، ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە فەلسەفە لەناو ئێمەدا پێشکەوتووە».

لەڕاستیدا مەبەستی دالامبێر راکێشانی سەرنجەکان بوو بۆ خۆبینیەکی ئەندێشاوی کە بە خەسڵەتی دیاری سەدەی هەژدە دەژمێرێت و سەدەی هەژدەهەمیشی پێدەناسرێتەوە. بێگومان دالامبێر ئاماژەی بۆ ماتماتیکناسانی وەك خۆی، یاساناسان، دادوەرەکان، زانایانی ئابوری و ئەخلاقگەرە تازەکان دەکرد، نەك ژمارەیەکی کەمی پسپۆری فەلسەفە. بەڵام سەدەی هەژدەهەم بە مانایەکی تەکنیکانەتری وشە، بێ هیچ گومانێك «سەدەی فەلسەفە بوو لە سنوری کامڵبونی خۆیدا». چونکە سەردەمێك بوو کە تیایدا بۆ یەکەم جار فەلسەفاندن لە ژمارەیەکی کەمی ئەرستۆکرات و نەجیبزادەکانەوە، کەوتە دەست پسپۆرە راستەقینەکانیەوە. گەورەترین ئاماژەی ئەم گۆڕانە گەرانەوەی فەلسەفە بوو بۆ ناوەندە زانستی و زانکۆییەکان.

ئەم گۆڕانە یەکەم جار لە ئەڵمانیا رویداو بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی بە زانکۆی هالەوە (کە لە ساڵی ١٦٩٤دا دامەزرابوو) هەیە. لە سەردەمی پێن لایب نیتز (لە ساڵی ١٧١٦ کۆچی کردووە) و کانت (لەدایکبووی ١٧٢٤) فەزای فەلسەفی گۆڕان و گۆڕانکاری بەسەردا هات. نوێنەری راستەقینەی ئەم گۆڕانە کریستیان ۆلف بوو کە فەلسەفەی لە هال خوێند و پردێکی پەیوەندی بوو لەنێوان بیروڕاکانی لایب نیتز و

کانت و تێڕوانینە تەواو جیاوازەکانی فەلسەفاندنیان لەیەکدی.

پاشتر کانت، وۆلفی بە ڕۆحی گشتگیربینی لە ئەڵمانیادا ناونا، دیارە بەڕاستی وۆڵف پێشرەوی شێوازگەلێك بوو کە فەلسەفەیان کردبوو بە لقێکی پسپۆری- واتە گرتنەبەری هوشیارانەی شێوازێکی سیستماتیك و داهێنانی وشە پسپۆرییەکانی فەلسەفە. وۆڵف بوارە جیاوازەکانی فەلسەفەی لەیەك جیاکردەوە و لەهەر بوارێکیشدا کتێبێکی نوسی کە تا ماوەیەکی زۆر وەك کتێبی مەنهەجی زانکۆکانی ئەڵمانیا، سودی لێوەرگیرا. هەروەها وۆڵف زۆرێك زاراوەی پسپۆری و تەکنیکی فەلسەفەی بڵاوکردەوە، کە تاهەنوکەش ئەو زاراوانە بەکاردەهێنرێن.

ڕۆشنگەری ئەڵمانیا بە یەکەم سەردەمی مۆدێرن دەژمێرێت کە «پسپۆرانی فەلسەفەی» دروستکردبوو. لە ئینگلتەرا خوێندنی فەلسەفە یان باسکردنی چالاکیە فەلسەفیەکان تا پاش هیوم ئەوەندە بە جدی وەرنەدەگیرا، گەرچی بوارە فەلسەفیەکان بە ئەندازەی پێویست لەیەك جیابووبونەوە، و لە هەر بوارێکیشدا باسی پسپۆرانە رویدەدا. ناونیشانی وەك مامۆستای فەلسەفەی زیهن، مامۆستای فەلسەفەی ئەخلاق یان فەلسەفەی میتافیزیك کە لە ئۆکسفۆرد و کامبریجدا باو بوو، لە ڕاستیدا بە بەرهەمی کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە و سەرەتاکانی سەدەی ١٩ دەژمێرێن.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ دوو هۆکاری دی لە ڕۆشنگەری ئەڵمانیادا بکەین: ١) دامەزراندنی یەکەم بڵاوکراوەی پسپۆری. ٢) دڵەڕاوکێی فەلسەفە لەبارەی مێژووی خۆیەوە و لە ئەنجامدا دەرکەوتنی دیاردەیەکی تازەی وەك لێکۆڵینەوە لەبارەی مێژووی فەلسەفەوە. بڵاوکراوە پسپۆریەکانی وەك کۆمەڵگای زانستی، لە بنەڕەتدا داهێنانی سەدەی حەڤدەهەم بوو. بەڵام شتێك کە سەرەتا وەك هەنگاوێکی گشتی لە بوارە جیاوازەکاندا دەرکەوتبوو، لە سەدەی هەژدەهەمدا بوو بە جوڵەیەکی تەواو فەلسەفی. لەم ڕۆژانەدا ژمارەیەکی زۆری بڵاوکراوە بڵاودەکرانەوە، لەوانە ACTA PHILOSOPHORUM (هال ٢٦-١٧١٥)، DER PHILOSOPHISCHE BUCHERSAAL (لایپزیگ ٤٤-١٧٤١) یان THE PHILOSOPHICAL BOOK ROOM و «گۆڤاری فەلسەفی نوێ» کە تەمەنێکی کورتی هەبوو، (NEUES PHILOSOPHISCHES MAGAZIN لایپزیگ ٩١-١٧٨٩) کە تایبەت بوو بە فەلسەفەی کانت.

لەمەش سەرنجڕاکێشتر دەرکەوتن و داهێنانی ژمارەیەکی زۆر بەرهەمە بە زمانی ئەڵمانی لە بواری مێژووی فەلسەفە لە ١٧٤٠دا. هەروەها لە سەدەی هەژدەهەمدا بەر ژمارەیەکی زۆری بابەتە مێژووییەکان و هەروەها بەر ئەو هەستە هوشیارانەیە دەکەوین کە فەلسەفە بوارێکی تایبەت پێکدەهێنێت، کە ڕابردوەکەی شایەنی تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیرە، لێکۆڵینەوەیەك کە لەگەڵ ڕێکخستنی ورد لەسەر بناغەی ڕۆحی کۆبینی ئەڵمانیدا تێکەڵ بوو بوو، دەرئەنجامی ئەمەش داهێنانی گەلێك بەرهەمی مێژوویی مەزن بوو لە بواری مێژوویی فەلسەفەدا. بەرهەمەکانی وەك «مێژووی فەلسەفە» (٤٤-١٧٤٢) لە شەش بەرگدا کە نوسینی یۆهان برۆکەرە، کتێبی «وانەیەك لەبارەی مێژووی فەلسەفەوە» (١٨٠٤-١٧٩٦) لە ٨ بەرگدا کە نوسینی یەزهان بۆهلە، کتێبی «ڕۆحی فەلسەفەی تیوری لە تالیسەوە تا بارکلی» (٩٧-١٧٩١) لە شەش بەرگدا کە بەرهەمی دیتریش تیدمانە، و کتێبی مێژوویی فەلسەفە لە یانزە بەرگدا بەرهەمی گۆتلیپ تنمان کە نوسینی ١٧٨٩وە تا ١٨١٩ی خایاند و کورتەی یەك بەرگیەکەشی لەژێر ناونیشانی «ڕێنمای مێژوویی فەلسەفە» بڵاوکرایەوە.

بهە لسە نگاندی     رخنە گراهی     عەق     لی     کات :

## ب/هەڵسەنگاندنی رەخنەی عەقڵ لای کانت:

کۆی ئەم روداوانە دواتر بە کانت (١٨٠٤-١٧٢٤) کۆتاییان دێت. کانت مامۆستای فەلسەفە بوو لە کۆنیگزیزك و بە گەورەترین فەیلەسوفی سەردەمی مۆدێرن دەژمێرێت، کە بەرهەمەکانی بە لوتکەی کامڵبوونی فەلسەفەی رۆشنگەری دادەنرێن. دەوری کانت لەرووی مێژووییەوە پەیوەستکردنی رەگەزە حسیەکان و پێشینەییەکان (A PRIORI) لە بواری ناسین و لەناوبردنی درزی نێوان قوتابخانەی عەقڵگەری (راسیۆنالیزم) پەرگیری لایب نیتز و قوتابخانەی ئەزمونگەری (ئمپرسیزم) پەرگیرانەی هیوم بوو. کانت بەدەر لە ناوەرۆکە روون و درەوشاوەکانی بیرورا فەلسەفیەکانی خۆی، لەراستیدا داهێنەر و دروستکەری سێ تازەگەری یان داهێنانی بنەرەتیە لە فەلسەفەدا: ١) پێشکەشکردنی پێناسێکی تازە بۆ فەلسەفە. ٢) تێروانینێکی تازە بۆ میتۆدی فەلسەفی، ٣) نمونەیەکی بونیادی تازە بۆ نوسینی فەلسەفە (نوسینی بەرهەمە فەلسەفیەکان).

پێناسی کانت بۆ فەلسەفە، رۆشنگەریی گەیاندە لوتکەی گەشانەوە و کامڵبوونی، چونکە لە پێناسەکەیدا عەقڵ وەك تەوەری سەرەکی یان دڵی لێدراوی فەلسەفە ناسێنراوە. بە بروای کانت تەنها ئەرکی فەلسەفە، دیاریکردنی هێز و لاوازی یان توانا و نەتوانینەکانی عەقڵە. ئەوەی عەقڵ دەتوانێت چ کارێك ئەنجام بدات و چ کارێکیش ناتوانێت ئەنجام بدات. کانت دەیگوت «فەلسەفە زانستی پەیوەندی سەرجەم زانینەکانی مرۆڤە بە ئامانجە سەرەکیەکانی عەقڵی مرۆییەوە». مەبەست و ئامانجی راستەقینەی فەلسەفەش هەم ئامانجێکی داهێنەرانە و دروستکەرە (وێنەکێشانی هێڵە سەرەکیەکان و بنەماکانی سیستەمی زانین کە لە عەقڵی پەتیەوە سەرچاوە دەگرێت)هەم ئامانجێکی رەخنەگرانەیە (ئاشکراکردنی تێروانینە نادروستەکان و وەهمە عەقڵیەکان کە سنورداریێتیەکانی خۆی فەرامۆش کردووە). لێرەوە فەلسەفە بانگهێشتی مەزنێتی و شکۆداریێتی یان بانگهێشتی بەها مەزنەکانە، چونکە ئامانجی فەلسەفە عەقڵنیەت و حیکمەت و مەعریفەتە، فەیلەسوفانیش «یاسادانەری عەقڵن». بەڵام بۆئەوەی فەلسەفە وەك «زانستی مەزنترین رێساکانی عەقڵ»ی لێبێت، فەیلەسوف دەبێت بتوانێت سەرچاوە، فراوانی و بایەخی زانینی مرۆڤ و دوا سنورداریێتیەکانی عەقڵ دیاری بکات. ئەم ئەرکە ترسناکانە بەبێ بوونی شێوازێکی فەلسەفی تایبەت، عەمەلی و مومکین نییە.

کانت ئەم شێوازەی بە تراسندنتالی ناودەبرد، بەڵام زۆرجار بەناوی «شێوازی رەخنەگرانە» ناوی دەهێنا. چونکە ئامانجەکەی نەفیکردنی دۆگمەکانی عەقڵگەرێتی بوو، لەلایەکی دیەوە خوازیاری گەرانەوە بوو بۆ هەڵوێستێکی نیوە گومانکارانە کە پێش کانت دیکارت پێش ئەوەی تێروانینە دۆگماییەکانی لەبارەی براوەییەوە دەربرێت، دەستی پێکردبوو. میتۆدەکەی کانت تاوتوێکردنی رەخنەگرانەی دەسەڵاتەکان و توانستەکانی عەقڵی پێشینەیی داوەریکەر، و لێکۆڵینەوەی ئەوەی ئەگەر هەموو جۆرە ئەزمونێك بخەینە لاوە، عەقڵ چ کارێك دەتوانێت بکات. میتۆدەکەی کانت لەسەر بروایەك دامەزرابوو کە خۆی ناوی نابوو «شۆرشی کۆپەرنیکۆسی» لە فەلسەفەدا (بە بەراوردکردن بەو گۆرانە گەردونناسیەی کە لەبری زەوی، خۆری بە ناوەند دانا): نە ئەو گریمانەیەی کە زانین و ناسینی مرۆڤ دەبێت خۆی لەگەڵ شتەکاندا بگونجێنێت، بەڵکو ئەو گریمانەیەی کە دەبێت شتەکان خۆیان لەگەڵ ئامێرەکانی ناسینی مرۆڤدا بگونجێنن. لێرەوە ئەو پرسیارەی هاتە ئاراوە ئەوەبوو: ماهیەتی وردی ئامێری ناسینی ناوبراو چییە؟.

کانت بە پێچەوانەی دیکارتەوە نەیدەتوانی بوونی زانین بخاتە ژێر پرسیارەوە. ماتماتیك و فیزیای نیوتنی بۆ باسکردنی زیهنی رۆشنگەری بۆ ئەم دودڵیە، زیاد لە ئەندازە واقعی و بابەتی بوون. لەبری ئەمە پرسیاری میتۆدی مەعریفی کانت ئەمە بوو: زانین یان ناسینی ماتماتیکی و فیزیایی چۆن موکینن؟ بۆ دابینکردن یان بەدەستهێنانی ئەم زانستانە، دەبێت بونیاد و پرۆسەی ناسینی مرۆڤ چۆن بێت؟ هەوڵدان بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە لە ئەستۆی گرنگترین بەرهەمی کانت، واتە «رەخنە لە عەقڵی پەتی» (١٧٨١) بوو.

بەڵام ئامانجی سەرەکی کانت لێکۆڵینەوەی عەقڵ نەك لەژێر یەکێك لە بوارەکانی باڵادەستی عەقڵدا، بەڵکو لە سەرجەم بوارەکاندا بوو، واتە گونجاو لەگەڵ سێ رەهەندی زیهنی مرۆڤ کە کانت لە وۆلفەوە وەریگرتبوو. بەمشێوەیە لێکۆڵینەوەی رەخنەگرانەی عەقڵی بیرکەرەوە (زانست) لە ئەستۆی کتێبی «رەخنە لە عەقڵی پەتی»، لێکۆڵینەوەی رەخنەگرانەی عەقڵی تامەزرۆ (ئەخلاق) لە ئەستۆی «رەخنە لە عەقڵی پراکتیکی» (١٧٨٨) و لێکۆڵینەوەی رەخنەگرانەی عەقڵی هەستیار (ستاتیکی) لە ئەستۆی کتێبی «رەخنە لە عەقڵی داوەری» (١٧٩٠) بوو.

## ج/وێنە ئەدەبییەکان:

لە بنەرەتدا شکڵبەندی روکەشیانەی ئەدەبیاتی فەلسەفی سەردەمی رۆشنگەری، خاوەن شێوەیەکی سادە و ساکار بوو. جگە لە هەندێك حاڵەتی گەرانەوە بۆ شێوازی دیالۆگ، بۆ نمونە لە کتێبی سێ گفتوگۆ لەنێوان هیلاس و فیلۆنۆس (١٧١٣) نوسینی بارکلی و یا کتێبی «چەند گفتوگۆیەك لەبارەی دینی سروشتیەوە»(١٧٧٩) نوسینی هیوم، جگە لەمانە ئەدەبیاتی فەلسەفی ئەم سەردەمە بەشێوەیەکی سەرەکی بریتییە لە لێکۆڵینەوە، باس و وتاربێژی و وتارگەلێکی بەگشتی بە دارشتنێکی رەوان و رون و بە رێژە ناتەکنیکیانە نوسرابوون. بەڵام کانت نەك هەر زاراوە و دەربرینە فەلسەفیە بێئەندازە گرانەکانی لە بەرهەمەکانی خۆیدا دەهێنایەوە، بەڵکو لەراستیدا داهێنەری شێوەیەکی تازەی فەلسەفی بوو. «رەخنە» یان «لێکۆڵینەوەی رەخنەگرانە» —کە تەلارسازی و ناسکی تایبەتی خۆی هەبوو- هەریەك لە رەخنە سێ لایەنیەکانی کانت خاوەن دابەشکردنێکی چونیەك و یەکتا بوو بۆ سێ بەش: ١) بەشی شیکاری، یان شیکردنەوەی کارکردنی دروستی عەقڵ. ٢) بەشی دیالەکتیکی، یان لۆژیکی هەڵە کە ئەو تەڵانە ئاشکرا دەکات کە عەقڵ بی خۆپارێزی دەکەوێتە ناویانەوە. ٣) «شێوازناسی» کە کۆمەڵێك رێسا و بنەمای دارێژراوە بۆ بەکارهێنان. بەمشێوەیە شکڵبەندی ئەدەبیاتی فەلسەفی ناوبراو، شێوەیەکی تایبەتە بە کانت، کە بێگومان کێشەی تایبەتی خۆشی لە بواری بیرکردنەوەی «ئۆپۆزسیۆنی» بەدوای خۆیدا هێنا، کە فەیلەسوفانی سەدەی نۆزدەهەم وەك هیگڵ، شۆپنهاوەر، کیرکجۆرد گەرانەوە بۆی.

## سەرچاوە:


فەسڵی سێهەمی کتێبی: (حسین علی نوزری: صورتبندی مدرنیتە و پست مدرنیتە. تهران. نقش جهان . چاپ اول .(١٣٧٩

عەلیشادی لۆربەچە
لە فارسییەوە: کاوە گوڵکار

# سێ سەدە بزاوی ڕۆشنگەری لە رۆژئاوادا

لە مێژووی گۆڕانکاری ئەندێشەدا، بەردەوام فەیلەسووفانێك سەریان هەڵداوە، کە دژ بە فەلسەفەی رەسمی دەسەڵات نارەزایەتیان دەربڕیوە. بۆ وێنە، سوفستاییەکان کە لە زەمانی کۆندا و نۆمینالیستەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، پۆزەتیڤیزمەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا و شیکار و راڤەکەران لە زەمانی ئێستادا. هەرچەند کەسانێك سەردەمی ڕۆشنگەری بە سەردەمی نامێژوویی دادەنێن، بەڵام ئەوانە کەسانێك بوون کە وەکو رەواقیەکان، خەونیان بە مرۆڤی ئایدیالی جیهانییەوە دەبینی، ئەو مرۆڤەی کە لە ڕێگەی عەقڵ و سروشت بوونەوەرێکی بەنرخ و بەرزی لێ بکەوێتەوە. مافی مرۆڤ، مرۆڤگەری، ئازادیخوازی، زانستخوازی، عەقڵگەرایی و سروشتگەرایی، چەمکە نوێ و دروشمە ئاساکانیان، لە ڕاستیدا وەڵامێکی نەگەتیڤ بە هێزەکانی دەسەڵاتداری وەکو شا و خان و قەشەکانی مەسیحی بوو. سیستەمە سیاسیەکانی رۆژئاوا لە مەشروتەی سەلتەنەتی ئینگلیزەوە تاکو سۆسیالیزمی ئێستالینی رووسی ویستیان هەندێك لەو خەونانەی ئەم بزوتنەوانە بهێننە دی. ئەمرۆکە دەتوانین وای دابنێین کە تێکرای ئەو دروشمانەی سەردەمی رۆشنگەری بۆ گەیشتن بە عەقڵگەرایی و ئازادیخوازی و بەرەو پێش چوون بێ سنوور بوون.

فەلسەفەی رۆشنگەری رۆژئاوا سەرەتای دەسەڵاتی عەقڵ بوو. بزوتنەوەی ئەدەبی کۆمەڵایەتی و رۆشنگەری فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆی هەبوو. رۆشنگەری تەنیا فەلسەفەی کردار نەبوو، بەڵکو فەلسەفەیەکی ساکار و رەشۆکی بوو. وشەی رۆشنگەری لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدە لە رۆژئاوادا بوو بە باو. لە ڕوانگەی سەیری مێژووی ئەندێشەوە، فەلسەفەی ڕۆشنگەری لەسەر بنەماکانی، هیومانیزم، ڕێنسانس،

عەقڵگەرایی و چاکەخوازی سەدەی هەڤدەهەم دژ بە فیۆدالیزم (دەرەبەگایەتی) دۆگمەکانی ئایینی مەسیح دامەزرا.

ئەم بزاوتە بوو بە سەرەتایەك بۆ بیروباوەڕی شۆڕشگێرانەی سەدەکانی هەڤدە و هەژدە لە ئەوروپادا.

ڕۆشنگەری لە سەدەی هەڤدەهەمەوە لە ئینگلیزدا سەری هەڵداو لە ڕێگەی فەرەنساو ئەڵمانیا باقی وڵاتانی ئەوروپی تەنییەوە و تەشەنەی کرد. لە ئینگلیزدا، لە ساڵەکانی ١٦٩٧ شۆڕشگێرە کۆمەڵایەتیەکان خۆیان بە ئازار ئەندێش ناوزەد ئەکرد. لە مێژووی گۆڕانکارییەکانی هزر و بیردا، بەردەوام فەیلەسووفانێك سەریان هەڵدا کە دژی فەلسەفەی ڕەسمی دەسەڵات و فەلسەفەی سەپێنراو دەنگی نارەزایەتیان دەربڕیوە. بۆ وێنە سۆفیستەکان لە زەمەنی کۆندا، نۆمینالیستەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، پۆزتیڤیستەکان (گەشبینەکان) لە سەدەی نۆزدەهەمداو شیکار و راڤەکاران لە زەمەنی ئێستادا. هەرچەندە کەسانێك سەردەمی ڕۆشنگەریان بە نامێژوویی داناوە، بەڵام ئەوانیش وەکو رەواقیەکان خەونیان بە مرۆڤی ئایدیالی جیهانیەوە دەبینی. ئەو مرۆڤەی کە لە ڕێگەی عەقڵ و سروشتەوە بونەوەرێکی بەنرخ و بەرزی لێبکەوێتەوە. ماف مرۆڤ، مرۆڤگەری، ئازادیخوازی زانستخوازی و عەقڵگەرایی و سروشتگەری و چەمکە نوێ و دروشمە ئاساکانیان، لە ڕاستیدا وەڵامی نیگەتیڤ بۆ دەسەڵاتەکان و دەسەڵاتدارانی وەکو شا و خان و پیاوانی ئایینی مەسیحیەت بوو.

سیستەمە سیاسیەکانی رۆژئاوا، لە مەشروتەی سەڵتەنەتی ئینگلیزەوە تاکو سۆسیالیستی ستالینی روسی ویستیان هەندێك لەو خەونانەی ئەو بزوتنەوانە بهێننە دی. لە ڕێگەی بزوتنەوەی ڕۆشنگەرییەوە هەردوو شۆڕشی سەدەی هەڤدەهەمی ئینگلیز بوونە هۆکارێك بۆ هاتنی ڕژێمی مەشروتەی سەڵتەنەتی (پادشایی) و وەلانان و سڕینەوەی حکومەتی ڕەها.

بزوتنەوەی ڕۆشنگەری ئینگلیز، بە ئاشکرا، سیاسی و ئەخلاقی و دژ بە ئایین بوو کە هەندێك لە ڕێبەرانی ئەم بزوتنەوەیە بیرمەندانێکی وەکو هۆبز، لۆك، تۆلاند و ماندوییل بوون. ئەوان نیازیان وابوو لە ڕێگەی بۆرجوازیەوە، کۆمەڵگا لە ژێر زەبری حکومەتی رەها و دۆگمە دینیەکان و کۆنەپەرستی دەرەبەگایەتی رزگار بکەن. ئەوان دەیانگوت مرۆڤ بە لەبەرچاو گرتنی سروشتی، ئازادە و هیچ دەسەڵاتێکی سەر زەوی بۆی نییە مرۆڤ لە مافە مرۆڤایەتیەکان بێ بەری بکات. ئەم بزوتنەوەیە لە فەرەنسادا نە تەنیا دژ بە کەنیسە و دەرەبەگایەتی بوو، بەڵکو توانی ڕێگە خۆشکەر بێت بۆ بزوتنەوەو ئایدیاکانی سۆسیالیزمی خەیاڵی. بیرمەندانی ئەم بزوتنەوەیە ڤۆڵتێر، مۆنتسکیۆ، هۆڵباخ و مارات بوون. ئەم بزوتنەوەیە لە ئەڵمانیادا لەگەڵ ئەوەی کە سیاسی بوو بەڵام تا ئەندازەیەك جۆراو جۆر و تیۆریك بوو. کە لە ئاکامدا فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی لێ کەوتەوە و تیۆریسینەکانیان کەسانێکی وەکو لایبینتز، لوسینگ، کانت و ویلاند و.. بوون. نوێنەرانی ئەم بزوتنەوەیە لە ئەمریکادا، بۆ سەربەخۆیی ئەمریکا لە ئینگلتەرا، دەستیان دایە خەبات کە فرانکلین، پایین و جێفرسۆن دەورێکی کاریگەریان هەبوو. بزوتنەوەی ڕۆشنگەری کە لە سەدەی هەژدەهەمدا، لە روسیا سەری هەڵدابوو، لە ژێر ڕێبەرایەتی (لۆمۆنۆسێڤ، رادیشۆڤ، هێرتسن، بلینسکی، چێرنیشۆڤیسکی، پیزارۆڤ و دۆبرۆلۆیۆڤ)دا بوو بە هۆکارێك بۆ دەسپێکردنی شۆڕشێکی دیمۆکراتیك لە سەدەی نۆزدەهەمدا. مێژوونووسانی چەپ لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئیمپریالیزم و بۆرژوازی ئەو سەردەمە خیانەتیان بە ئایدیاکانی ڕۆشنگەری کردووە، ئەوان بۆیە ئەم قسەیە دەکەن چونکە بەتەنیا خۆیان بە میراتگری ئایدیاکانی سەردەمی ڕۆشنگەری دادەنێن. ئەوان لایان وایە کە میراتی نەریتی پێشکەوتنخوازانە لە مارکسیزمدا خۆی سەلماندووەو ئایدیاکانی ڕۆشنگەری لە داهاتوویەکی نزیکدا لە سۆسیالیزم و کۆمۆنیزمدا ڕەنگ ئەدەنەوە.

دەبێ ئاماژە بەم ڕاستیە بکەین کە نووسەرانی ئەنسیکلۆپێدیا (دائرە المعارف) لە شۆڕشی فەرەنسادا

دەورێکی گرنگیان گێڕا. ئەوان لەوێدا نووسیویانە کە سەردەمی دین و فەلسەفە تەواو بووەو چیدی دەور دەوری عەقڵ و زانیاریە. دەتوانین بڵێین کە شۆڕشی ١٧٨٩ فەرەنسا بەرهەمی کاریگەریی ئەنسکلۆپیدیا بوو لەسەر رووناکبیران.

ڕۆشنگەری فەرەنسا رادیکاڵتر لە ڕۆشنگەری ئینگلیز بوو، گیانی شۆڕشگێڕانەی ئەم بزوتنەوەیە قەرزاری ئاتێیزم و ماتریالی بوونەکەی بوو. ئەوان دەیانگوت کە نابێت لە دیندا چاکسازی بکرێت بەڵکو دەبێ وەلا بنرێت لە سیاسەتیشدا ئامانجیان شۆڕش بوو، نەک گۆڕانکاری. ئەوان لە وەڵامی متافیزیکیەکاندا دەیانگوت دین و عەقڵ پێکەوە ناگونجێن. لە کاتێکدا کە دیدرۆ بە ئاشکرا باسی ئاتێیزمی دەکرد، دالامبێر پێکەنینی بەم وتانە دەهات. ئایدیای گرنگی ڕۆشنگەری ئینگلیز، لیبرالیزم و دەئیزم بوون. دئیستەکان خودایان بە دروستکەری گەردوون ئەزانی و بوونی پێغەمبەرەکان و پیاوە پیرۆزەکانیان ئینکار دەکرد.

لیبرالیزمی تاکرەوی ڕۆشنگەری ئینگلیز، خوازیاری دابەشکردنی دەسەڵات بوو لە حکومەتدا. لە ئاکامدا ویست و داواکارییەکانی ڕۆشنگەری ئەوروپا گەیشتە ئەمریکا. ئەو شوێنەی کە دەیان ساڵ بوو کە لیبرالیزمی جۆن لۆك بانگەشەی رەهای ئازادی تاکی دەکرد. بیرمەندانی ڕۆشنگەری وەکو سەردەمی رێنیسانس بڕوایان وا بوو مرۆڤ لە جیهان و بونەوەرەکانی تر گرنگترە و دەروونناسی (سایکۆلۆژی) لە سەروی متافیزیکەوەیە. ڕۆشنگەری فەرەنسی لەم تایبەتمەندیانەدا رەنگی دابووەوە: عەقڵگەرایی (لایەنگری لە عەقڵ)، ئەزموون گەریی و هەوڵ و کۆشش بۆ ئاسایش و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی. ئەمرۆکە وای بۆ ئەچین کە تێکرای دروشمەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری بۆ گەیشتن بە عەقڵ و ئازادی و پێشکەوتن بێ سنوور بوون. ئاتەئیزمە رادیکاڵەکەی ئەوان زۆرتر لەسەر بنەمای هێزی عەقڵ و زانست دانرابوو. ڤۆڵتێر و هۆڵباخ لە فەرەنسادا رەخنەیان لە دەسەڵاتی بێ سنووری دین و کەنیسە دەگرت. لە جیهانبینی ئەواندا دوو حەقیقەتی تر بەدی ئەکرێت کە باوەڕی ساویلکانە بە پێشکەوتنی بێ سنوری کۆمەڵایەتی و پەروەردەکردنی مرۆڤ بوو. ئەوان بەپێی یاسا سروشتیەکان خوازیاری بەرابەری مرۆڤەکان بوون. لە ڕوانگەی سروشتیەوە، ئەوان بەو قەناعەتە گەیشتبوون کە مرۆڤ دەتوانێت خاوەنی عەقڵ و سیفاتی چاك و دڵفراوان بێت. ئەوان جگە لە ئازادی و بەرابەری مرۆڤەکان لە بەرانبەری یاسادا، خوازیاری خۆشبەختی و بەختەوەری مرۆڤ و پێکەوە گونجانی بیروڕا جیاوازەکان بوون. ڕۆشنگەران دژە خورافەی دینی و لایەنگری ئاتێیزم تاکگەراو جیهان وەتەنی بوون. هەروەها خوازیاری ئازادی مافی نارەزایەتی، موڵکایەتی و ئاسایشی تاك بوون. ماتریالیزمەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری هەروەها لایەنگری یەکسانی مافی ژن و پیاو بوون. لە تایبەتمەندیەکانی تری ئەوان فکری شەفاف، رەخنەی وردبینانەو دەوڵەمەندی و بەربڵاوی ئەزموون بوو.

نووسەران و ئەدەبیاتیش، دەورێکی گرنگیان لە بزوتنەوەی ڕۆشنگەری فیکریدا هەبوو. هەندێکیان لە بەناوبانگترین نووسەرانی سێ سەدەی رابردووی ئەوروپا بوون. «لیسنگ»ی ئەڵمانی بە شانۆگەری «ناتان دانا» خوازیاری دۆستی و نزیکایەتی و گونجاندنی بیروڕا جیاوازەکانی ئایینی بوو. رەخنەگرەکان لە سەرەتای ئەم سەردەمەدا بەرهەمەکانی شکسپیریان لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتی، ئینسانی و رەخنەگرانەوە شی کردەوە.

ڕۆسۆ جگە لە عەقڵ بایەخی بۆ هەست و نەست و غەریزە سروشتیەکانی مرۆڤ دەدا.

گرنگیدان بە هەستەکان بووە هۆی ئەوەی کە هونەر و ئەدەبی ڕۆشنگەری بەرەو هونەری «ڕۆکۆکۆ» بچێت. بەرهەمەکانی نوسەرانێکی وەك ڕۆبۆفت، دۆڤۆ و ڕۆسۆ لە بواری فێرکاری یان ڕاپۆرت یان سەفەرنامەدا، سەرنجی خوێنەرانی راکێشا و هەوڵ درا تا بۆ یاسای گشتی ئەدەبی و دانانی سنوورێك بۆ ژانرە «بابەت» جۆراوجۆرەکانی ئەدەب، فەرهەنگێك دابنرێت.

هەندێ لە گەورەترین و گرنگترین نوێنەرانی بزوتنەوەی فیکری ڕۆشنگەری ئەو سەردەمە، وڵاتی خۆیان

بەجێهێشت و ڕوویان لە وڵاتانی دیکە کرد. دیدرۆ ماوەیەک میوانی کاترینی مەزن، شاژنی ڕوسیا بوو، ڤۆڵتێریش چەند ساڵێک لە کن پاشای پروس لە ئاڵمان مایەوە. هاونشینی لەگەڵ ئەم ڕۆشنبیرانەدا، بووە هۆی ئەوەی کە فرێدریش، شای دیکتاتۆر، دان بەوەدا بنێت کە پاشا دەبێت یەکەم خزمەتکاری دەسەڵات بێت. ڤۆڵتێر لە پەیوەندی لەگەڵ مەسیحیەتدا، دەیگوت: «خورافاتی هیچ و پووچ لە ناو خەڵکدا، بنەبڕ بکەن». دالامبێرش دەیگوت: «مەسیحیەت پاشماوەی فریوێکی مەزنە، چونکە دوای دزینی تەرمی عیسا، وایان بڵاوکردەوە کە ئەو بەرەو ئاسمان هەڵکشاوە» ئەوی تر پێی وابوو، «دینی حەقیقی، دینی عەقڵگەرایە، چون هەر شتێک لەگەڵ عەقڵ نەگونجێت لە خورافە بەولاوە چیتر نیە». هەروەها لە پەیوەندی لەگەڵ ڕۆشنگەریدا، کانت بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە بەبێ ترس سود لە عەقڵی خۆتان وەربگرن. ڕۆشنگەری یانی ڕزگاربوونی مرۆڤ لە هەلومەرجی سەپێندراوی خۆنەویستی خۆ بە کەم زانین و نەترسانە بڕیاردان بۆ بەکارهێنانی هزر و بیری خۆ بەبێ یارمەتی خەڵکی تر. ئەوان دەیانویست کە هەوڵی تاک بۆ بەختەوەری بنەمایەک بێت بۆ یەکیەتی گەلانی جیهان.

## پەراوێزەکان:

هونەری ROKOKO یان ROCOCO، شێوازێکی هونەری سەدەی هەژدەهەمە لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا و دەرەنجامی پشتکردنە لە هونەری بارۆک BAROQUE. پتر لە بواری شێوەکاری و مۆسیقا و معماری و نژیارڤانیدا ڕەنگی دایەوە. (وەرگێڕ).

## سەرچاوە:

WWW.ARMANS.COM

ئەمانۆیل كانت
لە فارسییەوە: بەختیار عەلی

# سەردەمی ڕۆشنگەری چییە؟

دەرچوونی مرۆڤە لەو حاڵەتی ئیفلیجی و دەستەوەستانەی کە هەر مرۆڤ خۆی بەرپرسیاری مانەوەو بەردەوامیەتی، ئیفلیجیش ئەو بارودۆخەیە کە مرۆڤ ناتوانێت هزری خۆی لە دەرەوەی ڕێبەرایەتی کەسانی دیکەدا بخاتە کار. مرۆڤی ئیفلیج بەرپرسیارە لە ئیفلیجیەکەی خۆی، چونکە هۆیەکەی ناگەڕێتەوە بۆ ون بوونی هزر، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ دەستەوەستانی لە بڕیارداندا و ترسنۆکی لە بەگەڕخستنی ئەو بڕیارانەدا، بەبێ ڕێبەرایەتی کەسانی تر. دروشمی سەردەمی ڕۆشنگەری ئەوەیە: (با هێند ئازابیت، بتوانیت هزرت بخەیتە کار).

بەهۆی سستی و ترسنۆکیەوەیە کە گەلێك کەس ئەگەرچی لە مێژە سروشت لە ڕێبەرایەتی خەڵکانی تر ئازادی کردوون، بەڵام بە درێژایی ژیانیان و بە قبوڵی خۆیان ئیفلیج و بێ توانا ماونەتەوە، تا ئەو ئەندازەیەی کە ئیدی سانا و بێ ئەزیەت بووە خەڵکانی تر بێن و خۆیان بکەن بە گەورەیان. بەڵێ گەلێك سووك و ئاسانە مرۆ بە ئیفلیجی بمێنێتەوە، ئەگەر من کتێبێکم هەبێت شوێنی هزری خۆم بۆ بگرێتەوە، لەبری هوشیاریشم سەرکردەیەك بیرم بۆ بکاتەوە، پزیشکێك پرۆگرامی خواردن و خواردنەوەم بۆ دیاری بکات.. هتد، ئیدی چ پێویستم بەوەیە زەحمەتی گەڕان و پشکنین بنێمە بەرخۆم، لە ڕاستیدا بتوانم بەهای ئەو ئەرکە بدەم کە کەسانی تر لە بری من بیر بکەنەوە، خۆم پێویستم بە بیرکردنەوە نابێت.

زۆربەی زۆری خەڵك (لە تەکیشیاندا هەموو کیژان و خانمان)، ئەو هەنگاوە بەرەو گەورەبوون و بیرکردنەوە بە هەنگاوێکی گەلێك ترسناك دەزانن، چجا با ئەرك و

زەحمەتەکەشی لەولاوە بوەستێت. ئەوانەش کە کۆمەك بە قبوڵکردنی ئەم ئیفلیجیە دەکەن، ئەو پیاوە گەورە و کاربەدەستانەن کە بە ڕەوای دەزانن دەستەڵاتێکی ئەوتۆیان بەسەر مرۆڤایەتیدا هەبێت کە لە هەر گومان و گۆڕانکاریەك بەدوور بێت.

ئەم پیاوانە دوای ئەوەی دەرگاکانی بەندیخانەی نەفامیان لەسەر گارانەکانیان پێوەداوە، چاودێریەکی وردیشیان خستۆتە سەر ئەم مەخلوقاتە هێمن و لەسەرخۆیانە، واشیان تێگەیاندوون ئەگەر بە تەنها بیانەوێت لە نێوەندی ئەو دیوارانە دەرچن، مەترسیەکی گەورە چاوەڕوانیانە، بەڵام لە ڕاستیشدا مەترسیەکە تا ئەو ئەندازەیە گەورە نییە، لەبەرئەوەی ئەگەر ئەوان هەوڵیان دا و کاریان بۆ کرد دوای چەند کەوتن و نسکۆیەك فێری هەنگاونان دەبن، بەڵام هەمیشە کەوتنەکان ترسێکی ئەوتۆیان تیا دروست دەکەن، وایان لێ دەکات پاشگەز ببنەوە لەوەی جارێکی دی تەقەلایەکی دیکە بدەن. لەبەرئەوە کارێکی گرانە فەرد بتوانێت بەتەنها لەو حاڵەتی ئیفلیجیە دەرچێت کە وەختە ببێتە جۆرێك لە سروشت تیایدا و ڕەزامەندیشە بەو ئیفلیجیە و ناتوانێت لەو قۆناغەدا هزری تایبەتی خۆی بخاتە کار، کە لە ڕاستیشدا هزر لە هەر دەرفەتێکی بەکارهێنان مەحروم کراوە. دەزگاکان و چەمکە وشکەڵاتووەکان، واتە ئەو کەرەستانەی کە تایبەتمەندی بەکارهێنانەکانی هزرن یاخود ئەگەر وردتر قسان بکەین ئەو کەرەستانەی تایبەتمەندی بەگەڕخستنێکی خراپی تواناو بەهرە سروشتیەکانن، کۆمەڵێك کۆت و پێوەندن و لەم دۆخی ئیفلیجیەدا (کە تا ئەمڕۆ پایەدارە)، بە دەست و پێی ئیفلیجیەکاندا هەڵواسراون. ئەگەر هاتوو یەکێکیش لەم ئیفلیجانە ئازاد بوو، دەتوانێت چی بکات جگە لە بازدانێکی سڵوکانەو پڕ لە ترس زیاتر، بەسەر درزو کەلەبەری چکۆلە چکۆلەدا، چونکە تا ئەو کاتە فێر نەبووە قاچەکانی خۆی بە ئازادی بجوڵێنێتەوە. لەبەرئەوە تەنها ژمارەیەکی کەم لە خەڵك توانیویانە لە ڕێگای بەکارهێنانی زەینی تایبەتی خۆیانەوە، لەو حاڵەتی ئیفلیجیە دەرباز ببن و بە هەنگاوی جێگیر و پایەدار بە ڕێگادا بڕۆن.

بەڵام مەسەلەی ئەوەی جەماوەرێك بۆ خۆی بچێتە سەر ڕێگای ڕۆشنگەری، ئەمەیان ئەگەری زیاتری هەیە و ئاسۆکانی کراوەترە. بەڵکو لە ڕاستیدا ئەگەر بڕێك ئازادی بدرێت بەو جەماوەرە، ئەم مەسەلەیە دەبێتە شتێك کە ناتوانرێت بخرێتە لاوەو نکوڵی لێ بکرێت. بۆ ئەمەش دەبێت لە ناو ڕیزی فەرمانڕەوا بەرەسمیەت ناسراوەکاندا، بڕێك خەڵك هەبن (سەربەخۆ و دوور لە عەقڵیەتی ڕابەری — و.ك) بە هزری خۆیان بیر بکەنەوە، خەڵکێك کە لە حاڵەتی ئیفلیجی دەرچوون و سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی گیانێکن کە هەر کەس بەهای تایبەتی خۆی بزانێت و هەر کەس ڕوو لە بیرکردنەوەی تایبەتی خۆی بکات.

دەبێت تێبینی ئەوەش بکەین ئەو جەماوەرەی لە ژێر دەستەڵاتی ئەو فەرمانڕەوایانەدا بووە، دوای ئەوەی کە ڕزگاریان دەبێت هەر ئەوان فەرمانڕەواکان ناچار دەکەن لە دۆخێکی نزمتردا بمێننەوە، کاتێك هەندێك فەرماندار دی کە ڕۆشنایی ڕۆشنگەریان بەرنەکەوتووە، بەرەو ڕابەرێتی توند پاڵیان پێوە دەنێن. ئەمەش خراپی و نالەباری حوکمدانی پێش وەختمان بۆ دەردەخات کە هەر بۆ خۆی تۆڵە لەوانە دەکاتەوە کە چاندوویانە، یان ئەوانەی بەدوویاندا دێن، چونکە جەماوەر بە جۆرێکی لەسەرخۆ نەبێت ناگاتە قۆناغی (ڕۆشنگەری) شۆڕش دەتوانێت دیکتاتۆریەتی تاکە کەسان بروخێنێت، چەوساندنەوەو جەوری تەماحکارانە نەهێڵێت، بەڵام هەرگیز ڕیفۆرمێکی ڕاستەقینەی شێوازەکانی بیرکردنەوەی لەتەك خۆیدا هەڵنەگرتووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە کۆمەڵێك بڕیاری پێش وەختی نوێ لەتەك خۆیدا هەڵدەگرێت کە لەگەڵ بڕیارە پێش وەختە کۆنەکاندا سنوورێك دروست دەکەن، شۆڕش دادەبڕێت لەو خەڵکانەی لە بیرکردنەوە مەحروم کراون.

بۆ ڕۆشنگەری جگە لە (ئازادی) هیچی دی مەبەست نییە، ئازادی بە مانا زۆر پاکەکەی، ئەویش قبوڵکردنە بە بەکارهێنانی ڕاشکاوانەی عەقڵ لە هەموو بوارەکاندا. بەڵام ئەمڕۆ لە هەموو لایەکەوە گوێم لە

هاوارێکە دەڵێت: (بیر مەکەنەوە) ئەفسەر دەڵێت: (بیرمەکەنەوە)، ئەرکەکانتان جێبەجێ بکەن. لێپرسراوی دارایی دەفەرموێت: (بیرمەکەنەوە)، باجەکانتان بدەن. پیاوی ئاینی دەڵێت (بیرمەکەنەوە) بەڵکو بڕواتان هەبێت. ئەمڕۆ لە سەرتاسەری دونیادا تاکە گەورە پیاوێك هەیە کە دەڵێت: «تا دەتوانن بیربکەنەوە و لە چ شتێکیش بیردەکەنەوە گرنگ نییە، بەڵام دەبێت ملکەچ بن»، لە هەموو شوێنێکدا سنوورێك بۆ ئازادی دانراوە. بەڵام ئاخۆ چ سنوورێك پێچەوانەی رۆشنگەرییە؟ چ سنوورێکیش دژی رۆشنگەری نییە و دەشێت لە قازانجیشیدا بێت؟ من دەڵێم بەکارهێنانی گشتی عەقڵمان پێویستە لە هەموو حاڵەتەکاندا ئازادانە بێت، تەنها ئەو بەکارهێنانەشە رۆشنگەری لە مرۆڤ نزیك دەکاتەوە، بەڵام بەکارهێنانی تایبەتی عەقڵمان پێویستە ملکەچی چەند سنوورێکی توند و تیژ بێت بەبێ ئەوەی ئەو سنوورانە ببنە کۆسپ لەبەردەم رۆشنگەریدا.

مەبەستم لە بەکارهێنانی گشتی (عەقڵ)، ئەو جۆرە بەکارهێنانەیە کە پیاوی (زانا) لەبەردەم جەماوەرێکی خوێندەواردا ئەنجامی دەدا. بەڵام بەکارهێنانی تایبەتی (عەقڵمان) ئەو جۆرە بەکارهێنانەیە کە مافی پراکتیك کردنمان پێدەدات و هەقمان هەیە لە شوێنێکی مەدەنیەوە یان لە هەر وەزیفەیەکی دیاریکراوی دیکەوە کە پێمان سپێردراوە کاری پێبکەین. چونکە لە چوارچێوەی ئەو مەسەلانەدا کە تایبەتە بە قازانجە گشتیەکان، دەزگایەکی میکانیکی دیاریکراو هەیە، کە ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵەیە ناچار دەکات هەستن بە ئەنجامدانی هەندێك کردار کە هیچ ئیرادەیەکی خۆیانی تیادا نییە و حکومەت بۆ بەدیهێنانی ئامانجە گشتیەکان یان لایەنی کەم بۆ پاراستنی ئەو ئامانجانە لە فەوتان، لە رێگای گردبوونەوەیەکی دەست کرد و خوڵقێنراوەوە ئەو کەسانە ئاراستە دەکات، لێرەدا رێگا بە بیرکردنەوە نادرێت و پێویست بە ملکەچی دەکات.

بەڵام ئەگەر کەسێکی ئەو دەزگا میکانیکیە لە هەمان کاتدا بە سیفەتی زانا ئەندام بوو لە کۆمەڵەکەدا یاخود لە (کۆمەڵگای مەدەنی جیهانیدا)، ئەم ئەندامەش بە پاڵپشتی هزری خۆی چەند نووسینێکی هێنایە مەیدان، لەم حاڵەتەدا دەتوانێت عەقڵی بەکاربهێنێت بەبێ ئەوەی ئەم بەکارهێنانە کار بکاتە سەر ئەو ئیش و کارانەی وەکو رەگەزێکی سەلبی لە بەشێکی کاتەکەیدا پێی سپێردراوە و پێی هەڵدەستێت.

ئەفسەرێك لە کاتێکدا چەند فەرمانێکی لە قوماندانەکەیەوە بۆ هاتووە، ئەگەر بیەوێت عەقڵی خۆی بخاتە کار بۆ ئەوەی چاك و خراپی فەرمانەکە لێك بداتەوە، ئەمە کارێکی ترسناکە و پێویستە ئەو ئەفسەرە ملکەچ بێت. بەڵام ئەگەر بمانەوێت هەقانی بین دەڵێین ئەگەر هاتوو ئەو ئەفسەرە زانا بوو، زۆر رەوایە تێبینیەکانی خۆی سەبارەت بە هەڵە و کەم و کوریەکانی ناو سیستمی (جەنگی) بخاتە روو و پێشکەش بە خەڵکی بکات تا رای خۆیانی لەسەر دەربڕن، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی لێ قەدەغە بکرێت.

ناکرێت هاوڵاتی سەرپێچی بکات لە پێدانی باج، بەتایبەتی ئەگەر رەخنەیەکی توند لەم ئەرکانە بگرێت. ئەمە دەیخاتە بەر مەترسی سزادان، چونکە دەشێت رەخنەکەی ببێتە مایەی ئابڕوچوون (ئیدی ئەم ئابڕووچوونەش دەبێتە مایەی پەشێویەکی سەرتاسەر لەناو سیستمەکەدا)، بەڵام کە ئەم جۆرە سڵکردنەوەیە لە بابەتەکە نیشان دەدەین، هیچ دژایەتی و ناکۆکیەکیشی لەگەڵ ئەرك و فەرمانەکاندا نابینین، ئەگەر هاتوو ئەم هاوڵاتیە (بەو سیفەتەی کە زانایە) بە شێوەیەکی راشکاوانە دید و بۆچوونی خۆی سەبارەت بە ناشرینی ئەو باجگیریە و زۆرداری ئەو کەسە نیشاندا کە ئەو حاڵەتەی سەپاندووە، هەروەها پیاوی ئاین لە پەرستگاکەی خۆیدا دەبێت رەعیەتەکەی بەپێی هێمای ئەو کڵێسەیە فێر بکات کە خزمەتی دەکات، چونکە ئەو بەپێی ئەو مەرجانە لەوێکانەدا دانراوە، بەڵام وەکو زانایەك تەواوی سەربەستی هەیە (ئەگەر نەشڵێین، ئەرکی سەرشانێتی) کە بیروراکانی خۆی بخاتە پێش دەمی جەماوەر، دوای ئەوەی بە رۆحێکی چاکەکەر بە وردی هەڵیاندەسەنگێنێ، بۆی هەیە چی لەم هێمانانەدا بە هەڵە دەزانێت ئاشکرایان بکات و پڕۆژەی

ڕوانینی خۆی بۆ ڕێکخستنێکی چاکتری کاروباری ئایین و کڵێسە بخاتە ڕوو. لەم کارەشدا چ شتێکی وا نابینرێت ویژدان ئەزیەت بدات، چونکە وەکو نوێنەرێکی کڵێسە ئەوەی بەپێی ئیشەکەی فێری خەڵکی دەکات، فەرمانێکە و ناتوانێت ئازادانە بیرورای خۆی تیا بەیان بکات، بەڵکو کۆمەڵێک ئامۆژگارییە کە بۆتە پابەندیان و بە ناوی دەستەڵاتێکی دەرەکیەوە بڵاویان دەکاتەوە.

ئەو دەڵێت: (کڵێسە وامان فێر دەکات)، ئەمەش ئەو بەڵگانەیە کە لەو مەسەلەیەدا دەیخاتە ڕوو لەوانەیشە هەر بەو بۆنەیەوە گەلێک خەسڵەتی باشی پراکتیک کاری ئەو تێزانە بخاتە ڕوو کە خۆی بڕوایەکی تەواوی پێیان نییە و ناچار بووە بیانخاتە ڕوو، چونکە دەشێت هەندێک ڕاستی شاردراوەی تیا دۆزیبێتەوە یاخود لایەنی کەم شتێکی ئەوتۆ پێچەوانەی تیا نەبینێت کە دژ بە بڕوا تایبەتیەکانی خۆی بوەستێتەوە، بەڵام ئەگەر کەوتە جۆرە حاڵەتێکی لەو بابەتەوە، ئەو کات ناتوانێت لە ئیشەکەشیدا بەردەوام بێت و لەگەڵ ویژدانیشیدا کۆک و تەبا بێت. کەواتە دەبێت واز لە کارەکەی بهێنێت. لێرەوە ئامۆژگارو ئەوانەی خەڵکان گۆش دەکەن لە کاتی کارکردندا و لە پێش دەمی ئەوانەدا کە وانەکانیان گوێ لێدەگرن (بەکارهێنانێکی تایبەتی) عەقڵ دەخەنە کار، چونکە مەسەلەکە مەسەلەی کۆبوونەوەیەکی خێزانیە، جا ئیدی قەوارەی ئەو خێزانە هەر چەندێک بێت. ئەویش لەبەردەمیاندا وەکو پیاوێکی ئاینیانەی پابەند قسان دەکات، لەبەرئەوەی فەرمانێکی دەرەکی جێبەجێ دەکات، ناتوانێت ئازاد بێت، بەڵام ئەگەر بە زانایەک لە قەڵەممان دا کە بە نووسینەکانی قسان بۆ جەماوەرێکی ڕاستەقینە دەکات. واتە زانایەک وەکو ئەندامێک لە دەستەیەکی دینیدا کە لە چێوەی بەکارهێنانێکی گشتیانەی عەقڵی خۆیدا کار دەکات.. ئازادیەکی بێ سنووری هەیە لە بەکارهێنانی عەقڵی خۆیدا و سەربەستیەکی تەواوی هەیە بە ناوی کەسی خۆیەوە قسان بکات.

ئەو پڕوپاگەندەیەش کە دەڵێت فەرمانڕەوایان و لێپرسراوی میللەتان (لە کاروباری ئاینیدا ) دەبێت خۆشیان ئیفلیج بن، تروهاتێکی بێ مانایە کە —پشتگیری تروهاتەکانی دیکە دەکات.

بەڵام ئەم کۆمەڵە ئاینیە، جا چ جا کۆمەڵێکی کڵێسەی بێت، یاخود چینێک بێت لە پەترپارکان. (وەک لە هۆلاند وایان پێ دەگوترێت)، ئاخۆ دەبێت بۆیان هەبێت ئەندامەکانیان بانگ بکەن تا سوێند لەسەر هێمایەکی نەگۆڕ و دیاریکراو بخۆن، تا دواتر فەرمانڕەواییەکی باڵاو هەمیشەیی بەسەریاندا بسەپێنێ و لە ڕێگای ئەوانیشەوە سیفەتی جاویدانی و نەمری بەو فەرمانداریە ببەخشن؟ لە ڕاستیدا من دەڵێم ئەمە کاری نەکردەیە، چونکە ئەم جۆرە پەیمان و سوێند خۆریە خۆی لە خۆیدا وازهێنانە لە هەر ڕۆشنگەریەکی نوێ کە لە توانای ڕەگەزی بەشەریدا بێت ئامێزی بۆ بکاتەوە و پێشوازی لێبکات. هەر لەسەر ئەم بنەمایەش هەتا ئەگەر ئەم بڕیارە لە دەستەڵاتێکی باڵای وەک پەرلەمانەکان یان لە سوێند و پەیمانی شکۆداری ئاشتیەوە سەلمێندرابێت، پوچەڵ و بێ کاریگەر دەمێنێتەوە. لەبەرئەوە هیچ سەدەیەک بۆی نییە ڕێکەوتنێکی وا بێنێتە پێش، سەدەکانی دیکەی دوای خۆی بکاتە پابەندی بڕیارێک کە چیتر نەتوانن زانستی خۆیان بەرفراوان بکەن (بە تایبەت لەو بوارانەدا کە تایبەتی قازانجەکانە لە بەرامبەر مەترسیدا). هیچ سەدەیەک ناتوانێت ڕێگا لەوانی دی بگرێت، هەوڵ بدەن خۆیان لە هەڵە ڕزگار بکەن و بە سیفەتێکی گشتی لەسەر ڕێگای ڕۆشنگەریا بچنە پێشێ. ئەگەر لەم ڕێگایەدا کۆسپ دروست بکرێت، ئەوا گوناهێکە دەرهەق بە مرۆڤایەتی کە قەدەری ڕەسەنی خۆی رووەو ئەم بەرەو پێش چوونەی دەبات. لەبەرئەوە بۆ وەچە تازەکان هەیە کە تەواوی ئەم یاسایانە قەبووڵ نەکەن و ڕەتیان بکەنەوە، بەڵگەشیان بۆ ئەوە هەڵەشەیی و نەزانینی ئەوانە دەبێت کە ئەو ڕێسا و دەستوورانەیان داناوە. بەردی بناغەی هەر شتێک کە لە قازانجی میللەتێکدا و لە شێوەی یاسادا دەیخەینە کار، لەو پرسیارەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئایا ئەم میللەتە قبوڵێتی وەها یاسایەک بداتە خۆی، دەشێت یاسای ناوبراو بۆ ماوەیەکی کەم و دیاریکراو گونجاو بێت، ئەویش لە حاڵی

چاوەڕوانیدا بۆ یاسایەکی باشتر و خۆ ئامادەکردن بۆ وەناوخستنی سیستمێکی دیاریکراوتر، بەو مەرجەی ئازادی بدرێت بە هەموو هاولاتیەك بەتایبەتی پیاوی ئایینی (ئەگەر زانا بێت)، تا تێبینیەکانی خۆی دەربارەی خەوشەکانی ناو ئەو دەزگایەی ئێستا دابڕێژێت، بە مەرجێك ئەو داڕشتنە ڕاشکاوانە بێت، واتە لە شێوەی نووسینذا بێت.

ئەمەش لەگەڵ پاراستنی سەرجەمی سیستمە خۆ گرتوو و سەقامگیرەکەدا تا ڕۆژێك دێت باس و لێکۆڵینەوە لەم بوارانەدا دەچێتە پێشێ و بە ئەندازەی پێویست بەڵگە و سەلماندنیان بۆ کۆدەبێتەوە، ئینجا پڕۆژەیەك بۆ بەردەم عەرش بەرز دەکرێتەوە، پڕۆژەیەك ئەگەر نەڵێین هەموو دەنگەکانی لە پشتە، ئەوا زۆربەیانی لە پشت دەبێت. پڕۆژەیەك کە دەیەوێت ئەو دەستەو تاقمە هاوکارانە بپارێزێت ئەگەرچی بیروڕای تایبەتی خۆیان هەیە، بەلام تەبان لەسەر گۆڕینی دام و دەزگا ئاینیەکە، بەبێ ئەوەی ئەم پڕۆژەیە مافی ئەوە بداتە خۆی بکرێتە ملی ئەوانەش کە وەفاداری دەزگا کۆنەکەن.

بەڵام ئەگەر مەسەلەکە مەسەلەی ڕێکەوتن بێت لەسەر دەستورێکی هەمیشەیی کە نەخرێتە بەر گومانەوە، هەتا ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بووە کە لە درێژی تەمەنی مرۆڤێك تێنەپەڕێت، بەڵام خۆ هەر بۆ سەردەمێك مرۆڤایەتی ئاوقای نەزۆکیەك دەکات و دووری دەخاتەوە لە پەرەسەندن و زیان لە نەوەکانی داهاتوو دەدا، لەبەرئەوە ئەمەیان کارێکی تەواو قەدەغەیەو ڕێگەی پێنەدراوە.

هەرکەسێك بۆی هەیە زانستێك کە پێویستە فێری ببێت بیخاتە کاتێکی دی و لە دەمێکی دیکەدا فێر ببێت، بەڵام مەسەلەی ئەوەی پشتی تێبکات و نەوەکانی داهاتووی لێ حەرام بکات، ئەمە پێی دەگوترێت دەستدرێژکردنە سەر مافە پیرۆزەکانی مرۆڤ و پێشێلکردنی. ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە کە لە میللەت حەرام کراوە، دەبێت بە حەرام لەسەر فەرمانڕەواش بنوسرێت، چونکە فەرمانڕەوا لەلایەنی تەشریعیەوە لە میللەتەوە هەڵقولاوەو ئیرادەی تایبەتی فەرمانڕەوا لە ئیرادەی گشتی گەلەوەیە. جا با فەرمانڕەوا هەوڵ بدات ڕیفۆرمە بەدیهاتووەکان و ئەو ڕیفۆرمانەش کە دەبێت بهێنرێتە دی، لەگەڵ سیستمی مەدەنیدا بگونجێنێت و شەونخونی بەدیار ئەو ئەرکەوە بکێشێت.

با ئازادی باس و گفتوگۆ بداتە میللەتەکەی سەبارەت بەوەی دەبێت چی بکەن و چی نەکەن، تا گیانیان لە سزای ئەو دنیا ئازاد بێت، چونکە ئەم کێشەیە پەیوەندی بە کەسی فەرمانداراوە نییە، بەڵکو ئیشی ئەوەیە بوار نەدات هەندێك لە خەڵك ڕێگا لە هەندێکی دیکەیان بگرن کە خەریکن ڕزگاری خۆیان وەدەست دەهێنن و بە پەلەن لە بەدیهێنانی ئەو کارەدا. فەرمانڕەوا زیانێکی ئێجگار گەورە لە شکۆی خۆی دەدات ئەگەر لە وەها کارێکدا کە هاولاتیەکانی دەیانەوێت بیروڕای خۆیانی لەسەر بدەن، بە جۆرێکی ڕەسمی بێتە مەیدان. ئەگەر لە ڕوی دەسەلاتی تایبەتی خۆشیەوە وەها کردەوەیەکی لێ بوەشێتەوە، ئەوا خۆی دەخاتە بەردەم ئەو تیروتوانجەی پێی بلێین: (خۆ جەنابی قەیسەر لە ڕێزمان ناسەکان شارەزاتر نییە). ئەگەر ئەو لە دەوڵەتەکەی خۆیدا ستەمکاریەکانی کلێسە و هەندێك لەو جەورکارانی زیاتر لە هاولاتیان پاراست و باوەشی بۆ کردنەوە، ئەوا بەو کردارەی لە توانستە بەرز و بالاکانی خۆی کەم دەکاتەوە.

دوای ئەو هەموو قسانە ئەگەر بپرسین: ئاخۆ ئێمە ئەمڕۆ سەردەمی ڕۆشنگەری دەژین؟ دەڵێم: نا لە ڕاستیدا لە سەردەمێکدا دەژین کە بەرەو ڕۆشنگەری دەچێت. تا ئەمڕۆ ئێمە کوری ناو ڕۆژگارێکین کە گەلێك ڕەگەزی دیکەی پێویستە، بۆ ئەوەی خەڵکی وا لێبکات بیرکردنەوەی تایبەتی خۆیان مەحکەم و بە تواناو بێ هاریکاری کەس (لە مەسەلە ئاینیەکاندا) پراکتیك بکەن. بەڵام ئەوەی کە ئەمڕۆ خەڵکی بوارێکی فراوانتریان هەیە تا ئازادانە ئەو بیرکردنەوە تایبەتیەی خۆیان بخەنە کار و ژمارەی کۆسپەکانیش لە جاران کەمترە بۆ ئەوەی بەرەو سەردەمێکی ڕۆشنگەری سەرتاسەر بڕۆین و خەڵك لەو ئیفلیجیە دەربازیان بێت کە

هەر خۆیان لێی بەرپرسیارن، ئەوا لە ڕاستیدا بەڵگە و بەهانەمان زۆرە بیسەلمێنێت ئێمە بەرەو ڕۆشنگەری دەچین.

لەم دیدەگایەوە دەتوانین بڵێین ئەم سەدەیە سەدەی ڕۆشنگەری و سەدەی «فردریك پاشایە». «فردریك» ئەو کەسەیە نیگەران نییە لەوەی بڵێت ئەرکی سەرشانی ئەوە کە نابێت لە مەسەلەی کاروباری دینیدا، هیچ فەرمانێك بڵاوبکاتەوەو لەمڕووەوە تەواوی ئازادی دەداتە خەڵك و لە بەکارهێنانی وشەگەلێکی پڕ غروری وەکو: (لێبوردن و لێ خۆش بوونیش) نکوڵی دەکات. ئەمیری وا بۆ خۆشی ڕۆشنگەرێکە، لەبەرئەوە شایستەی ستایشی هاودەمانی خۆیەتی و دەبێت وەچەکانی داهاتووشی دان بە چاکی کردارەکەیدا بنێن، چونکە ئەو یەکەمین کەسە ڕەگەزی بەشەری لە ئیفلیجی دەرهێناوە (لایەنی کەم ئەو کردارەی لە ڕووی ئیدارییەوە بە ئەنجام گەیاندووە). هەر ئەو ئازادی داوەتە هەموو کەسێك تا ئەقڵی تایبەتی خۆی لە مەسەلەکانی (عەقیدەدا) بخاتە کار، هەر لە سەردەمی «فردریك»یشدا پیاوە ئاینیە بەرێزەکان ئەگەر زانا بوونایە، مافی ئەوەیان دەست دەکەوت بیرو بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە هێما ڕەسمیەکانی کڵێسە بەیان بکەن، بێ ئەوەی ئەم کردارە ڕەنگدانەوەیەکی خراپی لەسەر جێبەجێکردنی ئەرکەکانی سەر شانیان هەبێت. هەروەها مافی ئەوەش بەدی هات بە ڕاشکاوی و لە دەرەوە دید و بۆچوونەکانی خۆیان بخەنە ناو تاقیکردنەوەوە.

بێگومان ئەوەش تایبەتی ئەو کەسانەیە کە پابەند نین بە وەزیفەکانیانەوە. ئەمڕۆ ئەگەرچی چەند کۆسپێکی بابەتی دێتە ڕێگا کە دەوڵەت دروستی کردووە، ئەمە لە حاڵێکدا کە هێشتا لەم بوارەدا دەوڵەت ڕۆڵی خۆی بۆ ئاشکرا نەبووە، بەڵام گیانی ئازادی هەتا لە دەرەوەش تەشەنەی سەندووەو بڵاوبۆتەوە. ئەوەی ئێمەی تێداین (واتە حکومەتی فردریك)، نموونەیە بۆ هەر دەوڵەتێك کە تا ئەمڕۆ تێنەگەیشتوون کەش و هەوای ئازادی، هیچ ترسێکی نییە بۆ سەر پەیمانی سیاسی و یەکێتی ناو دەزگا گشتیەکە کە لەوێدا خەڵکی ئەگەر یەکێك بەگیریان نەهێنێت تەقەلایەکی گەورە دەدەن لەو دۆخی وشك و برینگیە ئازادیان بێت.

لەم باسەدا سەبارەت بە سەردەمی ڕۆشنگەری، بایەخێکی زیادم بەو جۆرە ڕۆشنگەریە دا کە خەڵکی لەو حاڵەتی ئیفلیجییە ئازاد دەکات کە خۆیان بەرپرسیارن لێی، بایەخی زیادیشم بە مەسەلە ئاینیەکان دا، چونکە فەرمانڕەوایانی ئێمە لە بواری زانست و هونەردا خۆشیان بکەنە سەرگەورە قازانجێکیان چنگ ناکەوێت. دوای ئەوە ئەم حاڵەتی ئیفلیجیە ئایینیە کە باسم لێکرد زیانبەخشتر و مڵهورانەترە، بەڵام میتۆدی بیرکردنەوەی ئەو سەرەك دەوڵەتەی (کە لێرەدا مەبەست فردریکە، و.ك)، هانی ڕۆشنگەری دەدات گەلێك لەوەش زیاتر دەڕوات.

ئەو (سەرۆك دەوڵەتە) لە ڕوانگەی تەشریعەکەی خۆیەوە دان بەوەدا دەنێت هیچ مەترسیەکی لەسەر نییە ئەگەر ڕێگا بە ژێردەستەکانی بدات ڕاشکاوانە عەقڵی خۆیان بەکاربهێنن، تا بەرهەمی هزری خۆیان بخەنە بەردەست بۆ دارشتنێکی باشتر بۆ ئەو تەشریعە، هەتا ئەگەر ئەو کارەیان لە ڕێگای ڕەخنەیەکی ڕاستەوخۆوە لە تەشریعە دانراوەکە بە ئەنجام گەیاندبێت، لەمەشدا نموونەیەکی پیرۆزمان هەیە ئەو پادشایەیە کە ستایشی دەکەین و جگە لەویش کەسی دیکە بە کاری وا هەڵنەستاوە.

ئەم پادشا ڕۆشنگەرە تەنها پادشایە کە ناترسێت لە سێبەردا بمێنێتەوە و سوپایەکی دێرین و ڕێکخراوی لە ژێردەستدایە کە ئاسایش و دڵنیایی گشتی پێ دەپارێزێت، تەنها پادشایە دەتوانێت ئەو قسەیە بکات کە هیچ دەوڵەتێکی ئازادی دیکە ناوێرێت دوو لێوانی تیا ببزوێنێت، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێت: (چەند دەتانەوێت بیر بکەنەوە لە چ شتێکیش بیر دەکەنەوە، بیر بکەنەوە بەڵام پێویستە ملکەچ بن).

بەم شێوەیە کاروباری مرۆڤایەتی ڕێگایەکی چاوەڕوان نەکراو و سەرنجراکێش دەگرێتەبەر، مەسەلەکەش هەرچۆنێك بێت ئەگەر بە گشتی بیگرین، دەبینین هەموو شتەکان جۆرە هەستێکی تایبەتیان بە ناکۆکی تیا

دروست دەكەن. وەدیهێنانی پلەیەكی بەرز لە ئازادی مەدەنی بۆ مەسەلەی ئازادی فیكری لەلای سوودبەخش و بەكەڵك دێتە بەرچاو، بەڵام لە هەمان كاتدا سنوورێك بۆ میللەت دادەنێت كە میللەت ناتوانێ بیخاتە لاوەو بیشكێنێت، لەلایەكی دیكەشەوە ئاستێكی نزمتر لە ئازادی مەدەنی دەرفەتی ئەوەی پێ دەبەخشێت دەسەڵاتی خۆی بە تەواوی بڵاوبكاتەوە.

هەر هێندەی سروشت لە ژێر توێكڵە سەختەكەی خۆیەوە تۆوی ئارەزوو و تاودانی فیكری سەربەستی بەرەڵا كرد، ئیدی بە سۆزی خۆی دەوری دەدات و دەیكاتە ئەو ڕێبازەی كە هێدی هێدی كاریگەریەكی بەرتەكانە كار لە هەست و نەستی گەل دەكات. لە ڕێگای ئەو هەست و نەستەشەوە گەل ئامادەگی زیاتری بۆ ڕەفتاری ئازاد لا دروست دەبێت، ئەم ڕێبازەش بە دەوری خۆی لە دواجارا كار دەكاتە سەر بنەماكانی ئەو حوكمەی كە دەبینێت ئەگەر بەشێوەی شایستەی خۆی مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا بكات ئەمە لە قازانجێتی، چونكە مرۆ چی دیكە تەنها كەرەستەیەك نییە و بەس.

د. عیسام عەبدولفەتاح
لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

# عەلمانیەت و ڕۆشنگەری

پێم وا نییە ڕاستیمان نەپێکابێت، ئەگەر بڵێین هیچ زاراوەیەك نیە كە بیرمەندانی ئەم سەردەمە لەسەر چەمکەکەی ناتەبا بووبێتن بەو ئەندازەیەی كە لەسەر چەمکی عەلمانیەت ناتەبان. بەڵام ئەوەی گومانی تیا نیە ئەوەیە كە زۆربەی دانەرەكان، چ ئەوانەی پاڵپشتی عەلمانیەتیان كردووە، یان ئەوانەی بە توندی ڕەتیان كردۆتەوە، لەو بیرۆكە باوەوە دەستیان پێ كردووە كە بە ناهەق چەمكی عەلمانیەتیان لەوەدا كورت كردۆتەوە كە زۆر بە كورتی عەلمانیەت بریتیە لە جیاكردنەوەی دەستەڵاتی ئاینی لە دەستەڵاتی مەدەنی، ئەم مانایە لە ئەوروپای سەردەمی ڕۆشنگەریدا، واتا لە سەدەی هەژدەدا باو بووە، ئەو سەدەیەی كە ئەستێرەی عەلمانیەتی تیا درەوشایەوەو بنەمایەكی فەلسەفی بە زاراوەكە بەخشی. هەر دەیشبوو سەردەمیی ڕۆشنگەریی سەردەمی فەلسەفەی عەلمانیەت بێت، چونكە لەو سەردەمەدا دەستەڵات كەوتە دەستی ئەقڵەوە دوای ئەوەی لە سەدەكانی پێشتردا دەستەڵات بە دەست دەزگا ئایینیەكانەوە بوو.

لە ڕاستیدا، ڕەگی بیرۆكەی عەلمانیەت لە سەدەی شانزەدایە، بە تایبەتی لە شۆڕشی كوپەرنیكەوە، مەبەست نیكولا كۆپەرنیكۆس (١٤٧٣-١٥٤٣)ی زانای گەردوونناسی پۆلەندیە. چونكە كاتێك كۆپەرنیكۆس دەربارەی جووڵەی مەجەڕات و ئەستێرەكان نەیتوانی پەرە بە تیۆرەكەی بدات كە لە بیری بەتلیموسەوە سەرچاوەی گرتبوو كە تا ئەو كاتەیش هەر باو بوو، بەو مانایەی كە ئەو ئەستێرەو مەجەڕاتانە بە دەوری زەویدا گڕ دەخۆن و، كەنیسەیش پاڵپشتی ئەم تیۆرەی دەكرد چونكە لەگەڵ لێكدانەوە ئایینیە فەرمی و باوەكەدا دەگونجا، كۆپەرنیكۆس پەنای بردەبەر گریمانەیەكی تازە لەباتی گریمانە بە پیرۆز كراوەكە، ئەم بیرۆكەیەیش بەو مانا تازەیە دێت كە زەوی، وەك

هەموو ئەستێرەکانی دی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، بەهۆی ئەم گریمانە تازەیەوە کۆپەرنیکۆس توانی بەسەر ئەو تەنگژانەدا سەربکەوێت کە لە سایەی گریمانە کۆنەکەدا دەهاتە رێگای و کەس توانای ئەوەی نەبوو گومانی لێ بکات.

هەڵوێستی کۆپەرنیکۆس دەربارەی تیۆری بە پیرۆزکردن هەڵوێستێکی ناوازەی عەلمانیە، بۆ؟ چونکە دوای ئەوەی کە ئەقڵی ئەو پاشکۆی ئەقڵی کەنیسەو ملکەچی بوو. توانی ئەقڵی خۆی لەو کۆتە رزگار بکات. لە بواری بیری زانستیشدا دەستەڵاتی خۆی بسەپێنێت، بە جۆرێك تەنیا ئەقڵی دەکردە رێنمای خۆی لە بیرکردنەوەدا و هەر لەوێشەوە بریاری دەدا.

شۆرشی کۆپەرنیکۆس جارێکی دی لە سەدەی هەژدەدا دووبارە بوەوە کە بەسەدەی رۆشنگەریی ناسراوەو، فەیلەسووفی ئەڵمانی ئەمانوئیل کانت بنەماکەی داناوە. بەتایبەتی لە بەرهەمە مەزنەکەیدا (رەخنەی ئەقڵی پەتی) ئەم فەیلەسوفە بناغەی تیورێکی زانستی دانا کە سنوور بۆ مەعریفە مرۆڤایەتیەکان دادەنێت، لەوە دەدوێت کە ئاخۆ ئەقڵ لە توانایدایە درکی رەها بکات یان مەعریفە مرۆڤایەتیەکان تەنیا بۆ درکی رێژەییەکانە. ئەپستمۆلۆژیای کانت رەخنەیەکی زاتیە کە ئەقڵ لە خۆی دەگرێت. بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ خۆی دیاری بکات کە بتوانێت بە هەموو توانایەوە مەعریفە بەرهەم بێنێت و تیورەکانی تیا بنیات بنێت. ئەوەی لەو سنورە دەرچوو ئیدی هەمیشە لەبەردەم درکی ئەقڵدا بە سەختی دەمێنێتەوە.

لەم پێشەکیەوە، دەتوانین بە هۆی لێکدانەوەی زۆرەوە، رووناکیی بخەینە سەر ئەو سیما رۆشنگەریەی بە هەڵوێستی عەلمانیەتەوەیە، ئەوەیش لەرێی دوو پرنسیپی سەرەکیەوە: پرنسیپی دەستەڵاتی ئەقڵ و پرنسیپی دیموکراتیەت.

## یەکەم/ دەستەڵاتی ئەقڵ:

ئاوەزی مرۆڤ توانای بیرکردنەوەی نیە تەنیا لە بواری رێژەگەرایەتیدا نەبێت. بە مانایەکی تر، ئاوەز ناتوانێت هەموو شتەکان بە رەهایی وەربگرێت. هەروەك چۆن ئاوەز ناتوانێت لە ژێر ستەمی هەر کۆت و پەیوەندێکدا بێت بیر بکاتەوە، تۆ کە ویستت بۆ هەر کێشەیەك پەنا بۆ بیری ئەقلانی ببەیت، پێویستە یەکەمجار لە هەموو ئەو جۆرە ستەمانە خۆت رزگار بکەیت کە لە وانەیە لە شەن و کەوکردنی مەسەلەکاندا رێگا لە بیرکردنەوەی ئەقلانیت بگرن. ئەگەر کۆپەرنیکۆس هەر لە سەرەتاوە لەو کۆت و گریمانە بەپیرۆزکراوانە کە دەستەڵاتی ئاینی لەو سەردەمەدا بەسەر ئاوەزدا سەپاندبووی و نەیدەهێشت بیرکردنەوە لەو چوارچێوەیە دەربچێت خۆی رزگار نەکردایە، نەیدەتوانی دەربارەی گەردوون و بزاوتی ئەستێرەکان چ تیورەیەك بهێنێتە گۆرێ، چونکە بیروباوەرە ئاینیەکە زۆر دەمێك بوو بیری ئەقلانیی لەکار خستبوو کە بەو هۆیەوە هیچ پێشکەوتنێکی زانستی رووی نەدەدا. چونکە مەعریفەی زانستی مەعریفەیەکی یەقینی نیە بەڵکو خەمڵێنەرە. بەرئەنجامەکەیشی ئەوەیە کە پێشکەوتنی زانستیی هەرگیز لە قۆناغێکی دیاریکراودا ناوەستێت، بەڵکوو لە رەوتێکی بەردەوامدایە کە تیۆرەکانی بەردەوام دەگۆرێن، لەو رەوتەدا جێگای تیۆری پیرۆز و نەگۆر نابێتەوە، هەروەها ئەو رەوتە ئاوەز ناچار ناکات کە ملکەچ بێت یان بە ناو بیرۆکەی پیرۆزەوە کە کەس ناتوانێت دەستکاری بکات سەری بۆ بیرۆکەیەك دانەوێنێت. دەست بەسەرکردنی ئاوەز بە ناوی پیرۆزەوە حوکم دانە بە مردنی.

چرکەساتی رۆشنگەریی ئەقلانی کرۆکی هەڵوێستی عەلمانیەتە. چونکە لەو چرکەساتەدایە کە ئەقڵ ناتوانێت خۆی بکات بە قوربانیی لە پێناوی بیرۆکەیەکی ستەمگەردا کە بە ناوی هەقیقەتی رەهاوە

بانگەشەی مۆدێرنی بۆ خۆی دەکات و، نایەوێت ئەقڵ لێی نزیك بێتەوە یان هیچ نەبێت لەگەڵ میتۆدی بیری رەخنەگرانەو بیری لۆجیکیدا گونجاو بێت.

رۆشنگەریی بە مانای جڵەو دانە دەست ئەقڵە، بۆیە ناتوانین باس لە رۆشنگەریی بکەین ئەگەر لە چوارچێوەی بیرکردنەوەیەکی رێژەیی نەبێت بۆ ئەوەی کە رێژەییە، ئەمەیش ناوەرۆکێکی فەلسەفیە بۆ چەمکی عەلمانیەت. هەرچەندە هەر بە سروشتی عەلمانیەت هەڵوێستێکی ئەقڵانی و رۆشنگەریە، بەڵام تا هەنووکە دژی وەهم و نەزانینە و شەریان دەکات. چونکە تا ئێستا گەلێك سەختی و بەربەست هەیە کە رووبەرووی عەلمانیەت دەبنەوە، سەرچاوەیان وەهم و بەدحاڵی بوونێکە کە دەستی بەسەر بیرکردنەوەی کۆدا گرتووە:

## 1-وەهمی ئەو بیرکردنەوەیەی کە عەلمانیەت دژ بە ئاین دەزانێت:

لە گوتاری عەرەبیی هاوچەرخدا، وشەی عەلمانیەت وشەیەکی نەفرەتیە. بارگاویی کردنی عەلمانیەت بەوەی کە پێشێلکردنی موقەدەسەکانە، وای پێناسە کردووە، وەك یەکێك لە بیرمەندەکانی رۆشنگەریی دەڵێت: «عەلمانیەت هاومانای کوفرێکی راشکاوانەیە»[1] کاتێك دادوەر لە بکوژەکەی فەرەج فۆدەی پرسی «بۆ کوشتت؟» بکوژەکە وەڵامی دایەوە: «چونکە عەلمانی بوو» کە دادوەر لێی پرسی «عەلمانی مانای چییە؟» بکوژەکە وەڵامی دابووەوە «نازانم» تەنانەت خودی دکتۆر یوسف قەرزاوی کە گەورەترین فوقەهای ئێستای عەرەبە، لە یەکێك لە بەرنامەکانی «شەریعەت و ژیاندا» کە دەربارەی عەلمانیەتی موسڵمانەکانی ئەم چەرخە پرسیاریان لێکرد وتی: «من زۆر سەرم لەوە سوورماوە کە بۆچی تا ئێستا وەك لادەرانی ئیسلام مامەڵەیان لەگەڵدا نەکراوە؟»

ئەم وەهمە پشت بە هەمان ئەو بیرۆکەیە دەبەستێت کە پێشتر ئاماژەمان پێ کرد: جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت، لەبەرئەوەی عەلمانیەت ئەم جیاکردنەوەیەی دەوێت کەواتە دژی ئاینەو دەبێت شەری بکرێت.

لە راستیدا عەلمانیەت دژی ئاین نیە، بەڵکو داواکاری ئەوەیە کە ئەقڵ لە هەموو ئەو کار و بارانەدا بەکاربهێنرێت کە بوارێکی رێژەگەرایییان هەیە، بڕوایش ناکەم هیچ ئاینێك لە ئاینەکان هانی مرۆڤ بدات کە واز لە کارە ئەقڵیەکانی بهێنێت.

## 2-هاوشێوەبوونی دەزگا ئایینیە رەسمیەکان لەگەڵ ئایینیدا:

تا ئێستاش لە گوتاری عەرەبیی هاوچەرخ و ئەقڵیەتی میللیدا بەشێوەیەکی گشتی بیروڕایەك بنجی داکوتاوە کە لای وایە ئەوەی دەزگا ئایینیەکان و کەسایەتیە ئایینیەکانی ڕاگەیاندن دەیڵێن، وەك هەقیقەتێکی ئایینی رەها وایە، یان ئەوە خوێندنەوەیەکە پێویستە ئەقڵ چەند و چوون لەسەر ناوەرۆکەکەی نەکات، لەبەرئەوەی هەقیقەتێکی رەهای پیرۆزە، ئاساییە کە خاوەنی ئەو خوێندنەوەیە قسەکەرێك بێت بەناوی دەزگایەکی ئاینی فەرمیەوە، بەڵام خوێندنەوەکەی وا بدرێتە قەڵەم کە هەقیقەتێکی نکوولی لێ نەکراوەو گومان لە راستیی بوونیدا نییە. تەنانەت لە کۆمەڵگادا دەستەگەرێکی فراوانی خەڵك هەن کە لە ژیانی رۆژانەیاندا وا راهاتوون لە رووبەروو بوونەوەی کێشە و تەنگژەکانیاندا لەباتی بەکارهێنانی ئەقڵ پەنا بۆ کەسایەتیە ئایینیە رەسمیەکان بەرن. رۆشنگەریی لەلایەن ئەو کەسانە جێی نابێتەوە کە لەباتی بیرکردنەوەی ئەقڵانیی پەنا بەرنە بەر پیرۆزکردنی بیری غەیبانی و بەهەند وەرگرتنی.

بەکارنەهێنانی ئەقڵت پێچەوانەی سروشتی مرۆڤایەتیە، گەلێك لەوانەی فەتوا دەردەکەن و خۆیان بە میراتگری مەعریفەی رەها دەزانن، دەیانبینیت رێگە بە کەسی تر نادەن کە بۆ توێژینەوە لە دەقەکان و تەئویلیان پەنا بۆ ئەقڵ ببەن، بەو بیانووەی کە هەر کەسەو پسپۆڕیی لە بوارێکدا هەیە و تۆ بۆت نیە قسە لەسەر پسپۆڕیی یەکێکی تر بکەیت، بێگومان ئەم قسەیە بەوە رەت دەکرێتەوە کە جیاوازیی لە نێوان یەکێکدا هەیە کە سەربەستە لە رادەربڕیندا و کەسێکی تردا کە دەیەوێت رای خۆتت بەسەردا بسەپێنێت، بە پاساوی ئەوەی راکەی ئەو نموونەی هەقیقەتێکی رەهایە کە تەنیا ئەو دەیزانێت و تۆ هیچ پێشینەیەکت بۆ زانینی نیە.

## 3-دەستەڵاتی ئاینی و مومارەسەی سیاسی:

ئاین توانای ئەوەی هەیە رۆڵێکی پۆزەتیڤ لە کۆمەڵگادا ببینێت، ئەگەر بەشێك لە ئەرکەکانی، وەك ئیمام محەمەد عەبدە پێشنیازی کردووە بریتی بێت لە دەستەڵاتێکی ئاکاریی و چاودێری کردنی دەوڵەت کە رێگای ستەمکردنی لێ بگرێت و نەهێڵێت دەستدرێژی بکاتە سەر ماف و ئازادیی خەڵك لە بیرکردنەوەو گۆڕاندا. بەڵام دەستەڵاتە چاودێری کراوەکە بوو بە «ئامێرێکی دۆزەخیانە بۆ سەرکوت کردن ئەگەر بکرێتە پرۆژەیەکی دەوڵەتی یان پاساوێك بۆ زوڵم و ئامێرێك بۆ دەستبەسەراگرتن[٢]» لەو کاتەدا ئاینیش دەبێتە ئامرازێك بۆ ستەمکردن ئەگەر دەستەیەکی دیاری کراوی کۆمەڵگای نوێ بە ناوی خواو هەقیقەتەوە کە بالاترین شێوەی توندوتیژیە دەستەڵات بەسەر ئەقڵدا بگرێت و رێگری بکات لە هەر هەوڵێکدا کە بۆ رۆشنگەریی بکرێت. کۆمەڵگا ئامادەگی ئەوەی هەیە کە ئاین وەك پرۆسەیەکی سەرەکی وەربگرێت. بەڵام بە سەختی دوو شت لەگەڵ یەکدا تێکەڵ دەکات: ئەو ئاینە رۆحیەی کە بەرگری لە بەها ئاکاریە گشتیەکان دەکات، لەگەڵ ئەو ئاینە دامەزراوەیەی پیاوانی ئاین دروستیان کردووەو خەڵکیی بەوە دەخەڵەتێنن کە ئەمەیان ئاینی راستەقینەیە و بێجگە لە خۆیان کەسی تر نایزانێت.

یەکێك لە مەرجەکانی رۆشنگەریی ئەوەیە کە نایەوێت دەستەڵاتێکی فەرمی هەبێت تەنیا هەق بە خۆی بدات بە ناوی ئاینەوە قسە بکات و، بە ئارەزووی خۆی بە ناوی ئاینەوە سیاسەت ئەنجام بدات. لە جیهانی عەرەب و ئیسلامدا، هوشیاریەکی ئایدۆلۆژی وا باوە کە دەبێت لە ئیسلامدا هەردوو دەستەڵاتی ئاینی و سیاسی تێکەڵ بە یەکتربن، کەسیش بیری لە قسەکەی حەسەن بەنا نەکردۆتەوە کە لە ساڵانی سیی سەدەی رابوردودا وتوویەتی ئیسلام دین و دەوڵەتە، لە کاتێکدا کە وشەی «دەوڵەت» نە لە دەقی قورئاندا هەیە و نە لە سەدان هەزار وتەی پێغەمبەردا، ئیتر وتە راستەکان بێت یان دانراوەکان. بەڵکوو لە وتەیەکی پێغەمبەردا هاتووە کە:»ئەوەی لەبارەی خوداوە پێم گەیاندون هەقن. بەڵام ئەوەی لە خۆمەوە وتوومە، ئەوە من مرۆڤم و مرۆڤیش هەڵە دەکات و راستیش دەکات».

هەروەها وتوویەتی «ئەو شتانەی دەربارەی دنیان پەیوەندیی بە خۆتانەوە هەیە، بەڵام دەربارەی ئاین پەیوەندی بە منەوە هەیە» لە ئەنجامی تێکەڵکردنی ئاین بە سیاسەتەوە دزێوترین فیتنەو جەنگ روویداوە، رەنگە باشترین نموونە قەسابخانەکەی نێوان سونەو شیعە و کوشتنی حسەین و هەر چوار کوڕە بەرهاتووەکەی بێت. مێژوو باس لەوە دەکات کە سەربازەکانی سوپای ئەمەوی ئەگەر یەکێك لە کوڕەکانی حسەینیان بگرتایە تەماشای بەریان دەکرد، ئەگەر تووکی پێوە بوایە سەریان دەبڕی.

هەر لەم بارەیەوە ئەوەندە بەسە باس لە چارەنووسی وەرگێڕان بکەین لە سەردەمەکانی ئیسلامدا و ئەو سروشتە ئایدۆلۆجیەی کە دەبوونە فاکتەری. لە سەردەمی عەباسیەکاندا و بەتایبەتیش لەسەردەمی خەلیفە «مەئمون»دا، پاڵنەرێکی ئایدیۆلۆژی لە پشت دروستکردنی (بیت الحکمة)وە بوو کە گەورەترین

مەڵبەندی وەرگێران بوو لە ئیسلامدا، ئەمەش وەك (ئیبن خەلدون) دەڵێت: پشت ئەستوور بوو بەو ڕێبازەی «مەئمون»ی لەسەر بوو، وەکی دەشزانین ڕێبازی «مەئمون» (ئیعتیزال) بوو. لە سەردەمانی دواتردا هۆلۆکۆستێکی ڕاستەقینە بۆ پاشماوەو میراتی موعتەزیلەکان و ئەو ڕێچکە ئەقلانیەی هاوشانی بوو ڕێکخرا و ڕەنگە بەناوبانگترین هۆلۆکۆستێك کە بۆ کتێب لە مێژودا سازدرابێت، ئەوە بێت کە لە سەردەمی دەوڵەتی بوەیهیەکان و لەسەر دەستی سوڵتان «مەحمودی غەزنەوی» (٣٨٧-٤٢١) ئەنجام درابێت، کە کتێب گەلێکی فەلسەفی و ڕێچکای موعتەزیلەکان بوونە قوربانی، هاوکات نابێت ئەو پرۆسەی کتێب سوتانەشمان لەیاد بچێت کە بەرهەمەکانی «ئیبن ڕوشد» بوونە قوربانی. دیاردەی کتێب سوتاندن تەنها تایبەت نەبوو بە دەستەڵاتداران و حوکمڕانانی ولاتەوە، بەڵکوو لە ڕێی هاندانی فوقەها دەمار گیرەکانیشەوە گەیشت بە خەڵك و هاوولاتیانی ئاسایی.

بە پێچەوانەی دیاردەی سووتاندنی کتێبەوە، مێژوو جەخت لەسەر دیاردەیەك دەکات کە ئێمە تەنیا لە دنیای عەرەبدا دەیبینین. ئەویش دیاردەی کەڵەکە نەکردنی مەعریفەیە، هەر زانایەك یان بیرمەندێك دەربکەوێت کە بیرکردنەوەی تازەو دیدێکی ئەقلانیی داهێنەرانەی هەبێت، زۆر نابات لەلایەن دەستەڵاتی ئایدیەوە لەناو دەبرێت. زۆر دەگمەنە لە دنیای عەرەبیدا هەوڵدانێکی مەعریفی درابێت بۆ تەواوکردنی هەوڵە مەعریفیەکانی پێش خۆی. هیچ زانا و بیرمەندێکی تازە نەبووە ئەگەر ویستبێتی بیرێك یان تیورەیەکی نوێ دابهێنێت لە سفرەوە دەست پێنەکات.

## دووەم/ پرنسیپی دیموکراتیەت:

عەلمانیەت و ڕۆشنگەریی لە کۆمەڵگایەکی مەدەنی و دیموکراتیدا نەبێت بەرنادەن، بەڵام لە دنیای عەرەبیدا دیموکراتیەت لە تەنگژەیەکی سەختدایە، توێژەرەوەکان لە چارەسەرکردنیدا ڕای جیاوازیان هەیە. ئەگەرچی دیموکراتیەت گەلێك چارەسەری جیاوازی بۆ نەخۆشیی ستەمی دەستەڵات دۆزیوەتەوە، وەك پرنسیپی جیاکردنەوەی دەستەڵاتەکان و دەوڵەتی یاسا و مافی مرۆڤ، بەڵام لە دنیای عەرەبدا تا ئێستایش دەوڵەت ئامێری جەور و چەوساندنەوەیە. ئەگەر لای هەندێك وابێت کە دەوڵەت دەست لە دژایەتی کردنی کۆمەڵگای مەدەنی هەڵناگرێت، ئەوا هەندێکی دی وای دەبینن کە ئەوە دەستەڵاتە دوژمنایەتی دەوڵەت دەکات و ڕێگریەتی لەوەی ڕۆڵی خۆی ببینێت وەك فاکتەرێکی ڕێکخستن و بە ئەقلانی کردنی کۆمەڵگای بەشەری.

گەلێك جار لە نێو کۆمەڵگادا، زۆربەیەکی حیزبی دەبینین کە پاڵپشتی لە هەڵبژێراوەکانی خۆی دەکات، ئەم زۆربەیە دەست بەسەر دەزگا سیاسیەکاندا دەگرێت و وازناهێنێت، بۆیە دەستی گۆران ناگاتە ئەو کۆمەڵگایە چونکە زۆربەیەکی ساکسۆنیە و یاسا ڕێگای داوە ئەو دەستەڵاتە سالانێکی دورودرێژ بمێنێتەوە. لە سایەی ئەم دەستەڵاتەدا کە ئەم زۆربەیەی ڕێکخستووە، ئازادی فیکر بەرەو رووی ستەم و کۆت و بەند دەچێت و بزوتنەوەی ڕۆشنگەریی دەوەستێت.

دیموکراتیەتی ڕاستیی هەرگیز بەدی نایەت ئەگەر لەگەڵیدا بەشێوەیەکی تەریبی زەینی دیموکراتی لای ئەوانە نەبێت کە بانگەشەی بۆ دەکەن، چونکە بەدەگمەن لە نێو گەلانی عەرەبدا ئەو کەسە دەبینینەوە کە هەمیشە بانگەشەی دیموکراتیەت دەکات. بەڵام لە کاروباری تایبەتی و خێزانی خۆیدا ڕەفتاری دیموکراتیانەی هەبێت. ئەوان هەمیشە بانگەشە بۆ دیموکراتیەت دەکەن. بەڵام بەدەگمەن بەسەرخۆیاندا پراکتیکی دەکەن. لە دنیای عەرەبیدا قەیرانێکی ڕاستەقینە هەیە، قەیرانی نەبوونی بیری دیموکراتی.

## کۆتایی:

یەکەم: ڕۆشنگەریی ڕاستەقینە بەدی نایەت ئەگەر ئەقڵ کارا نەبێت، هەروەها نابێت بهێڵرێت دەزگا ئایینیەکان ببنە دیکتاتۆر بەسەر ئەو شتانەوە کە پەیوەندیان بە ئازادی فیکری ئەقلانیەوە هەیە کە بە بیانووی ڕەخنەگرتن لە بیروباوەڕی پیرۆز ئەو دەزگایانە بە گوناە لە قەڵەمی بدەن.

دووەم: ڕۆشنگەریی ڕاستەقینە بەدی نایەت ئەگەر ئەقڵ لە دەستەڵاتی بەپیرۆزکردنی کەسان ڕزگاری نەبێت.

سێیەم: ڕۆشنگەریی بەدی نایەت ئەگەر ئەقڵ ڕزگار نەکرێت لە بیری شوێن کەوتن و لاسایی کردنەوەی کوێرانە و دانانی بیری ڕەخنەگری لە جێگایدا.

چوارەم: پێویستە یاساکان تا ئەو شوێنە بگۆڕدرێن کە ببنە ئامرازێك بۆ بەرگریکردن لە ئەقڵ نەك هەر میکانیزمێك بن لە دەستی دەزگا ڕەسمیەکاندا بۆ بەکۆیلەکردن و زیندە بەچاڵ کردنیان.

پێنجەم: هیچ چاکسازیەکی ڕاستەقینە ناکرێت ئەگەر ئاین لە دەزگاییەوە نەکرێتە ئاینی تاکە کەسی کە شێخ و فوقەها نەتوانن دەستی بەسەردا بگرن و بۆ مرازی خۆیان بەکاری بهێنن. چونکە تەنیا دیدێکی فیقهی بۆ ئاین نیە و گەلێك دیدی جیاوازی تر هەیە: دیدی فەلسەفی و ئەدەبی و دیدی زانستی. ئاینی تاکایەتی لە خۆیدا ئاینێکی ڕۆحیی دەوڵەمەندە بە چاکی و مەزنی.

## پەراوێزەکان:

١-بڕوانە — جورج تەڕابیشی «کوفری دیموکراتیەت و عەلمانیەت و مۆدێرنە. دار الساقی بیروت ٢٠٠٦.

٢-بڕوانە د. محەمەد حەداد «ئایینی ویژدانی تاك و چارەنووسی ئیسلام لە چاخی نوێدا. بەیروت ٢٠٠٧.

## سەرچاوە:

WWW.ALAWAN.ORG

ڕوی پۆرتەر
لە فارسییەوە: ب. باران

# چەمکە سیاسیەکانی ڕۆشنگەری

تیورە سیاسیەکانی فەیلەسوفانی سەردەمی رۆشنگەری بەردەوام روبەروی رەخنە بۆتەوە. نەیارانی شۆرشی گەورەی فەرەنسی، لەوانە ئەدمۆند بۆرك و ئابێ بارۆئل ئەم بیریارانەیان بە عەقڵباوەری سادەئەندێش وەسفدەکرد کە بە دروشمخوازی ئەبستراکت و نابەرپرسیارەیان لە پشتگیریکردنی ئازادی، خواستی گشتی و مافەکانی خەڵکی، هاوکاری روخانی رژێمی پێشوی فەرەنسایان کرد، بەڵام روخانی ئەم رژێمە لە پراکتیکدا هیچ گۆرانێکی دروست نەکرد، چونکە سەرەتا ئاژاوە و پاشان حکومەتێکی ستەمکار جێگەی گرتەوە. ئەوەی رەخنەگران و نەیارانی بیرە سیاسیەکانی فەیلەسوفانی رۆشنگەری لە هەموو شتێك زیاتر رەخنەیان لێی هەبوو، خەسڵەتێك بوو کە خودی ئەم فەیلەسوفانە بە روکەش زۆرترین بەهایان بۆ دادەنا: ئەزمونکردن.

ئەم بروایەی سەرەوە لە سەیرکردنێکی ساوێلکانەدا پێدەچێت لۆژیکی بێت. بەڵام دەبێت سەرنج لەو خاڵە گرنگە بدرێت ئەدمۆند بۆرك هەموو تەمەنی ئەندامی پەرلەمان بوو، خاوەن پلەیەکی باڵای دەوڵەتی بوو، وە تامی شیرینی دەسەڵاتی چەشتبوو، لەکاتێکدا زوربەی فەیلەسوفانی رۆشنگەری لەبواری سیاسیدا دەورێکی زیاتر لە پروپاگەندەی سیاسی «دروشمدارێژەر» یان نەبوو، و ئەستەمیشە بکرێ خودی ئەوان لەبەر ئەم هۆیە بە کەمتەرخەم بزانرێت. لویی پانزەهەم لە ساڵی ١٧٤٥دا ئامادەبوو ڤۆڵتێر بە «مێژوونوسی سەڵتەنەت» دامەزرێنێت، چونکە بەهەرحاڵ ڤۆڵتێر بەرجەستەترین مێژووزان، شاعیر و شانۆنوسی سەردەمی خۆی بوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك قبوڵی نەدەکرد رەخنەگرێکی وا سازشنەکەر وەك وەزیر دامەزرێنێت.

گرنگیە سیاسیەکانی هەندێك فەیلەسوفی رۆشنگەری رەنگە ناواقعی، ساوێلکانە

یان تەنانەت ترسناك دەرکەوێت. رۆسۆ لە « پەیمانی کۆمەڵایەتی»دا بەهای بۆ کۆمارە بچوك و بێدەسەڵاتەکان وەك سەرچاوەی پاراستنی فەزیلەتە گشتیەکان دادەنا. بەڵام ئەوەی رۆسۆ لە سپارتی دێرین و قۆناغە سەرەتاییەکانی کۆماری رۆمدا ستایشی دەکرد، لە باشترین حاڵەتدا تەنها بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ لەگەڵ ئەوروپای نیوەی سەدەی هەژدەهەمدا دەگونجا. چونکە لەو سەردەمەدا تەنها ژمارەیەکی کەمی دەوڵەتشاری وەك ڤینیزیا و ژنۆ هەبوو، کە هێشتا دەوڵەتگەلێکی ئولیگارشی پڕ رەونەق بوون. هەندێك لە مێژوونوسانی دوایی وەك جی ئیل تالمان، بیروراکانی رۆسۆیان لەژێر تیشکی فاشیزم لە سەدەی بیستدا بەتوندی رەخنە کردووە. بەبڕوای ئەم رەخنەگرانە پەیامی رۆسۆ لەبارەی «یاسادانەری قارەمان» کە دەبوو هێزێکی نەتەوەیی تازە بژێنێتەوە، لەباشترین حاڵەتدا ساوێلکانە و لە خراپترین حاڵەتیشدا خراپەی رووت بوو (ئەگەرچی پێدەچێت ئەمجۆرە هەڵسەنگاندنانە ناوەخت بن). کەوابوو چۆن دەتوانین لە لۆژیکی شاراوەی مژدە یان هەڕەشەی رۆسۆ تێبگەین کە بریتی بوو لە «ناچارکردنی مرۆڤ بۆ ئازادبوون»؟ بەهەرحاڵ گومانی تیا نیە بیریارانی تری ئەم قۆناغە کەمتر لە رۆسۆ ناواقعی نەبوون. ویلیام گۆدوین لە «لێکۆڵینەوە لەبارەی دادپەروەری سیاسیەوە» (١٧٩٣) تێگەیشتنێکی هێندە توندڕەوانە لەبارەی تاکگەریەوە پێشکەش دەکات، کە تەنانەت ئۆرکستراش لەبەر پێویستی لێکچوون، کە هەڕەشە لە دەربڕین و داهێنانی تاکەکەسی دەکات، رەخنەدەکات(رەنگە بکرێت ئەو بەیەکەمین پشتیوانی موسیقای جاز دابنێین؟).

هەندێکجار فەیلەسوفانی رۆشنگەری روبەرووی ئەو تۆمەتە بونەتەوە کە لە سیاسەتدا پەیڕەوی بنەماکان نەبوون. گۆدوین کە لەسەرەوە ناومان هێنا بەشێوەیەکی سەرسەختانە هاوسەرگیری لەبەرئەوەی ئازادی تاکەکەسی سنوردار دەکات، مەحکوم دەکرد (گۆدوین هاوسەرگیری بەجۆرێك سۆزانیەتی یاسایی دەزانی). بەڵام نەك هەر هاوسەرگیری لەگەڵ ماری ولستۆنکرافتدا کرد کە فەمەنستێکی بەناوبانگە، بەڵکو داوای لە شلی هاورێی کچەکەیان کرد کە بەر لە هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەیاندا نەخەوێت. ڤۆڵتێر و دیدرۆ نەك لەگەڵ ستەمکارە گەورەکانی ئەوروپادا- فردریکی گەورە شای پرۆس و کاترینی گەورە شاژنی روسیا- هاتوچۆیان هەبوو، بەڵکو هەندێکجار روپامایشیان بۆ دەکردن. بێگومان ئەو هاوکاری و یارمەتی و پاراستنەی لەم رێگەیەوە بەدەستیانهێنا، گەلێك سودمەند بوو بۆیان، بەڵام بێدەنگی رێژەیی ئەم رۆشنبیرانە لەبەرامبەر شێوازە سەرکوتکردنە ناوخۆییو سیاسەتە دەستدرێژیکەرە دەرەکیەکانی ئەم دوو فەرمانڕەوایە، چەندان پرسیاری بێ وەڵام بەجێدێڵێت.

فەیلەسوفانی بەرجەستەی رۆشنگەری بەتوندی کارەسات و کەموکوڕیەکانی رژێمی پێشویان مەحکوم دەکرد، بەڵام ئەو پرسیارەش دێتە پێشێ ئایا توانیبویان کە بەلاغەت و راشکاوی خۆیان لەگەڵ پێداویستیەکانی سیاسەتێکی واقعیدا(REAL POLITIC) بگونجێنن؟ هیچ کامیان بزوتنەوەی بەرگریان دژی ستەمکاری رێکنەخستووە، یان خەڵکیان بۆ خەباتی چەکدارانە هان نەداوە. ئایا بێکرداری ئەم فەیلەسوفانە، نەیدەتوانی لەبەرئەوە بێت کە سەرەرای رەخنەکانیان، بە ئەندازەی پێویست هەستیان بە رەزامەندی بەرامبەر بە هەلومەرجی هەبوو (STATUS QUO) کردبێت؟ ڤۆڵتێر و دیدرۆ هەردوکیان ماوەیەکی کەم زیندانیان چەشت، بەڵام جگە لەم ماوە کورتە، توانیان چالاکیە دژ بە رژێمەکەی خۆیان بەبێ ئەوەی ئازادی شەخسی خۆیان بخەنە مەترسیەوە، درێژە پێبدەن، و لە ناوەندە سیاسی و ئەدەبیەکاندا ئافەرین بکرێن. دەبێت هەلومەرج و بارودۆخی سیاسی بیریارانی سەدەی هەژدەهەم بە بەراورد لەگەڵ چارەنوسی کارەساتاوی بیرئازاد و بیریارانی نوێخوازی سەدەی شانزە و حەڤدەهەم، وەك جۆردانۆ برۆنۆ، کامپانلا و تەنانەت گالیلۆ (هەرچەندە سزایەکی سوکتر درا) ببینین، و بەراوردی لەگەڵ بەدواداچوون و سزای سەختی بانگەشەکەرانی سیاسی لە روسیا و نەمسادا بکەین. کەوابوو فەیلەسوفانی رۆشنگەری بە چ پێوانێك

دەستیان لە ڕوخانی ڕژێمی پێشودا هەبوو؟ ئایا نابێت ڕۆشنگەران وەك كۆمەڵێك بانگەشەكەری سیاسی پڕ هەراو و هوریا و ناجیدی ڕەت بكەینەوە و بەگرنگیان نەزانین؟.

دەبێت سەرەتا بۆ هەڵسەنگاندنی گرنگە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری وەك چالاك و بیریاری سیاسی، چەند هۆكارێك لەبەرچاو بگرین. یەكەم هۆكار ئەوەیە كە لەدوای شۆڕشی ئەمەریكا و شۆڕشی گەورەی فەرەنسی بەدواوە، بەرنامەیەكی سیاسی دیاریكراو و پێناسكراو لە جیهانی ڕۆژئاوادا جێگەی خۆی كردۆتەوە و سەقامگیر بووە. هەنوكە «هەموان» بڕوایان بە حكومەتی خەڵكی، بەهۆی خەڵكیەوە و بۆ خەڵك هەیە. بڕوایان بە مافی ڕای گشتی، هەڵبژاردنی گشتی و دیموكراسی وەك سەنگەری ئازادی هەیە. هەموان بڕوایان وایە پەرلەمانتاریزم، ڕژێمێكی سیاسی دامەزراو لەسەر نوێنەرایەتی، و ئازادی هەموو حیزبەكان ئامرازی پێویستی كۆمەڵگای مەدەنین. ئەم پێوەرانە بەدەر لە هەڵسەنگاندنی ئێمە لەبارەی بەهاكانیەوە، بوون بە گا پیرۆزەكانی دیموكراسی «ڕۆژئاوا». كەوابوو بۆچی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری پشتیوانیان لەم ئامانج و بنەمایانە نەدەكرد؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە كە بیریارانی عەقڵانی سەرەتاكان یان ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم، بچوكترین هۆیان بۆ سەلماندنی ئەم بنەمایانە، تەنانەت بە سەلماندنی هەر یەكێكیان بەشێوەی جیا نەدەدۆزیەوە. پەرلەمانی ئەوروپیێكان، بەشێوەیەكی نەریتی، سەنگەری پاراستنی بەرژەوەندیە نەگۆڕەكانی (VESTED INTERESTS) ئەرستۆكراتەكان بووە، و حیزبە سیاسیەكانیش بەگشتی ڕوداوگەلێكیان دەوروژاند كە لە ململانێی فراكسیۆنی پەرلەماندا، لە خزمەت بەرژەوەندی گروپدا بوون. دیموكراسی ڕاستەوخۆ بە ڕژێمێكی حكومەتی دادەنرا كە لەگەڵ یۆنانی دێریندا دەركەوتووە و بە لەناوچونیشی لەناوچووبوو. وەك ڕۆسۆ دەیگوت و زۆرێك لە ڕۆژنامەنوسە لیبرالەكانی لە ئینگلتەراشدا قسەكەیان دەسەلماند «حكومەتی نوێنەرایەتی هیچ نەبوو جگە لە گەندەڵی و ساختەیی هەڵبژاردن».

لە هەموو ئەمانەش گرنگتر ئەوەیە كە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری لەسەر چ بناغەیەك دەیانتوانی پشت بە عەقڵانیەتی سیاسی جەماوەری بەرفراوانی خەڵك ببەستن؟ سەرژمێری كۆی وڵاتە ئەوروپیەكان لە جوتیاران و كرێكاران و تەنانەت ڕەعیەتە نەخوێندەوارەكان پێكدەهات، كە هەر هەمویان لە دیدی ڕۆشنبیرانەوە بەشێوەیەكی نائومێدانە خوارافاتی و دواكەوتوو و نەزان بوون، بە پەیڕەویكردن لە دابونەریت و بەبێ بیركردنەوە و ڕەخنەگرتن، وەفاداریان بۆ كۆشك و كەنیسە پیشاندەدا. ڤۆڵتێر و هاوبیرانی بەگشتی جوتیارانی وەك جەماوەرێكی بێ شكڵ وەسف دەكرد كە ئەستەم بوو لە ئاژەڵەكانی دەشت و بیابان جیابكرێنەوە. ئەوان (واتە ڕۆشنگەران) سودیان لەمجۆرە بەراوردكردنە ڕاشكاو و بێ پەردەیە بۆ ڕەخنەگرتن لە ڕژێمی كۆن وەردەگرت، كە پلەی مرۆڤی تا ئاستی ئاژەڵ دابەزاندبوو. بەڵام ئەمجۆرە تەفسیرانە جۆرێك زهنیەتیش ئاشكرا دەكات، زیهنیەتێك كە كێشە و مەسەلەی واقعیەكەی بەشداریكردنی جەماوەر لە حكومەتدا نییە (شتێك كە ئەو سەردەمە پێدەچوو لە ڕیزی پێشەوەی گرنگی پێدانەكان بێت)، بەڵكو ئەوەیە ئایا دەوڵەتدارانی فەرمانڕەوا بەسەر خەڵكدا، خەڵكی بەتوانا و تێگەیشتوون، یان بێكەڵك و بێتوانا»، مەسەلەی شكڵی ڕاست یان ڕەوای حكومەت( یان ئەوەی كە بە وردی چ كەسێك مافی یان توانای دەسەڵاتگرتنە دەستی هەیە) لە كۆكراوەترین شێوەیدا بەهۆی مۆنتیسیكۆ لە «ڕۆحی یاساكان»دا هێنراوەتە ئاراوە.

«ڕۆحی یاساكان» سێ شێوەی حكومەت لەیەك جیا دەكاتەوە. حكومەتی كۆماری لەسەر ئەم سیانە ڕاوەستاوە. مۆنتیسیكۆ بەتوندی لایەنگری حكومەتی كۆماری بوو و بڕوای وابوو ئەم شێوە حكومەتە زامنی ئازادیە و پارێزگاری لە شەرافەتی تاكە چالاكەكان لە باسە سیاسیەكاندا دەكات. حكومەتە كۆماریەكان لە سەردەمی دێریندا پشكوتن و پاشان لەناوچوون، و مۆنتسیكۆ بە داخێكی نۆستالیژییەوە ئەو دەرئەنجامە

وەردەگرێت کە حکومەتی کۆماری وتەزایەکی سەر بە رابردووە».

شێوەی دوهەم حکومەتی سەڵتەنەتی دەستوریە کە بە بڕوای مۆنتسیکۆ شێوەی پایەداری (VIABLE) و پراکتیکی حکومەتە لە جیهانی مۆدێرندا. ئەم شێوە حکومەتە سەقامگیریەکی بەرچاوتر پێشکەش دەکات کە تا ئەندازەیەك لەبەر بونیادەکەیەتی کە بۆ چینە جیاوازە کۆمەڵایەتی، ئەرستۆکراتی، و نەجیبزادەکان و رۆحانیەکان زنجیرە پلەیەکی تەواو پێناسکراو و پێگەیەکی دیاریکراو پێشکەش دەکات و تارادەیەکیش لەبەر «شانازیەك» کە هەر گروپێك بەهۆی ئینتیمای بۆ گروپەکەیەوە هەستی پێدەکات. بەبڕوای مۆنتیسیکۆ سەڵتەنەتی دەستوری داواکراوترین شێوەی حکومەتی یەك نەفەریە. دواجار، شێوەی سێهەم لادان و لارێیە لە حکومەتی دەستوری، واتە حکومەتی ستەمکاری. لە حکومەتێکی لەم چەشنەدا فەرمانڕەوای رەها هەموو ئیمتیازە یاساییەکانی هاوڵاتیان لەناو دەبات و بەهۆی دەسەڵاتی تێرۆر و تۆقاندنەوە حوکم دەکات. بەرزەفریە چاوچنۆکەکانی لویی چواردەهەم، مۆنتیسیکۆی توشی ئەو نیگەرانیە کرد کە دەیەوێت سیستەمی ستەمکاری بکاتە جێگری سەڵتەنەتی دەستوری. ئەم کەڵکەڵەیە وای لە مۆنتسیکۆ کرد لە نوسینەکانی خۆیدا ستایشی دەوری سیاسی ئەرستۆکراتی دێرین، پەرلەمانە ویلایەتیەکان و تەنانەت کەنیسەش بکات، بەو ئومێدەی کە دەسەڵاتیان بتوانێت رێگرێك لەبەردەم جێگیربوونی نزیکی رژێمی ستەمکاری بنەماڵەی بۆربۆندا دروستبکات.

شیکردنەوەکەی مۆنتسیکۆ کێشە مەتەڵئاسا سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی سەردەمی خۆی، بەبێ پەردە پیشاندەدات. لەلایەکەوە رژێمی کۆماری لە وڵاتە گەورە سەڵتەنەتیەکاندا لەناوچوو بوون، و لەلایەکی دیشەوە سیستەمی دەستوری بەرەو حکومەتی ستەمکاری دەڕۆیشت. لێرەوە پێدەچوو کە پشتگیری کۆنەپەرسترین گروپی کۆمەڵایەتی بۆ پاراستنی ئازادی و بەرگریکردن لێی پێویستە (لەهەمانکاتدا دەبێت ئەوەمان لەبیر بێت کە مۆنتیسیکۆ بەر لە ئێستا لە «نامە ئێرانیەکاندا» بانگەشە و ئیمتیازاتی چینی ئەرستۆکراتی بەتوندی سەرزەنشت کرد).

بەهەرحاڵ سیاسەتە باڵادەستەکان لە پەرلەمانەکانی ئەوروپاش، خاوەن داوی ترسناك بوو. هەرکات لویی پانزەهەم و جێگرەکەی هەوڵیان بۆ ئەنجامدانی ریفۆرمی ئابوری کردووە، یان هەوڵیانداوە بودجەی ناهاوسەنگ و کەمهێنانی فراوانی حکومەت چارەسەر بکەن، پەرلەمانی فەرەنسا کە چینی ئەرستۆکرات تیایدا بەهێز بوو، دژیان راوەستا، شتێك کە زیانێکی راستەقینەی بە خەڵکی ئاسایی گەیاند. رۆسۆ تەنانەت دیدێکی بەدبینانەتری هەبوو. بەپێی بەڵگاندنەکانی رۆسۆ، دانانی دەستورێکی ئاڵۆزتر، بە مەبەستی رێگری لە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات و ئیمتیازات، چارەی دەردەکە نیە. چونکە بەبڕوای رۆسۆ کۆی پێکهاتەی کۆمەڵگای مۆدێرن، بەتوندی گەندەڵە، پەیوەندییە باڵادەستەکانی ئەم کۆمەڵگایە بۆتە هۆی نامۆ بوونی مرۆڤ لە مرۆڤ، پایەکانی ئازادی وێران کردووە و فەزیلەتەکانی مرۆڤ بێ بەها دەکات.

ئەوەی کە چ کەسێك توانا و شایستەیی دەسەڵاتگرتنە دەستی هەیە، ئاڵۆز و سەرسوڕهێنەرە. لە دیدی فەیلەسوفانی رۆشنگەریەوە دارشتنی بەرنامەیەکی پێشنیاری بۆ ریفۆرمی کۆمەڵایەتی و ئەوەی دەبێت دەوڵەت ئەنجامی بدات، بەشێوەیەکی گشتی دروستکەرتر و پراکتیکی تر بوو لە بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی. فەیلەسوفانی رۆشنگەری بڕوایان وابوو کە مەسەلەی حکومەت کورتدەبێتەوە بۆ بابەتی سادەی «رەوایەتی» و میراتگری یاسایی سەڵتەنەت، پاراستنی دۆخی هەبوو، و بەرگریکردن لە موڵکایەتی تایبەتی و ئیمتیازاتە چینایەتیەکان. خواستی دیاریکراوی ئەم بیریارانە گەیشتنە دەسەڵاتی ئەو حکومەتانە بوو کە دەبوو لە رێگەی سەقامگیرکردنی ئاشتیەوە، بوژانەوەی ئابوری، خۆشگوزەرانی و دادپەروەری لە کۆمەڵگای مەدەنیدا، زەمینەیان بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی دەرەخساند. ئەوان ئازادی تاکەکەسیان بە بەشێکی ئەم

ئامانجانە دەزانی، لەبەرئەوە سروشتیە کە هەموو جۆرە دەستێوەردانێکیان لە مەسەلە تایبەتیەکانی هاولاتیاندا بە توندی رەت دەکردەوە. بەپێی تێگەیشتنی فەیلەسوفانی رۆشنگەری، ئازادی دەربڕین و بیرکردنەوە، ئازادی چاپەمەنی، لێکبوردنی مەزهەبی و مافی کەمایەتیە مەزهەبیەکان بۆ ئەنجامدانی دابونەریتە مەزهەبیەکانی خۆیان، هەموو ئەمانە بەشێکن لە پێداویستیە سەرەکیەکانی کۆمەڵگای مەدەنی. تەنانەت کانتی پرۆسی کە کۆنزەرڤاتیڤێکی سەرسەخت بوو، وە بڕوایەکی ئەوتۆی بەو حکومەتانە نەبوو کە لەسەر بناغەی ڕای گشتی دامەزراون، بڕوای وابوو کە رەتکردنەوەی مافە بنەڕەتیە مەدەنیەکان هەم بۆ دەوڵەتداران و هەم بۆ هاولاتیان، سوکایەتی پێکردنە، چونکە ئەمە وەك ئەوە وایە لەگەڵ گەورەکاندا وەك منالان رەفتار بکەین. ڤۆڵتێر لە نامە فەلسەفیەکانیدا (١٧٣٣) لەرێگەی وەسفکردنی شانۆی بازاڕی بۆرسەی لەندەنەوە، باشیەکانی مافە مەدەنیەکان و ئازادی مەزهەبی بەو شێوەیەی لە ئینگلتەرادا بینیبووی، ئافەرین دەکات. لەوێ پەیڕەوانی کەنیسەی ئینگلتەرا، نەیارەکانی و کاسۆلیکەکان، یەهودیەکان و موسوڵمانان هەر هەموویان مافی سەوا و مامەڵەیان بە مافی یەکسانەوە هەیە. لە دیدی ڤۆڵتێرەوە ئازادی بازرگانی و ئازادی مەزهەب بەستراون بەیەکەوە و هاوڕێیەتیان لەگەڵ یەکدیدا، زامنی ئاشتی و خۆشبەختی دەکات.

فەیلەسوفانی رۆشنگەری بە ئەسەفەوە لاوازبوونی ئازادیان لە سەرتاسەری ئەوروپادا مەحکوم دەکرد. رۆسۆ کتێبی «پەیمانی کۆمەلایەتی» بەم رستە بەناوبانگە دەست پێدەکات: «مرۆڤ بە ئازادی لەدایك دەبێت، بەلام لە هەموو شوێنێکدا زنجیر کراوە». فەیلەسوفانی دواتری رۆشنگەری لە ولاتەکانی ئەوروپادا، بە پێچەوانەی ئەو لیبرالانەی لایەنگری سیاسەتی ئازادکردن (LAISSE FAIRE) بوون لە ئینگلتەرا، هەرگیز زیادبوونی ئازادی تاکەکەسیان بە بەهای کەمکردنەوەی بەرامبەری دەسەلاتەکانی دەوڵەتیان، وەك خواستی سەرەکی خۆیان نەهێنایە ئاراوە. یەکێك لە هۆکارەکانی ئەم حاڵەتە، پێویستی بوونی دەزگایەکی جێبەجێکاری بەهێز بوو، بۆ بەرگریکردن لە مافی هاولاتیان لەبەرامبەر دەستدرێژییەکانی کەنیسە و ئیمیتازە چینایەتیەکانی ئەرستۆکراتەکان. فیزیۆکراتیەکانی وەك کیوزنی، بەرگریان لە سیاسەتێکی ئابوری دەکرد کە لەسەر بناغەی بازرگانی ئازاد دامەزراوە، بەلام لەهەمانکاتدا ئەوەیان قبوڵبوو کە تەنها یەك دەزگای جێبەجێکردنی بە ئیرادە و لەژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتدا (DIRIGISTE) دەتوانێت پارێزگاری لە بازاڕی ئازاد لەبەرامبەر گروپە سودخوازەکاندا (VESTED INTERESTS) بکات. هیچ بیریارێکی ئەوروپا حەزی لە بیرۆکەی دەوڵەتی «پاسەوانەکان» (NIGHTWATCHMAN STATE) نەدەکرد، کە بیریارانی رادیکاڵی ئینگلیز زۆر ئارەزویان دەکرد. تەنانەت تام پین کە لە کتێبی مافەکانی مرۆڤدا (١٧٩١) (RIGHTS OF MAN) بەتوندی هێرشی کردبووە سەر سەرکوتکردنی دیسپۆتیزمانە، ئەو بابەتەی دەهێنایە ئاراوە کە رژێمێکی رەوا و یاسایی جەماوەری، کە خۆی لە خۆیدا خاوەن دەوڵەتێکی هەڵبژێراوی خەڵکیە، دەبوو بەدوای سیاسەتی دروستکردن و خۆشگوزەرانیدا بچێت (بۆ نمونە لەرێگەی زامنکردنی بیمەی بەساڵاچووان).

بیریارانی ئەوروپای ناوەندی و ئەڵمانیا بەر لە بیریارانی تری کیشوەری ئەوروپا حەزیان لە بیرۆکەی فەرمانڕەوای « رۆشنگەر» (ENLIGHTENED RULERS) بوو. بە پێی ئەم تیورەیە دەبوو دەسەلاتی سیاسی لەدەست فەرمانڕەوایەکی رۆشنگەردا بێت، لە لوتکەی دەوڵەتێکدا کە خاوەن سیاسەتێکی تەندروستە. مەبەست لە دەوڵەتێك کە سیاسەتێکی تەندروستی هەیە، رژێمێکە کە لە رێگەی بیرۆکراسیەکی پرۆفیشناڵەوە، پسپۆرانە و بەکەڵکهاتوی مەسەلە مەدەنیەکان، بازرگانی، کار، ئەخلاق و تەندروستی بەشێوەیەکی گشتی و هەندێکجار بە وردترین شێوە رێکدەخات. بەپێی تێگەیشتنی ئەم بیریارانە بۆ رێکخستنی سیاسەتێکی لەمچەشنە، دەبوو یاساگەلێکی جیاواز دابنرێت، بۆ نمونە لەرێگەی دانانی یاسای کەمکردنەوەی ساڵی هاوسەرگیری، سەرژمێری ولات و دوابەدوای ئەویش هێزی کار زیاد دەکات،

مەسرەفی زۆرتر دەبێتە هۆی بزواندنی ئابوری و رادەی باجیش زیاد دەکات، و لەئەنجامی ئەمەشدا دەسەڵاتی بەزەبری سەربازی وڵات پەرەدەستێنێت. لایەنگرانی بەرجەستەی حکومەتی عەقڵانی و سیستماتیکانە، وەك «یۆستی»و «زوننفلز» بروایان وابوو زانستی بەڕێوەبردنی جێبەجێکاری دەتوانێت هاوکات هەم لە خزمەتی دەوڵەتداراندا بێت (لەرێگەی زیادبوونی دەرامەتی دەوڵەتی، و پتەوکردنی رێکخستنی گشتی) و هەم هەلومەرجی ژیانی خەڵکیش باشتر بکات.

ئاراستەیەکی هاوشێوەی ئەمەش بۆ دانانی یاساکان، یان لانیکەم گرنگیدان بە رێکخستنی «بەرژەوەندییە گشتیەکان» بەشێوەیەکی ناوەندی، لە تێڕوانینە تیوریەکانی بیریارانی رادیکاڵی فەرەنسی ناوەراستی ئەم سەدەیەشدا بەرجەستە بوو. هلۆتیوس کە لایەنگری تیورەی سودخوازی بوو، مرۆڤەکانی خۆبەخۆ بە یەکسان دەزانی. بە بڕوای هلۆتیوس هەموو مرۆڤەکان بەشێوەیەکی یەکسان قابیلی پەروەردەکردنن، و بۆئەوەی بەهۆی فەزا و پەروەردەکردنەوە بەشێوەیەکی کامڵ شکڵ وەربگرن، توانایەکی یەکسانیان هەیە. کەوابوو فەرمانرەوایەکی عەقڵانی دەتوانێت خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی بۆ هەموان دابینبکات. بیریارانی دی وەك مابلێ و مۆرۆل ئەو تیورەیەیان دەهێنایە ئاراوە، کە نەمانی ئیمتیازاتی گروپی، موڵکایەتی تایبەتی، گرنگیدانی بە بەرژەوەندی گشتی لەبەرامبەر بە بەرژەوەندیە تاکەکەسیەکاندا، مژدەی دەرکەوتنی مرۆڤ پاك و شەرەفمەندەکان دەدات. رۆسۆش ئەم خەونەی لەسەردا بوو کە مرۆڤ لە کۆمەڵگایەکدا کە یاسای گونجاوی هەیە، دوبارە بۆ سروشت و رەسەنایەتی خۆی دەگەڕێتەوە، یان لانیکەم بەرەو گەندەڵی و دارمانی زیاتر ناڕوات.

بیریاران لە سەرەتای قۆناغی رۆشنگەریدا بەدوای رێگەیەکەوە بوون بۆ رێگەگرتن لە پەرەسەندنی حکومەتی رەها. جۆن لۆك بە پێی ئەو بەڵگاندنەی کە هەموو دەسەڵاتە یاسایی و رەواکان، بەهۆی یاسا سروشتیەکانەوە سنوردار دەکرێن و بەستراون بە خواست و رەزامەندی هاوڵاتیانەوە، خەباتی لەپێناو حکومەتی دەستوریدا دەکرد. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناکرێت بگوترێت لۆك لایەنگری دیموکراسی بوو. مۆنتیسیکۆ بەهۆی ئەزمون و نمونە مێژوویەکانیەوە، بالاتربوون و خەسڵەتە پۆزەتیڤەکانی حکومەتە دەستوریەکان پیشاندەدا. بەڵام رۆشنگەری لە سەدەی حەڤدەهەم بەدواوە سەرنجی خۆیان ئاراستەی مەسەلەی ئامێر و ئامانجەکانی دەسەڵاتی سیاسی کرد. هەنوکە بیریاران ئەو پرسیارە بنەڕەتیەیان دەکرد، کە چ دەوڵەتێك مرۆڤە بە توانا و چاکەکان پەروەردە دەکات؟ چ سیاسەتێك زامنی رەونەقی بازرگانی دەکات، یان زەمینە بۆ تەندروستی و چالاکی هاوڵاتیان دەرەخسێنێت؟ بەمشێوەیە بەرنامە سیاسیەکان زۆرتر شکڵێکی پۆزەتیڤیان بەخۆوە گرت، بەڵام ئەو مەترسیەش هەبوو کە ئەمجۆرە بەرنامانە ببن بە کۆمەڵێك خەیاڵ پڵاوی یۆتۆپیانە.

ئەمە بووە هۆی ئەوەی شۆڕشی کۆلۆنەکانی ئەمەریکا دژی ئینگلتەرا، دەورێکی چارەنوسسازی بۆ ئەوروپا هەبێت. راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمەریکا (١٧٧٦) دەریخست کە هێشتا کاری قارەمانانە بۆ بەرگریکردن لە ئازادی، لانیکەم لە جیهانی نوێدا مومکینە. جەنگی سەربەخۆی ئەمەریکا دەسەڵاتی لەشکرە جەماوەریەکانی بۆ بەرگریکردن لە ئازادی دژی «فەرمانرەوا ستەمکارەکان» ئاشکرا کرد. دەستوری ئەمەریکا سەلماندی کە حکومەتی کۆماری لە سەردەمی مۆدێرندا کارایی هەیە، و خۆی بوو بە نمونەی حکومەتێك کە تیایدا خەڵك وەك سەرچاوەی سەرەکی دەسەڵات کاردەکەن.

دواجار ئەوەی کە دەستوری ئەمەریکا مۆدێلی حکومەتێکی پیشاندا کە تیایدا بەرگریکردن لە ئازادی، بە پێچەوانەی وێنای مۆنتیسیکۆوە، نەبەسترا بوو بە هێزە کۆنخوازەکانەوە. ئەزمونی ئەمەریکا کە پێدەچوو عەمەلی بێت، ئەوەی دەسەلماند کە دەسەڵات ئەگەر لە خەڵکیەوە سەرچاوەی گرتبێت، و لەژێر چاودێری

وردی دەستوردا بێت، ئەوا بەناچار گەندەڵ نییە.

کۆماری تازەی ئەمەریکا بانگهێشتی ئەوروپای دێرینی دەکرد، بۆئەوەی ڕەوت و شێوازێکی هاوشێوە هەڵبژێرێت. لە دەیەکانی ۱۷۸۰دا فەیلەسوفانی وەك کۆندریسە کە پێش ئەمە بڕوای بە عەقڵ و پسپۆری تەکنەلۆژی وەك زامنی پێشکەوتن بوو، وازی لە تاکرەهەندی تەکنۆکراتی پێشوی خۆی هێنا، و هێواش هێواش کارایی و توانایەکی تازەی لە جەماوەری خەڵکیدا دۆزیەوە.

لەڕاستیدا ئەو مەسەلەیەی کە خەڵکی لە چی دروستبوون و چ کەسانێك دەبێت قسەکەریان بن، زۆر ئاڵۆز بوو، وە تا پێش شۆڕشی مەزنی فەرەنسی لە ساڵی ۱۷۸۹دا، بەتەواوی روون نەبۆوە. دیارە شۆڕی فەرەنسی خەرمانێك تیورە و بەرنامەی سیاسی دروستکرد. ئەو ڕژێمانەی پاش لە سێدارەدانی لوی شانزەهەم یەك لەدوای یەك هاتنە سەرحوکم، هیچ کامیان نەیانتوانی شێوەیەکی سەقامگیر و سەرکەوتوو بۆ پەیوەندی نێوان خواستی دولایەنەی حکومەتی جەماوەری و حکومەتێکی کارا و بەتوانا پێشکەش بکەن. هێشتاش لەبارەی ئەو مەتەڵانەی کە بەرجەستەترین بیریارانی ڕۆشنگەری سەرقاڵبوون پێوەی و شۆڕشی فەرەنسیش نەیتوانی چارەسەریان بکات، شتێکی زیاتر ناتوانرێت بگوترێت.

**سەرچاوە:**

وەرگێڕانی فەسڵی سێهەمی کتێبی: (روی پرتر: روشن نگری، ت: سعید مقدم. تهران، اختران ۱۳۸۷).

میشێل فۆکۆ
لە عەرەبییەوە: بەختیار عەلی

# کانت و شۆڕش

پێم وایە ئەم دەقەی کانت، جۆرێکی دیکەی پرسیارمان لە بواری بیرکردنەوەی فەلسەفیدا بۆ ئاشکرا دەکات. بێگومان ئەمە یەکەمین دەقی ناو مێژووی فەلسەفە نییە، هەروەها یەکەمین نووسینی کانت خۆشی نییە کە پرسیار دەربارەی مێژوو دەهێنێتە گۆڕێ. هەر لەلای ئەم فەیلەسوفە گەلێ نووسینی دیکە بەرچاو دەکەوێت کە پرسیاری ڕەگ و ڕیشە و بنەچەکان لە مێژوو دەکات. وەکو ئەو نووسینانەی سەبارەت بە سەرەتاکانی مێژوو و سەبارەت چەمکی ڕەگەزەکان لەبەردەستماندایە. هەروەها چەند دەقێکی دیکەش هەیە کە مێژوو دەخەنە پێش ئەم پرسیاری (چۆنیەتی بە ئەنجام گەیاندن و گەلاڵە بوونە)، وەك ئەو دەقەی لە ساڵی ١٧٨٤ بڵاوکراوەتەوە بە ناونیشانی (دەربارەی بیرۆکەی مێژوویەکی جیهانی لە ڕوانگەی دیدگایەکی گەردوونیەوە) جگە لەمانەش چەند نووسینێکی دیکە هەیە لەو ئامانجە تایبەتیە دەپرسن کە ڕوگە مێژووییەکان ڕێك دەخەن، وەکو ئەو دەقەی تایبەتە بە بەکارهێنانی (بنەما ئامانجدارەکان – المبادیء الغائیة). ئەم دەقانەش کە بە یەکەوە بەستراون و پەیوەندییەکی پتەو لە نێوانیاندا هەیە، کۆی بۆچوونەکانی «کانت»یان بڕیوەو بە ناویدا شۆڕبونەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وا مەزەنە دەکەم کە ئەم نووسینە دەربارەی (سەردەمی ڕۆشنگەری)، لەگەڵ هەموو نووسینەکانی تردا جیاوازە، چونکە لانی کەم ئەم دەقە هیچ یەکێك لەو پرسیارانە ناخاتە ڕوو کە ئاماژەمان بۆ کرد. پرسیار دەربارەی ڕەگ و ڕیشە و پرسیاری بە ئەنجام گەیشتن و گەلاڵە بوون – ئەگەرچی وا بێتە بەرچاوی بینەریش-، بەڵکو ئەم دەقە بە جۆرێکی شەرمنانە و وەختە بڵێم لابەلا مەسەلەی ئامانجی شاردراوەی نێو ڕەوت و ڕەوگەی مێژوو دەهێنێتە کایەوە. لام وایە

ئەم مەسەلەیەش کە بۆ یەکەمجار لەلایەن (کانت)ەوە خراوەتە ڕوو، مەسەلەی ئێستاکێیە: واتە پرسیارە دەربارەی (هەنوکە — الانیة): ئەمڕۆ چی ڕوو دەدات؟ ئێستا چی ڕوو دەدات؟ ئەو ئێستایە چییە کە ئێمە و کەسانی تری تیا دەژین، کێیە ئەو کەسەی ئەم ساتە دیاری دەکات کە من تیا دەنووسم؟

ئەمە یەکەمجار نییە کە لە ناو بیرکردنەوەی فەلسەفیدا ئاماژەیەکی ئاشکرا بۆ (ئێستاکی — الحاضر) دەدۆزینەوە، وەکو دۆخێکی مێژوویی دیاریکراو. دیکارت لە سەرەتای (گوتاری میتود)دا وەسفی ڕێبازی خۆی و ئەو کۆمەڵە بڕیارە فەلسەفیە دەکات کە بەرامبەر بە خۆی و فەلسەفە داوێتی. بەڕوون و ئاشکراش ئاماژەی بۆ مەسەلەیەك کردووە کە دەتوانین بە دۆخی مێژوویی (خۆی- وك)، لە ناو ڕیزبەستنی زانست و زانیاریەکانی سەردەمی خۆیدا حسێبی بکەین. بەڵام ئەوەی لەم جۆرە ئاماژانەدا پێویستە، دۆزینەوەی ئەو پاڵهێزەیە وادەکات لەناو ئەو شێوە ناوازەیەدا کە بە (ئێستاکی) ناودێری دەکەین، بڕیاری فەلسەفی بدرێت. لای دیکارت لەم جۆرە پرسیارە نادۆزینەوە کە بپرسێت: (دەبێت ئەم ئێستایەی کە من تیا دەژیم، بە تەواوەتی چی بێت؟)، بەڵام من وای دەبینم ئەو پرسیارەی (کانت) ناچار بووە وەڵامی بداتەوە، جۆرێکی دیکەیە لە پرسیار، واتە پرسیارێکە بەم ئاسانییە و لەم شێوەیە دانارێژرێت کە بڵێین ئەو شتانە چین لە بارودۆخی ئێستادا ئەم بڕیارە یاخود ئەوی دیکە لەناو سیستمی فەلسەفیدا دیاری دەکەن؟. بەڵکو پرسیارەکەی کانت پابەندی شوناسی ئەم (ئێستا)یەیە. بەر لە هەر شتێکیش دیاریکردنی ڕەگەزێکی دیاریکراوە لەناو هەموو ڕەگەزەکانی ئێستادا و ناسینەوەو جیاکردنەوەو یەکالاکردنی شفرەی ئەو ڕەگەزەیە تا پرسیارەکەمان دەبێتە ئەمە. لە ئێستاکەدا چ شتێکە لە ناو بیرکردنەوەی فەلسەفیدا (مانا) فۆرمەلا دەکات؟ کانت لە وەڵامیدا بۆ ئەم پرسیارە، هەوڵدەدات خەسڵەتەکانی ئەم ڕەگەزە دیاری بکات کە وا دەکەن ئەم ڕەگەزە ببێتە نیشانەی ڕەوگەیەك کە فیکر و زانست و فەلسەفەی لە ئامێزە. بەڵام لە هەمان کاتدا پێویستە هەموو ئەو هۆو شێوانە دیاری بکرێت کە کارێك دەکەن (قسەکەر-المتحدث) جا ئیدی بیریار بێت یاخود زانا، یان فەیلەسوف، بۆ خودی خۆی ببێتە بەشێك لەو ڕەوگەیە و پابەندی بێت. دواتریش چۆن ئەو ڕۆڵە دیاری بکەین کە ئەم قسەکەرە لەناو ئەو ڕەوگەیەدا دەیگرێت کە خۆی لە یەك کاتدا وەکو ڕەگەزێك و بکەرێکیش تیایدا ئامادەیە.

بە گشتی من وا دەبینم لەم دەقەی کانتدا مەسەلەی ئێستاکی وەکو ڕووداوێکی فەلسەفی خراوەتە ڕوو کە ئەو فەیلەسوفەی قسەی لەسەر دەکات خۆشی بەشێکە لێی و پابەندێتی. ئەگەر ئێمە ئەوەمان قەبووڵ بێت فەلسەفە شێوەیەکە لە شێوەکانی کاری تیئوری کە مێژووی تایبەتی خۆی هەیە، ئەوا بەڕای من (زیادڕەویش نییە ئەگەر بڵێم بۆ یەکەم جار لەم دەقەی کانتدا سەبارەت بە ڕۆشنگەری، دەبینین فەلسەفە کار دەکات بۆ دارشتنی ئیشکالیەتێك بۆ ساتەوەختی تیئوری خۆی لە هەنووکەدا). لێرەدا فەلسەفە (هەنوکە — الانیە)ی خۆی دەهێنێتە قسە، وەك ڕووداوێك کە دەبێت مانا و بەهاو ناوازەیی فەلسەفیانەی ئاشکرا بکرێت، لە هەمان کاتدا دەبێت لە ناو ئەو هەنووکەیەدا بەهانەی بوونی خۆی و بناغەی قسەکانی خۆی بدۆزێتەوە.

کەواتە پرسیاری فەیلەسوف دەربارەی ئینتمای بۆ (ئێستا)، بە هەموو شێوەیەك لەوە دەرچووە پرسیار بێت دەربارەی ئینتمای بۆ مەزهەبێك یان کەلەپوورێکی دیاریکراو، لەوەش دەرچووە پرسیار بێت سەبارەت کێشەی ئینتماکردنی بۆ کۆمەڵەیەکی مرۆیی بەشێوەیەکی گشتی، بەڵکو پرسیارەکە تایبەتی ئینتمایەتی بۆ (ئێمە- نحن)یەکی دیاریکراو، بۆ ئێمەیەك ئاماژەیە بۆ دەستەیەکی ڕۆشنبیری کە بە هەنووکەیەتی خۆیدا دەستنیشان دەکرێت. هەر ئەو ئێمەیەشە لە فەلسەفەدا بۆی دەبێتە بابەتی بیرکردنەوە.

لێرەشەوە ئیدی لە توانای فەیلەسوفدا نییە خۆی لەو پرسیارە بدزێتەوە کە تایبەتە بە ئینتمای تاك و تەنهایانەی خۆی بۆ ئەو (ئێمەیە). هەموو ئەم مەسەلانەش (واتە مەسەلەی فەلسەفە وەکو کردارێك کە

هەنوکەیەتی خۆی کردووە بە گرفتێك، یان وەکو پرسیارێك دەربارەی ئەم هەنوکەیەی فەیلەسوف ئینتمای بۆ دەکات و دەبێت هەڵوێستێکی لێ وەربگرێت)، هەموو ئەمانە وا دەکات بتوانین فەلسەفە وەك گوتاری تازەگەری و گوتارێك دەربارەی تازەگەری جیابکەینەوە. بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی سادەتر قسە بکەین دەڵێین: مەسەلەی تازەگەری لە ڕۆشنبیری کلاسیکی خۆرئاوادا لە تەوەرەیەکی دوو جەمسەریدا خراوەتە ڕوو: جەمسەری سەردەمی کۆن و جەمسەری تازەکردنەوە (مودێرنیزەکردن)، مەسەلەکە وا فۆرمەلە کراوە کە یان بە ئاراستەی دەستەڵاتێك بووە کە دەبێت قەبووڵی بکەین، یاخود ڕەتی بکەینەوە (چ دەستەڵاتێکمان قەبووڵە و پەیڕەوی چ نموونەیەك دەکەین.. هتد؟) یاخود بەشێوەیەکی هەڵسەنگێنەرانەی بەراوردکارانە بووە (کە هەر پابەندی ئاراستەی یەکەم): ئایا کۆنەکان چاکترن یاخود تازەگەران؟ ئەی ئاخۆ ئێمە لە ڕۆژگاری هەرەس و دارماندادین.. هتد؟ بەڵام لەگەڵ ئەم دەقەی کانتدا مەسەلەی تازەگەری بەشێوەیەکی نوێ خرایە ڕوو. پرسیارەکە لە ئێستادا تایبەتی ئەو پەیوەندییە تەریبە نییە لەگەڵ کۆنەکاندا، بەڵکو دەربارەی پەیوەندییەکە کە دەتوانین بە «تیشکیانە- شعاعیە» ناوی بەرین کە لە (هەنوکەی) خاوەن پرسیارەوە دەردەچێت.ئیدی لە ئێستاوە دەبێت گوتار (هەنوکەی) تایبەتی خۆی حیساب بکات، تا لە لایەکەوە بتوانێت بواری ئامادەبوونی تایبەتی خۆی دیاری بکات، لەلایەکی تریشەوە مانای خۆی لەفز بکات، دواجاریش شێوەی ئەو کردارە دەستنیشان بکات کە لە ناو ئەو (هەنوکەیەدا) دەتوانێت پێی هەستێت.

(هەنوکەی) من چییە؟ مانای ئەو (هەنوکەیە) چییە؟ جۆری ئەو کردارە چییە کە پێی هەڵدەستم، کاتێك باس لەو هەنوکەیە دەکەم؟ بەڕای من ئەمە پێناسەی ئەم پرسیارە تازەیەمان سەبارەت (تازەگەری) بۆ ئاشکرا دەکات.

بەڵام ئەم دەرئەنجامانەی کە تا ئێستا دەستمان کەوتووە تەنها ڕاڕەوێکە کە دەبێت لە نزیکەوە بیپشکنین، لەبەرئەوە پێویستە بکەوینە باسێکی جینالۆجیانە کە بە زەرورەت مەبەستمان لێی بیرۆکەی تازەگەری نییە، بەڵکو کێشەی تازەگەرییە. بەهەرحاڵ هەتا ئەگەر دەقەکەی کانت وەکو خاڵێکی بەرجەستە بوونی ئەم مەسەلەیە وەربگرین، ئەوا دەبینین ئەم دەقە دەکەوێتە ناو ڕوگەیەکی مێژوویی بەرفراوانترەوە کە دەبێت ماف تەواوەتی خۆی بدەینێ. ئەم جۆرە کارکردنەش بێگومان دەبێتە تەوەرێکی گرنگ بۆ لێکۆڵینەوەی سەدەی هەژدەهەم بەگشتی و سەردەمی ڕۆشنگەری بەتایبەتی. ئەگەر هاتوو ئێمە ئەم مەسەلەیەمان خستە ژێر پرسیارەوە کە سەردەمی ڕۆشنگەری کاتێك ناوی خۆی ناوە (ڕۆشنگەری) ئەوا بەبێ هیچ دوودڵییەك ڕوگەیەکی ڕۆشنبیری تایبەتمەندی ناوازەبوە، چونکە بە ناونانی خۆی هوشیاری بەرانبەر بە خودی خۆی هەبووە و خوشی لەبەردەم ڕابووردو و داهاتوودا دەستنیشان کردووە، ئەمە جگە لە دیاری کردنی بۆ ئەو هەڵبژاردنانەی کە لە چوارچێوەی ئێستاکێدا ڕوویان تێدەکات.

ئەی هەر سەردەمی ڕۆشنگەری نییە کە یەکەمین سەردەمە خۆی (ناو) لە خۆی دەنێت. یەکەم سەردەم نییە کە دوور لە نەریتە دێرینەکان لە ڕێگای سیفەتی دارمان یاخود بەهۆی گەشەسەندن و بوژاندنەوەوە بیناسینەوە، یان هەر لە ڕێگای پەنابردنە بەر ناوی وەکو (سەردەمی ڕەونەقدار) یان (سەردەمی کلۆڵی و نەداری)، جیای بکەینەوەو بیناسینەوە. ڕۆشنگەری یەکەم سەردەمە کە لە ڕێگای ڕووداوێکی دیاریکراوی ناو مێژووی فیکری سەرتاسەرەوە ناو لە خۆی دەنێت، یەکەم سەردەمە کە بە ناوی ڕووداوێکی ناو مێژووی عەقڵ و زانست کە خۆی ڕۆڵێکی تایبەتیشیان تیا دەگێڕێت خۆی تۆمار دەکات.

سەردەمی ڕۆشنگەری قۆناغێکە هەروەکو چۆن خۆی زانست و ئامۆژگارییەکانی خۆی فۆرمەلا کردووە، هەر خۆشی دروشمی خۆی دارشتووەو کاری خۆی لە بەرامبەر مێژووی فیکردا بە گشتی ڕاگەیاندووەو ئینجا هەمان ئەو کردارەشی دەستنیشان کردووە کە لە ئێستادا پێی هەڵدەستێت. هەروەکو چۆن ئەو ئیشەی لە

بەرامبەر شێوەکانی زانست و زانیاری و نەزانین و ئەوهامدا دیاری کردووە کە ئەم سەردەمە زانیوێتی چۆن لێیان نزیك ببێتەوە و چۆن دۆخی مێژووی خۆشی لە ناویاندا بناسێت. من پێم وایە ئێمە لە مەسەلەی (سەردەمی ڕۆشنگەری)دا و لە ئاستی مامەڵەکردنی فەلسەفیدا، یەکەمین دیاردەکانی لەدایکبوونی ڕێگایەکی دیاریکراو دەبینین کە بە درێژایی دوو سەدە بە مێژوویەکی درێژدا ڕابووردووە، چونکە یەکێ لە گرنگترین ئەرکەکانی ئەو فەلسەفەیەی کە بە (تازە) ناوی دەبەین (کە دەشێت دەستپێکردنی بگەڕێتەوە بۆ دوورترین سەرەتاکانی چەرخی هەژدەهەم) پرسیارکردنێتی سەبارەت بە (هەنووکەی) خۆی. دەشتوانین لە سەدەی نۆزدەهەمەوە بە شوێن پێی ئەو شێوازەدا بڕۆین تا دەگەینە ئەمڕۆ.

بەڵام تاکە شتێك کە حەز دەکەم زیاتر پێی لەسەر داگرم و تۆخی بکەمەوە، ئەوەیە «کانت» ئەم مەسەلەیەی کە لە ساڵی ١٧٨٤دا خستبوویە ڕوو، دواتر لە یادی نەکردووەو نەیخستۆتە ناو خانەی فەرامۆشیەوە. ئەو لە ١٧٨٤دا وەڵامی پرسیارێکی دەدایەوە کە لە دەرەوە لێی کراوە، بەڵام جارێکی تر و لە بۆنەیەکی دیکەدا، لە ناوەندی قسەکانی خۆیدا کاتێك لەسەر شۆڕشی فەرەنسی قسە دەکات، کە ڕووداوێکە لەو سەردەمانەدا پرسیاری لە خودی خۆی دەکرد، جارێکی تر هەوڵدەدات وەڵامی هەمان پرسیاری پێشوو بداتەوە.

ساڵی ١٧٩٨ کانت نووسینێك دەخاتە بەردەست کە دەتوانین بڵێین تەواوکەری دەقەکەی ساڵی ١٧٨٤ە. لە ١٧٨٤دا ئەو هەوڵی دەدا وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە کە ئایا ڕۆشنگەری چییە؟، بەڵام ١٧٩٨ وەڵامی پرسیارێکی دیکە دەداتەوە کە ڕووداوەکانی ڕۆژ خستویانەتە بەردەمی، لە ڕاستیدا ئەم مەسەلەیە هەر لە ١٧٩٤ەوە لە ئەڵمانیادا گفتوگۆ فەلسەفیەکان فۆرمەلایان کردبوو، ئەویش پرسیار بوو سەبارەت بەوەی ئایا (شۆڕش چییە)».

خۆتان دەزانن کە کتێبی (ململانێی کۆلێژەکان)، سێ نامەیە سەبارەت بەو پەیوەندیانەی لە نێوان کۆلێژە جیاوازەکانی زانکۆدا هەیە. نامەی دووهەم تایبەتە بەو کێشەیەی لە نێوان کۆلێژی فەلسەفە و مافناسیدا هەیە. ئەو کات ئەو پرسیارەی کە (ئایا ڕەگەزی بەشەری لە پەرەسەندنێکی بەردەوامدایە؟)، کۆنترۆڵی پەیوەندیەکانی فەلسەفە و مافناسی کردبوو. کانت بۆ ئەم وەڵامە لە بڕگەی پێنجەمی ئەم نامەیەدا هەوڵدەدات ئەم ئیستدلالە بسەلمێنێت کە (ئەگەر ئێمە بمانەوێت وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە کە ئایا ڕەگەزی بەشەری لە پەرەسەندنێکی بەردەوامدایە؟)، دەبێت ئەوە دیاری بکەین کە ئایا هۆکارێکی مومکن هەیە بۆ ئەم پەرەسەندنە. هەر کە ئەوەشمان قەبووڵ کرد ئەو هۆکارە هەیە ئەوکات دەبێت بیسەلمێنین کە هۆکارێکی چالاك و کاریگەرە، چونکە تەنها دیاریکردنی هۆکارە کە بوار بە ڕستێك بەرەنجامی مومکن دەدات، یان بە گوزارشتێکی وردتر تەنها بواری پێشبینی کردنی ئەنجامێك دەدات، بەڵام دامەزراندنی واقیعی ئەنجامەکە بەبێ بوونی (ڕووداوێك) مومکن نییە. کەواتە بەس نییە تەنها هەست بە (هاوئاهەنگیەکی ئامانجدارانە) بکەین کە دەبێتە مایەی پەرەسەندن، بەڵکو دەبێت لەناو مێژوودا ڕووداوێك دیاری بکەین کە هەمان نرخ و بەهای (هێمانومای – مۆشر) هەیە، بەڵام (هێمانومای) چی؟

هێمانومای هۆکارێکی بەردەوام کە ڕێنوێنی ڕەگەزی بەشەری کردووە بەرەو پەرەسەندن و پێشکەوتن، هۆکارێکی نەگۆڕ کە دەتوانین بیسەلمێنین لە ڕابووردوودا چالاك بووەو ئێستاش بەکارەو لە پاشەڕۆژیشدا هەر کاری خۆی دەکات. کەواتە ئەو ڕووداوەی بواری ئەوەمان دەداتێ دان بە بوونی پەرەسەندندا بنێین، ئەوە بۆ خۆی (هێمانوما)یەکە کە دەشێت لە یادەوەریەکانمانەوە بانگی بکەین و لە ئێستادا بیسەلمێنین و لە داهاتوودا پێشبینی ڕوودانی بکەینەوە (لە دەقە ئەسڵیەکەدا بە لاتینیە). واتە (هێمانوما) کە دەبێت بیسەلمێنێت مەسەلەکان لە ڕابووردوودا ڕوویداوەو بانگهێشتنی لە یادەوەریەوە، هەر ئەو مەسەلانەش ئێستاکی ڕوودەدەن (هێمانومان کە لە حاڵەتی ئیستیدلالیدا)، بەردەوامیش مەسەلەکان هەر بەم جۆرە

ڕوودەداتەوە (هێمانوما کە لە حاڵەتی پێشبینی کردندا). بەم شێوەیە دەتوانین دڵنیابین کە ئەو هۆکارەی دەبێتە مایەی پەرەسەندن تەنها لە بارودۆخێکی دیاریکراودا بەو کردارە هەڵنەستاوە، بەڵکو ئارەزوویەکی سەرتاسەری لە خۆیدا هەڵگرتووە کە پاڵ بە هەموو ڕەگەزی بەشەریەوە دەنێت بە ئاراستەی پەرەسەندن بەرەو پێش بڕۆن.

ئەو کاتیش پرسیارەکە بەم جۆرە دەکەوێتەوە: (ئاخۆ لە دەوروبەرمان ڕووداوێکی ئەوتۆ هەیە بتوانین لە یادەوەریەوە بانگی بکەین لە ڕێگای ئیستدلالەوە ئاماژەی بۆ بکەین، پێشبینی دووبارە دەرکەوتنەوەشی لە خۆیدا ئاماژەی ئەو پەرەسەندنە بەردەوامە بێت کە هەموو ڕەگەزی بەشەری هەڵگرتووە؟).

بێگومان ئێوە هەستتان بەوەڵامەکەی کانت کردووە. من لێرەدا پارچەیەکتان لە تێکستێکی کانت بۆ دەخوێنمەوە کە لە ڕێگایەوە کانت (هەروەکو خۆی دەستنیشانی کردووە)، وەکو ڕووداوێك لە شۆڕش نزیك دەبێتەوە کە بەهای (هێمانومای) هەیە. ئەو لە برگەی شەشەمی نامەی (ناوبراودا) نووسیوێتی:

(نەکەن لەو ڕووداوەدا کۆی ئەو کردارە بەرز و خراپەکاریە ترسناکانە ببیننەوە کە خەڵکی پێی هەستاون. ئەو کردارانەی هەموو شتە مەزنەکانی لای ئەوان کردە شتی پڕوپوچ، شتە پڕوپوچەکانیشی کردە شتی مەزن، نەکەن ئەو دیاردە دێرینە قەشەنگانە ببینن کە بە کاریگەرییەك کە هەر لە کاری سیحر دەچێت لەناوچوون و لە شوێنی ئەواندا هەر کت و مت وەکو ئەوەی لە ژێر زەوییەوە هەڵقوڵێبن دیاردەی دیکە دەرکەوتن نا، نا هیچ شتێکی وا لە گۆڕێ نییە).

لەم دەقەدا کانت ئاماژە بۆ ئەو بیروڕا تەقلیدیانەیە دەکات کە لە کۆدیتا و هەرەسی ئیمپراتوریەتەکاندا، بەدوای بەڵگەو ئاماژەی پەرەسەندن یاخود وەستان و گەشەسەندندا دەگەڕێن، یاخود لە شکست و نسکۆی بارودۆخە زۆر جێگیرەکاندا دەگەڕێن، یان ئەو گۆڕانکاریە چارەنووسسازە دەپشکنن کە هێزە پایەدارەکان تێك دەشکێنێت و دەیانگۆڕێت بە هێزێکی تر. (کانت) بە خوێنەرانی خۆی دەڵێت: (ئاگاداربن، ئێمە لەو ڕووداوە گەورانەدا ئەو هێمانوما بانگ کراوە — ئیستدلالیە — پێشبینی کراوەی پەرەسەندن نادۆزینەوە، بەڵکو ئێمە لە ڕووداوی بچوکتردا دەیبینینەوە. ڕووداوێك کە شاردراوەتر و نادیارترە. ئێمە لەسەر ڕۆشنایی ئەو بەها و دەلالەتانەدا ناتوانین ئێستای خۆمان شی بکەینەوە، بێ ئەوەی بکەوینە ناو تەلیسمێکەوە کە بەرەو ئەوەمان دەبات کە ئەو بەهایانە لەدووی دەگەڕێین بیبەخشینە ڕووداوێك لە ڕووکەشدا خاڵیە لە هەر بەها و دەلالەتێك).

بەڵام کام ڕووداوەیە کە گرنگ نییە؟ لێرەدا موفارەقەیەك هەیە گەر بڵێین شۆڕش ڕووداوێکی پڕ لە هەیاهوو جەنجاڵی نییە. ئەی شۆڕش خۆی نموونەی ڕووداوێك نییە شتەکان سەرەوژێر دەکات و هەڵیان دەگێڕێتەوە، شتە گەورەکان دەکاتە شتی پڕو پووچ و شتە پڕوپووچەکانیش دەکاتە شتی مەزن. هەر شۆڕش نییە کە پەیکەری ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتە گەورانە دەخوات کە لە ڕووکەشدا پایەدار و نەگۆڕ دێنە پێش چاو؟ بەڵام لای کانت ئەم چەمکەی شۆڕش نییە کە ماناکان دیاری دەکات.

ئەوەی لای کانت ئەو ڕووداوە فۆرمەلا دەکات و بەهای (بانگ کراو، ئیستدلالی، پێشبینی کراو)ی هەیە، خودی دراما شۆڕشگێڕیەکە نییە، وەك چۆن خودی سەرکەوتنە شۆڕشگێڕانەکەو ئاماژە و غەمزاندنەکانی هاوشانی نییە. ئەوەی لە شۆڕشدا هەڵگری دەلالەتە ئەو میتۆدەیە کە شۆڕش دیمەنەکەی پێهەڵدەسەنگێنێت. واتە دەلالەتی چۆنێتی پێشوازی کردنی بینەرانە لە شۆڕش. بینەرانێك کە بەشداریان نەکردووە، بەڵکو تەنها تەماشاچی بوون، ئامادەی بوون و بەچاك و بە خراپ خۆیان داوەتە دەست شەپۆلەکەی. ئاڵوگۆڕی شۆڕشگێڕانە بەڵگەی پێشکەوتن نییە، چونکە یەکەم، تەنها ئاوەژوو کردنەوەی واقعی شتەکانە. دووەم، ئەگەر ئەوانەی بە شۆڕش هەستاون بۆیان هەبێت وەکو خۆی دووبارەی بکەنەوە، نایکەنەوە.

دەقێکی کانت هەیە ئێجگار بایەخدارە دەڵێت: گرنگ نییە شۆڕش شۆڕشی نەتەوەیەکی خاوەن فەرهەنگێکی دەوڵەمەند بێت، وەکو لەم سەردەمەدا بینیمان (لێرەدا باس لە شۆڕشی فەرەنسی دەکات)، ئەوەش گرنگ نییە بزانین سەرکەوتوو دەبێت یاخود ژێرکەوتوو، زانینی بڕی ئەو کلۆڵیی و نەگبەتیەش کە لە کاتی شۆڕشدا کەڵەکە بووە هەر بایەخێکی ئەوتۆی نییە، چونکە ئەگەر مرۆڤێکی عاقڵ بۆی هەبێت بە هیوای سەرکەوتن ئەنجامی بداتەوە، هەرگیز بە هەمان نرخی پێشوو ئەزموونی وای پێ قبووڵ نییە. ڕەوتی شۆڕش بایەخێکی ئەوتۆی نییە، هەروەها مەسەلەی سەرکەوتن و نووشستیش پەیوەندییەکی بە مەسەلەی پەرەسەندنەوە نییە، یاخود لایەنی کەم پەیوەندییەکی بەو هێمانۆمایەی پەرەسەندنەوە نییە کە ئێمە بەدوایدا دەگەڕێین. هیچ یەکێك لە سەرکەوتن و لە نووشستیش هێمانومای پەرەسەندن نین، هەروەکو چۆن نیشاندەری نەبوونی پەرەسەندنیش نین. بەڵکو ئەگەر مرۆڤ بۆی برەخسابایە سەبارەت بە ئەنجامەکانی شۆڕش و چۆنێتی گەشەسەندنی ئاگادار بووایەو لە هەمان کاتیشدا بیتوانیایە جارێکی تر بە هەمان ئەو نرخەی کە پێویست بوو بدرێت بەرەو سەرکەوتن ڕێنوێنی بکات، ئەوا ئەم مرۆڤە ئەگەر عاقڵ بێت کاری وا دووبارە ناکاتەوە. شۆڕش بۆ خۆی وەکو پرۆسەیەکی هەڵگێڕانەوە یان وەکو دەستپێشخەرییەك کە دەشێت سەرکەوتوو بێت یاخود نووشوستی بهێنێت دواتریش وەکو نرخێکی زۆر گران کە دەبێت بیدەین، نیشاندەری ئامادەبوونی ئەو هۆکارە نییە کە لە ناو مێژوودا دەبێتە مایەی پەرینەوەی بەردەوامی ڕەگەزی بەشەری بەرەو پێشەوە.

بەڵام لە بەرامبەردا ئەوەی لای کانت نیشانەی پەرەسەندنە ئەو هاوسۆزییەیە لە نێوان هیواکاندا کە لە حەماسەت نزیك دەبێتەوە شان بە شانی شۆڕش بە ڕێگادا دەڕوات، ئەوەی لە شۆڕشدا گرنگە خودی ڕووداوی شۆڕش نییە، بەڵکو گرنگ ئەو شتانەیە کە لە زەینی ئەو کەسانەدا دەسوڕێتەوە کە هەڵناستن بە کاری شۆڕش کردن، یاخود لایەنی کەم بکەرە سەرەکیەکانی نین. گرنگ ئەو پەیوەندییەیە لە نێوان ئەوانەدا کە ئەندامی کارای شۆڕش نین لەلایەك و شۆڕش خۆیدا لە لایەکی دیەوە بەرقەرار دەبێت. لای کانت حەماسەت بۆ شۆڕش هێمانومایەکە، خۆتەیارکردن و خۆسازدانێکە هەمیشە لە دوو شێوەدا دەردەکەوێت: یەکەمیان لەو مافەدا بەرجەستە دەبێت کە هەموو میللەتێك دەبێت ئەو دەستوورە سیاسییە ببەخشێتە خۆی کە قبوڵێتی. دووەمیان لەو بنەمایەدا ئاشکرا دەبێت کە لەگەڵ ڕەوشت و هەقدا دەگونجێت و تەبا دێتەوەو دەیەوێت مرۆڤایەتی دەستوورێکی سیاسی سەرتاسەری هەبێت کە هەر لە دیدی ئەو بنەما دەستوریانەوە، لە سازدانی هەر هەڵمەتێك و هێرشێکی پەلاماردەرانە خۆ لابدەین.

ئەو خۆ سازدان و خۆ تەیار کردنەش کە بەشەریەت بەرەو لای ئەم دەستورە هەڵدەگرێت، نیشاندەرەکەی لە حەماسەتدا بۆ شۆڕش دەردەکەوێت. شۆڕش وەکو دیمەنێك نەوەکو چەند غەمزەو ئاماژەیەك وەکو نیشتەجێی حەماسەت لای ئەوانەی ئامادەی دەبن، نەوەکو چەند مەبدەئێك لای ئەو کەسانەی بەشداری دەکەن لە دروستکردنیدا. ئەمەش هێمانومایەکی بانگکراوە، چونکە ئەو خۆ تەیارکردنە بەرجەستە دەکات کە لە ناو مرۆڤدا ڕیشەی داکوتاوەو هەروەها هێمانومایەکی ئیستدلالیشە، چونکە کاریگەری ئێستاکیی ئەم خۆتەیارکردنە ئاشکرا دەکات. هێمانومایەکی پێشبینی کەریشە، چونکە لە پاشەڕۆژدا ناتوانرێت ئەو خۆسازدانە فەرامۆش بکرێت کە لە کاتی ئەنجامدانی شۆڕشدا دەرکەوتووە، ئەگەرچی دەشێت لە دوایيدا بەسەر هەندێك ئەنجامی شۆڕشدا بچینەوە. دواتر ئێمە دەزانین ئەم دوو ڕەگەزە — ئەو دەستوورە سیاسیەی میللەت بە ئیرادەی خۆی هەڵیبژاردووە و ئەو دەستوورە سیاسیەش کە لە هێرش و پەلامار دەمانپارێزێت-، هەردووکیان دوو ڕەگەزن لە ناو ڕەوتی سەردەمی ڕۆشنگەری و شۆڕش. دەبنە یەکێك لەو ڕووداوانەی کە فەرامۆش ناکرێت و لەیاد ناچێتەوە، چونکە لە ڕاستیشدا شۆڕش بەردەوامی و بڵندکردنەوەی سەردەمی

ڕۆشنگەرییە. کانت لەمڕووەوە دەنووسێت:

من دەتوانم پێشبینی داهاتووی ڕەگەزی مرۆڤایەتی بکەم، ئەمەش لە ئارەزووی تەنجیم و فاڵگرتنەوە هەڵنەقوولاوە، بەڵکو لەو دیاردانەوە دێت و لەو پەیوەندیانەوە هەڵدەقوڵێت کە لەم سەردەمەدا دەیبینم. دەتوانم پێشبینی یەکەم کە ڕەگەزی بەشەری دەگاتە ئەو ئامانجە واتە دەگاتە حاڵەتێك خەڵك بتوانن کار بە دەستوورێك بکەن کە هێرش و پەلاماریان لە کۆڵ بکاتەوە، بە جۆرێك ئەم دەستکەوتانەش لە هەر پێشێلکردن و نکوڵی لێکردنێك بە دووربن. دیاردەیەکی واش ناکرێت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا لەیاد بکرێت، چونکە لە سروشتی مرۆڤدا جۆرە تواناو خۆسازدانێك بەرجەستە دەکات بۆ پەرەسەندن کە هیچ سیاسەتێك چەند فێڵبازانە بێت، ناتوانێت لە ڕەوتی پێشبینی و ڕابوردووی ڕووداوەکان دەریان بکێشێت. ئەگەر بەپێی ئەو بنەما شاردراوانەی هەق کە مرۆڤ لەناو خۆیدا هەڵی گرتووە (سروشت و ئازادی) کۆبووەوە، ئەوا ئەگەر بە شێوەیەکی دەستنیشان نەکراوو ڕاگوزەریش بووە، تەنها خۆیان (واتە سروشت و ئازادی) بۆیان دەبێت بڕیار بدەن، بەڵام ئەگەر ئامانجی داواکراوی ئەودیو ئەم ڕووداوانە هەر دەستەبەر نەبوو، واتە هەتا ئەگەر لە دوای شۆڕش و ئەو ڕیفۆرمانەوە کە دەستووری میللەتیشی گرتۆتەوە جارێکی تر سەرنەکەوتن و نووشستی هاتەوە پێش، ئەگەر دوای تێپەڕینی ماوەیەکی زەمەنی کورت هەموو شتێك کەوتە هەرەس هێنان بۆ ناو هەمان خەرەندەکانی جاران وەك هەندێك لە سیاسیەکان پێشبینی دەکەن. ئەوا ئەم کەوتنە هیچ شتێك لە تین و تاوی ئەم پێشبینیە کەم ناکاتەوە، چونکە ئەم ڕووداوە ئەوەندە گرنگە و بە ئەندازەیەك پەیوەندی بە قازانجەکانی مرۆڤایەتیەوە هەیە و بە ئەندازەیەکیش کاریگەری بەرفراوانی هەیە لەسەر هەموو بەشەکانی جیهان کە وای لێدەکات هەر هێندەی بارودۆخی بۆ ڕەخسایەوە، لە ڕووی ناچاریەوە بگەڕێتەوە بۆ یادەوەری میللەت. هەر هێندەی قەیرانەکەش دووبارە بووەوە لە ڕیزی چەند تەقەلایەکی دیکەی نوێ لەم جۆرە بابەتە جارێکی تر ئامادە دەکرێتەوە، چونکە مەسەلەیەك بۆ ڕەگەزی بەشەری هێندە گرنگ بێت کارێك دەکات کە دەستووری چاوەڕوان کراو ڕۆژێك لە ڕۆژان بە هۆکاری وانەو پەندە دووبارەکانەوە، لە زەینی مرۆڤدا بگاتە پلەی پێویست لە توندی و تۆکمەیی.

بەهەرحاڵ دەبێت شۆڕش لەبەردەم هەڕەشەی هەرەس هێناندا بێت بۆ ناو کەندەڕەکانی جاران، بەڵام ئەو تەنها وەکو ڕووداوێکی پووچ و بێ ناوەڕۆك هەرەس دەهێنێت، بوونیشی وەکو بەڵگەی حاڵەتی مت بوونێکی بەردەوام دەمێنێتەوە کە هەرگیز لەیاد ناچێتەوە و فەرامۆش ناکرێت، ئەمەش بۆ ڕەوتی پەرەسەندن زەمانەتی پاشەڕۆژە.

تەنها ویستم شوێنی دەقەکەی کانت دەربارەی سەردەمی ڕۆشنگەری دیاری بکەم و لە دوایدا هەوڵدەدەم بە شێوەیەکی وردتر بیخوێنمەوە، ویستم ببینم چۆن پانزدە ساڵ دوای ئەوە کانت بیری لەو ڕووداوە دراماتیکیانە کردۆتەوە کە گەلێك درامیترن لەوەی کە لە کاتی دەقی (سەردەمی ڕۆشنگەری)دا هەبووە، ئەویش بیرکردنەوەی کانتە دەربارەی ڕووداوەکانی شۆڕشی فەرەنسا. ئێمە لەبەردەم ئەم دوو دەقەدا دەکەوینە بەردەم مەسەلەی ڕەگ و ڕیشە و خاڵی دەستپێکردنی زنجیرەیەك پرسیاری فەلسەفی، چونکە ئەم دوو پرسیارە: (سەردەمی ڕۆشنگەری چییە؟) و (شۆڕش چییە؟)، دوو شێوەی جیاوازن بۆ ئەو پرسیارەی کانت دەربارەی ساتەوەختی خۆی (واتە هەنوکەی خۆی کردوێتی. پێم وایە ئەم دوو پرسیارە ئەگەر نەڵێم لە ڕێگای هەموو فەلسەفەی نوێوە، ئەوا لە چەرخی نۆزدەوە لە ڕێگای ڕووبەرێکی گەورەی فەلسەفییەوە بەردەوام دەردەکەوێت و دووبارە دەبێتەوە. لە دواجاریشدا وا دێتە بەرچاوم کە سەردەمی ڕۆشنگەری وەکو ڕووداوێکی ناوازە، پێکۆڵکەری مۆدرینیزمی خۆرئاوا بووەو لە مێژووی عەقڵیشدا وەکو ڕەوگەیەکی بەردەوام بەرجەستە دەبێت و جار دوای جار دەردەکەوێتەوە. لە نێوەندی پەرەسەندنی شێوەکانی عەقڵانییەت و

تەکنیکدا لە پرۆسەی دامەزراندنیدا، دواتریش لە چوارچێوەی سەربەخۆیی زانست و دەستەڵاتی زانستدا دەرکەوتۆتەوە. سەردەمی ڕۆشنگەری تەنها قۆناغێکی ناو مێژووی فیکر نییە، بەڵکو بۆ خۆی کێشەیەکی فەلسەفیە کە لە چەرخی هەژدەوە لە فیکرماندا تۆمار بووە. ئیدی با ئەوانەی دەیانەوێت کەلەپووری سەردەمی ڕۆشنگەری بە زیندوێتی و پیرۆزی بمێنێتەوە لە تەقوای خۆیاندا جێبهێڵین، چونکە پەرستنی ئەو کەلەپوورە خیانەتێکی ئێجگار نەفامانەیە. ئەوەی پێویستە پاراستنی پاشماوەکانی ڕۆشنگەری نییە، بەڵکو زیندوو ڕاگرتنی ئەو پرسیارەیە کە ئەم ڕووداوە خستوێتیە ڕوو، هەروەها پاراستنی ئەو مانایەیە (واتە دیاریکردنی چەمکی مێژوویی بیرۆکەی جیهان گەراییە کە دەبێت لەمڕۆدا بپارێزرێت، وەکو شتێك کە دەبێت ببێتە مادەی فیکر هەڵبگیرێت.

مەسەلەی سەردەمی ڕۆشنگەری و مەسەلەی عەقڵ وەکو گرفتێکی مێژوویی، لە کانتەوە تا ئەمڕۆ بە پلەی جیاواز جیاوازی ئالۆزییەوە بە ناو فیکری فەلسەفیدا تێپەڕیوە. دیوێکی تری ئەو هەنوکەیێتیەی بەردەم کانت مەسەلەی شۆڕش بووە، شۆڕش وەکو ڕووداوێك و پاشان وەکو دابڕانێك، دواتر وەکو لابەلابوونەوەیەکی لە مێژوودا دواتریش وەك هەرەسێك، پاشان وەکو بەهاو نیشاندەرو خۆتەیارکردنێك کە لە هەناوی مێژوودا و لە سنوورەکانی پەرەسەندنی مرۆڤایەتیدا کاردەکات. لێرەشدا ئەوەی لە ئەستۆی فەلسەفەیە وەڵامی بداتەوە، دیاریکردنی ئەو لایەنانەی شۆڕش نییە کە دەبێت بپارێزرێت و وەکو نموونەیەك بەرجەستە بکرێت، بەڵکو پرسیارەکە ئەوەیە دەبێت چی لەم ئیرادەیە بکەین کە لەگەڵ شۆڕشدا دێتە پێش؟ چی لەو حەماسەتە بکەین کە جودایە لەگەڵ خودی پرۆسە شۆڕشگێڕیەکەدا؟. ئەو دوو پرسیارە: (سەردەمی ڕۆشنگەری چییە؟) و (چی لە ئیرادەی شۆڕش بکەین؟)، هەردووکیان بواری ئەو پرسیارە فەلسەفیە دیاری دەکەن سەبارەت بە شوناسی بوونی لە (هەنوکە)دا.

من وا هەست دەکەم کە کانت دامەزرێنەری هەردوو ئەو بنەما سەرەکیەی کەلەپووری ڕەخنەگرانەیە کە سەرجەم فەلسەفەی نوێی دابەش کردووە، یان با بڵێین ئەو لە پرۆسەی ڕەخنەییە مەزنەکەی خۆیدا کۆڵەکەی ئەو کەلەپوورە فەلسەفیەی دارشتووە کە سەبارەت بە مەرجەکانی زانینی ڕاستی دەپرسێت. دەتوانین پێ لەسەر ئەو خاڵە دابگرین کە لایەنێکی تەواوەتی فەلسەفەی نوێیەو کە بە شێوەیەکی شیکارانە بۆ حەقیقەت کار دەکات، لە کانتەوە هاتۆتە دونیاوەو لەوەوە پەرەی سەندووە.

بەڵام لە فەلسەفەی نوێدا پرسیارێکی ترمان هەیە کە لە شێوەیەکی دیکەیە، واتە بە جۆرێکی دیکە دەپرسێت و بە تەواوەتیش بەرهەمی ئەو پرسیارەیە کە لە سەردەمی ڕۆشنگەری و لە دەقی شۆڕشدا کراوە. ئەم کەلەپوورە تازەیەی ڕەخنە ئەم پرسیارە دەهێنێتە گۆڕێ: (هەنوکەی ئێمە چییە؟ بواری ئێستاکێ چییە لەبەردەم ئەزموونە مومکنەکاندا؟) ئەو پرسیارەش پابەندی شیکردنەوەی حەقیقەت نییە، بەڵکو دەتوانین بڵێین پابەندی ئەنتۆلۆژیای ئێستاکەیە، واتە ئەنتۆلۆژیای ئێمە خۆمان. بۆیە من وا دەبینم ئەو تاقیکردنەوە فەلسەفیەی ئەمڕۆ و ئێمە لەبەردەمیا وەستاوین ئەمەیە: یاخود دەبێتە فەلسەفەیەکی ڕەخنەگرانە کە وەك فەلسەفەیەکی شیکارانە دێتە بەردەستمان کە بە شێوەیەکی گشتی سەرقاڵی شیکاری حەقیقەتە، یان فیکرێکی ڕەخنەیمان پێ چاکترە شێوەی ئەنتۆلۆژیایەك وەردەگرێت بۆ خودی خۆمان واتە ئەنتۆلۆژیای هەنوکەیی. ڕێگای دووەمیش شێوەیەك لە فەلسەفەی دارشتووە کە لە هیگڵەوە دێت تا دەگاتە (قوتابخانە فرانکفۆرت)، بە ناو نیتشەو ماکس فیبەردا تێدەپەڕێت جۆرێکە لە بیرکردنەوە کە من خۆم هەوڵم داوە لە ناویدا کار بکەم.

**سەرچاوە:**

وانەی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣ ی «کولیج دی فرانس».

د. مەهدی مەحفوز
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

# ڕۆشنگەرانی فەرەنسا
# -مۆنتسکیۆ، ڤۆلتێر-

## مۆنتسکیۆ 1689 - 1755

### یەکەم/ سەرەتایەك دەربارەی ژیانی:

«مۆنتسکیۆ» ساڵی ١٦٨٩ لە بنەماڵەیەکی خوا پێداو کە سەر بە چینی خانەدانەکانی هەرێمی بۆردۆی فەرەنسی بوو، چاوی بە دنیا هەڵهێناوە. دوای ئەوەی خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکات، دەست بە خوێندنی یاسا دەکات. لە تەمەنی بیست و حەوت ساڵیدا دەبێتە سەرۆك پەرلەمانی شاری بۆردۆ و ماوەی دە ساڵ لەو پۆستەدا دەمێنێتەوە. لەو ماوەیەدا گرنگیەکی تایبەت بە خوێندنەوەی میدیا و فەلسەفەی مۆراڵ و مێژوو و ئامادەکردنی توێژینەوەی زانستی دەدات. ساڵی ١٧٢١ یەکەمین کتێبی بە ناوی (نامە فارسیەکان) بلاوەدەکاتەوە، ئەم کتێبە بە گەرمی پێشوازی لێدەکرێت و شۆرەت و نێوبانگێکی زۆر بۆ « مۆنتسکیۆ» پەیدا دەکات.

دوای ئەوەی واز لە پەرلەمان دێنێت، دەست بە سەفەرێکی ماوە درێژ دەکات کە نزیکەی سێ ساڵێك دەخایەنێت، لەو ماوەیەدا سەردانی هەریەك لە: (ئیتاڵیا و نەمسا و هەنگاریا و سویسرا و هۆڵەنداو ئینکلتەرا) دەکات. مەبەستی لەم سەفەر و گەڕانەش ئەوە بوو، لە فۆرمە جیاجیاکانی حوکمڕانی و هەڵسوکەوتی میللەتان و کاریگەری ژینگە لەسەر ڕەفتاری خەڵکی بکۆڵێتەوە. دوای گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا و لە ساڵی ١٧٣٤ دووەمین کتێبی خۆی بە ناوی (هۆکارەکانی مەزنی و دارمانی ڕۆمان) بلاوەدەکاتەوە. ساڵی ١٧٤٨ کتێبە نەمرەکەی (ڕۆحی یاساکان)ی بە چاپ گەیاند کە زۆربەی زۆری هێڵە سەرەکیەکانی فەلسەفەی سیاسی « مۆنتسکیۆ»ی تێدایە.

لە دەسپێکی کتێبی(ڕۆحی یاساکان)دا دەڵێت: (سەروەختێك قوتابخانەم جێهێشت،

کەسێك هاتوو کتێبێکی دەربارەی یاسا دایە دەستم، بۆ ئەوەی بە دوای ڕۆحی یاساکاندا بگەڕێم)٠ ئەمەش هانی دەدات تا لە ڕۆحی یاساکان بگەڕێت و ئەو کتێبە بەناوبانگە بنوسێت٠ کتێبی (ڕۆحی یاساکان) پوختەی سالانێکی زۆری لێکۆڵینەوەو گەڕان و بەرەنجامی تێڕامانێکی مێژوویی و سیاسی گرنگە٠ ئەم کتێبە ژمارەیەکی زۆر پەند و مۆجیاری گرنگی تێدایە و لە بەشە جیاجیاکانی کتێبەکەدا دەبینرێن٠ ئەو بابەتانەی کتێبەکە باسیان لێدەکات جۆراوجۆرن٠ هەندێکیان تایبەتن بە مەسەلەکانی تیۆریای دەوڵەتی مەزن و هەندێکی کەیان باس لە سزادان و ئامرازەکانی بەڕێوەبردن لە دەوڵەتدا دەکەن، لەگەڵ باس و خواسی ئازادی و ئاسایش و پەیوەندی یاساکان بە کێشەی بەرگریکردن لە نیشتمان، هاوکات کاریگەری هۆکارە فیزیۆلۆژیەکان (لە خاك و ئاو هەوا) لەسەر ژیانی مرۆڤایەتی و دەستور و یاساکان، لەگەڵ پەیوەندی یاساکان بە هەڵسوکەوت و بە ئایین و ژمارەی دانیشتوان و٠٠ هتد٠ واتە دەتوانین بڵێین کتێبی (ڕۆحی یاساکان) ئەنسیکلۆپیدیایەکی یاساییە، لەبەرئەوەی بابەتگەلێکی هەمەڕەنگ لە خۆ دەگرێت و یەکیەتی بابەتیش لە نێوانیاندا نییە٠

ئەوەی بە ئاشکرا بەم کتێبەی « مۆنتسکیۆ»وە دیارە ئەوەیەکە ویستویەتی لە ئاکامی ئەو گەڕان و سەفەرە دوور و درێژانەی ئەنجامی داون، ئەوە بسەلمێنێ کە کۆمەڵگا ئینسانیەکان بە شێوەیەکی هەرەمەکی و خۆڕسکانە دروست نابن، بەڵکو دروست بوون و دەرکەوتنیان پابەندی یاساگەلێکی نەگۆڕ و جێگیرە٠ واتە مێژووی هەموو نەتەوەیەك ڕەنگدانەوەی کاریگەری و شوێن دەستی ئەو یاسا جێگیر و نە گۆڕانەیە لەسەری٠ لێرەوە « مۆنتسکیۆ» دەیەوێت خەسڵەتی سستمە سیاسی و دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی تەواوی نەتەوەکان، لە ڕێی کاریگەری ئەو یاسا گشتی و نەگۆڕانەوە لێکبداتەوەو تاو توێیان بکات٠

ئەوەی ڕاستی بێت « مۆنتسکیۆ» دەیەوێت باس لەوە بکات کە یاساگەلێکی گشتی و نەگۆڕ هەن، ئەم یاسایانەش جڵەوی تەواوی دیاردە سروشتیەکان و ژیانی کۆمەڵایەتی میللەتان دەکەن٠ ئەم یاساگەلەش وەك « مۆنتسکیۆ» پێناسەیان دەکات: (بریتیە لەو پەیوەندییە ئیلزامیانەی لە سروشتی شتەکانەوە سەرچاوە دەگرێت)٠ ئاشکرایە لێرەدا ئەم پێناسەیە خەسڵەتی پێوەری مۆراڵی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی، بەو یاسایانە دەبەخشێت و هەروەها شێوازی ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە تەندروستانەش دیاری دەکات کە مەرجە لە کۆمەڵگادا بەر قەرار بێت٠

سەرەڕای ئەوەی ئەم پێناسەیە کەمەکێك ئاڵۆزی و ناڕۆشنی پێوە دیارە، لەگەڵ ئەوەشدا « مۆنتسکیۆ» باس لەوەش دەکات ئەم یاسایانە ئەگەرچی گشتییەو تەواوی میللەتانی سەرگۆی زەوی دەگرێتەوە، بەڵام بە هەمان چۆنیەت لە سەرجەم کۆمەڵگاکاندا کاری پێناکرێت، بەڵکو بە پێی هەلومەرجی تایبەتی هەر کۆمەڵگایەك دەگۆڕێت٠ بۆ ڕونکردنەوەی ئەم بۆچونە، باس لەوە دەکات کە سەروەختێك مرۆڤەکان لە دۆخی سروشتی دەرچوون، دەستبەرداری سەربەخۆیی سروشتی خۆیان بوون، تا لە ژێر سایەی دەسەڵاتی یاسا سیاسیەکاندا بژین، ئەو دەسەڵاتە یاساییە مەدەنیانەی زادەی ئەقڵی ئینسانەکانەو فەرمانڕەوایەتی تێکڕای میللەتانی سەرگۆی زەوی دەکات٠ بەو پێیەی یاساکانی کۆمەڵ حاڵەتێکە لە حاڵەتە تایبەتەکانی پراکتیزەکردنی ئەقڵی مرۆڤ و هەلومەرجی ژیانی نەتەوەکانیش جیاوازە و وەك یەك نییە، ئەوا بونی یاسا گەل و ستایلی حوکمڕانی جیاجیا شتێکی سروشتی دەبێت٠ لێرەوە بە دەگمەن یاساکانی نەتەوەیەك بۆ میللەت و نەتەوەیەکی دی دەست دەدەن٠

بیرۆکەی فرە جۆری یاسا بە پێی هەلومەرجی تایبەتی هەر کۆمەڵگەیەك وەك ئەوەی « مۆنتسکیۆ» باسی لێ دەکات، ئەگەری بوونی سستمێکی یۆنڤێرسالی یاسای سروشتی ڕەتدەکاتەوە کە بۆ هەموو سەردەم و زەمانێك دەست بدات٠ واتە دەرەنجامێك کە ئەو پێی دەگات ئەوەیە (هەر نەتەوەیەك یاسا و فۆرمی

دەوڵەتداریەك هەڵدەبژێرێت و كاری پێدەكات كە لەگەڵ هەلومەرج و سروشتی دامودەزگا كۆمەڵایەتیەكانیدا یەك بێتەوەو گونجاو بێت، هەر كاتێكیش هەلومەرج گۆڕا، یاسا و فۆرمی دەوڵەتیش گۆڕانی بەسەردا دێت).

« مۆنتسكیۆ» خەسڵەتە تایبەتیەكانی هەر نەتەوەیەك دەرگیری هۆكارە سروشتیەكان و هۆكارە كۆمەڵایەتیەكان دەكات، هۆكارە سروشتیەكان وەك: (ئاو هەواو تۆبۆگرافیا و خاك)، هۆكارە كۆمەڵایەتیەكانیش وەك: (ئەو شتانەی ڕەفتار و هەڵسوكەوتی مرۆڤەكان لە كۆمەڵگەیەكدا دیاری دەكەن). هەرچی پەیوەندی بە هۆكارە سروشتیەكانەوە هەیە، «مۆنتسكیۆ» پێیوایە ڕۆڵێكی گەورەو كاریگەر لە دیاریكردنی سروشتی یاساكان و شێوازەكانی حوكمكردن و ئەقڵیەتی نەتەوایەتی و هونەر و ترادسیۆن و ئەو ڕەفتار و هەڵسوكەوتانەدا دەبینێت، كە لە ئەدگارە نەتەوایەتیەكانی كۆمەڵگەدا بەرجەستە دەبێت. بەمجۆرە دەبینین دانیشتوانی ناوچە ساردەكان خاوەنی هێز و جوامێرین، ئەمە لە كاتێكدا دانیشتوانی ناوچەگەرمەكان لاواز و ترسنۆكن[1].

هاوكات ڕوبەری جوگرافی هەر دەوڵەتێك، فۆرم و جۆری حوكمڕانی دیاری دەكات. بۆ نمونە سستمی كۆماری لەگەڵ ڕوبەری جوگرافی بچوك و سستمی پادشایەتی لەگەڵ ڕوبەری جوگرافی مام ناوەند و سستمی دیسپۆتیزمی و ستەمكاریش لەگەڵ ڕوبەری جوگرافی بەرفراواندا دەگونجێت[2]. دواجار هۆكاری سروشتی خاك، سروشتی ئەقڵیەتی نەتەوەیی دیاری دەكات. واتە ئەو شوێنانەی خاكەكەیان بۆ كشتوكاڵ لە بارە، ئەقڵیەتی ملكەچی و پاشكۆیایەتی تێدا زاڵە، لە كاتێكدا ئەقڵیەتی ئازاد و پەیوەست بون بە ئازادیەوە، لەو ناوچانەدا بەرقەرارە كە كشتوكاڵی تێدا ناكرێت[3].

بەڵام لێرەدا دەبێت ئەوەش بوترێت كە ڕۆحی گشتی نەتەوە هەر بە تەنها هۆكارە سروشتیەكان دیاری ناكەن، بەڵكو ئەو هۆكارە كۆمەڵایەتیە باوانەی لە كۆمەڵگەیەكی دیاریكراودا هەیە، دەستیان لە دیاریكردنیدا هەیە. ئەو هۆكارانەش سەرباری ئاو و هەوا بریتین لەمانە: (ئایین، فۆرمی حوكمكردن، ڕوداوەكانی ڕابردوو، هەڵسوكەوت، ترادسیۆن و.. هتد). كەواتە هۆكارە سروشتی و كۆمەڵایەتیەكان پێكەوە بەشدارن لە پێكهێنانی ڕۆحی گشتی نەتەوەدا كە بریتیە لە ڕۆحی یاساكان.

## دووەم/ شێوازەكانی سستمی حوكمڕانی:

دوای تاوتوێكردنی شێوازەكانی سستمی حوكمڕانی و خەسڵەتە تایبەت و دیارەكانی هەریەكەیان، «مۆنتسكیۆ» شێوازەكانی حوكمڕانیكردنی بەسەر سێ سستمی سەرەكیدا دابەشكرد كە بریتین لە: سستمی كۆماری و سستمی پاشایەتی و هەروەها سستمی دیسپۆتیزمی. سەبارەت بە سستمی كۆماری دەشێت دوو جۆری هەبێت، یەكێكیان كۆماری دیموكراسییەو ئەم مۆدێلەش كاتێك بەرقەرار دەبێت كە دەسەڵاتی باڵا لە دەستی میللەتدا بێت، ئەوی دیكەشیان كۆماری ئۆرستۆكراتیەو ئەمەش لەو حاڵەتەدا دێتە ئارا كە دەسەڵات لە دەستی توێژێكی بچوك و دیاریكراوی گەلدا بێت.

هەرچی سستمی حوكمڕانی پادشایەتیشە، ئەوا تایبەتمەندیەتی لەوەدایە كە دەسەڵات تیایدا تەنها لە دەستی یەك كەسدایە و ئەو كەسەش پادشایە، بەڵام ئەم دەسەڵاتە لە سایەی دەستور و یاسادا یە. خەسڵەتی حوكمڕانی دیسپۆتیزمیش ئەوەیە كە دەسەڵات لە دەستی تاكە كەسێكدایە، بەڵام بە پێی حەز و ئارەزوی خۆی بەكاری دێنێت، بەبێ پابەند بوون بە هیچ یاسا و ڕێسایەكەوە. بەمجۆرە حوكمڕانی دیسپۆتیزمی خراپترین و ترسناكترین مۆدێلی حوكمڕانیە، چونكە هیچ شتێك ناتوانێت بەر بە ڕەفتار و هەڵسوكەوتە دیسپۆتیزمیەكانی بگرێت. لە بەرامبەر ئەم مۆدێلە بەدوترسناكەی حوكمكردندا، « مۆنتسكیۆ»

دەیەوێت ستایشی سستمی حوکمڕانی کۆماری و پادشایەتی بکات و بەدوو سستمی حوکمڕانی میانڕەو دەیانداتە قەڵەم. بە بۆچوونی ئەویش میانڕەوی حاڵەتێکی پۆزەتیڤانەیە. هاوکات گواستنەوە لە سستمی پادشایەتیەوە بۆ کۆماری و بە پێچەوانەشەوە، شتێکی ئاساییەو هیچ مەترسیەك بۆ سەر قەوارەو ئاسایشی دەوڵەت دروست ناکات. « مۆنتسکیۆ» لە کاتێکدا هێرشدەکاتە سەر حوکمڕانی دیسپۆتیزمی و حوکمڕانی کۆماری و پاشایەتی ستایش دەکات، لە هەوڵی ئەوەشدا بووە هەریەکە لەو مۆدێلی حوکمڕانیکردنانە بە پرانسیپێکی تایبەت یان بە هێزێکی بزوێنەرەوە گرێ بدات کە هەر سستمی حوکمڕانیەك هێز و توانای خۆی لێ بەدەست دێنێت. بەمجۆرە بنەما و پرەنسیپی حوکمڕانی کۆماری بریتی دەبێت لە فەزیلەتی سیاسی، واتە خۆشویستنی نیشتمان و یاساکانی لەگەڵ قوربانیدان و خۆبەختکردن لە پێناو ئەو شتانەدا. شایەنی باسە بوون و مانەوەی حوکمڕانی کۆماری، گرێدراوی ئامادەگی ئەو پرانسیپە بەرز و پیرۆزەیە[٤].

هەرچی پرانسیپی حوکمڕانی سستمی پادشایەتیشە، ئەوا لە شەرەف و جوامێریدایە، واتە لە حوکمدانی پێشوەخت بەسەر هەموو کەسێك و هەموو باروودۆخێکی کۆمەڵایەتی کە پەیوەندی بە پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و لەدایك بوونەوە هەیە. هەر ئەمەشە کە هەستی جوامێری و مەزنی لەلای گەورە پلەدارانی سەربازی و خاوەن پلە و پایە کۆمەڵایەتیە بەرزەکان دەبزوێنێ. سەبارەت بە پرانسیپی حوکمڕانی دیسپۆتیزمیش، ئەوا بریتیە لە ترس و بیمی زۆری هاوڵاتیان و ملکەچ بونیان لە ئاست دەسەڵاتی فەرمانڕەوای ستەمکاردا.

«مۆنتسکیۆ» لەو کاتەی کە پەلاماری سستمی حوکمڕانی دیسپۆتیزمی دەدا، چاوی لەسەر فەرمانڕەوایەتی دیسپۆتیزمی «لویسی چواردە» بوو کە تەواوی دەسەڵاتە لۆکاڵی و پەرلەمانیەکانی لەناو بردبوو، هاوکات دەسەڵات و دەسکەوتی خانەدانەکانیشی نەهێشتبوو. لەبەر ئەوە «مۆنتسکیۆ» هەردوو سستمی حوکمڕانی پادشایەتی و کۆماری پێ چاکتر بوو. سەربارەی ئەمەش ئەو بە سستمی کۆماری ئایدیالی سەرسام بوو، چونکە میانڕەوی و فەزیلەتی مەدەنی تێدا بوو، دوو خەسڵەتێك کە تایبەتمەندی سستمی کۆماری بوو لە سەردەمی رۆمان و گریکەکاندا. ئەم فۆرمەلە حوکمڕانی کۆماری ئایدیالی کە «مۆنتسکیۆ» پێی سەرسام بوو، هەردوو جۆری حوکمڕانی کۆماری دیموکراسی و ئۆرستۆکراتی لە خۆیدا کۆکردبووەوە.

بۆ نموونە لەلایەك کۆماری دیموکراسی رێژەیی تێدا بوو کە بواری بە چین و توێژە عەوامەکان نەدەدا دەسەڵاتی حوکمڕانی بگرنە دەست، لەبەرئەوەی مەرجی ئەوەیان تێدا نەبوو، بەڵام ئەوەی بۆ زۆرترین ژمارەی توێژ و گروپە هوشیار و داناکان بەرەوا دەزانی. هەروەها کۆماری ئۆرستۆکراتیشی تێدا بوو کە لە هەوڵی ئەوەدایە زیاتر و زۆرتر لە دیموکراسیەوە نزیك بێت، ئەویش لە رێی بەشداری پێکردنی زۆرترین ژمارەی خەڵك لە بەڕێوە بردنی کاروباری وڵاتدا.

بە هۆی ترس و بیمی ئەوەی حوکمڕانی کۆماری نەتوانێت خەسڵەتی میانڕەوی بپارێزێت و لێی لا بدات، «مۆنتسکیۆ» ڕو دەکاتە ئەوەی باس لە چاکە و تایبەتمەندیەکانی حوکمی پادشایەتی بکات، سستمی حوکمڕانی پادشایەتیەك کە بە پێی یاساگەلێکی سەرەکی و کۆنکرێتی کار دەکات و ئەمەش رێگرە لەوەی دەسەڵات مەیلی بەلای ستەمکاریدا بچێت. بەڵام بۆ ئەوەی پادشا پابەندی ئەو یاسایانە بێت، پێویستە چەند دەسەڵاتێکی ناوەندی هەبن کە لە رێیانەوە دەسەڵاتی پادشا گوزەر بکات و شۆڕبێتەوە بۆ خوارەوە. هەر کاتێك ئەم دەسەڵاتانە نەمان، ئەوا لە دەوڵەتدا هەر بە تەنها ئیرادەی پادشا حوکم دەکات. ئەو دەسەڵاتە ناوەندیانەی دەبنە بەربەستێك بە رووی ستەمکاریدا، بریتین لە: (دەسەڵاتی چینی خانەدانەکان و دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی و دەسەڵاتی شارەکان).

بەمجۆرە تیۆریاکەی «مۆنتسکیۆ» دەربارەی ئەو دەسەڵاتە نێوەندیانە، دەبێتە جۆرێك لە پاساو و هێنانەوە بۆ ئەو دەسکەوتانەی سستمی پادشایەتی دەیبەخشێتە چینە کۆمەڵایەتیە باڵا دەستەکان لە

کۆمەڵگەی فیوداڵیدا. چونکە بە نەمانی ئەم دەسەڵاتە نێوەندیانە و دەسکەوتەکانیان، حوکمی پادشایەتی دوچاری لادان دەبێت و بەرەو ستەمکاری دەچێت. (ئەگەر هاتوو پادشا نەبێت، ئەوا چینی خانەدانەکانیش نابێت. چینی خانەدانانیش نەبێت، پادشاش نابێت، بەڵکو ئەوەی دەبێت زاڵمێکی ستەمکار دەبێت)[٥].

لەم ڕوانگەیەوە «مۆنتسکیۆ» دەیەوێت بیسەلمێنێت کە سیاسەتی ستەمکارانەی «لویسی چواردە»، زیانێکی گەورەی بە بنەما و پایەکانی سستمی پادشایەتی گەیاندووە. لەم بارەیەوە دەنوسێت و دەڵێت: (پادشایەتی ئەو کاتە بەلادا دێت و لەناو دەچێت کە پادشا هەموو شتەکان لە خۆیدا کورت دەکاتەوە. دەوڵەت کورت دەکاتەوە بۆ پایتەخت و پایتەخت بۆ کۆشك و کۆشکیش بریتی دەبێت لە خۆی)[٦]. ئاشکرایە «مۆنتسکیۆ» لەم قسەیەیدا مەبەستی سەردەمی ستەمکارانەی «لویسی چواردە» بووە کە دەسەڵاتی لۆکاڵی و پەرلەمانی و هەروەها دەسکەوت و دەسەڵاتی خانەدانەکانیشی لەناوبرد.

سەرەڕای ئەم پێشنیار و چارەسەرانەی «مۆنتسکیۆ» پێشکەشی سستمی حوکمڕانی پادشایەتی دەکات، تا لە کەوتنە ناو داوی ستەمکاری بیپارێزێت، بەڵام کارێکی هەڵەیە وا بزانین حوکمی پادشایەتی تاکە فۆرمێکی حوکمکردنە کە بۆ دەوڵەتە ئەوروپاییە گەورەکان، گونجاو بێت و دەست بدات.

ئەگەر حوکمی کۆماری بریتی بێت لە وێنەیەکی یۆتۆپیانەی قەشەنگ، ئەوا سستمی پادشایەتی سەرەڕای ئەو هەموو ڕێگریانەی تەوقیان داوە تا بەرەو ستەمکاری نەچێت، بەڵام هەر ئەگەری ئەوە هەیە هەڵخلیسکێتە ناو داوی ستەمکاری. لەبەرئەوە بە بۆچونی «مۆنتسکیۆ» سستمێکی باشتر هەیە، ئەویش ئەو سستمە سیاسیەیە کە لە ئینگلتەرادا لە ئارەدایەو بە تەنیشت کۆمەڵگەی فەرەنسییەوەیە. ئەم سستمەی کە «مۆنتسکیۆ» ناوی دەنێت سستمێکی کۆماری کە خۆی لە پشت پەردەی پادشایەتیەوە شاردۆتەوە، دەیتوانی مەبەست و پاساوی بون و ئامادەگی خۆی دەستەبەر بکات. ئەو مەبەستەی لە فەرەنسادا بوونی نەبوو و «مۆنتسکیۆ»ش هەوڵی بۆ دەدا و چاوی لەسەری بوو، بریتی بوو لە ئازادی سیاسی.

### سێیەم/ تیۆریای لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان:

«مۆنتسکیۆ» بڕوای وا بوو سستمی حوکمڕانی بەریتانی، ڕێگاچارەیە بۆ دەستەبەرکردنی ئازادی سیاسی و تەواوی ئازادیەکانی دیکەش، وەك: (ئازادی بیرو بیروباوەڕ و خاوەنداریێتی) کە گرێدراوی ئەون. مانەوەی «مۆنتسکیۆ» لە ئینگلتەراو هەستانی بە تاوتوێکردن و خوێندنەوەی سروشتی ئەو سستمە دەستوریەی لەوێدا بەرقەرار بوو، زیاتر ڕق ئەستورتری دەکرد لە دژی سستمی دیسپۆتیزمی لە فەرەنسا، هاوکات زۆرێك لە قەناعەت و باوەڕی پێشوی خۆی گۆڕی، هەموو ئەمانەش بۆ ئەوەی چارەسەرێك بۆ ئەو ستەمکاریە بەدو چەپەڵەی فەرەنسا بدۆزێتەوە.

«مۆنتسکیۆ» وەك تیۆرسینێکی سیاسی لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی کردە پرانسیپێکی سەرەکی و پێیوابوو ئەوە دەبێتە سەرچاوەی بەرهەم هێنانی دەستور گەلێکی ئازاد و دەستەبەرکردنی ئازادیە سیاسیەکان. ئەو ئازادیە سیاسیەی «مۆنتسکیۆ» داوای دەکات، مانای هەڵسوکەوتکردن نییە بەپێی حەز و ئارەزووی شەخسی، بەڵکو کاروڕەفتار کردنە بەو جۆرەی یاسا ڕێگەی پێدەدات. چونکە گەر هاتوو ڕێگە بە هەموو هاوڵاتیەك درا یاسا شکێنی بکات و ڕێز لە یاسا نەگرێت، ئەوا ئازادی بونی نامێنێت و تەواوی هاوڵاتیانیش لای خۆیانەوە، مافی ئەوە بە خۆیان دەدەن یاسا شکێنی بکەن. لە چوار چێوەی دەوڵەتدا دەسەڵات بۆ ئەوەی سنوری خۆی نەبەزێنێت، پێویستە بە دەسەڵاتێکی دی ڕێی پێبگیرێت. بە بۆچونی «مۆنتسکیۆ» لە هەموو دەوڵەتێکدا سێ جۆر لە دەسەڵات هەیە:

١-دەسەڵاتی یاسادانان: ئەرکی ئەم دەسەڵاتە داڕشتنی ئەو یاسایانەیە کە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان

له کۆمەڵگەدا ڕێك دەخات، یان هەڵدەستێت بە دەسکاریکردن و لابردنی ئەو ڕێسایانەی لە ڕێکخستنی کاروباری کۆمەڵگەدا کاریان پێدەکرێت.

٢-دەسەڵاتی جێبەجێکردن: ئەرکی جێبەجێکردن و پراکتیزەکردنی ئەو یاسایانەیە کە لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە دەردەچن و پەیوەندیان هەیە بە پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ و پاراستنی وڵات لە هێرش و پەلاماری دەرەکی، لەگەڵ جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەکان لەگەڵ وڵاتانی دیکە بە چاکترین شێوە.

٣-دەسەڵاتی دادوەری: ئەرکی ئەم دەسەڵاتە جێبەجێکردنی تەواوی ئەو مەسەلانەیەکە یاسای مەدەنی ڕێکیان دەخات، وەك: (چارەسەرکردنی کێشە و ململانێی هاوڵاتیان و جێبەجێکردنی یاسا بەسەر ئەو کەسانەی کێشە دەنێنەوە و سزادانی هەموو ئەوانەشی لە یاسا دەردەچن).

لە ڕێی ئەم جیاکاری و دابەشکردنەی دەسەڵاتەوە، «مۆنتسکیۆ» باس لە تیۆریای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان دەکات و نیشانی دەدات کە کۆکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە یەك شوێندا، چ مەترسیەك دروست دەکات. ئەو پێی وایە ئەگەر هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن لە دەستی یەك دەزگادا بوو، ئەوا ئازادی هاوڵاتیان دەکەوێتە مەترسیەوە، لەبەر ئەوەی ئەو دەزگایەی ئەو دوو دەسەڵاتەی دەبێت، ڕەنگە مەیلی بەلای دارشتنی یاسای نارەوادا بچێت و لە هەوڵی ئەوەدا بێت بە شێوازی سەرکوتکەرانە و زۆرە ملێیانە بیسەپێنێت. هاوکات ئازادیش بونی نامێنێت، هەروەختێك دەسەڵاتی دادوەری لەگەڵ یەکێك لەو دوو دەسەڵاتەدا کۆبێتەوە. چونکە هەر کاتێك دادوەری بوو بە یاسا دانەریش، ئەوا ڕێگە لەبەردەم ستەمکاری و زوڵم و زۆردا ئاوەڵا دەبێت. بەڵام ئەو کاتەی هەرسێ دەسەڵاتەکە لە یەك دەزگادا کۆبووەوە، ئەوا سروشتی مرۆڤ بۆ خۆسەپاندن و ستەمکاری بەسە بۆ ئەوەی حوکمڕانی بەلای ستەمکاریدا بەرێت، چونکە هیچ ڕێگریەکی لەبەردەمدا نابێت. ئەمەش خەسڵەتی سستمی حوکمڕانی دیسپۆتیزمیە.

لێرەوە گەر بمانەوێت زۆرترین بڕی ئازادی مسۆگەر بکەین، ئەوا دەبێت دەسەڵات بەسەر ناوەندی جیاجیادا دابەش بکەین کە هەر یەکەیان ڕێگە لەوی دیکەیان بگرێت و نەهێڵن هیچیان بەلای ستەمکاریدا بچن. بۆ ئەوەی کەس نەتوانێت دەسەڵات بەخراپی بەکار بەرێت، پێویستە بەدەسەڵات ڕێگری لە دەسەڵات بکرێت. هەروەها دەبێت سەربەخۆیی هەر دەسەڵاتێك لە فەزایەکی پڕ هاریکاری و هارمۆنیدا بێت لەگەڵ دەسەڵاتەکانی دیکەدا. هاوکات هاوسەنگی لە نێوان هەرسێ دەسەڵاتەکەدا و مافی هەریەکەیان لە بەرامبەر یەکتریدا، بە گشتی دەبێتە مایەی ئەوەی ئەو دەسەڵاتانە بە جۆرێك کارەکانیان جێبەجێ بکەن کە خێرو خۆشی و ئازادی هاوڵاتیان مسۆگەر بکات.

بەم پێیە «مۆنتسکیۆ» لە هەوڵی ئەوەدا بوو ئەو بنەمایانە دیاری بکات کە مەرجە هەموو دەسەڵاتێك، بە پێی ئەوە ئەرکی خۆی ڕایی بکات. بۆ نمونە دەسەڵاتی جێبەجێکردن پێویستە لە دەستی یەك کەسدا بێت، بۆ ئەوەی کارەکان خێرا و دەست بەجێ ڕاییبکرێن. هەروەها دەبێت مافی ئەوەشی هەبێت کە بڕیارەکانی دەسەڵاتی یاسادانان هەڵبوەشێنێتەوە و تەنانەت بتوانێت دەسەڵاتی یاسادانان بانگهێشت بکات بۆ کۆبوونەوەو دیاریکردنی خولی دانیشتنەکانیان، چونکە گەربێتو مافی درێژکردنەوەی ماوەی مانەوە بدرێتە دەست دەسەڵاتی یاسادانان خۆیان، ئەوا ڕەنگە ماوەی مانەوەیان تا دەکرێت درێژ بکەنەوە، ئەویش بە مەبەستی دەسەڵات گرتنە دەست و پاوانکردنی کورسی حوکمڕانی وڵات.

دەسەڵاتی یاسادانان بۆی نییە دەست لە بڕیارەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن وەربدات یان تەگەرەیان بۆ دروست بکات، هاوکات دەسەڵاتی یاسادانان تەنها بۆی هەیە سەرپەرشتی چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەو یاسایانە بکات کە خۆی دایڕشتون و لەلایەن دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە پراکتیزە دەکرێن و کاریان پێدەکرێت. هەروەها مافی ئەوەی نییە لە پادشا بپێچێتەوە، بەڵام دەتوانێت لێپێچنەوە لەگەڵ وەزیرەکاندا

بکات و سزای ئەوانەشیان بدات کە ڕێنوێنی خراپی پادشادەکەن. مافی ئەوەشی هەیە لەو مەسەلانە بکۆڵێتەوە کە پەیوەندیان بە موڵك و ماڵاتی دەوڵەت و هێزە سەربازییە دەریایی و زەمینیەکانەوە هەیە، بەڵام ئەم مافەی کە دراوە بە دەسەڵاتی یاسادانان تا کاریگەری لەسەر دەسەڵاتی جێبەجێکردن دابنێت، بۆ ماوەی ساڵێکەو تازە دەکرێتەوە، ئەویش لە ترسی ئەوەی نەك ئازادی بکەوێتە بەر هەڕەشە و مەترسی.

هەرچی دەسەڵاتی دادوەریشە، ئەوا «مۆنتسکیۆ»، ئەو گرنگیە زۆرەی پێنەداوە وەکی ئەوەی بەهەردوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردنی بەخشیووە، لەبەرئەوەی پێیوایە ئەمە دەسەڵات نییە بە مانای پڕاوپڕی وشەکە و پێویستە نەدرێتە دەست لیژنەیەکی هەمیشەیی، بەڵکو وا باشترە لەلایەن نوێنەرانی گەلەوە بەڕێوە ببرێت، بە تایبەت ئەوانەی بەپێی ئسوڵی یاسایی داوایان لێدەکرێت کاروباری داد بەڕێوەبەرن.

لە ڕێی تاوتوێکردنی تیۆریای لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و بنەمای کارکردنی هەریەکەیانەوە، «مۆنتسکیۆ» دەگات بە دیاریکردنی بنەماکانی پەیوەندی ئەو دەسەڵاتانە لەگەڵ یەکتریدا، ئەویش بەدروستکردنی چوارچێوەیەکی هاوسەنگ لە نێوانیاندا. ئەوسێ دەسەڵاتە هەریەکەیان جڵەوی ئەوی دی دەکات. دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە ڕێی مافی ڤیتۆکردنەوەو دەسەڵاتی یاسادانان بەهۆی سەروکاری لەگەڵ پارەو سامانی گشتی و مۆبێلیزە کردنی هێزە چەکدارەکان و بەو سانسۆر و چاودێریەشی بەسەر دەسەڵاتی جێبەجێکردندا دەیسەپێنێت. بۆ زیاتر ڕاگرتنی هاوسەنگی و میانڕەوی، «مۆنتسکیۆ» داوای دابەشکردنی پسپۆڕی لەناویەك دەزگا و یەك دەسەڵاتدا دەکات. بۆ نمونە دابەشکردنی دەزگای یاسادانان بۆ دوو ئەنجومەن. ئەنجومەنی گشتی کە نوێنەرانی لەلایەن گەلەوە دیاری دەکرێن، لەگەڵ ئەنجومەنی لۆردەکان کە ئەندامانی لە ناو چینی خانەدانەکانەوە هەڵدەبژێردرێن. بەم دابەشکردن و جیاکاریە، «مۆنتسکیۆ» دەیەوێت جۆرە هاوسەنگیەك لە نێوان بەرژەوەندی گەل و دەسکەوتەکانی چینی خانەدانەکاندا دروست بکات، بە جۆرێك تەنها بە ڕەزامەندی هەردوو ئەنجومەنەکە دەسەڵاتی یاسادانان توانای دەرکردنی یاسای هەبێت. سەبارەت بە دەسەڵاتی جێبەجێکردنیش، «مۆنتسکیۆ» دەیەوێت جیاکاری لە نێوان پادشا و وەزیردا بکات. پادشا بەو پێیەی سیمبولی شانشینی ئازادە، نابێت لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە لێپێچنەوەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێت پادشا دەوڵەت لە ئەگەری ستەمکاری دەسەڵاتی یاسادانان بپارێزێت. هەرچی پەیوەندی بە وەزیرەکانیشەوە هەیە کە دەزگای جێبەجێکردنی حوکم پێکدەهێنن، ئەوا دەکرێت ڕادەستی دەسەڵاتی یاسادانان بکرێن بۆ لێپێچینەوە و سزادانیان، گەر هاتوو دەسەڵاتەکانیان بە خراپ بەکارهێنا یان مۆجیاری و ڕێنوێنی خراپی پادشادیان کرد.

## چوارەم/ مۆنتسکیۆ و نوێنەرایەتیکردنی گەل:

سەربباری باوەڕی زۆری «مۆنتسکیۆ» بە ئازادی، بەڵام دەبینین کاتێك باس لە نوێنەرایەتی میللی دەکات، لیبراڵ نەبووە بە مانای تازەی وشەکە. بەو پێیەی مومارەسەکردنی دیموکراسی ڕاستەوخۆ لە وڵاتە گەورەکاندا مەحاڵە و لە وڵاتە بچوکەکانیشدا مایەی سەر ئێشەیە، ئەوا پێویستە دیموکراسی ڕاستەوخۆ بە دیموکراسی نوێنەرایەتیکردن بگۆڕین. ئەمەش ئەوە دەخوازێت میللەت مافی خۆی لە دەسەڵاتدا لە ڕێی ئەو نوێنەرانەوە مومارەسە بکات کە لە چوار چێوەی هەرێم و بازنەکانی هەڵبژاردندا دەنگیان دەداتێ.

مادامەکی مرۆڤ زیاتر ئاگاداری پێداویستییەکانی شارەکەی خۆیەتی، ئەوا چاکترە هەڵبژاردنی نوێنەران لە هەر شارێکدا بە جیا بێت، نەك لەسەر ئاستی گشتی وڵات بێت. هەروەها پێویستە لەسەر نوێنەران وەکالەتێکی گشتیان لە لایەن دەنگدەرانیانەوە پێبدرێت، بە جۆرێك ناچار نەبن بۆ هەموو کێشە و بابەتێك بگەڕێنەوە لایان. بەمجۆرە ئەو ئەندام پەرلەمانەی کاندید دەکرێت، ئازاد دەبێت لە نوێنەرایەتیکردنی

ئەوانەی دەنگیان پێداوە.

ئەگەر ئەمە پوختەی بیرو بۆچونی «مۆنتسکیۆ» بێت دەربارەی دیموکراسی نوێنەرایەتیکردن، بۆمان ڕوندەبێتەوە کە ئەو هێشتا لە زۆر شت قوتاری نەبووە کاتێك پەیرەوی سستمێکی چینایەتی کردووە کە جیاوازی لە نێوان مرۆڤەکاندا دەکات بە هۆی ڕەچەڵەك و سەروەت و سامانەوە، یان کاتێك دەسکەوت گەلێکی زۆر دەداتە خانەدانەکان و ئەوە بۆ ئەوان و جیاواز لە کەسانی دی بەڕەوا دەبینێت.

«مۆنتسکیۆ» لەگەڵ ئەوەی بڕوای بە دیموکراسی پەرلەمانی هەبوو کە هەڵبژاردنی گشتی دەخوازێت، بەلاّ م لەگەڵ ئەوەشدا توێژێکی زۆری لەوانەی لۆمپەن و هیچ ئیرادەیەکی سەربەخۆیان نییە، لەو پرۆسەیە بێبەشکردبوو[٧]، واتە ئەوانە بۆیان نەبوو دەنگ بدەن و کاندیدای خۆیان دەست نیشان بکەن. هاوکات «مۆنتسکیۆ» پێیوابوو کۆمەڵە خەڵکانێکی ناوەزەو تایبەت هەن لە ڕووی ڕەچەڵەك و سەروەت و سامان و خوا پێداوییەوە، کە پێویستە پلە و پایە و دەسکەوتە مادی و مەعنەوییەکانیان پارێزراو بێت. ئەمانە گەر بێتو وەکی سەرجەم خەڵکانی دیکە تەنها ماف یەك دەنگیان هەبێت، ئەوا ئازادی گشتیان دەکەوێتە مەترسیەوە. بۆیە پێویستە دەسکەوت و پلە و پایەی ئەو کەسانە پارێزراوبن و نەهێڵرێت لەناو بچن، ئەمەش بەوە دەبێت کە لەسەر ئاستی یاسادانان هەندێ دەسکەوتی تایبەتی بدرێتە خانەدانەکان.

بۆ نمونە خانەدانەکان بتوانن ئەنجومەنێکی یاسادانانی تایبەت و بە جیا بۆ خۆیان پێکبهێنن، بەجۆرێك مافی ڤیتۆکردنی ئەو بڕیارانەی هەبێت کە لەلایەن ئەنجومەنی گەلەوە دەدرێت. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئەو ئەنجومەنی خانەدانانە بۆ ماوەیی بێت و دەبێت دەسەلاّتی دادوەریشی پێبدرێت. لەبەرئەوەی خانەدانەکان لەبەردەم ئیرەیی و حەسودی پێبردندان، ئەوا دەبێت لەلایەن نەیارەکانیانەوە دادگایی نەکرێن، ئەمەش بۆ ئەوەی حوکمی ناهەقیان بەسەردا نەدرێت. واتە ناکرێت لەبەردەم دادگایەکی ئاسایدا لێپێچنەوەیان لەگەڵدا بکرێت، بەڵکو دەبێت ئەو پرۆسەیە لە بەرامبەر ئەنجومەنێکی یاساداناندا ئەنجام بدرێت کە ئەندامەکانی لە خانەدانەکان پێکهاتبن.

## ڤۆڵتێر (1694 - 1778)

«ڤۆڵتێر» لە سەردەمانی حوکمڕانی «لویسی چواردە» و لە ساڵی ١٦٩٤دا هاتۆتە دنیاوە. لە بنەماڵەیەکی بۆرژوازی بووە کە بە بازرگانی و کوتاڵ فرۆشیەوە خەریك بوون. لە پەیمانگای LOUIS LE GRAUD دا خوێندویەتی کە یەکێك بووە لە مەڵبەندە زانستیە بەناوبانگەکانی فەرەنسا و پیاوانی ئایینی سەرپەرشتیاریان کردووە. بەهۆی ئەوەی لە بنەماڵەیەکی بۆرژوا بوو هەروەها بیرتیژ و زیرەك بوو، توانی پەیوەندی ئەدەبی و کۆمەلاّیەتی بەرفراوان ببەستێت. ئەمەش وەك شاعیر و بیریارێك، ناوبانگێکی زۆری بۆ پەیدا کرد. «ڤۆڵتێر» سەرەڕای ئەوەی سەربە ناوەندێکی بۆرژوازی بوو و خاوەنی نێوبانگێکی زۆر و زەوەندیش بوو، بەلاّم لە ژیانیدا قۆناغی زۆر دژوار و ئاڵۆزی بینی کە کاریگەری گەورەی لەسەر ناوەڕۆکی بیرو بۆچونە سیاسی و کۆمەلاّیەتیەکانی بەجێهێشت. ساڵی ١٧١٧ لە پای کێشەیەکی لەگەڵ یەکێك لە خانەدانەکاندا، ناچار بوو بەرەو بەریتانیا هەڵبێت و ماوەی سێ ساڵێك لەوێدا بمێنێتەوە. لە ماوەی مانەوەی لەوێدا، «ڤۆڵتێر» بە سستەمی حوکمڕانی ئینگلتەرا و ئەو کەش و هەوا ئازادەی ئەدیبان و بیریارانی ئەوێ لێی بەهرەمەند بوون سەرسام بوو، چونکە دەیانتوانی بە ئازادی قسە بکەن و بەرهەمەکانیان بلاّوبکەنەوەو گوزارشت لە ڕاو بۆچونی خۆیان بکەن.

تەواوی ئەم ئازادیانە لە سەردەمانی حوکمڕانی «لویسی چواردە» و «لویسی پازدە»دا، لە فەرەنسا بوونیان نەبوو. ئەمەش هانی «ڤۆڵتێر»ی دا، تا خۆی تەرخان بکات بۆ داکۆکیکردن لە ئازادی بیریاران و ئەدیبان، لەڕێی خەباتێکی بێوچانەوە و بۆ خزمەتکردن بە فیکر و کۆمەڵگەی سیاسی فەرەنسی.

## یەکەم/ ڤۆڵتێر و کڵێسا:

ئێمە لە ڕێی نوسین و بەرهەمەکانیەوە تێدەگەین، «ڤۆڵتێر» هەڵوێستی توندی لە دژی کڵێسا و ئەو تەفسیرە ئاینیانە هەبووە کە پیاوانی پێی هەڵدەستان. ئەمەش بە ئاشکرا لەو شەرانەدا دیارە کە لە دژی ئەو جەهل و خورافە و حوکمە پێشوەختانە بەرپای کردبوو کە درابوونە پاڵ ئایینی مەسیحی و کڵێسا دوژمنی سەرسەختی کۆمەڵگە بوو، لەبەرئەوەی بەهۆی ئەو دەمارگیری و خورافەت و ژەهرانەی بڵاوی دەکردەوە، دەیتوانی شەڕی ئایینی ماڵوێرانکەر و قەیرانی کۆمەڵایەتی ترسناک دروست بکات.

«ڤۆڵتێر» ڕەخنە تەنزئامێزەکانی بەر لە هەر شتێك، ئاراستەی کڵێسا و پیاوانی ئایینی دەکرد و بەهانە و چەمکە ئایینیە تەقلیدیەکانی ڕەتدەکردەوە. کاری ئەو ئەوە بوو ئەقڵی مەسیحی لە ملدان بە بیروباوەڕە ئایینیە تەقلیدیەکانی کڵێسا ڕزگار بکات، بۆ ئەوەی دواتر بتوانن تێگەیشتنێکی ڕاست و دروستیان دەربارەی گەردوون هەبێت، بە جۆرێك کە لەگەڵ پرانسیپەکانی ئەقڵدا بگونجێت. بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی، «ڤۆڵتێر» دەستی کرد بە لێکدانەوەو پشکنینی سەرچاوە مێژووییەکانی ئایینی مەسیحیەت و لەم پرۆسەیەشدا ئەوەی بۆ ساخ بووەوە کە تەواوی ئەو بیروباوەڕە ئایینیە تەقلیدیانەی کڵێسا بانگەشەی بۆ دەکات، پووچ و بێ بناغەیە و زۆر دوورە لە لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی ئەقڵانیەوە.

لێرەوە «ڤۆڵتێر» پێیوایە کڵێسا لە هەموو ئەو تاوانانە بەرپرسیارە کە ڕوو دەدەن. لەلایەك بەرپرسە لەو ژیانە پڕ عەیش و نۆشەی پیاوانی ئایینی دەیگوزەرێنن، لەلایەکی دیکەشەوە بەرپرسیارە لەو دەمارگیرییە ئایینیەی بووە مایەی جۆرەها شەڕ و شۆڕی ئایینی. جەنگ لە دژی پرۆتستانت و لە ڕێ لادەرەکان و هەموو ئەوانەی لەسەر ڕێبازی ئاینزای کاتۆلیکی نین. «ڤۆڵتێر» ژمارەی قوربانیانی شەڕەکانی کڵێسا بەدەیان ملیۆن مرۆڤ حساب دەکات (ئەی کەوا بێت کوا ڕۆح و جەوهەری ئینجیل؟ ئەوانە نوێنەری تایبەت و دەگمەنی یەسوعی مەسیحن، چونکە لە هەموو هەنگاوێکیاندا پێچەوانەی پەیڕەو و ڕێنومایەکانی مەسیح ڕەفتار دەکەن). لەمبارەیەوە دەڵێت: (گەر بێت و مەسیح جارێکی تر بگەڕێتەوە سەر زەوی، ئەبێ چەند توڕە بێت و توشی چ شۆکێکی گەورە دەبێت).

«ڤۆڵتێر» کاتێك سەرکۆنەی کڵێسا و دەمارگیری کڵێسا دەکات، دەیەوێت جیاوازی لە نێوان ئەو بیروباوەڕە ئاینیەیدا بکات کە لە کڵێساوە دێت و هیچ بنەمایەکی ڕاست و دروستی نییە، لەگەڵ مۆراڵێکدا کە لە بوونەوەرێکی بەرز و بالاوە سەرچاوە دەگرێت (کە یەزدانە) و لە هەموو کات و شوێنێکدا وەك یەکە و لە یەك دەچێت. لەبەرئەوەی یەزدان سەرەوەختێك ئەم گەردونەی خوڵقاند، یاساگەلێکی جێگیری دارشت کە ناگۆڕێت و وەکی خۆی دەمێنێتەوە. لەم یاسا سروشتیانەشەوە ڕێسا ئەخلاقیە گشتیەکان دەرسکێن و کاریان پێدەکرێت. لێرەوە «ڤۆڵتێر» دەیەوێت خەڵك و خوا لە دەستی کڵێسا و بیروبۆچونە تیۆلۆژیە نائەقلانیەکانی قوتار بکات و لە بەرامبەریشدا ڕێنوێنیان بکات، تا پابەندی ئەو ڕێسا مۆراڵیە سروشتیانەبن کە سەرچاوە لەو یاسا سروشتیانەوە دەگرن کە یەزدان بۆ گەردونی داناوە. ئەم ڕێسا ئەخلاقیە سروشتیانە، پڕاوپڕ لەگەڵ یاسای سروشتیدا و لەگەڵ پەیوەندی و پێداویستیە کۆمەڵایەتیەکاندا دەگونجێت و بەهایەکی گشتی و یۆنیڤێرسالی هەیە، لەبەرئەوەی ئاکامێکی بێ چەند و چونە بۆ یەکیەتی سروشتی مرۆیی. مرۆڤ هەروەکو چۆن هەبووە بەشێوەیەکی خۆڕسك و بە سروشتی خۆی حەزی بە ژیانی کۆمەڵایەتیە، چونکە

ئینسانەکان لەبەرئەوە دروست بوون تا پێکەوە بژین. بەمجۆرە ئەو ڕێسا مۆراڵیانەی لە یاساکانی یەزدانەوە بۆ گەردوون سەرچاوە دەگرن، دەیەوێت خێر و چاکە بۆ سەرتاپای مرۆڤایەتی دەستەبەر بکات.
ئەوەی سود بە کۆمەڵگە دەگەیەنێت خێر و چاکەیە و ئەوەشی زیانی پێدەگەیەنێت شەرو خراپەکاریە.
لێرەوە تێگەشتنێکی کۆمەڵایەتی بۆ بونی یەزدان لای «ڤۆڵتێر» دروست دەبێت، کە پاداشتی کاری چاکە دەداتەوەو سزای خراپەکاریش دەدا. ئەم بوونە پێداویستیەکی کۆمەڵایەتیە بۆ پاراستنی ئارامی و ئاسایش لە نێوان مرۆڤەکاندا و بێ بونی ئەوە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ڕاست و دروستەکان بەردەوام نابن. (من دەمەوێت مرۆڤەکان هەموویان و تەنانەت هاوسەرەکەشم بڕواداربن بە یەزدان، ئەو کات پێموایە کەمتر دوچاری فرت و فێڵ و دزی لێکردن دەبم).

## دووەم/ ئازادی و یەکسانی لای ڤۆڵتێر:

ئەوەی «ڤۆڵتێر» لە زۆربەی زۆری بیریارانی سەدەی هەژدە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە ڕێبازی کۆمەڵایەتی ئەو بە پێچەوانەی ڕێبازە کۆمەڵایەتیەکانی دی لە سەردەمەکەیدا، پشت بە بنەماگەلێکی واقعی دەبەستێت کە پێویست و گرنگن بۆ چاکسازیکردن لە کۆمەڵگەیەکی گەندەڵدا. بە بۆچونی ئەو سستەمی کۆمەڵایەتی بۆ ئەوەی دادپەروەرانەتر و لە بارتر بێت، پێویستە ئازادی و موڵکدارێتی تایبەت و یەکسانی تێدا بەرقەرار بێت.

سەروەختێك دێتە سەر باسی ئازادی، «ڤۆڵتێر» لە ژێر کاریگەری «مۆنتسکیۆ»دایەو پێیوایە ئازادی ئەوەیە کە مرۆڤ جگە لە یاسا ملکەچی هیچی دیکە نەبێت. لێرەوەیە کە «ڤۆڵتێر» یەکێك بووە لەوانەی زۆر سەرسەختانە بەرگریان لە ئازادی کردووە. ئازادی بە پلەی یەکەم، ئازادی کەسایەتی مرۆڤ لە خۆ دەگرێت و بە پلەی دووەمیش ئازادی قسە کردن و ڕۆژنامەوانی و گوزارشت کردن لە ڕاو بۆچونی تایبەتی دەگرێتەوە، ئەمەش گرەنتی سەرەکیە بۆ سەرجەم ئازادیەکانی دیکە، دواجار ئازادی بیروڕاش لە خۆ دەگرێت کە دژ بە دەمارگیری ئاینی کڵێسای کاتۆلیکیە، لەگەڵ ئازادی کاردا، چونکە هەموو مرۆڤێك مافی ئەوەی هەیە هێز و توانای بفرۆشێت بەوەی زیاتری دەداتێ، لەبەرئەوەی مرۆڤ گەلێك هەن جگە لە هێزی کار شتێکی تر شك نابەن.

سەبارەت بە یەکسانیش، «ڤۆڵتێر» تێگەیشتنێکی تایبەتی دەربارەی ئەو چەمکە هەبوو. یەکسانی بەلای ئەوەوە نابێت بە هیچ جۆرێك بەسەر موڵکایەتیدا پراکتیزە بکرێت، چونکە گەر ئەوە کرا ئەوا یەکسانی جگە لە وەهمێك هیچی تر نابێت. ئەی کەواتە با بزانین یەکسانی بەلای ئەوەوە چی دەگەیەنێت و بریتیە لە چی؟ یەکسانی بەلای «ڤۆڵتێر»ەوە، بریتیە لە مسۆگەرکردنی بەهرەمەندبوون و چێژ وەرگرتن لە مافە سروشتیەکان بۆ تەواوی مرۆڤایەتی بەبێ جیاوازی، هاوشان بەوەش دەستەبەرکردنی چاودێری و پارێزگاری یاسایی بۆ هەموان. بەم پێیە هەموو مرۆڤێك مافی ئەوەی هەیە بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ خۆی و خێزان و موڵك وماڵاتیدا بکات کە بە گونجاوی دەزانێت. بەمجۆرە مرۆڤەکان لە ناوەڕۆکدا هاوبەش دەبن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم یەکسانیە نابێتە مایەی لەباربردنی ئەوەی مرۆڤەکان هەندێکیان پاشکۆی هەندێکی دیکە نەبن.

ئێمە هەموومان مرۆڤین، بەڵام هەموومان لە کۆمەڵگەدا چون یەك و یەکسان نین، لەبەرئەوەی هەریەك لە ئێمە ڕۆڵێك دەبینێت جیاواز لەوانی تر و بەو جۆرەش ڕۆڵی خۆی دەبینێت کە لەگەڵ تواناو لێهاتویدا بگونجێت. بەو پێیەشی بەهرەو توانای مرۆڤەکان یەکسان و چون یەك نییە، ئەوە شتێکی سروشتیە کە مرۆڤەکان بەسەر چین و توێژی نایەکساندا بەش ببن. بۆ ڕونکردنەوەی ئەمە «ڤۆڵتێر» دەڵێت: (لەم جیهانە سیاچارەیەی ئێمەی تێدا دەژین، مەحاڵە ئەو مرۆڤانەی لە کۆمەڵگەدا دەژین بەسەر دوو چیندا دابەش نەبن،

چینێکی دەوڵەمەند و خوا پێداو کە فەرمان بە خەڵکی دەکەن، لەگەڵ چینێکی هەژار و نەداردا کە کاریان ملکەچی و گوێ ڕایەڵیە). (ئەگەر ئەم سەرزەویە وەها بوایە کە ئێمە دەمانویست و مرۆڤ لە هەر جێ و شوێنێك دڵی بیگرتایە بەشە خۆراکی ڕۆژانەی سوك و ئاسان چنگ کەوتایە، ئەوا مەحاڵ بوو هیچ مرۆڤێك بتوانێت مرۆڤێکی تر بکاتە پاشکۆی خۆی)[٨].

کەواتە کۆمەڵگە بە ڕاوبۆچونی «ڤۆڵتێر» ناکرێت بەبێ هەژاران بژی، لەبەرئەوەی پێویستی ئەو خەڵکانەی خاوەنی هیچ شتێك نین بۆ کارکردن، وا دەکات کۆمەڵگە بژی. هاوکات دەوڵەمەندو خوا پێداوەکان بەو هەلی کارانەی بۆ هەژارانی دەرەخسێنن، سود بە کۆمەڵگە دەگەیەنن و وای لێدەکەن کە بژی و بەرەو پێش بچێت. بەمجۆرە پاشکۆیایەتی چینێك بۆ چینێکی دی، دەبێتە پێداویستیەکی کۆمەڵایەتی بۆ ژیانی کۆمەڵگە و یەکسانیش لە موڵکدارێتیدا وەهمێکە و شتێکی نەشیاوە.

«ڤۆڵتێر» لەگەڵ ئەوەی ئەگەری بەدیهێنانی یەکسانی لە سامان و موڵکدارێتیدا ڕەتدەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە توندی دژی ئەو ناعەدالەتیە کۆمەڵایەتیە کە سستمی فیودالی لە ڕێی پێدانی دەسکەوتی زۆر و زەوەندەوە بە خانەدانەکان دروستی دەکات، چونکە ئەو پێی وایە خانەدانەکان بەو دەسکەوتە زۆرانەی پێیان دەدرێت دەبنە بارێکی قورس بەسەر شانی میللەتەوە، بۆیە پێویستە ئەم بارە قورسە لابدرێت و لە ناو تەواوی چین و توێژەکانی میللەتدا بە دوای بەهرەمەند و کەسانی لێهاتوودا بگەڕێین و بناسێنرێن و بتوانن بە ئەرکی خۆیان هەستن لە کۆمەڵگەدا.

کەواتە بە شێوەیەك کە لەگەڵ سروشت و خەسڵەتی کۆمەڵگەی بۆرژوازیدا بگونجێت (ئەو کۆمەڵگەیەی ڤۆڵتێر سەر بەوان بوو)، دەیویست بۆ چونی خۆی دەربارەی ئازادی و موڵکایەتی و یەکسانی دەربڕێت، ئەویش لە میانەی ڕوانگەیەکی بۆرژوازیانەوە بۆ ئەو چینە کۆمەڵایەتیە تازە پێگەیشتووە، تا پێگەی سروشتی خۆی لە هەرەمی دەسەڵات و حوکمرانیدا بگرێت، ئەمەشی بەو پێگە ئابووریە پێشەنگە پاساو دەدایەوە کە لەسەر سامان و خاوەندارێتی وەستا بوو.

لێرەوە دەبینین «ڤۆڵتێر» لە پێگەی ئینتیمای بۆ چینی بۆرژوازیەتەوە، تێگەشتن و بۆچونی خۆی سەبارەت بە یاسای مەدەنی و سیاسەت، بە موڵکدارێتیەوە دەبەستێتەوە. لە لایەکی ترەوە «ڤۆڵتێر» پێیوایە مرۆڤ بۆ ئەوەی لە هەموو مافە مەدەنیەکانی بەهرەمەند بێت، پێویستە خاوەنی سەروەت و سامان و زەوی و زار بێت، چونکە تەنها موڵکدارەکان بۆیان هەیە دەربارەی ئەو مەسەلانە ڕای خۆیان بڵێن کە پەیوەندیان بە بەرژەوەندی کۆمەڵگەوە هەیە، هەرچی ئەوانەشە کە خاوەنی هیچ نین، ئەوا بۆیان نییە خۆیان لە کاروباری گشتی ئەو وڵاتەدا هەڵقورتێنن کە تیایدا دەژین.

## سێیەم/ بنەچەی دەوڵەت و چاکترین سستمی حوکمرانی:

«ڤۆڵتێر» هەرگیز لەوانە نەبووە کە بڕوای بە تیۆریای پەیمانی کۆمەڵایەتی هەبێت، وەك بنەمایەك بۆ دروست بوونی دەوڵەت. دەوڵەت لە فۆرمە سەرەتاییەکەیدا، دروستبونی بەرەنجامی یەکگرتنی بنەماڵە جیاجیاکان بوو لەگەڵ یەکتریدا، هەرچی پرۆسەی بەرەو پێشچونیشیەتی رووەو بەدەستهێنانی فۆرمی سستمی پاشایەتی، تەنها لە ڕێی ئەو جەنگ و ململانێیانەوە دەستەبەر بووە کە دەوڵەت ئەنجامی داون و وایکردووە سەرکردەی سوپاکەی ببێتە پیاوێکی مەزن و سامدار، بەجۆرێك خەڵك و خوای نەتەوەکەی ڕابێن لەسەر گوێڕایەڵیکردن و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی. بەمجۆرە ئەو کەسە دەبێتە پادشا و چارەنوسی میللەتەکەی بە دەستی ئەو دەبێت و دوا قسە لە تەواوی مەسەلەکاندا بۆ خۆی دەبێت. بە بۆچونی «ڤۆڵتێر»، ڕەگ و ڕیشەی سستمی پادشایەتی لێرەدایە[٩].

سەبارەت بەوەشی کە چاکترین سستمی حوکمڕانی لای ئەو چی بووە، دەتوانین بڵێین بەو پێیەی «ڤۆڵتێر» زۆری پلار و ڕەخنەکانی لە کڵێسا و سستمی فیوداڵی بوو، چونکە ئەوانی بە هۆکاری سەرەکی خراپبون و گەندەڵی بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی فەرەنسا دەزانی، دەیویست وەکی سەرجەم بیریارانی چینی بۆرژوازی سەردەمەکەی، وێنە و بۆچونێکی لەمەڕ سستمی پادشایەتی ڕۆشنگەر پێشکەش بکات، لەبەرئەوەی تاکە سستمێکە بتوانێت وڵات لەو دۆخە ناهەموارە قوتار بکات، ئەویش لە ڕێی ئەو پرۆسەی چاکسازیانەوە کە توانای جێبەجێکردنیانی هەیە. سستمی حوکمڕانی پادشایەتی ستەمکاری ڕۆشنگەر چاکە و دەسکەوتی خۆی هەیە، ئەگەر بەو پشێوی و نائارامیەی سستمی فیوداڵی بەراورد بکرێت.

سەرەڕای قەناعەتی «ڤۆڵتێر» بە سستمی پادشایەتی ستەمکاری ڕۆشنگەر، بەڵام نەیدەتوانی سەرسامی زۆری خۆی بە سستمی پادشایەتی دەستوری بەریتانی بشارێتەوە. «ڤۆڵتێر» ئەو ماوەیەی لە ئینگلتەرادا مایەوە، لە نزیکەوە بە وردی سەرنجی ئەو سستمی حوکمڕانیەی دەدا. لە ئاکامی ئەو سەرسامیەشی بەو مۆدێلی حوکمڕانیە، کەوتە پیاهەڵدانی ئەو سستمە پادشایەتیە دەستوری و پەرلەمانیەی، ئازادیە سیاسی و مەدەنیەکانی دەستەبەر دەکرد، شتێك کە لەو سەردەم و زەمانەدا لە فەرەنسادا بونی نەبوو، «ڤۆڵتێر»یش خەباتی لە پێناو بەدیهێنانیدا دەکرد.

«ڤۆڵتێر»بە دژایەتیکردنی سستمی فیوداڵی و کڵێسا بە هەموو دەمارگیری و خورافاتەکانیەوە، دەیویست بیرکردنەوەی مرۆڤ لەو بیرو بۆچونە ژەنگ گرتوانە ڕزگار بکات کە لە ئارەدا بوو. بەم کارەشی توانی لەگەڵ تەواوی ئەدیب و بیریارانی سەردەمەکەیدا، بەشدار بێت لە دەوڵەمەندکردنی میراتی فیکری فەرەنسیدا و زەمینە خۆش بکات بۆ ئەو گۆرانکاریانەی کۆمەڵگەی فەرەنسی لەبەریەك هەڵوەشاند و ساز و ئامادەی بکات بۆ ئەو شۆڕشە مەزنەی ساڵی ١٧٨٩ لە دژی پادشایەتی ستەمکار ئەنجامدرا.

بەمجۆرە دید و بۆچونەکانی دەربارەی ئازادی و یەکسانی و موڵکایەتی، بوونە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ ئەوانەی بنەماکانی مافەکانی مرۆڤیان نوسیەوە، لە سەروبەندی سەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسیدا لە ساڵی ١٧٨٩.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

١–ف. فولغین: فلسفة الانوار – ترجمة: هنرييت عبودي، ص ٥٢.

٢-هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣-ه.س.پ.

٤–جان جاك شيفالية: امهات الكتب السياسية من ميكافيللي الى ايامنا. ترجمة: جورج صدقني، ص ١٩٣.

٥–ف. فولغين: فلسفة الانوار– ترجمة: هنريت عبودي، دار الطليعة، بيروت – ص٦٠.

٦–ف. فولغين: ه. س. پ.

٧-مونتسکیۆ دیاری نەکردووە ئەم گروپە کێن.

٨–ف. فولغين: فلسفة الانوار – ترجمة: هنريت عبودي – دار الطليعة، بيروت – ص ٣٢.

٩–ف. فولغين: فلسفة الانوار– ص ٣٠.

## سەرچاوە:

الدكتور مهدي محفوظ: اتجاهات الفكر السياسي في العصر الحديث – المؤسسة الجامعية للدراسات و النشر و التوزيع، بيروت – الطبعة الثالثة، ٢٠٠٧.

رامین جهانبگلو
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

# ڤۆڵتێر و سەردەمی رۆشنگەری

بەرلەوەی باسی ڤۆلتێر بکرێت، پێویستە کەمێك باسی سەردەمی رۆشنگەری بکرێت. لەم ئاراستەیدا دەبێت وەڵامی پرسیارێکی بنەڕەتی بدەینەوە: «رۆشنگەری چیە؟».

گوتراوە رۆشنگەری کۆمەڵێك خەسڵەتی وەك متمانەکردنی تەواو و بێسنوری بە مرۆڤ و عەقڵی مرۆڤ و ئایندەی هەیە. وەك چۆن رۆمانسیەت دەرئەنجامی روبەروبونەوەی تاکە دژی یاسا و سنورداریێتی. لێرەوە دەبێت بۆ قسەکردن لەبارەی رۆشنگەرییەوە، راستەوخۆ باسی واقعێکی مێژوویی و بونیادنانەوەیەکی یۆتۆپی و کامڵخوازانە بکەین. باسکردنی واقعی مێژوویی لەو روەوەیە کە لە قۆناغی رۆشنگەریدا زیاد لە سەدساڵ کۆمەڵێك نوسەر و فەیلەسوف بەشێوەیەکی هوشیارانە و بەرپرسیارانە، بۆ رۆشنگەری مرۆڤ کاریان کرد و دەیانویست بە سودوەرگرتن لە عەقڵی رەخنەگرانە، زیهنی مرۆڤەکان لە پێشداوەری و باوەڕە خورافیەکان رزگاربکەن. باسکردنی بونیادنانەوەی یۆتۆپیانە لەو روەوە کە بیرەکانی سەردەمی رۆشنگەری وەك گێژەڵوکەیەکی ترسناك لە تیورە و پێشنیارە نەیارەکان لەبارەی بەردەوامی رابردو و سەیرکردنی ئایندەوە، لە ململانێ و هەوڵ و کۆششدا بوون. بە دەربڕینێکی دی رۆشنگەری لە چوارچێوەی نمایەکی گشتی گۆرانکارییەکانی سەدەی هەژدەدا دەردەکەوێت. ئەم نمایە هەڵگری رەگەزگەلێکی وەك دەسەڵاتی سیاسی و مەعنەوی کەنیسەیی، باوەڕە مەزهەبیەکان، پێشکەوتنی زانستەکان، گۆڕان لە دیدە مێژوییەکاندا، تیورە تازەکانی ئابوریو نارەزاییە سیاسیەکان بوو. بەکورتی رۆشنگەری ئەوروپایی، تایەکی رۆشنبیرانەی مەعنەویانە بوو کە لەنێوان سەدەی هەژدەدا لەناو خەڵکی ئەوروپادا رویدا و بڵاوبۆوە. رۆشنگەری

کاریگەری کردە سەر سەلیقە ئەخلاقی، زیهنی و ستاتیکیەکانی خەڵکی و بەمشێوەیە سەرتاسەری جیهانی خستە ژێر کاریگەریی خۆیەوە.

ئەوروپیەکان لەهەر زمانێکی ئەوروپیدا بۆ رۆشنگەری وشەی تایبەتی خۆیان هەیە. لە زمانی ئەڵمانیدا سود لە وشەی AUFKLARUNG دەگرن کە بەمانای (تەپ و تۆز داماڵینە). فەرەنسییەکان سود لە وشەی «SIECLE DES IUMIERES" دەگرن کە بەمانای «سەردەمی روناکیەکانە» و ئیتاڵیەکانیش بە «ILLUMINISMO" ناوی دەبەن.

بەمشێوەیە یەك دیاردەی رۆشنگەری، لە وڵاتە ئەوروپیە جیاوازەکاندا و بەپێی خەسڵەتە تایبەتیە کلتوری سیاسی و ئابوریەکان، شکڵێکی تایبەتی بەخۆیەوە دەگرت. فەرەنسیەکان کە دەورێکی سەرەکی و چارەنوسسازیان لە رۆشنگەریدا بینی، وشەیەکی دیان بۆ بەکارنەهێنا. فەرەنسیەکان دەیانتوانی وشەی ECLAIRCISSEMENT کە یەکسانە بە وشەی AUFKLARUNG بەکاربهێنن، بەڵام وایان پێ باش بوو کە هەمان ئەو وشەیە بەکاربهێنن کە بەمانای «سەردەمی روناکیەکانە». زۆرن ئەوانەی نوێنەری رۆشنگەرین و ژماردنیان لەتوانای هەموو فەهرەستێك تێدەپەرێت. بەڵام لەم ناوەدا دەکرێ ناوی ڤۆڵتێر، مۆنتیسیکۆ، رۆسۆ، کۆندرسە، کانت و هیوم ببرێت.

رۆشنگەری لە چ کاتێکەوە دەستی پێکرد؟ ئەگەر ئێوە سکۆتلەندی بن دەڵێن کە لە ساڵی ١٧٣٩وە، واتە ئەو کاتەی وتارەکەی هیوم «لەبارەی سروشتی مرۆییەوە» بڵاوبۆوە. بەڵام ئەگەر فەرەنسی بن بێگومان سەرەتاکەی دەگەرێننەوە بۆ ساڵی ١٧٨١، واتە ساڵی بڵاوبونەوەی «نامە فەلسەفیەکانی» ڤۆڵتێر. ئەڵمانیەکان ساڵی ١٧٨٤ پەسەند دەکەن، چونکە لەم ساڵەدا بەرهەمە فەلسەفیەکەی کانت بەناونیشانی «رەخنە لە عەقڵی پەتی» بڵاوبۆوە. کانت لە ساڵی ١٧٨٤دا لە وەڵامی پرسیاری رۆژنامەیەکی ئەڵمانی کە بریتی بوو لە «رۆشنگەری چیە؟» وتی رۆشنگەری بریتیە لە دەرچوون لە دۆخی منداڵی». بەدەربرینێکی دی ئەوەی کانت دەیویست بیڵێت ئەوە بوو کە: رۆشنگەری نیشانەی گەشەکردن و پێگەیشتنی مرۆڤە و لەراستیدا شۆرشی مرۆڤە دژی هەموو دەمارگیری و ناسینێك کە لە سنوری ناسینی مرۆڤدایە. دەکرێت سەردەمی رۆشنگەری بۆ دوو قۆناغ دابەش بکرێت:

١- لەنێوان ساڵەکانی ١٦٨٠و ١٧٤٥. لەم قۆناغەدا گۆرانێکی بنەرەتی لە دیدگا و بونیادەکاندا رویدا و یەکەم روبەروبونەوەکان لەگەڵ دەسەڵاتدا دەستی پێکرد.

٢- لەنێوان ساڵەکانی ١٧٤٦و ١٧٧٠دا. لەم قۆناغەدا گەورەترین بەرهەمەکانی سەدەی هەژدەهەم بڵاوبۆوە، و قوتابخانە فکرییەکان خەسڵەتی قوڵتریان بەخۆیانەوە گرت.

لە دوو دەیەی پاش ئەم قۆناغانەدا، ئێمە شایەتی بڵاوبونەوەیەکی فروانتری بیرە نوێکان و رودانی شۆرشەکانی فەرەنسا و ئەمەریکاین. ڤۆڵتێر بەکردەوە سەر بە هەردوو ئەم قۆناغەیە. ڤۆڵتێر لە نۆڤەمبەری ١٦٩٤دا لەدایك بوو، لە ١٧٧٨دا کۆچی دوایی کرد. ناوی راستەقینەی فرانسوا مری ئرۆئە بوو. پێنجەم منداڵی مری فرانسوا و مری مارگرێت بوو. بەداخەوە کەس نازانێت کە ناوی ڤۆڵتێر لەکوێوە و کەی بۆی دانرا. بەڵام چەند ئەگەرێك بۆ ئەم حاڵەتە هەیە:

١- یەکێکیان ئەوەیە ناوەکە پەیوەندی بە پلەی خێزانیەوە هەبێت.

٢- نوسەرێك ئەم ناوە بۆ ڤۆڵتێر لە ئیتاڵیادا دادەنێت.

٣- یەکێك لە پسپۆرانی بەرهەم و ژیانی ڤۆڵتێریش بروای وایە کە ناوی ڤۆڵتێر لە ناوی شاری ئرووە وەرگیراوە.

بەهەرحاڵ ئەم ناوە هەموو ژیانی ڤۆڵتێری گۆڕی و چارەنوسێکی درەوشاوەی بەرەو روی کردەوە. ئەسقەفی ئەو سەردەمە ناوی ڤۆڵتێر بە ناشرینی دەهێنێت. ڤۆڵتێر لە وەڵامدا ئەم ئەرستۆکراتە گەورەیەی بۆ جەنگ یەك بەیەك بانگکرد. بەڵام ئەو ڤۆڵتێری بۆ زیندانی باستیل رەوانەکرد. ڤۆڵتێر پاش یەك شەو لە باستیل ئازادکراو بەڵام یەکسەر بۆ ماوەی ٣ ساڵ بۆ ئینگلترا دورخرایەوە. ئەم سێ ساڵە بە پڕ بەرهەمترین و گرنگترین قۆناغە ئەزمونیەکان لە ژیانی ڤۆڵتێردا دەژمێررێت. هەندێك لە تەفسیرکەرانی ڤۆڵتێر بڕوایان وایە ئەوەی ڤۆڵتێری کردە بیریارێکی لیبراڵ، ئازادیخواز و بەرگریکەر لە مافە فەردیەکان و دژی دەمارگیری، هەر ئەم کاریگەرەی ئینگلتەرا بووە لەسەر ژیانی. بەهەرحاڵ ڤۆڵتێر بەشێوەیەکی قوڵ لە دوو سەرچاوەوە کاریگەری کراوەتە سەر:

١- ڤۆڵتێر کەوتە ژێر کاریگەری بیرئازادانی ئینگلیزیەوە.

٢- پاش پێگەیشتنی فکری خۆی، لە کۆمەڵگای فەرەنسیدا ژیا و لەلایەن بیریارە فەرەنسییەکانەوە کاری تێکرا.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ڤۆڵتێر بەتوندی قەرزاری بیری ئینگلیزەکانە و لەیەك سەری ئەم پرۆسەی بیرەدا راوەستاوە. لەلایەکەوە درەوشانەوەی تازەی خۆری دەبینی و لەلایەکی دیشەوە تاریکیەکانی شەوی دەبینی. ئەم دوو لایەنیە لەوەوە دێت کە ڤۆڵتێر لە نیشتیمانی خۆیدا بۆ نوسین لەبارەی مەسەلەی مەزهەبی و لێکبوردن و ئاسانگیری، لە زەحمەتدا بوو. بەڵام لە هەمانکاتدا مەسەلەی ئاسانگیری مەزهەبی لە مەسەلەکانی رۆژ بوو. لە درێژەدا ڤۆڵتێر لە بەرگریکردنیدا لە بیرە سیاسیەکانی خۆی، بەتوندی پشتی بە نەریتی فەیلەسوفانی لیبراڵ و ئەزمونگەرانی ئینگلیزی و بەتایبەتی سێگۆشەی بیکۆن، لۆك و نیوتن دەبەست. ڤۆڵتێر بۆ یەکەمجار لە ئینگلتەرادا ئاشنای مەسەلەگەلی وەك باوەڕ لە زانستدا، ئۆمێد لە عەقڵدا و عەشق لە ئازادیدا بوو.

گرنگە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین ڤۆڵتێر داهێنەری ئەم بیرانە نەبوو، بەڵکو رونکەرەوە و راگەیەنەری ئەم بیرانە بوو. ڤۆڵتێر هەرگیز بانگەشەی ئەوەی نەکرد کە فەیلەسوفێکی پرۆفیشناڵە، بەڵام شایستەی ناونیشانی رونکەرەوەی فەلسەفە و رۆشنگەری و عاشقی داناییە. لە دیدی ڤۆڵتێرەوە بیرکردنەوە قەیرانی دروستکردووە:

١- لە دیدی ڤۆڵتێرەوە فرانسیس بیکۆن میتافیزیکای توشی قەیران کرد و هوشیاری مرۆڤەکانی بەخەبەر هێنایەوە.

٢- بەهەمان شێوە نیوتن بە تیورەیەکی زانستی دیدی ئەرستۆیی بۆ جیهانی بەشێوەیەکی کامڵ تۆشی قەیران کرد.

٣- بەڵام فەیلەسەفی خۆشەویستی ڤۆڵتێر، جۆن لۆك بوو کە دەریخستبوو بیری قبوڵکراوی زوربەی فەیلەسوفانی پێشمۆدێرن، بێ بناغەیە.

لە دیدی ڤۆڵتێرەوە تێڕوانینی لۆك بۆ ناسین، کاریگەرییەکی گەورەی کردە سەر دینناسی بیر وشك کە پێی لەسەر ئەو بڕوا هەڵەیە دادەگرت، کە بوونی رۆحێکی نەمر، بنەمایەکی قبوڵکراو و سەقامگیرە. بەڵام لە دیدی ڤۆڵتێرەوە میتۆدی ئەزمونی و زانستی بۆ ناسین، بەناچاری دژە مەزهەبی نییە. ڤۆڵتێر دیدێکی ئازاد و ئەخلاقی بۆ خودا و مەزهەب هەبوو. ئەو خودای بە کاتژێرسازێکی پیرۆز دەزانی، کە خودای رێکخستن و هەروەها عەشقە، خودایەکە کە فەرمانی بە مرۆڤەکان داوە یەکیان خۆش بوێت. لای ڤۆڵتێر بوونی خوداوەند

ناچاریەك بەسەر مرۆڤەكاندا دەسەپێنێت، بۆ ئەوەی لە بچوكی خۆیان تێبگەن و لە هەمانكاتدا هوشیاربن بە برایەتی خۆیان. ناسینی مرۆڤیش بە نۆبەتی خۆی پاساو بۆ ناچاری لێكبوردن و ئاسانگیری دولایەنە دەهێنێتەوە. لێرەوە لە دیدی ڤۆڵتێرەوە لێكبوردن بەهەمان ئەندازە كە ئامانجێكی سیاسیە، ئەركێكی دینیشە. لێكبوردن وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەیە: مرۆڤانەترین مەسەلە لە جەوهەری مرۆییدا چیە؟ لە دیدی ڤۆڵتێرەوە هەر تاكێك تاكێكی دی بەو بەهانەیە ئازاربدات كە بڕوایەكی جیاوازی هەیە، دێوێكە.

لێرەوە ڤۆڵتێر خەڵك بۆ لێكبوردن بانگ دەكات. چونكە هەموویان لەبەردەم ئەگەری گۆڕان و هەڵەكردندان. بەڵام لێكبوردن میوەی تێگەیشتن و تێڕوانینی عەقڵانی مرۆڤە بۆ هەلومەرجی خۆی، ئەمەش خۆی دەرئەنجامی دینی سروشتیە. لەئەنجامدا خودایەك كە ناچاركردنی وەك لێكبوردن دەكاتە ئەركی مرۆڤ، بونیادێكی میتافیزیكی نییە، بەڵكو خودای واقعیە. لێرەوە ڤۆڵتێر وەك رەخنەگرێكی ئازاد، مەسیحیەتی بە دوژمنی راستەقینەی دین زانیووە. لە دیدی ڤۆڵتێرەوە مەسیحیەت ترسناكە، چونكە سەرچاوەیەكە بۆ ئاژاوە و هەروەها خورافە بڵاودەكاتەوە. ڤۆڵتێر خورافە بە رەگەزێك دەزانێت كە مەیل و پاڵنەرە دینیەكان لەناودەبات، و دەمارگیریش نەخوشیەكی دینیە. لێرەوە چەند خورافەگەری كەم بێتەوە، دەمارگیری كەمتر دەبێتەوە و لە ئەنجامدا مەترسی و كارەساتی كەمتر دێتە پێشێ. بەمشێوەیە لە دیدی ڤۆڵتێرەوە ئەو دەوڵەتدارانەی دەیانەوێت دەمارگیری لە رەگەوە دەربێنن، سەرەتا دەبێت خورافە لە رەگەوە دەربێنن، تەنها رێگەی بەرەو پێشبردنی ئەمكارەش بڵاوكردنەوەی بەرهەم و بیروراكانی فەیلەسوفانی رۆشنگەرییە، ئەمەش هەموو جۆرە دۆگمایەك لەناودەبات. لێرەوە دیدی مەسیحی بۆ مرۆڤ كە ڤۆڵتێر لە پرۆسەی خودهوشیاریدا بە ناكارای دەژمارد و نكوڵی لێدەكرد، لەگەڵ فەلسەفەی رەواقی لە بواری سەربەخۆی و بەرپرسیاری و كەرامەتی مرۆیدا دژبەیەكە. هەر لەبەر ئەمەیە ڤۆڵتێر، ئەپیكتتۆس بە فەیلەسوفی خۆشەویستی خۆی دەزانێت و ناوی ماركۆس ئۆرلێۆس وەك ئیمپراتۆری خوشەویستی خۆی دەبات و ئەویش بە نمونە و رەمزی واقعی بۆ مەزنێتی سەڵتەنەت پێناس دەكات. فەلسەفەی رەواقی (بە جەختكردن لەسەر بیرەكانی یەكسانی، بەهای یاساو شایستەسالاری و گرنگی ئەرك و تێبینی كردنی كۆمەڵگای ئازاد تیایدا)، لە پایە فەلسەفە كۆمەڵایەتیەكان، لەلایەن ڤۆڵتێریشەوە قبوڵكراوە. چەند كاریگەرییەكی دی فەلسەفە و بیری رەواقی لە فەلسەفەی سیاسی ڤۆڵتێریشدا هەیە، كە پەیوەندی بە یاسای سروشتیەوە هەیە. جەختكردنی ڤۆڵتێر لەسەر یاسای سروشتی بەشێوەیەكە كە دەكرێت بە بەرنامەیەكی سیاسی دابنێن:

١- یاسای سروشتی بریتیە لەوەی ئێمە لەبەر لاوازیەكان و نەزانیەكانمان، یەكدی دەبەخشین و ئەمەش یەكسانە بە لێكبوردن و ئاسانگیری. لە دیدی ڤۆڵتێرەوە لێكبوردن توانای ئەوە بە مرۆڤ دەبەخشێت، بە خۆشبەختی و بەشێوەیەكی شەریف بژی.

٢- ئەو چەمكەی لە فەلسەفەی سیاسی ڤۆڵتێردا گرنگە، باڵادەستی یاسایە. لە دیدی ڤۆڵتێردا ئازادی بریتیە لە وابەستەبوون بە یاساو رەچاوكردنە.

لەسەر ئەم بناغەیە ئەو وڵاتانەی یاسا تیایدا باڵادەستە، وڵاتی ئازادن، لەبەرئەمەش ڤۆڵتێر داوا لە خەڵكی فەرەنسا دەكات لاسایی خەڵكی ئینگلتەرا و هۆڵەندا و سویسرا بكەنەوە.

بەمشێوەیە دەبینین ڤۆڵتێر گرنگی سیاسی و دەروونناسیانەی باڵادەستی یاسای بەشێوەیەكی كامڵ دەركككردووە. لە دیدی ڤۆڵتێرەوە یاسا رێنماییەكی عەقڵانیە لە جیهانێكی خاڵی لە عەقڵدا. چونكە یاسا هاوكاری مرۆڤەكان دەكات بۆ ئەوەی پێشبینی دەرئەنجامی كارەكانیان بكەن. لە دیدی ڤۆڵتێرەوە لە ئینگلتەرادا بە باڵادەستی یاسا هەر كەسێك دەزانێت كە چی هەیە، ئەركی چیە و چ شتێك دەتوانێت بكات. چونكە هەموو كەس و هەموو شتێك لە پاشاوە بگرە تا كەنیسە، بەپێی یاساو لەسایەی یاسادان. لێرەوە

قسەی ڤۆڵتێر بەتەواوی روونە. ئەو ستایشی هاوسەنگی دەسەلات دەکات و بڕوای وایە رژێمی ئینگلتەرا لەم قۆناغەدایە. ڤۆڵتێر ستایشی دەستوری ئینگلتەرا دەکات، چونکە نادادپەروەری و ئاژاوەی ناخۆیی کەمکردۆتەوە. لێرەوە لە دیدی ڤۆڵتێرەوە ئینگلتەرا بە پێچەوانەی فەرەنساوە سەرزەمینی ئازادییە: ئازادی بیر، ئازادی کار و ئازادی داهێنان.

کاتێك ڤۆڵتێر باسی ئازادی داهێنان دەکات، رەخنە لەو سنورداریێتیە کلتوری و سیاسیانە دەگرێت کە لە فەرەنسادا بینیویێتی. لە فەرەنسای سەردەمی ڤۆڵتێردا، هونەرمەندیان بە شایەر دەزانی. ئەوان بە پێچەوانەی هونەرمەندانی ئینگلتەراوە، هیچ بەها و رێزێکیان نەبوو، وە رێگەیان نەبوو بەشداری لە پایەو پلەکانی دەوڵەتدا بکەن. نوسەرانی فەرەنسایان بە خەڵکی شۆرشگێر دادەنا، چونکە گوناهەکەیان ئەوە بوو خەڵکیان هاندەدا بیر لەبارەی خۆیان و بۆ خۆیان بکەنەوە و خەڵکیان لە پەیڕەوی و گوێڕایەڵی کوێرانە بۆ فەرمانڕەوایان، ئاگادار دەکردەوە.

ئەم دیدە ئێمە بەرەو دیدی ڤۆڵتێر بۆ دەوڵەت دەبات. فەلسەفەی سیاسی ڤۆڵتێر لەگەڵ بنەمای دیموکراسیدا هاوئاهەنگە. چونکە ڤۆڵتێر بڕوای وایە بوونی دەوڵەت لەبەرخاتری هاولاتیانە و بەپێچەوانەی دەوڵەتێکی دەسەلاتخوازە کە تیایدا بوونی هاولاتیان بۆ دەوڵەت پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە. بە دەربڕینێکی دی ڤۆڵتێر تاکەکەس بە تاکە رەگەزی مومکین لەناو رێکخستنی کۆمەلایەتیدا دەزانێت. لێرەوە ئەرکی دەوڵەت تەدارەکی ئازادی و ئاسایشە بۆ تاك و لەبەرامبەر ئەمەشدا تاکیش پارێزگاری لە دەوڵەتەکەی خۆی دەکات و وەفادار دەبێت بۆی. لێرەوە هەرچی خەسڵەتەکانی ئەم هەڵسوکەوت و خزمەتە دولایەنیە لەنێوان دەوڵەت و هاولاتیدا زیاتر بێت، لە پرۆسەی پەیوەندییە سیاسیەکانی خۆیاندا سەرکەوتوتر دەبن. کەوابوو ڤۆڵتێر سروشتیترین و داواکراوترین شێوەی فەرمانڕەوایی بە کۆماری دەزانێت، کە زۆرتر توانای بۆ گەیاندنی مرۆڤەکان بۆ یەکسانی سروشتی هەیە. چونکە لە دیدی ڤۆڵتێرەوە کۆمار دەوڵەتێکی سەربەخۆی جەماوەریە و دەرکەوتی سیاسی یاسای سروشتیە. کۆمار دەبێت خاوەنی دەوڵەتێکی بەهێز بێت، کە سود لە دەسەلاتی خۆی بۆ بەکارهێنانی بنەما دیموکراسیەکان لە پەیوەندییە مرۆییەکاندا وەربگرێت. بەلام ڤۆڵتێر ئەگەرچی پێشنیاری حکومەتێك بۆ خەڵك دەکات، بەلام نەك بەهۆی خەڵکیەوە یان دروستبوو لە خەڵکەوە، چونکە بڕوای وایە ئەمشێوەیە زۆر پۆتۆپیانەیە. هەرلەبەر ئەمەش ڤۆڵتێر بڕوای وایە رۆشنگەری بزوتنەوەیەکە لە چەمکی دەسەلاتداریێتی و سەربەخۆییەوە دەستی پێکردووە.

وەك پێشتر گوتمان لە دیدی ڤۆڵتێرەوە چەمکی یاسای سروشتی، پێویست دەکات مرۆڤەکان هاوکاری یەك بکەن. رێکخستنی سیاسی ئەرکی پاراستنی ئازادی، ئاسایش و دارایی هەر تاکێکی لە ئەستۆیە. لێرەوە حکومەت هەرچی زیاتر لە خزمەت خەڵکدا بێت، بەرپرسیارانی دەوڵەتیش زیاتر لەگەڵ مافە سروشتیەکاندا هاوئاهەنگ دەبن. ئەو یاسایانەشی مرۆڤ دایرشتون هەرچی زیاتر لەگەڵ یاسای سروشتیدا تەبابن، ژیان زۆرتر قابیلی تەحەمولکردن دەبێت. لە دیدی ڤۆڵتێردا تەنها لەیەك حاڵەتدا یاساکان بۆ دابینکردن و پاراستنی بەرژەوەندییە دنیاییەکانی هاولاتیان دادەرێژرێن، ئەویش لەو حاڵەتەدا دەسەلاتەکانی کەنیسە و دەوڵەت لەیەك جیابوبنەوە. چونکە ئامانجی دەوڵەت دابینکردنی خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی کاتی خەڵکیە، لەکاتێکدا ئامانجی کەنیسە رزگارکردنی رۆحی مرۆڤە لە مەلەکوتی ئاسمانیدا. کەوابوو لە دیدی ڤۆڵتێرەوە دەبێت هەقیقەتی بوونی کەنیسە، بۆ هاوکاریکردنی دەوڵەت بێت لە دابنیکردنی خۆشبەختی بۆ هەموو خەڵك. ئەم روانینە بەو مانایەیە کە ڤۆڵتێر پێگەی کەنیسە لەچاو دەسەلاتە جیهانی و کاتیەکاندا بە پەراوێزی دەزانێت، بەلام ئەم جێگۆرکێیەی پێگە، تەنها لەرێگەی ململانێ لەگەڵ خورافە و دەمارگیریدا مومکینە. لێرەوەیە ڤۆڵتێر لێکبوردن و ئاسانگیری دینی، ئازادی رادەربڕین و ئازادی بلاوکردنەوە بە کلیلی

ژیانی مەدەنی و زامنی ئازادی تاکەکەسی دەژمێرێت.

ڤۆڵتێر وەك هیومانستێك چەمکی کەرامەت و رێزی مرۆڤ، لە هەموو چەمکەکانی دی لەوانە نەتەوە، زۆر بە بەرزتر دەزانێت. بەدەربڕینێکی دی لە دیدی ڤۆڵتێرەوە هەموو مرۆڤەکان یەکسانن، چونکە ئەوان بەشێوەیەکی یەکسان مرۆڤن. کەوابوو یەکسانی لە دیدی ڤۆڵتێردا، مەرجێکی سروشتیە، چونکە مرۆڤەکان بەشێوەیەکی یەکسان لەدایکدەبن. لێرەوە یەکسانی مەرجێکی سیاسیو کۆمەڵایەتی و هەروەها دەرئەنجامی خەباتەکانی مرۆڤیشە. کەوابوو ئەرکی دەوڵەتی رۆشنگەری تێگەیشتنی ئەو خاڵەیە کە هەموو هاوڵاتیان بەشێوەیەکی یەکسان مرۆڤن، تەنانەت ئەگەر دەوری جیاوازیشیان لە کۆمەڵگادا هەبێت.

بەکورتی ڤۆڵتێر بەردەوام لەگەڵ سیاسەتە پراکتیکیەکانی سەردەمی خۆیدا دەستەویەخە بووە. هۆی ئەوەش کە بۆچی ناوی ڤۆڵتێر تێکەڵ بە شۆڕشی فەرەنسا بووە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵە. هیچ جێی گومان نیە کە ڤۆڵتێر بەرجەستەترین کەسێك بوو کە رێگەی بۆ شۆڕشی فەرەنسا کردەوە. بەڵام هەڵەیە گەر وابزانین ڤۆڵتێر پێشبینی شۆڕشی کردووە یان سەلماندویێتی. بە پێچەوانەوە ڤۆڵتێر لە بیستنی ئەوەی ئەرستۆکراتی فەرەنسا تەنها بە شۆڕش دەروخێت، بەتوندی دەحەپەسا و دەترسا. هۆکەشی ئاشکرایە. چونکە ڤۆڵتێر ئەگەرچی پرۆتستۆی فەقیری و نادادپەروەری دەکرد، بەڵام بڕوای بە جەماوەر نەبوو. ڤۆڵتێر هەم لە بڕوا و هەم لە ڕووی خێزانیەوە ئەرستۆکرات بوو. ڤۆڵتێر خوازیاری ئەوە بوو ئەرستۆکراتیەت لێکبوردنی زیاتر لەخۆی پیشانبدات و لەهەمانکاتدا دژی حکومەتی جەماوەری بوو. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ڤۆڵتێر نوێنەری راستەقینەی سەردەمی خۆی، واتە سەردەمی رۆشنگەرییە. هەرلەبەر ئەمەشە زۆرجار سەدەی هەژدە بە سەدەی ڤۆڵتێر ناودەبەن. پێدەچێت هێشتا ڤۆڵتێر بەهایەکی هەبێت کە هێشتاش بەکەڵکی ئەم سەردەمەی ئێمەش بێت. لە چوار خاڵدا ڤۆڵتێر هێشتا زیندووە:

١- یەکێتی بەخشین بە دوو کلتوری مرۆیی و زانستی.

٢- خەبات دژی دۆگم و دەمارگیری.

٣- رەخنە لە کۆمەڵگای یۆتۆپی و خەیاڵاوی. دروشمی «کاندید» ئەمەیە: «چاکسازی بکە ، یۆتۆپی مەبە»

٤- پێداگرتن لەسەر بەهاکانی وەك شایستەیی عەقڵ، یەکێتی و لێکبوردن.

پۆل ڤالری شاعیری بەناوبانگی فەرەنسی، لە ساڵی ١٩٤٤دا لە بارەی ڤۆڵتێرەوە گوتویێتی: «ڤۆڵتێر زیندووە، ڤۆڵتێر دەژی، ڤۆڵتێر زەمەنی هەموو زەمەنەکانە».

## سەرچاوە:

ئەم وتارە لە کتێبی (ڕامین جهانبگلو: حاکمیت و ازادی. تهران. نشرنی. ١٣٨٣) وەرگێڕاوە.

د. جۆرج كەتورە
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

# دیالەكتیكی ڕۆشنگەری
# ماكس هۆركهایمەر و تیودۆر ئەدۆرنۆ

### قوتابخانەی فەلسەفی فرانكفۆرت

كتێبی دیالەكتیكی ڕۆشنگەری لە نوسینی «ماكس هۆركهایمەر» و «تیودۆر ئەدۆرنۆ»یە. ئاشنایەتیم بەم كتێبە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێكی دوور. ساڵانێكی زۆرە من لای خۆمەوە گرنگی بە قوتابخانەی فرانكفۆرت دەدەم، ئەمەش قوتابخانەیەكە كە لە یەك كاتدا فەلسەفە و كۆمەڵناسی پێكەوە كۆكردۆتەوە. قوتابخانەی فرانكفۆرت لە بیستەكانی سەدەی ڕابردو لە ئەڵمانیادا دامەزراو تا هەنوكەش بەردەوامە. دوای ئەوەی لە دەوروبەری ساڵانی ١٩٢٣ كورسییەكیان بۆ لێكۆڵینەوە كۆمەڵایەتیەكان لە زانكۆی فرانكفۆرتدا بۆ تەرخانكرد. ئەم كورسیەش بۆ ماوەیەكی زۆر مایەوە، تا ئەو كاتەی نازییەكان لە سەردەمی حوكمڕانی «هتلەر»دا قوتابخانەكەیان داخست و كەوتنە ڕاوەدونانی ئەندامەكانی، لەوانە «هۆركهایمەر» و «ئەدۆرنۆ». سەرەتا ئەمانە ڕایانكرد بۆ نەمسا و لەوێوە بۆ بەریتانیا و پاشان بۆ وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا.

ئەم كتێبە واتە (دیالەكتیكی ڕۆشنگەری)، «هۆركهایمەر» و «ئەدۆرنۆ» پێكەوە لە تاراوگە نوسیویانە، لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٤٥ بۆ ١٩٤٧. كتێبەكە بە گشتی گەڕانەوەیەكە بۆ سەردەمی ڕۆشنگەری. ئەم سەردەمە لای فەرەنسیەكان ئاماژەیەكە بۆ ئەو بیرمەندانەی زەمینەیان بۆ شۆڕشی فەرەنسی خۆشكرد، لە ئەڵمانیشدا ئەو بیریارانە دەگرێتەوە كە سەرەتاكانی شۆڕشی پیشەسازی و ژیانێكی هاوچەرخ و مۆدێرنیان لە ئەڵەمانیادا دارشت.

كتێبەكە لە چەندین بەش پێكهاتووە، بابەتی سەرەكی زۆربەی بەشەكانیش

ئەگەری دروستکردن و هێنانە ئارای ئەقڵێکی نوێیە کە لەگەڵ جەوهەری شارستانیەتی نوێ و سەردەمی مۆدێرندا بگونجێت. بەڵام ئەم پرۆسەیە روندادات بەبێ رەخنەگرتن لەوەی رۆشت و رویدا. لێرەوە زۆربەی ئەو رەخنانە ئاراستەی ئەقڵی کۆن دەکرێت، یان لانی کەم روبەروی ئەو ئەقڵە دەبێتەوە کە بووە مایەی پەکخستنی ئەقڵ (ئەقڵ وەکی ئەوەی لای هیگڵ و کانت هەیە)، نمونەی ئەو پەکخستنەش دەشێت لە مارکسیزمدا بیبینین کە لە یەکێك لە قۆناغەکانیدا بە ستالینیەت گەیشت.

لێرەدا نابێت ئەوەمان لە بیر بچێت کە بیرکردنەوەی زۆربەی زۆری بیریاران و ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، لە چوارچێوەیەکی مارکسیستی و ماتریالیزمیانەدا بوو، بەڵام بە رۆح و دنیابینیەکی رەخنەگرانەوە. واتە ئەوان مارکسیستیان بە شێوە دۆگماتیستیەکەی پەیرەونەکردبوو، هاوکات چەمکی (عەقڵ)یشیان بە مانا هیگڵیەکەی وەرنەگرتبوو، چونکە دواجار ئەقڵ لای «هیگڵ» بوو بە ئامێرو ئەقڵێکی پەتی، کە دەکرا بەکار بهێنرێت یاخود وازی لێبهێنرێت یان وەکی ئامێر و ئامرازێك کاری پێبکرێت.

گرنگی دانی من بەم کتێبە لەلایەك لەبەر ئەمە بوو، لەلایەکی دیش لەبەر ئەوە بوو کە بە یەکێك لە سەرچاوە گرنگ و دەگمەنەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ئەژمار دەکرێت. ئەڵبەت لە دوای نەوەی «هۆرکهایمەر» و «ئەدۆرنۆ»وە، چەندین لێکۆڵیار و بیرمەندی تر لە قوتابخانەی فرانکفۆرتدا دروست بوون، کە دواهەمینیان رەنگە «یۆرگن هاپرماس» بێت. «هابرماس» تا ئێستا لە ژیاندایە و لە ئەڵەمانیادا سەرقاڵی کارو چالاکیەکانی ئەو قوتابخانەیە و ئەو کورسیە فەلسەفی و کۆمەڵایەتیەیە کە بۆ ئەوان تەرخان کراو تا ئێستاش لە حەرەمی زانکۆی فرانکفۆرتدا وەکی خۆی ماوە.

## گرێدانەوەی ئەقڵ بە واقیع و فەلسەفە بە کۆمەڵناسیەوە.

کتێبی (دیالەکتیکی رۆشنگەری) لە چەندین بەش پێکهاتووە، ئەڵبەتە بەشی یەکەمی باس لە چەمکی رۆشنگەری دەکات. وەکی چەمك رۆشنگەری لە «کانت»ەوە دێت، کاتێك وتارێکی لە ژێر سەردێری (رۆشنگەری چییە) نوسی و تێیدا هاتووە کە: (رۆشنگەری ئامرازی خۆ قوتارکردنە لە دەست کۆیلەیەتی و جادوبازی و ئەو دنیابینیە تاریك و ئەنگوستە چاوەی تەوقی جیهانی داوە و ئێمەش دەبێت بەپێی ئەوە سەیری دنیا بکەین). ئەمە دیدگای «کانت» بوو بۆ رۆشنگەری لە سەرەتاکانی سەردەمی رۆشنگەریدا، بەڵام ئەم ئەقڵە لەگەڵ «کانت» و بەتایبەتیش لەگەڵ «هیگڵ»دا، بە جۆرێك لە ئەقڵانیەتی پەتی گەیشت کە لە فەلسەفەدا پێی دەوترێت (ئەقڵی ئایدیالی). فەلسەفەی رەخنەیی رەخنە لە ئەقڵی ئایدیالی دەگرێت، واتە رەخنە لەو ئەقڵە دەگرێت کە ئەقڵێکی پەتییە، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەم ئەقڵە بە واقیعەوە گرێ بدات. بۆ ئەوەی حەقیقەت وا وێنا نەکرێت کە حەقیقەتێکی ئایدیالیەو تەنها دەکرێت لە رێی ئەقڵەوە پەی پێببرێت، بەبێ ئەوەی هیچ لینك و پەیوەندیەکی بە واقیعەوە هەبێت.

لێرەوەیە کە دەبینین لە فەلسەفەی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا، یەکانگیری و پەیوەندیەکی توندوتۆڵ لە نێوان فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا هەیە. ئەوان پێیان وایە گەر فەلسەفە گەران بێت بە دوای حەقیقەتدا، دەبێت ئەو حەقیقەتە بە واقیعەوە گرێ بدرێت. کەواتە ئاشنابوون بە واقیع بەبێ کۆمەڵناسی دەسگیرنابێت. ئەمە بیرۆکەی سەرەکی کتێبی (دیالەکتیکی رۆشنگەری)یە، بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین کە بەشە جیاجیاکانی کتێبەکە لەوەش زیاتر دەروات و باس لە شتگەلێکی گرنگتر دەکات.

ئەڵبەت هەندێ بەش و پەرەگرافی کۆتایی کتێبەکە باس لە کۆمنیکاشیۆن و تەنهایی و گۆشەگیری دەکات. باس لەوە دەکات کە ئەگەرچی ئامرازەکانی هاتوچۆ و پەیوەندی بەستن و بەیەك گەیاندن، بۆ نزیك کردنەوەی مرۆڤەکانە لە یەکتری، بەڵام بۆتە ئامرازێك بۆ تەنهایی و دورکەوتنەوەی ئینسانەکان. لەمبارەیەوە

ئەم نمونەیە باس دەکەن: (دەیان کیلۆمەتر دەبڕین و پارەیەکی زۆر بە خەرج دەدەین بۆ ئەوەی لە کافێ و چێشتخانەیەکدا دانیشین و یەکتر ببینین. هەمان قسە دووبارە دەکەینەوە و دواتر هەر کەس بەلایەکدا دەڕوات، وەکی ئەوەی هیچ نەبووبێت).

ڕاستە ئەو ئامرازی پەیوەندیانە توانیویەتی کۆمان بکاتەوە، بەڵام نەیتوانیوە مانایەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو بە کۆبوونەوەو دیدەنیەکانمان ببەخشێت. «هۆرکهایمەر» و «ئەدۆرنۆ» دوای ئەوەی باس لە بایەخ و گرنگی کەناڵەکانی پەیوەندی و ڕیکلام و ڕادیۆ و.. هتد، دەکەن، ئاماژە بۆ ئەوەش دەکەن کە قسە و باسەکان لە ئۆتۆمۆبێلێکەوە بۆ ئۆتۆمۆبیلێکی دی جیاوازی لە نێوانیاندا نییە و یەك شتن: (قسە و باسی ناو هەموو خێزان و خانەوادەیەك بەرژەوەندی عەمەلی بەسەریدا زاڵە، هەموو خێزانێکیش بەشێك لە پارەو پولی مانگانەی بۆ کرێ خانوو و چونە سینەما و جگەرەکێشان تەرخان دەکات.. ئامارەکان باس لەوە دەکەن کە بابەتی قسەکردنەکان بەپێی جۆر و مۆدێلی ئۆتۆمۆبیلەکان دەگۆڕێت.. سەروەختێك ڕۆژانی یەك شەممە خەڵکانێك لە چێشتخانەیەکدا یەکتر دەبینن و کۆدەبنەوە، چێشتخانەیەك کە جۆری خواردەمەنیەکانی و هۆڵ و ژورو نرخەکانی لەیەك دەچن، زیاتر و زۆرتر حاڵی دەبن کە هەموویان لە تەنهاییاندا لە یەك دەچن، واتە ئەو پەیوەندیانە لێکچون و هاوشێوە بوون لە ناو مرۆڤەکاندا دروست دەکات، ئەویش لە ڕێی تەنهایی و گۆشەگیری مرۆڤەکان خۆیانەوە).

ئەم کتێبە بڕگە و پەرەگراف جوانی تێدایە کە دەربارەی ڕەخنەگرتنە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و بۆ ئەمڕۆش دەست دەدات. میدیا لەگەڵ ڕادیۆدا و لە سەردەمی «هتلەر»دا دەبێتە میدیایەکی جەماوەری، هەموو ماڵ و مەنزڵێك چاوەڕێی ئەوە دەبن بزانن ڕادیۆکان چی دەڵێن. لەو سەردەمەدا بێژەری ڕادیۆکان بەدرێژایی ڕۆژ تەواوی هاوڵاتیانیان بەدیار خۆیانەوە ماتڵ دەکرد. ئەمەش هەر بۆ ئەوە نەبوو بزانن سەرۆك دەڵێت چی یان گوێ لە ڕینومایییەکان بگرن یاخود بۆ ئەوە بووبێت کە کۆمەڵگە لە دۆخی شەڕدا بوو، نەخێر لەبەرئەوە بوو، چونکە ڕادیۆ لەو سەردەمانەشدا وەکی ڕادیۆ و ڕاگەیاندنەکانی ئەمڕۆ، بە درێژایی ڕۆژ پێشبڕکێیان هەبوو، پەیوەندیمان پێوە بکەن و خەڵات دەبەنەوە. تەنانەت لە ڕۆژگاری هتلەریشدا ڕادیۆ لەو جۆرە هەواڵ و خەڵاتانەی پێشکەشی ئەوانە دەکرد کە پەیوەندیان پێوە دەکرد و مەتەڵەکانیان دەزانی. لێرەوە دەبینین ڕادیۆ وەك دەزگایەکی ڕاگەیاندنی تاك و تەنها لە قۆناغێکی دیاریکراودا توانیویەتی جەماوەر کۆنترۆڵ بکات، واتە خەڵك ئالودەی ئەو دەزگایەی ڕاگەیاندن بوون.

ئەم کتێبە دەیەوێت لە میتافیزیکاوە ئایدیۆلۆژیا و ئەفسانەوە بمانبات بەرەو کۆمەڵایەتی بوون. واتە نەسکی ئەفسانە لەم کتێبەدا، دەیەوێت پێمان بڵێت: ( ئەو قارەمانە ئەفسانەییە وەکی مرۆڤ ڕەفتاری کردووە، نەك وەك بونەوەرێکی ئەفسانەیی). لێرەوە ئەم کتێبە دەتوانێت دنیابینی فەلسەفی وامان پێ ببەخشێت کە بە کەڵکی هەموو کات و شوێنێك بێت، واتە ئەم کتێبە تا ئێستاش بایەخ و گرنگی خۆیی هەیە، چونکە ئەو ئیشکالیاتانە باس دەکات کە تا هەنوکەش ئێمە سەروکارمان لەگەڵیدا هەیە و پێیانەوە خەریکین.

کتێبی دیالەکتیکی ڕۆشنگەری کە چەند سەرەقەڵەمێکی فەلسەفیەو «مارکس و هۆرکهایمەر» و «تیودۆر ئەدۆرنۆ» نوسیویانە، لەم بەشانە پێکهاتووە:

-ئەفسانەو ڕۆشنگەری.

-ڕۆشنگەری و مۆراڵ.

-ڕۆشنگەری و چەواشەکردنی جەماوەر.

-سنوری ڕۆشنگەری .

-وەرگۆڕانی ئایدیا بۆ ئەفسانە.
-دەربارەی تیۆریای تارماییەکان.
-پیسکۆلۆژیای ئاژەڵ.
-لە پێناو ڤۆڵتێردا.
-گۆشەگیری لە ڕێی ئامرازەکانی پەیوەندیەوە.
-ڕەخنە لە فەلسەفەی مێژوو.
-پەیکەرەکانی مرۆڤایەتی.
-نرخی پێشکەوتن.
-ترسی بەتاڵ.
-گرنگی جەستە.
-کۆمەڵگەی جەماوەر.
-فەلسەفە و دابەشکردنی کار.
-مرۆڤ و ئاژەڵ .
-پڕوپاگەندە.
-دروستبوونی گەمژەیی.

**سەرچاوە:**

WWW.ALJAZEERA.NET

سازدانی: مەمدوح ئەلمهینی
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

# دەربارەی سەردەمی ڕۆشنگەری
# گفتوگۆیەك لەگەڵ هاشمساڵح

ڕەنگە هیچ کەسێك نەبێت وەك بیرمەندی بە ئەسڵ سوری «هاشم ساڵح» بتوانێ وەڵامی پرسیارە گرنگەکان بداتەوە کە دەربارەی واقیعی فیکریمانە. ئەو شایەنی ئەوەیە بۆ نمونە وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە بداتەوە: کەی کاتی ڕزگاربونی فیکریمان دێت؟ کەی عەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست تێدەپەڕێنین؟ کەی دەچینە ناو تازەگەرییەوە؟

ئەم بیرمەندە خاکیو سادەیە کە خاوەنی شێوازێکی ئاسانەو نزیکە لە دڵەوە، زیاد لە سی ساڵە ڕۆچووەتە ناو قوڵایی ئەم کێشە جەوهەرییەوە، کێشەیەك نەك تەنها بەڵای موسڵمانەکانەوە شوێنی بایەخە، بەڵکو بەلای هەموو جیهانیشەوە شوێنی بایەخو گرنگیپێدانە. «هاشم ساڵح» کاتێ باس لە بارودۆخی عەرەبی دەکاتو بەراوردی دەکات بە ڕۆشنگەری ئەوروپی، ئەوا لە گۆشەیەکی سەرنجراکێشەوە ئەو کارە دەکات. «هاشم ساڵح» جیهانی عەرەبیو ئیسلامی بە هەمان ئەو ئاقارەدا دەبات کە لە مێژوی ئەوروپادا ڕویداوە، بە شێوەیەك ئەوانەی بە وردی نوسینە قووڵو سیحراویەکانی دەخوێننەوە، واهەستدەکەن لە ئەوروپای کۆندا دەژینو دەپرسن: کوا ڕۆشنگەرەکانمان!.

«هاشم ساڵح» لە میانەی کتێبەکانی یاخود لە میانەی وەرگێڕانەکانی بۆ کتێبەکانی بیرمەند «محەمەد ئارکۆن»و لە میانەی ئەو لێکدانەوەو پەراوێزانەی بۆ ئەو کتێبانەی نوسیوە یان لە میانەی ئەو وتارو ڕانانی کتێبانەی کە خوێندنەوەیان بۆ دەکات، دەمانخاتە ناوەندی ململانێی ئەم دراما مەلحەمییەی نێوان عەقڵو هێزی تاریکی. بێگومان ئەو یەکێکە لە جەنگاوەرەکانی ڕۆشنگەری کە سوارچاکێکی شارەزاو لێهاتوی مەیدانەکەیە. مێژوو وەك تاقە گەنجێکی سوری باسی دەکات کە ڕۆشت بۆ پاریس تاکو ببێت بە شاعیرو ڕەخنەگر، بەڵام بوو بەیەکێك لەو پیاوانەی لە جەنگە سەختو

دژوارەکەی ڕۆشنگەری‌و ڕێنیسانسدا پیربوو. ئەمەی خوارەوە چەند بەشێکی ئەو چاوپێکەوتنەیە.

*** بەشێوەیەکی پتەو ناوت بە ڕۆشنگەرییەوە پەیوەستە، ئایا دەکرێ دەربارەی سەرەتای ئەو پەیوەستبونە قسەمان بۆ بکەیت؟**

- لەو بڕوایەدام ئەم پەیوەندییە هەر لە منداڵییەوە دەستپێدەکات. زانستی ئاینم لە ڕێگەی تەلقینەوە لە باوکم‌و لە کۆمەڵگاو لە ژینگەوە وەرگرت، بەبێ هیچ گفتوگۆو پرسیارکردنێك. کاتێ گەورەبووم، هەستمکرد لەنێوان خوێندنی تازە کە لە ناوەندی‌و پاشان لە زانکۆ لە سوریا وەرمگرت، لەگەڵ پەروەردەی ئاینی تەقلیدی کێشەیەك هەیەو کۆمەڵێك ناکۆکی گەورە لەنێوانیاندا هەیە. ئا لەو ساتەوەختە زووەوە پرسیارەکان سەریانهەڵدا. پاشان دەستمکرد بە خوێندنەوەی نوسەرانی میسرو لوبنان، وەك «تەها حسێن»، «عەباس مەحمود عەقاد»، «جەبران خەلیل جەبران»، «میخائیل نەعیمە». دواتر هەوڵمدا لەو چوارچێوە تەسکەو لەو پەروەردە تەقلیدییەم بێمەدەرەوە. من نکۆڵی لەوەناکەم ئەو پەروەردە تەقلیدییە هەندێ لایەنی ڕۆحی‌و ئەخلاقی پۆزەتیڤی بۆ من تێدابووە، من ئەو لایەنانە وەك توێشویەك (زادێك) حسابیان بۆ دەکەم‌و هەرگیز دەستبەرداریان نابم‌و تاکو ئێستاش لە ناوەوەی خۆمدا هەڵمگرتوون. هەروەها فەیلەسوفانی ڕۆشنگەریش لەلایەنی ئەخلاقییەوە کۆمەکیان کردم، گەر کارێکی باشەت ئەنجامدا، وەك ئەوە وایە بۆ هەمو مرۆڤایەتیت ئەنجامدابێت، یاخود وەك چۆن پێت خۆشە خەڵکی چاکەت لەگەڵدا بکەن، پێویستە بەهەمان شێوە خۆشت چاکە لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا بکەیت. لەو بڕوایەدام ئالێرەوە پێویستیم بە ڕۆشنگەری هەبوو، تاکو بتوانم کێشەکانم‌و پرسیارە تایبەتییەکانم چارەسەر بکەم.

*** ئایا ئەم خوێندنە تەلقینییە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر کەسایەتیت هەبووە کە زۆر پەرۆشی ڕۆشنگەری‌و مەیلە ڕزگاریخوازانەکەی ڕۆشنگەریت؟**

- بەڵێ، هیچ گومانێك لەوەدا نییە، بەڵام دواتر ئەمە بەگوڕوتینێکی زیاترەوە دەردەکەوێت. کاتێ لە ساڵی ١٩٧٦ سوریام بەجێهێشت، شەپۆلی فێندەمێنیتالیزم لە جۆری (خومەینیزم)و (ئیخوانەکان)و جۆرەکانی دیکەی فێندەمێنیتالیزم دەستیپێکرد. هەستمکرد ئەو شەپۆلانە هەڕەشە لە خودی کۆمەڵگا دەکەن‌و کۆمەڵگا توشی دابەشبوون دەکەن، دابەشبونی عەرەب لەنێوان موسڵمانەکان‌و مەسیحییەکان‌و دابەشبونی نێوان سونە‌و شیعە. ئەمە کێشەیەکی هێجگار گەورەبوو، پێویستی بە دەستنیشانکردن‌و چارەسەرکردن هەبوو. کاتێ گەشتمە فەرەنسا، کۆمەڵێ پرسیار دەربارەی کەلتوری ئیسلامی لە قوڵایی ناخمدا دەهاتن‌و دەچون‌و گێنگڵیان دەدا. دەمپرسی ئاخۆ مانا مێژووییەکەی وشەی ئیسلام چییە، هەروەها مانا مێژووییەکەی قورئان چییە، ئەی مانای ڕەخنەی فەلسەفی لە ئاین چییە؟ لە ڕاستیدا هەمو ئەم پرسیارانە لەپێناو وەڵامدانەوەی قەیرانەکانی واقیعی عەرەبی‌و ئیسلامیدا بوو کە تا هەنووکەش ئەو قەیرانانە لە بەرزبونەوەدایە.

خۆشبەختانە لە زانکۆی سۆربۆن بەرێکەوت مامۆستا «محمەد ئارکۆن»م ناسی، ئەو لە سۆربۆن مامۆستا بوو. من لەم سەردەمەدا «محەمەد ئارکۆن» بە گەورەترین بیرمەندی ئیسلامی، بەمانای فەلسەفی وشەکە دادەنێم. هەروەها خۆشبەختانە ئەو سەرپەرشتی تێزی خوێندنەکەمی کرد. لە سەرەتادا ئامانجی من ئەوەبوو خوێندنەکەم تایبەت بێت بە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، چونکە خۆم ئەوکات شاعیر بووم‌و پەیوەندییەکی ئەوتۆم لەگەڵ فەلسەفەدا نەبوو. بەڵام کاتێ لە فەرەنسا ئەو گفتوگۆ فیکرییە قووڵ‌و بەهێزەم دەربارەی ئیسلام بینی، گفتوگۆیەك تێدا تیشکێکی فەلسەفیانە دەخرایە سەر لایەنە مێژوویی‌و ئەدەبی‌و زمانەوانی‌و کۆمەڵایەتیەکانی کەلتوری ئیسلامی، بەخۆمم وت مەبەست‌و مەرامی خۆمم دۆزییەوە. لە هەمانکاتدا

هەستمکرد ڕەخنەی ئەدەبی لە سنورێکی دیاریکراودا دەمێنێتەوە، لێرەوە ئەرکی سەرشانم بووە ئەرکێکی فیکری‌و ڕۆشنگەریانە. لەو بڕوایەدام ئەو گۆڕانە لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە ڕوویدا.

*** پێش ئەوەی بچیت بۆ فەرەنسا، ئایا هیچ بایەخێکت بە ڕۆشنگەری داوەو ڕەخنەت لە فیکری ئاینی گرتووە؟**

- لەو کاتەدا زۆربەی بایەخدانەکانم ئەدەبی بوون. سەرەتای نوسینم لەسەر ئاین دوای گەیشتنم بوو بۆ فەرەنسا. یەکەم وتاری ئاینیم کە نوسیم لەسەر خودی «محەمەد ئارکۆن»بوو، گۆڤاری (المعرفە)ی سوری بڵاوی کردەوە، ئەمە ناونیشانی وتارەکەم بوو (گەشتێك بە فیکری محەمەد ئارکۆن دا... بەرەو ئارکۆلۆجیایەکی ڕیشەیی فیکری ئیسلامی)، من لەبەرئەوەی لەو سەردەمەدا نەناسرابووم، دەترسام وتارەکەم بڵاونەکرێتەوە، ئەمە لە ساڵانی هەشتاکاندا بوو، لەو کاتەدا تەمەنم نزیکەی ٣٠ ساڵ بوو. بڵاوبونەوەی وتارەکەم بە شێوەیەکی جوان لە گۆڤاری (المعرفة)ی سوریدا، بەلای منەوە شوێنی سەرسوڕمان بوو. لەو چرکەساتەوە دەستم کرد بە ناساندنی ئەم فیکرە ڕۆشنگەرە دەربارەی ئیسلام، فیکری پێگەیشتوی «محەمەد ئارکۆن». نارەوابوو فیکری «ئارکۆن» لە سۆربۆندا بمێنێتەوە. ئەو فیکرە بۆ ئێمەیە نەك بۆ فەرەنسییەکان یاخود بۆ ڕۆژئاوا نییە، ڕۆژئاوا فەیلەسوف‌و بیرمەندی خۆی هەیە. ئێمە پێویستیمان بەو بیرمەندانە هەیە کە ئەم جۆرە میتۆدە تازانە بەکاردەهێنن‌و دەزانن چۆن چۆنی بەسەر کەلتوری عەرەبی‌و ئیسلامیدا پراکتیکی بکەن.

*** لە یەکێك لە نوسینەکانتدا باسی ئەوەت کردووە گەر فێری زمانی فەرەنسی نەبویتایە، ئەوا هەمو ڕێڕەوی ژیانت دەگۆڕا! هەروەها باسی ئەوەت کردووە ڕۆشتنت بۆ فەرەنسا لەسەر ئاستی فیکری‌و تەنانەت لەسەر ئاستی ویژدانیش، بریتییە لە دابڕانێکی گەورە.**

- لە ڕۆژی ١٩٧٦/١٠/٨ گەشتمە فەرەنسا، هەنووکە نزیکەی ٣٢ ساڵە من لەم وڵاتەم. تا ئێستا ئەو بەرواره‌م زۆرباش لەبیرە، ئەوە بەرواری لەدایکبونی دووەممە، چونکە پاریس شاری ڕوناکی‌و زانست‌و فیکری ڕۆشنگەرو فەلسەفەکانە، جگە لەوە شاری بزوتنەوە فیکری‌و فەلسەفییەکانی وەك بونیاتگەری‌و سوریالییەت‌و ئەوانی دیکەیە. ئەمە سەرەڕای ئەو ئازادییە فیکرییەی تێدایە، سەرەڕای زانکۆکان‌و کتێبخانەکان‌و زمانە تازەگەرەکەی. لەبیرمان نەچێت کۆمەڵێك زانستی زۆر هەیە، لە زمانی عەرەبیماندا بوونیان نییە. بۆ نمونە لە زانکۆکانی مەغریبدا هەندێ زانست بە زمانی فەرەنسی دەوترێتەوە، لە وڵاتانی کەنداو هەندێ بابەتی زانستی بە زمانی ئینگلیزی دەخوێنرێت، ئەمەش لەسەرمان فەرزدەکات لەپێناو گواستنەوەی زانستی تازە بۆ جیهانی عەرەبی، هەستین بە بزوتنەوەیەکی وەرگێڕانی گەورەو فراوان، چونکە لە زمانی عەرەبیماندا بۆ هەندێ لە زانستەکان هیچ سەرچاوەیەکمان نییە. ئەمەش کارێکی نەشیاوە، کارێکی نەشیاوە ئەو زانستە تازانە دووربێت لە زمانی عەرەبییەوە کە زمانێکی مێژوویی مەزنەو لەڕابردودا چەندین شارستانییەتی دروستکردووە، مەعقول نییە زمانی عەرەبی لەبواری زانستدا ببێتە زمانێکی پەراوێزخراو، تەنها ببێتە زمانی ئەدەب‌و شیعرو فقهو پەخشان. بگرە پێویستە زمانی عەرەبی ببێتە زمانی فیکرو فەلسەفەو ببێتە زمانی زانستی کیمیاو فیزیاو مێژوو ئەدەب‌و زانستە مرۆڤایەتییەکان. ئەمەش یەکێکە لە خەمە سەرەکییەکانم.

*** دوای گەشتنت بۆ فەرەنساو ناسینی محەمەد ئارکۆن، چ وەك وەرگێڕو چ وەك نوسەر دەستتکرد بە بەرهەمهێنانی ئەم پرۆژە گەورەیە کە پەیوەستە بە ڕۆشنگەرییەوە.**

- لە ڕاستیدا لە دوولاوە کارم دەکرد. لایەکیان بریتی بوو لە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی «محەمەد ئارکۆن» بەو پێودانگەی بیرمەندێکی عەرەبییە، لاکەی دیکەیان وەرگێڕانی فیکری فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری ئەوروپا بوو. گومانی تێدانییە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری ئەوروپا لە بەرهەمەکانیاندا تەرکیزیان لەسەر کەلتوری مەسیحی بووە. ڕاستە من هەستام بە گواستنەوەی تیۆرەکانی فەیلەسوفانی ئەوروپا لە نمونەی «ڤۆڵتێر»، «کانت»، «هیگڵ»و ئەوانی دیکە، ئەو فەیلەسوفانە تیشکیان خستبووە سەر کەلتوری مەسیحیو ڕوناکیان کردەوە، بەڵام من لە هەمانکاتدا ئەوەم گواستەوە کە چۆن «محەمەد ئارکۆن» تیشکی ڕۆشنایی فەلسەفەی مۆدێرنو زانستە مرۆڤایەتییەکان دەخاتە سەر کەلتوری ئیسلامیمان. لێرەوە من وەك ئەو کەسە وام بە بەردێك دوو چۆلەکە دەپێکێت. کاتێ کار لەسەر بەرهەمەکانی «ئارکۆن» دەکەم، چ بە وەرگێڕانی کارەکانی یاخود بە لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی نوسینەکانی، ئەوا کار لەسەر لایەنی عەرەبی ئیسلامی دەکەم. لەلایەکی دیکەوە کاتێ وتارەکانی خۆم دەنوسم یاخود کتێبەکانم بڵاودەکەمەوە وەك کتێبی (دەروازەیەك بۆ ڕۆشنگەری ئەوروپی) یاخود کاتێ خوێندنەوە (ڕانان) بۆ کتێبی دیکە دەکەم، لەو خوێندنەوانەدا بۆ نمونە باس لەوە دەکەم «ڤۆڵتێر» چۆنو بە چ شێوەیەك کەلتوری مەسیحی ڕوناککردۆتەوە، هەروەها باس لە بزوتنەوە گەورەکانی دیکەی ڕۆشنگەری دەکەم، پاشان دەستدەکەم بە بەراوردکردنی نێوان ئەو لێکۆڵینەوەو زانستو فەلسەفانە لەگەڵ یەکتر.

*** ئاشکرایە کتێبو وتارەکانت تەرکیز دەخەنە سەر ڕۆشنگەری ئەوروپی، بەڵام لە پێناو ئەوەی لە جیهانی ئیسلامیماندا شتێکی هاوشێوەی ئەوەی ئەوروپا ڕوبدات.**

- ئەو بیرمەندە مەزنانە پێشتر ئەوانیش بە بارودۆخێکی سەختو دژواردا تێپەڕیون، بۆ نمونە «ڤۆڵتێر» بەدەست هەڕەشەی کوشتنو تەنگپێهەڵچنینەوە ناڵاندویەتی، نزیکەی ٣٠ساڵی لە دەرەوەی پاریس بردوەتەسەرو نەیتوانیوە بۆی بگەڕێتەوە، هەندێجار لە ترسی برایانی مەسیحی خۆی شاردوەتەوە، چونکە ناوبەناو هەڕەشەیان لێکردووە. بە هەمان شێوە «جان جاك ڕۆسۆ» ڕوبەڕوی ناخۆشیو ئاستەنگی زۆر بوەتەوە، کتێبەکانی لە پاریس دەسوتێنران، وەك کتێبی (پەروەردە)و (پەیمانی کۆمەڵایەتی)و چەندین کتێبی دیکە لە کۆشکی (عەدل) لە پاریس سوتێنران. «ڕۆسۆ» دواجار دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتە ئەسڵیەکەی خۆی سویسرا، بەو هیوایەی لەوێ پارێزگاری لێبکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەوێش کتێبەکانی سوتێنرانو خۆشی ڕایکرد بۆ شاخەکان. لێرەوە ئەو بیرمەندانە وەك ئەوە وایە بە بیرمەندە عەرەبەکان بڵێن بۆچی قوربانی بەخۆشیو شادیو خۆشگوزەرانی خۆتان نادەن، پێویست ناکات ڕۆشنبیر لە خۆشگوزەرانیدا بێت. «جان جاك ڕۆسۆ» هەموو ژیانی خۆی لە پەراوێزداو لەسەر دەخلێکی مادی کەم بردەسەر، ئەمەش ڕێگەی ئەوەی لێنەگرت ببێتە فەیلەسوفێکی گەورە، فەیلەسوفێك توانی کۆمەڵێ فیکر بێنێتەئاراوە کە لێیانەوە شۆڕشی فەرەنسیو شۆڕشی ڕۆمانتیکی ئەڵمانی سەریانهەڵدا.

مەبەست لەم قسانەم ئەوەیە جەخت لەوە دەکەمەوە کە جیاوازییەکی مێژوویی لەنێوان ئێمەی عەرەبو موسڵمانو ئەوروپییەکاندا هەیە. گەر لەم جیاوازییە تێنەگەین، ئەوا ماندو دەبین، پێویستە لەوە تێبگەین زەمەنی عەرەبی ئیسلامی هەمان زەمەنی ئەوروپی نییە. من کاتێ لەلایەنی ئاینییەوە لەسەر کۆمەڵگاکەم دەنوسم کە ٢٠٠ ساڵ لە پاش پاریسەوەیە، چونکە لە ئەوروپادا ڕیفۆرمی ئاینیو ڕێنیسانس هاوکاتبوون لەگەڵ یەکدا. زۆرجار ناچارم ئەم بەراوردکارییە ئەنجامبدەم، چونکە من لە نێوان دوو جیهاندا دەژیم، من لە پاریس زیاتر ژیاوم تاکو لە سوریا. ٣٢ ساڵە لە پاریس دەژیمو ٢٦ ساڵ لە سوریا ژیاوم، هەروەها لەنێوان دوو زماندا دەژیم، وەك وەرگێڕێك لە نێوان زمانی فەرەنسیو زمانی عەرەبیدا دەژیم.

*** ئایا دەکرێ موسڵمانەکان بەبێ ئەوەی ڕەخنە لە کەلتورو لە رابردو بگرن، بڕۆنە ناو تازەگەرییەوە؟ بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەزمونی ئەوروپا، ئایا لەو بڕوایەدایت ئەوە مەرجێکی سەرەکییە بۆ چونەناو تازەگەری؟**

- لەم حاڵەتەدا پێویستە بیرمەند لەگەڵ خودی خۆیدا جەنگێك بەرپابکات، بیرمەند بۆ ئەوەی مەسەلەکان بە ڕووونی تێبگات، پێویستە لەگەڵ زاتی کەلتوریی خۆیدا بکەوێتە جەنگەوە. ئەم بابەتە «ڕێنییە دیکارت» لە کتێبی (وتارێك دەربارەی میتۆد) جەختی لەسەر دەکاتو دەڵێ: (من بۆ ئەوەی جیهانێك لەسەر ئەساسێکی تۆکمەو پتەو بە زانستی تازەو فەلسەفەی تازە بنیادبنێم، بڕیارم دا هەموو فیکرە پێشوەختەکان تێكوپێك بشکێنم). مەبەستم ئەوە نییە کەلتوری پێشوی عەرەبی تێکبشکێنین، ئێمە لەو کەلتورەوە هاتوینو ناتوانین کەلتورێکی عەرەبی ئیسلامی پانو فراوان تێکبشکێنین کە تەمەنی زیاد لە ١٤ سەدەیەو چەندین لایەنی ڕۆشنی تێدایە.

«محەمەد ئارکۆن» دەڵێ: دوای ئەوەی موسڵمانەکان چونەناو سەدەکانی پاشکەوتنەوە، گەورەترین کارەساتێك کە توشیان هات ئەوەیە لە ڕەوتی عەقڵانیو هیومانستی دابڕان کە لە سەدەی سێیەمو چوارەمی کۆچیدا لە گەشەکردنو پەرەسەندندابوو. لە ڕەوتی تەوحیدیو مەسکویەو ئیبن سیناو فارابیو جاحزو دەیان بیرمەندی دیکەی عەرەبو موعتەزیلە دابڕان. ئێمە بانگەشەی ئەوە ناکەین لە کەلتوری عەرەبی ئیسلامی داببڕێن، بەڵکو ئێمە بانگەشەی ئەو لایەنە ڕۆشنەی کەلتوری عەرەبی ئیسلامی دەکەین کە لەگەڵ دەستپێکردنی سەدەکانی پاشکەوتندا داپۆشرا. لەدوای ئەو پاشکەوتنەوەو تاکو ڕۆژی ئەمڕۆ، تەنها جەخت لەسەر لایەنەکەی دیکەی کەلتوری عەرەبی ئیسلامی دەکرێت، لایەنی فێندەمێنیتالیزم، تەنها خوێندنەوەیەکی حەرفیانەی قورئانی پیرۆز دەبینین، هەڵخلیسکانی عەقیدەو دژایەتیکردنی عەقڵو فەلسەفە دەبینین. ئەم شتە لەسەردەمی زێڕینو گەشەکردوی کەلتوری ئیسلامیدا نەبووە، ئێمە دەڵێین پێویستە کار لەسەر لایەنی ڕۆشنی کەلتور بکەین، نەك تەنها ئەو لایەنەی فێندەمێنیتالیستەکان بۆ دژایەتی کردنی عەقڵو فەلسەفە بەکاریدەهێننو ئیشی لەسەر دەکەن.

*** بەم دوایانە کۆمەڵێ بیروڕا دەرکەوتونو دەڵێن بۆ زامنکردنی ئایندە مەرج نییە ڕەخنە لە ڕابردوو بگیرێت، چونکە هەندێجار فاکتەری ئابوری بەخێرایی باز بە کۆمەڵگاکان دەدات بەرەو پێشکەوتن، وەك ئەوەی لە زۆر شوێندا ڕویداوە. هەندێجاری دیکە فاکتەری سیاسی کە لەسەر عەلمانییەتێکی پەرگیر ڕاوەستاوە، وەك ئەوەی لە تورکیا ڕویدا، یارمەتی پێشکەوتن دەدات بەبێ ئەوەی بە ڕەخنەگرتنی کەلتوردا تێپەڕێت.**

- لەو بڕوایەدانیم ئەمە بتوانێ ڕۆڵی تەواو ببینێت. بێگومان بواری ئابوریو سیاسی لە پێشکەوتندا ڕۆڵێکی گەورە دەبینن، بەڵام ئاشتبونەوە لەگەڵ کەلتوردا کارێکی ئیجبارییە. تەنانەت لە تورکیاشدا سەبارەت بە ڕەخنەگرتن لە کەلتور کاری زۆر کراوە. بۆ نمونە موفتی ئەستەنبول پێشوازی لە پاپای ڕۆما کردو داوایکرد موسڵمانەکانیش لە ڕێگەی ڕەخنەی فیکرییەوە لە شارستانیەتی جیهانیدا بەشداربن. بەڵام ئەوانەی دەڵێن: ئەوەتا یابان بەبێ ئەوەی بیرمەندی هەبێت، هەستاوەتەوەو پێشکەوتووە. من بەوانە دەڵێم لە یاباندا کۆمەڵێ زاناو فەیلەسوفو بیرمەند هەیە سەرقاڵی گفتوگۆو مشتومڕن لەسەر تیۆرەو فیکرەکان. لە یابان خەڵکانێك هەیە دەستبەرداری عەقیدەی ئیمپراتۆری پیرۆز بوونو پرسیارێکی زۆر دەربارەی کەلتوری ئاینی یابان دەخەنەڕوو. لێرەدا پێویستە جەخت لەوە بکەمەوە کە دوای پرۆسەی ئاشتبونەوەی مێژوویی لەگەڵ ئاینو کەلتور، خەڵکی نابێت لە ئاینو لە کەلتورەکەی بترسێت. پراکتیزەکردنی میتۆدە تازەکان بەسەر ئاینو کەلتوردا نابێتە هۆی ڕوخاندنو لەناوبردنیان، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی وەك

حەقیقەتێکی پرشنگدار دەربکەون، ئیدی لەو بەرگو تۆکڵە ڕزیوانەی ڕزگارمان دەبێتو پەیوەندی بە شتە ڕۆشنو پرشنگدارەکانی ناویەوە دەکەین، پەیوەندی بۆ نمونە بە ئیبن سیناو ئیبن عەرەبیو ئیبن خەلدونو ئیبن ڕوشدو موعتەزیلەو فەیلەسوفەکانو ڕۆحانییەکانەوە دەکەین. بەداخەوە خەڵکی لەوە دەترسن ئاین کۆتایی پێبێت، کەچی بە پێچەوانەوەیە ئاین کۆتایی پێنایەت، بەڵکو بە شێوەیەکی تازەی پرشنگدارتر دەردەکەوێتەوە. پاشان خەڵکی تێدەگەن کە تێگەشتنێکی دیکە بۆ ئاینی ئیسلامو بۆ کەلتورەکەمان هەیە، من نازانم ئەم هەمو ترسە بۆچی.

*** بەوپێیەی ئاگاداری ئەزمونی ڕۆشنگەری ئەوروپیتو هەروەها بەو پێیەی ئاگاداری ئەزمونی عەرەبی ئیسلامیت، ئاخۆ لە ئێستادا لە کوێی پرۆسەی ڕۆشنگەری چاکسازییدا ڕاوەستاوین، ئایا ئێمە لە قۆناغی تۆما ئەکوینی یان مارتن لۆسەر یاخود دیکارت داین، یان چیمان کردووە؟**

- لەنێوان ئێمەو ئەوروپییەکاندا جیاوازییەکی مێژویی هەیە لەوانەیە زیاد لە ٣٠٠ ساڵ بێت. ئێمە بەیەکجار هەموو سەدەکان پێکەوە دەژین، هەندێجار بیردەکەمەوەو دەڵێم کۆمەڵێ توێژ لە جیهانی عەرەبیدا هەیە ئەوەندە تەقلیدین، لە قۆناغەکانی پێش سەدەکانی ناوەڕاستدا دەژین. هەروەها پەیمانگای تەقلیدیو کۆلیژەکانی شەریعەو ناوەندی زانکۆیی تەواو داخراومان هەیە. کاتێ قسە لەگەڵ ئەوانەدا دەکەیت، وا هەستدەکەی ٥٠٠ ساڵ گەڕاویتەتەوە بۆ دواوە. بەڵام کاتێ دەڕۆیتە زانکۆیەکی مۆدێرنەوەو کۆمەڵێ ڕۆشنبیری عەلمانی یاخود لیبرالی دەبینیت کە قسە لەسەر مۆدێرنەو پۆست مۆدێرنە دەکەن، پێت سەیرە. لێرەوە ئێمە بەیەکجار هەموو سەدەکان پێکەوە دەژین، بە یەکجار قۆناغی پەرینەوە گەورەکەی شارستانییەت دەبڕین، واتە بەیەکجار ئەو قۆناغی گواستنەوە سەختە دەبڕین کە دەکەوێتە نێوان تێگەشتنی تەقلیدی بۆ کەلتوری ئاینی لەگەڵ تێگەشتنی تازە بۆ هەمان کەلتوری ئاینی. قۆناغی نێوان تێگەشتنی تەوەکولی بۆ کەلتور لەگەڵ تێگەشتنێکی پێگەیشتوی تەئویلیو ڕۆشنگەر بۆ هەمان کەلتور. ئەم قۆناغە قۆناغێکی سەختو دژوارەو هەندێجار خوێنی لێدەچۆڕێتو ڕوبەڕوی هەژانی گەورە دەبێتەوە. ئەوەیە ئێمە لەمڕۆدا دەیبینین. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە وایدابنێین ئەم قۆناغە قۆناغێکی سروشتییە، چونکە ئەم قۆناغە لە قوڵایی ناخماندا پەنگی خواردوەتەوەو ئێمە چاوەڕوانی بوین لە هەر ڕۆژو ساتێکدا بێت بتەقێتەوە، ئەوەتا ئێستا تەقیوەتەوە.

وەلێ بەلای کەمەوە پێویستە لەسەرمان لە ڕێگەی فیکرێکی تازەوە بەرپرسیارەتی ئەو تەقینەوەیە بگرینە ئەستۆ، فیکرێکی عەقڵانی ڕێزی ئەزمونی ئاینی بگرێت، لەهەمانکاتدا ڕێزی مافەکانی عەقڵو فەلسەفەش بگرێت. کاتێ دەبینم پاپای ڕۆما، لێرە لە پاریس، لەبەردەم کەسایەتییە فەرەنسییەکاندا قسە دەربارەی عەقڵو ئیمان لەلای مەسیحییەکان دەکات، هەستدەکەیت کەسێکە ئاگاداری فەلسەفەی گریکیو فەلسەفەی ئەڵمانییە. کەچی زۆر بەداخەوە پیاوانی ئاینی لای ئێمە، هیچ یەکێکیان یەك کتێبیان لەسەر فەلسەفە نەخوێندوەتەوە. ئا لەبەرئەمەیە دەڵێم دەبێ زانستی فەلسەفە بۆ نمونە لە کۆلیژەکانی شەریعە یاخود لە پەیمانگا تەقلیدییەکان یان لانی کەم لە زانکۆ مۆدرێنەکاندا بخوێندرێت.

*** ڕۆشنگەری ئەوروپیو ڕیفۆرمی ئاینی لە ڕێگەی پیاوانی ئاینی کڵێساوە دەستیپێکرد، بە نیسبەت ئێمەوە ئایا پیاوانی ئاینیمان هەیە بتوانن هەستن بەکاری ڕیفۆرم لەنێوان عەقڵو ئیماندا؟**

- لەم بوارەدا دەکرێ ناوی «حەسەن حەنەفی» بێنین گەر وەك پیاوێکی ئاینی دایبنێین، ئەم پیاوە لە فەرەنسا ئەترۆحەیەکی دەربارەی مەسیحییەکانو لیبرالییەکان نوسی، ئەم کارەی وەك کارێکی «جاك

جیکتۆن»ی فەیلەسوف وابوو کە فەیلەسوفێکی مەسیحییە. لێرەوە «حەسەن حەنەفی» دەستیکرد بە نوسین لەسەر چەپی ئیسلامی، ئەمەش وایکرد ببێتە فەیلەسوفێکی موسڵمان. دەکرێ «حەسەن حەنەفی» وەك «تۆما ئەکیونی»و «مارتن لۆسەر» تەماشا بکەین. «حەسەن حەنەفی» دەتوانێت رۆڵی رەخنەگرێك ببینێت لە نێوان پیاوانی ئاینیو فەیلەسوفەکان. جگە لە «حەسەن حەنەفی» لە مەغریب «محەمەد عەبدالعزیز ئەلحبانی» هەیە، ئەم پیاوە لەسەر فەلسەفەی (الشخصانیە الاسلامیە) نوسی وەك ئەو فەلسەفە (شەخصانیە مەسیحییەی) لە فەرەنسادا هەیە. کەسایەتییە مەسیحییەکانی فەرەنسا لە نمونەی «مانوێل مۆنییە»و ئەوانی دیکە، ویستیان مەسیحیەت لەگەڵ مۆدێرنەدا ئاشتبکەنەوە. ئەوانە بانگەشەی ئەوەیان نەدەکرد واز لە ئاینی مەسیحی بێنن، چونکە ئەو ئاینە عەقیدە مێژوییەکەیانە، وەك چۆن ئیسلام عەقیدە مێژوییەکەی ئێمەیەو ناتوانین دەستبەرداری ببین، بەڵام دەتوانین بە عەقلانی بکەین.

پیاوانی ئاینی مەسیحی ئاینی مەسیحیان بە عەقلانی کرد، تا وایلێهات لەسەدە تازەکاندا بە ئاسانی لە ئاینی مەسیحی بگەیت. ئێمەش لەلای خۆمان ئەمەمان دەوێت، دەمانەوێت ئەمە ببێتە دەستپێکێك بۆ قۆناغی گواستنەوە کە تاکو ئێستا لەسەرەتاکەیداین‌و تاکو ئێستا لە رێگەی هەندێ هەوڵەوە لە مەغریبو رۆژهەلاتی عەرەبی تێیدا پەلەقاژێ دەکەین. ئەمەی ئێستا هەوڵێکی گواستنەوەیە، بەڵام هەندێ کەس دەیانەوێت زۆر لەوە زیاتر برۆن‌و دەیانەوێت کۆی فیکری ئاینی بە تەواوی عەقلانی بکەن. لێرەدا پێویستە ئەوەمان لەبیرنەچێت کە مێژوی ئەوروپی یەك رەنگ نییە، رۆشنگەرییەکی مولحیدو رۆشنگەرییەکی نا مولحیدی هەبووە. «ڤۆڵتێر» زۆر لە رۆشنگەری مولحید بێزار بووە. لە فەرەنسادا چەندین فەیلەسوف هەبووە هەوڵیانداوە وردو درشتی مەسیحییەت لەناوبەرن. بەڵام لە هەمانکاتدا «ڤۆڵتێر»و کۆمەڵێ فەیلەسوفی دیکە هەبوون کە ئیماندار بوون. لێرەوە رۆشنگەرییەکی ئیماندارو رۆشنگەرییەکی مادی مولحید هەیە. ئێمەش لە رۆژهەلات هەمان شت دەبینین. ئێمە مرۆڤین، من دژی ئەوەم یەکێك بیر لەوەبکاتەوە من یاخود کەسێکی دیکە بگرێت، بە پاساوی ئەوەی ئێمە لاسایی رۆژئاوا دەکەینەوە. نازانم بۆچی کاتێ ئێمە رۆشنگەربوین‌و رۆژئاوا دواکەوتوبوو، ئەو لاسایی ئێمەی کردووەتەوە. وەك دەزانیت زانا مەسیحییەکان لە سەدەی یازدەهەم یاخود لە سەدەکانی ناوەراستدا بۆ دوو بەرە دابەشببوون: بەرەیەکیان دەیگوت نابێت زانستی کافرەکان بگوێزنەوە، ئەوکات موسڵمانەکانیان بە کافر دادەنا، وەك ئیبن عەرەبیو غەزالی، هەروەها دەیانگوت ئایا بەرهەمەکانی ئەوانە وەربگێرین یاخود نا.

*** رەخنەگرتن لە کەلتوری ئیسلامی، دەبێتە هۆی وروژاندنی هوشیاری باو، ئەم هوشیارییە تاکو ئێستا بە چاوێکی پیرۆزەوە لەو کەلتورە ئیسلامییە دەروانێت، چۆن دەتوانین ئەم ئیشکالییەتە تێپەرێنین؟ ئایا لەسەر بیرمەندەکان پێویستە بە شێوەیەکی سازشکارانە یان بە ناراستەوخۆ کارەکانی خۆیان ئەنجامبدەن، وەك "دیکارت"، یاخود بەوپەری راشکاویو بەریەککەوتنەوە وەك "سپینۆزا"؟**

- دیکارت ئەوەندەی بەسە کە هەستا بە رەخنەگرتن لە فەلسەفەی ئەرستۆ، بەڵام سەبارەت بە رەخنەگرتن لە فیکری ئاینی، ئەوا بۆ ئەو سەردەمەی «دیکارت» هێشتا زوو بوو، بەتایبەتی «دیکارت» بەردەوام لەژێر هەرەشەدا بوو، ئەمە وایکرد لەبەرچاوان نەمێنێت‌و خۆی بشارێتەوەو هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدابوو شوێنی نیشتەجێ بوونی بگۆرێت. «دیکارت» لە بارودۆخێکدا دەژیا تەواو لەم بارودۆخەی ئێستای رۆشنبیرانی عەرەب دەچێت کە لە ترسی فێندەمێنیتالیستەکان خۆیان دەشارنەوە. لێرەوە «دیکارت» بۆ ئەوەی گیانی خۆی رزگار بکاتو ئامانجی خۆی بەدەستبێنێت‌و بیروباوەرەکانی جێگیر بکات، وەك دەڵێن پرنسیپی سەلامەتی هەڵبژارد. «دیکارت» لەم بارەیەوە دەڵێت: (گەر ئەوان پێش ئەوەی ئامانجەکانم بەدەستبێنم

منیان بکوشتایە، مرۆڤایەتی چ قازانجێکی دەکرد).

هەرچی «سپینۆزا»یە کە ٣٠ ساڵ دوای «دیکارت» هاتو کەسێکی ڕادیکاڵ بوو، بەڵام بارودۆخەکە بۆ ئەو باشتر بوو. تەنانەت «سپینۆزا»ش بەدرێژایی ژیانی تەنها یەك کتێبی بەناوی خۆیەوە بڵاوکردەوە، هەروەها هەوڵیدا کتێبەکەی (ئەخلاق) بڵاوبکاتەوە، وەلێ کاتێ بیستی فێندەمێنتالیستەکان دەیانەوێ حەملەیەك لەدژی بەرپابکەن، لە بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی پەشیمان بووەوەو داوایکرد دوای مردنی بڵاویبکەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا فێندەمێنیتالیستەکان چونە سەر گۆڕەکەی‌و نەفرەتیان لێکردو (تف)یان لە گۆڕەکەی دەکرد.

«محەمەد ئارکۆن» پێیوایە پراکتیزەکردنی مێژوییانەی ئاین، ڕوبەڕوی ڕەخنەو توێژینەوە دەبێتەوە، بەڵام لایەنە ڕۆحییە بڵندگەراو پاکژەکەی ئاین‌و پەیوەندی مرۆڤ بە یەزدانەوە، ئەوانە کۆمەڵە شتێکی پیرۆزو ئایدیالە.

*** لە کتێبەکەتدا (دەروازەیەك بۆ ڕۆشنگەری ئەوروپی) ئاماژە بەوە دەکەیت هەڵکشانی فیکری ڕۆشنگەری، هاوکات بووە لەگەڵ دەرکەوتنی چینی بۆرجوازی. ئایا لە جیهانی ئیسلامیماندا هیچ دیمەنێکی لەو شێوەیە بەدی دەکەیت ڕوبدات؟**

- مەحاڵە (ڕێنیسانس) بوژانەوە لە گەشەی ئابوری جیاکرێتەوە، بوژانەوەی ئابوری یارمەتی بوژانەوەی فیکری‌و ڕۆشنگەری دەدات. لە جیهانی عەرەبیدا تێبینی ئەوە دەکەین کە بۆرجوازیەتی بازرگان لە بەغدا کۆمەکی بە ڕۆشنگەری بەخشیوە. بازرگانە موسڵمانەکان چینێکی دەوڵەمەندیان پێکهێنابوو، ئەم چینە دەوڵەمەندە توانی کۆمەڵێ کتێبخانە دروست بکات‌و پارەی بۆ فەیلەسوفان‌و شاعیران خەرج دەکرد. لێرەوە ئەم جۆرە کارانە دەکرێ ڕێنیسانس (بوژانەوە) بێننەئاراوە. هەروەها هێزی ئابوری لە سعودییەو کەنداو دەتوانێت ببێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕێنیسانس، بەوەی کۆمەڵێ ناوەندی توێژینەوەو کۆمەڵێ ناوەندی وەرگێڕان‌و کتێبخانە بکرێتەوەو کۆمەکی چالاکییەکانی ئەدیب‌و بیرمەندان‌و توێژەران بکرێت. لێرەدا دەتوانین نمونەی ئەو ئیشانە بێنینەوە کە «مەئمون» پێیهەستا، کاتێ (خانەی حیکمەت)ی کردەوە، لە ئێستادا مانا تازەکەی خانەی حیکمەت یەکسانە بە ناوەندی توێژینەوەو وەرگێڕان. کاتێ سعودییە لە ریاز ناوەندێکی گەورە بۆ وەرگێڕان دەکاتەوە، هەروەها ئیمارات‌و قەتەرو میرنشینی عەمان‌و دەوڵەتانی دیکەی کەنداو هەمان کار دەکەن، ئەمە مانای ڕێنیسانسێکی مادیی دەگەیەنێت کە لەلای خۆیەوە دەکرێت ببێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕێنیسانسێکی عەقڵی. وەك ئەوەی وتراوە: (ئەوەی گیرفانی بەتاڵ بێت عەقڵیشی بەتاڵ دەبێت).

*** قسەیەك هەیە دەڵێ: گەر سیاسییەك بەلای فیکرێکی دیاریکراودا شکاندییەوە، ئەو فیکرە دەبێتە فیکرێکی باو، وەك ئەوەی لە سەردەمی مەئمون لەگەڵ موعتەزیلەدا ڕویدا؟**

- سەبارەت بەوەی لەنێوان مەئمون‌و موعتەزیلەدا ڕویداوە ڕاستە، بەڵام دواجار موعتەزیلەکان شکستیان هێنا، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کۆمەك یاخود پشتگیرکردنی دەسەڵاتدارێك بەس نییە بۆ بڵاوبونەوەی فیکرێکی دیاریکراو، گەرچی تەواو لەو بڕوایەدام خەڵکی پێیان وایە دەسەڵاتدار نمونەیەکە پێویستە چاوی لێبکەین. وەلێ ئەوە بەس نییە، چونکە تیۆرەیەك هەیە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت گەر چینێکی کۆمەڵایەتی نەبوو، ئەوا ڕێنیسانسی فیکری بەدەستنایەت. لە ئەوروپا ڕۆشنگەری بۆیە سەرکەوتنی بەدەستهێنا، چونکە چینی بۆرجوازی چووە شوێنی چینی ئەرستۆکرات. ئەوە چینی بۆرجوازی بوو فیکری ڕۆشنگەری هەڵگرت‌و لەناو میللەتدا بڵاویکردەوە. ئیدی لەو کاتەوە فیکری ڕۆشنگەری لە پاریسەوە بۆ شارەکانی دیکە بڵاوبوەوە، هەروەها بڵاوبونەوەی فیکری ڕۆشنگەری لە شارەکانی دیکەوە بۆ دێهاتەکان‌و لەوێشەوە بۆ شاخەکان

کاتێکی زۆری خایاند.

کاتێ ڕۆشنگەری ئیسلامی دەردەکەوێتو لە زانکۆو خوێندنگاو ژینگە ڕۆشنبیرییەکاندا کە بەسەر عەقڵدا کراونەتەوە بڵاودەبێتەوە، ڕەنگە ئەمە وابکات چیتر ڕۆژئاوا بە تۆمەتو پاساوی ئەوەی پرۆگرامەکانمان پڕە لە بابەتی ئوسوڵی دەمارگیرو بابەتی ڕق لێبونەوە لە مەسیحیو جولەکەو ئاینەکانی دیکە تۆمەتبارو هەراسانمان نەکەن. ئێمە داوای پێشکەوتن لە هەمو کایەکاندا دەکەین، هەروەها (ئافرەت)یش دەیەوێت شوێنی خۆی لە کۆمەڵگادا هەبێت، چونکە ئافرەت نیوەی کۆمەڵە، گەر ئافرەت ئیفلیج بوو، ئەوا کۆمەڵگاش ئیفلیج دەبێت. ئافرەت دەکرێ ببێتە بەخێوکەر، مامۆستا، پزیشك، ئەندازیار، هەروەها دەتوانێت ڕۆڵێکی گەورە لە کەرتە جۆراو جۆرەکانی کۆمەڵگادا ببینێت.

*** ئاستی بڵاوبونەوەی فیکرە ڕۆشنگەرییەکەی محەمەد ئارکۆن چۆن دەبینیت؟**

- گەر بەراوردی بکەین بە نیو سەدە لەمەوپێش، ئەوا لەئێستادا باشتر بڵاوبوەتەوە. کاتێ «محەمەد ئارکۆن»م ناسی، لە جیهانی ئیسلامیدا تەنها ژمارەیەکی کەم دەیانناسی. بەڵام هەنووکە ڕەوتێکی بەرفراوانی هەیە. لە ماوەی نیو سەدەدا هەندێ لە کتێبەکانی، نەك هەمووی، وەرگێڕدراون. لێرەوە ناوی لەناو ناواندایە، بەتایبەتی لە ناوەندە ڕۆشنبیرییەکان. فیکری ئارکۆن فیکرێکی ئاسان نییە، بۆیە پێویستی بە ڕاڤەکردنو ئاسانکردنەوە هەیە، چونکە ئارکۆن بە زمانێکی ئەکادیمی پڕ زاراوە دەنوسێت کە لە دەیان فەیلەسوفی فەرەنسیو ئەوروپییەوە وەریاندەگرێت. تێگەشتن لەو زاراوانە بەلای خودی ئەوروپییەکانەوە قورسە، چ جای بەلای ڕۆشنبیری عەرەبەوە. زۆرجار لەکاتی وەرگێڕانی کتێبەکانیداو لەکاتی ڕاڤەکردنو ئاسانکردنی فیکرەکان بۆ خوێنەر، هەست بە ناڕەحەتی دەکەم.

*** لەبەر ئەوەی ئێمە ئێستا لەسەردەمی تەقەنیاتداین، ئاماژەت بەوە کرد ئێمە دەتوانین گواستنەوەیەکی هەمەلایەنە ئەنجامبدەین، گواستنەوەیەك سەدان ساڵ بۆ چەند دەیەیەك کورتبکاتەوە؟**

- دەکرێ ئەوە ڕوبدات، بەڵام زیاد لە پێویست نا. پێویستە لەسەرمان هێدی هێدی قۆناغەکان ببڕین. ئەوەی بە ڕۆژئاواییەکانی دەڵێم ئەوەیە کەمەکێك کاتمان بدەنێ، چونکە ئەوان بۆ بەدەستهێنانی ڕێنیسانسو ڕۆشنگەرییەکەیان پێویستیان بە زیاد لە ٣٠٠ ساڵ بوو. مەعقول نییە ئێمە لە میانەی ٣٠ ساڵدا ڕێنیسانس ئەنجامبدەین، ئەمە مەحاڵە. ئێمە بۆ ئەوەی لە سەدەکانی پاشکەوتن بێینەدەرێ، پێویستمان بە کات هەیە. کەواتە ئێمە پێویستمان بە کاتێکی درێژ هەیە، پێویستە لەسەر ڕۆژئاواش کەمەکێك لەسەرمان بوەستن، تاکو عەقڵانیەتی زانستیو فەلسەفی وەردەگرینو دەیگونجێنین. جگە لەوە ئێمە بە جیهانگیری گەمارۆدراوین، ئەمە مانای وایە ڕۆشنگەری پێویستی بە ٣٠٠ ساڵ نابێت وەك ئەوەی لە ئەوروپا ڕویدا، ڕەنگە بۆ بڕینی مەسافەیەکی درێژ لە ڕێنیسانسو ڕۆشنگەری، پێویستیمان بە دوو نەوە یاخود سێ نەوە بێت.

*** بەڵام دەبینین جیهانگیری بە ڕێگایەکی خراپ بەکاردەهێنرێتو عەقڵیەتێکی داخراوی دەمارگیر دەچەسپێنێت، زۆربەی کەسایەتییەکانو بەرنامەکان لە ڕێگەی کەناڵە ئاسمانییە کاریگەرەکانو لە ڕێگەی ئەنتەرنێتەوە سەرقاڵی بەرهەمهێنانی فیکری ئوسوڵین. ئایا ئەمە ئەرکی گۆڕان قورستر ناکات؟**

- ئەمە بەڵگەی ئەوەیە جەنگ لە دژی فیکری ئوسوڵی کوێرانە، جەنگێکی درێژخایەن دەبێت. جەنگەکە جەنگێکی سەخت دەبێت بەتایبەتی لەگەڵ ئەو کەناڵانەی تاکو ئێستا فیکری کۆنی بەسەرچووی سەدەکانی ناوەڕاست جێگیردەکەن. لەبەردەم ئەم جەنگە گەورەیەدا، پێویستمان بە کەناڵی کراوەو ڕۆشنگەر هەیە.

ژمارەی جەماوەری ئوسوڵی زۆرترەو ئەوان باڵادەستنو کۆنترۆڵی شەقامیان کردووە. بەڵام بە تێڕوانینی خۆم ئەم قۆناغە زۆر ناخایەنێت، لەسەر ئەوە نمونەیەك دێنمەوە: کاتێ لە فەرەنسا ڤۆلتێرو گروپی ئینسایکلۆپیدیا دەستیان بە کاری ڕۆشنگەری کرد، ژمارەیان لەچاو سوپای بێشوماری فێندەمێنیتالیستە مەسیحییەکاندا زۆر کەمتر بوو، جەنگی نێوانیان تابڵێی جەنگێکی بێ بەرابەربوو، کەچی دوای نزیکەی ٤٠ ساڵێك توانییان جەنگەکە بەرنەوە، ئەمە وەك موعجیزەیەك وابوو. ئەمە مانای ئەوەیە گەرچی ئێمە لە جیهانی عەرەبیدا کەمینەین، بەڵام پێویستە ئەو جەنگە بەرێوەبەرینو ئەوەی لە توانامانداییە بیکەینو نەوەی داهاتوش دەتوانێت کاروانەکە تەواو بکات.

*** زۆرجار ڕەخنە لەو ڕۆشنبیرە عەرەبانە دەگریت کە دەیانەوێت بگوێزنەوە بۆ عەلمانییەت؟**

- وەك چۆن ئاراستەیەکی پەرگیری ئوسوڵی هەیە، ئاواش لە لایەکەی دیکەوە ئاراستەیەکی پەرگیر هەیە. من بانگەشەی ئەوە دەکەم تێگەشتنێکی دیکە هەبێت بۆ ئاینی ئیسلامو قورئانی پیرۆز، ئەو تێگەشتنەش تێگەشتنێکی فەلسەفی مێژوویانەی پێگەشتوبێت. ئەمەش ئەو تێگەشتنەیە کە لەلای «محەمەد ئارکۆن» دۆزیمەوەو خۆشم لەو چوارچێوەیەدا کاردەکەم. هەرچی پەیوەندی بە ئەزمونی ڕۆحییەوە هەیە، ئەوا بە ئەزمونێکی پیرۆز دادەنرێت، ئەمە دەچێتە چوارچێوەی ڕەهەندی ڕۆحی ئاینەوەو من هەرگیز بانگەشەی ڕەتکردنەوەی ناکەم. هەروەها هەندێ ڕەهەندی نا ڕۆحی هەیە کە بۆ مەبەستی ماستاوچیەتیو گەشتن بە پلەوپایەو بەدەستهێنانی بەرژەوەندی شەخسی بەکاردەهێنرێت. من مەبەستم ئەم ڕەهەندەیان نییە، بەڵکو مەبەستم ئەو لایەنە ڕۆحییە بڵندەی ئاینە کە لە مێژووی ئیسلامدا کۆمەڵێ کەسایەتی گەورە پەیرەویان لێکردووە، لەوانە «فارابی»، «ئیبن سینا»، «غەزالی»، «ئیبن عەرەبی»و دەیان کەسایەتی دیکەی ئیسلامی مەزن کە گەشانەوەیەکی ڕۆحی ئاینییان هەبووە، بەڵام زۆر بەداخەوە لە ئێستادا ئەو گەشانەوە ڕۆحییەمان نییە.

*** بە دروستی بۆچی "محەمەد ئارکۆن"ت هەڵبژارد؟**

- چونکە باشترین لێکدانەوەی عەقڵانی بۆ کەلتوری عەرەبی ئیسلامی پێشکەش دەکات. لێکدانەوەکانی ڕۆشنایییەکی فیکری بێ وێنەیە بۆ هەمو کەلتورمان، پێشتر ئەم کەلتورە لە ساتەوەختی سەرهەڵدانییەوە تاکو ئێستا، هیچ لێکدانەوەیەکی لەو جۆرەی «ئارکۆن»ی بۆ نەکراوە. چونکە پرۆژەی ڕەخنە لە عەقڵی ئیسلامی بە مانا فەلسەفییەکەی بە پرۆژەیەکی گەورە دادەنرێتو چەندین پرسیاری لەم شێوەیەی لەخۆگرتووە: ئیسلام چۆن دەرکەوت؟ وەحی چۆن لەگەڵ مێژودا بەریەککەوتن؟ لە سەدە بەرایییەکاندا گرۆهە ئیسلامییەکان چۆن دروست بوون؟ ململانێی نێوان ئاینو دنیا چۆن ڕویدا؟ فیکری گریکی چۆن هاتنە ناو فیکری ئیسلامییەوە، ئەی باشە زاناکان چۆن وەڵامی هاتنی ئەو فیکرەیان دایەوە بەو پێیەی فیکرێکی نامۆیە؟ چۆن هێرشکرایە سەر فەیلەسوفەکان؟ جەنگی نێوان فەیلەسوفانو فوقەهاکان چۆن ڕویدا؟ هەروەها چۆن قورئان لە تێڕوانینێکی سیمیائی مۆدرێنو تێڕوانینێکی ئەنسرۆپۆلۆجیاوە بخوێنینەوە؟ چۆن قورئان لە تێڕوانینی بەراوردکردنی لەگەڵ ئاینە یەکتاپەرستییەکانی دیکەدا بخوێنینەوە؟

«محەمەد ئارکۆن» زۆرجار لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری لە نێوان هەرسێ ئاینە یەکتاپەرستییەکەدا کردووە، پاشان بە کۆمەڵێ ڕۆشناییەوە دێتەدەرەوە، ئەو حەزناکات هیچ کەسێك خۆی لەناو کەلتورەکەیدا بەندبکات، چونکە گەر وایکرد ئەوا ناتوانێت لە لێکۆڵینەوەکانی دیکە بگات. لەم گۆشەنیگایەوە «محەمەد ئارکۆن» داوا دەکات مێژووی بەراوردکاری ئاینەکان لە زانکۆ عەرەبییەکاندا بخوێندرێت.

*** پێشتر پێشنیاری ئەوەت کردبوو زانستی بەراوردکاری ئوسوڵی بخوێنرێت.**

- بەڵێ ئەو پێشنیارەم کردووە، بۆ ئەوەی بە باشی لە ئوسوڵییەتی خۆمان تێبگەین، پێویستە لە ئوسوڵییەتی ئەوانی دیکەش تێبگەین. هەمو ئاینەکان بە درێژایی سەدە جیاواز جیاوازەکان دژ بە تازەگەری راوەستاون. بەڵام دانی پێدادەنێین ئێمە لە قۆناغێکی سەختدا دەژینو پەنا بەخوا لە رێگەی رۆشنگەریو خوێندنو خۆ رۆشنبیرکردنەوە ئەم قۆناغە سەختە تێدەپەڕێنین، ئێمە دوارۆژمان لە پێشەو بە رۆژئاوا دەڵێم: وەك چۆن ئێوە پێشتر بە دەست هەمان کێشەوە گرفتاربیوونو دواتر توانیتان پێش ئێمە بکەونو هەنووکە بارودۆخێکی باشترتان بۆ رەخساوە، ئێمەش لەسەر هەمان رێگا دەرۆین، هەوڵدەدەین بە شێوەیەکی عەقڵانی لە ئاینەکەمان تێبگەینو کێشەکانمان چارەسەر دەکەین.

*** عەلی حەرب بە توندی رەخنەت لێدەگرێتو بەوە تۆمەتبارت دەکات کە تۆ ئیرەیی بە مەنهەجیەتی ئارکۆن دەبیت، هەروەها نەسر حامد ئەبو زێد دەڵێ ئارکۆن قسە لەسەر تیۆرە مەنهەجییەکان دەکات بەڵام پراکتیکیان ناکات.**

- من لەو کەسانەم ستایشو رێزی «نەسر حامد ئەبو زێد» دەگرم، چونکە ئەو کارێکی باش ئەنجام دەدات. بەڵام پێم وانییە ئەو بتوانێت ئەو کارانەی بنوسێت گەر ئاگاداری لێکۆڵینەوەکانی «ئارکۆن» نەبێت. هەرچی «عەلی حەرب»ە، ئەوا ئەو هاورێمەو رێزی دەگرم، بەڵام وەك پێویست ئاگاداری مەنهەجە زانستییەکان نییە. بۆ نمونە «ئارکۆن» لە کتێبەکەیدا (چەند خوێندنەوەیەك بۆ قورئان) لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانیو ئەنسرۆپۆلۆجی بۆ دەقە ئاینییەکان کردووەو کار لەسەر ئەوە دەکات دەقەکانی قورئان بە هەمو دەقە ئاینییەکانی پێش قورئان ببەستێتەوە. کەچی دواتر دێنو دەڵێن «ئارکۆن» تەنها قسە لەسەر تیۆرە مەنهەجییەکان دەکاتو پراکتیکیان ناکات. هەروەها کاتێ «ئارکۆن» لێکۆڵینەوە لەسەر قورئان دەکات، هەوڵدەدات لێکۆڵینەوە لەسەر لایەنی خەیاڵ یاخود لایەنی سیحرئامێزی قورئان بکات، هەوڵدەدات بزانێ واتای تێگەشتن لە عەقڵ لەسەر ئاستی قورئان چی دەگەیەنێت. ئەوەی ئەو بەرێزانە لەسەریانە بیکەن ئەوەیە کەمەکێك سادەبنو تەرکیز بخەنە سەر توێژینەوە مەنهەجییەکانی «ئارکۆن»و هەوڵدەن بە قوڵی لەوە تێبگەن کە ئەو پیاوە دەینوسێت. هەروەها لەسەریانە توێژینەوە لەسەر ئەو میتۆدانە بکەن کە لە جیهانی ئەوروپادا هەیە، تاکو بزانن ئەو میتۆدانە چۆنو بە چ شێوەیەك بەسەر کەلتوری ئەوروپیو کەلتوری ئیسلامیو مەسیحیدا پراکتیك دەکرێت. رەنگە ئەم قسانە ئیحراجیان بکات، بەڵام کۆمەڵە زاراوەیەکی زۆر هەیە کە لەوانەیە ماناکەی نەزانن. ئاسانە لە خۆڕا قسەی بێ بنەما بکەیت، لە راستیدا من سەرقاڵی ئیشکردنمو کاتم نییە وەڵام بدەمەوە.

*** بۆچی تەنها کارەکانی محەمەد ئارکۆن وەردەگێڕیت؟**

-لە راستیدا کۆی وەرگێڕانەکانی من بۆ «ئارکۆن» تەنها پێنج کتێبیانی گرتووەتەوە، چونکە پرۆژەکەی پرۆژەیەکی گەورەیەو کاتێکی زۆری دەوێت. پێویستە چەند لایەنێکی گەورەتر هەبێت بەم کارە زۆر گرنگو بایەخدارە هەستن. راستە کتێبگەلێکی زۆر هەیە بەسەرمانا تێدەپەڕێتو بۆ زمانەکانی دیکە وەردەگێڕدرێن، بۆ نمونە بۆ زمانی ئێرانیو تورکی وەردەگێڕدرێن.

من «ئارکۆن»م هەڵبژارد لەبەر ئەوە نا بە مانا ئەکادیمییەکەی کەسێکی زانایە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کەسێکی بیرمەندە، لەبەرئەوەی بیرمەندێکی بە رەگەز ئیسلامییەو هەندێ شتی گرنگو بایەخدار دەڵێ.

ڕۆژهەڵاتناسەکان، ئەوانەیان لە کێشەکەمانەوە نەگلاون، نایزانن. «ئارکۆن» بە ویژدانیو بە ڕۆحیو بە عەقڵی دەنوسێت، ئەو دەیەوێت کۆمەڵگاکەمان هەستێتەوەو بگات بە کاروانی گەلانی دیکە. بۆیە تێگەشتنێکی فەلسەفی هەیە لەوەی ڕۆژهەڵاتناسەکان قوڵترە. بەڵام هەنوکە گەر پرسو ڕام پێبکەن چی بکەین بۆ بوژانەوەی فیکری ئیسلامیو عەرەبی، دەڵێم پێویستە چەند ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی ئاست بەرزی تایبەت بە ڕۆهەڵاتناسی بکرێنەوە. بگەڕێن بە شوێن ئەوەی بزانین ڕۆژهەڵاتناسی ئەنگلۆساکسۆنی لە زانکۆ گەورەکاندا چی بەرهەمدەهێنن؟ بزانین ڕۆژهەڵاتناسی یابانیو ڕوسیو فەرەنسیو ئیتالیو ئەڵمانی چی بەرهەمدەهێنن؟ بۆچێ دەبێت ناوەندێکی باشمان نەبێت تاکو توێژینەوەکانی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەمان بۆ بگوێزێتەوە، ئێمەش گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکەین کە چییان لەسەر نوسیوین، بە تەنها هەر خۆم ناتوانم هەمو شتێك بکەم.

*** پرۆژەی ئاییندەت چییە؟**

- کتێبێکم لەسەر «مارتن لۆسەر» هەیە، ئێستا کار بۆ ئەوە دەکەم ئەو کتێبە تەواو بکەم، بەشێکی ئەو کتێبەم تەواو کردووە، بەڵام هێشتا پێویستی بەوەیە بەشێکی دیکەی بۆ زیاد بکەم تاکو کتێبێکی تەواو دەرچێت. «لۆسەر» ڕابەری چاکسازی ئاینی مەسیحی بوو، بۆ ئەوەی بزانین ئەو کارە مەزنە، (واتە چاکسازی ئاینی-و-) چۆن ڕویداوە، پێویستە «لۆسەر»و ئەو قۆناغانەی پرۆژە ڕۆشنگەریەکەی پێیدا تێپەڕیوە، بناسین.

*** بەرنامەی هاشم ساڵح چییە،چۆن دەتوانیت ئەم هەمو کارە زۆرە لە نوسینو وەرگێڕان بەرهەمبێنیت؟**

- پێدەچێت بەختم هەبێت بەوەی لە تەنهاییەکی گەورەدا دەژیم، پێشترو ئێستاش هەمو کاتو ژیانی خۆم بۆ ئەم پرۆژەیە تەرخانکردووە. بە تەنها دەژیمو منداڵم نییە. تەنها کار لە نوسینو وەرگێڕاندا دەکەم. هیچ بەرپرسیارەتییەکی خێزانیم نییە، لەوانەیە ئەمە هۆکاری ئەوەبێت بەو شێوە زۆرە بەرهەمم هەبێت. بارودۆخەکە وا کەوتەوە خۆم بۆ ئەم پرۆژەیە تەرخان بکەم. من بە تەواوی ڕۆچومەتە ناو پرۆژەی ڕۆشنگەرییەوە. هیوادارم موسڵمانانو عەرەب هەستنەوەو دوارۆژێکی شارستانی بەهێز دروستبکەن. ڕاستە جەستەم لە پاریسە، بەڵام دڵو ڕۆحم لە دیمەشقو ڕیازو ڕیباتە.

*** بۆچی چیتر ئەو نوسینانە بڵاوناکەیتەوە کە لەسەر ئەدەبو شیعر دەتنوسین، هەروەها ئەو خوێندنەوە نایابانەی بۆ شیعرەکانی ڕامبۆو بۆدلێرو ئەوانی دیکەت دەکرد؟**

- کاتێ بۆ تاوێك لەم کارە فیکرییە قورسو پڕوکێنەرە ڕزگارم دەبێت، دەگەڕێمەوە سەر ئەدەب، چونکە ئەوکە لایەنێکی سەرەکییە لە نوسینەکانم. گەر بەشێوەیەکی گەورە بایەخی پێبدەم، ئەوا خوێنەر کەسێکی دەبێت. ئەدەب زیندویەتیو خۆشبەختیم پێدەبەخشێت.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی الریاض، ٢٧/ ١١/ ٢٠٠٨

# (ئەدەب لە مەترسیدایە)ی تۆدۆرۆف
# کەڵەکەبوونی مەعریفە و
# لێکۆڵینەوە ڕەخنەییەکان


خوێندنەوەی: فەیسەڵ دەراج
لە عەرەبییەوە: عیسا چیایی




.....ئایا تیۆری ئەدەبی زانستێکە، یان بابەتێکە لەزانست دەچێ .. پێکهاتەی کەڵەکەبوونێکی مەعریفیە، دەیەوێ هەم دابڕێ لەوەی کە بە دەست دێ وکۆدەبێتەوە و لە لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکانیشدا ماوەیەکی تیۆری تازە دابمەزرێنێ؟. ئایا ئەم تیۆرە وتەزاگەلێکی بابەتی هەیە کە بەهێز و تەوژمی ئاراستە تایبەتیەکانی خۆی کەم وزیاد بکا، یان ملکەچن بۆ ئەو کارلێکە سیاسی و ئایدیۆلۆژیانەی دەرەوە کە تیۆرە ئەدەبیەکان بەکاردێنن، زیاتر لەوەی گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکەن و پێشیان دەخەن ..؟ ئەوە دوو پرسیارە کە بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ یان ناڕاستەوخۆ دووا کتێبی «تۆدۆرۆف»، (ئەدەب لەمەترسیدایە) لەیەك کاتدا ئاراستەی شارەزایانی ئەو بوارە بەتایبەتی و خوێنەرانیشی بەگشتی دەکات .

ڕەنگە بەلای «تۆدۆرۆف»-ەوە، ڕەخنەگرێکی ئەدەبی و سیمیۆلۆژی و فەیلەسوفێکی زمان، وەڵامی ئەو دوو پرسیارە بداتەوە .چونکە لە نیوەی دووەمی شەستەکانی سەدەی پێشوودا و لە لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکاندا ناوی «تۆدۆرۆف» وەکو دامەزرێنەری میتۆدی بونیادگەری دەبریسکایەوە، ئەو دەمەی دەقی ئەدەبی بە بابەتێکی زمانەوانی سەربەخۆی وا پێناسە کرد کە بەسەر دەرەوەی خۆی-(کۆمەڵگا)-دا ناکرێتەوەو وا پێویست دەکات دەرەوەش بەسەر

ئەودا نەكرێتەوە. چونكە پەیوەندیە ناوەكیەكانی دەق هێندەیە كە لێكۆڵینەوە و لێكدانەوەیان بۆ بكرێ. «تۆدۆرۆف» یان وەك دەڵێن (باوكی بونیادگەریەكان)، ئەو میتۆدەی لە دوو پەیوەندیدا كورت كردەوە، یەكەم :دەقێكی ئەدەبی كە جگە لەخۆی پشت بەهیچ شتێكی تر نابەستێ، دووەمیش ڕەخنەگرێكی ئەدەبی، كە ئامرازە ڕەخنەییەكانی بەسەر دەقە باسكراوەكەدا پەیڕەو دەكات، بێئەوەی بەلای خوێنەردا یان بەلای ئەو شتانەدا ئاوڕ بداتەوە كە جگە لەو ئەوانی تر بە(ئەركی كۆمەڵایەتی ئەدەبی)-ی ناودەبەن. ڕەنگە بڕواهێنانی ڕەخنەگر بەو زانستە وردەی خۆی یان ئەو بڕوایەی كە زانایەكی ئەدەبی پێش خۆی نمونەی نەبووە، پەنای هاودەمبوونی بەرەو نمونەی بیركاری و وەدەستهاتووەكانی ئەنسرۆپۆلۆژیا بردبێ .. بەڵام ئەم بڕواهێنانەی ڕەخنەگری ئەدەبی بەو(كارە وردەی) زۆری نەبرد و لەكۆتایی حەفتاكاندا كشایە دواوە، چونكە لەكتێبی (ڕەخنە لە ڕەخنەگرتن)دا ڕەخنەی لەو میتۆدەی خۆی گرتووە بگرە بەجارێ وازی لە ڕەخنە هێناوەو بەرەو گۆڕەپانگەلێكی فراوانتر پەلی هاوێشتووە. كتێبێكی لەمەڕ دەمارگیری و لێبووردەیی داناوە بەناونیشانی (ئێمە و ئەوانی تر)، و هەروەها كتێبێكی ئەخلاقی سەرنج ڕاكێشتری لە گێڕانەوەو بەڵگەنامەییدا هەیە ئەویش (داگیركردنی ئەمریكا) یە، تا دوواتر دەگاتە ئەو لێكۆڵینەوەیەی لەسەر (سستمی نوێی جیهانی)..

«...ترفتیان تۆدۆرۆف» دووجار ڕەخنەی لە میتۆدەكەی خۆی گرتووە : جاری یەكەم، كاتێ كە ئاوڕی لەو وتەزا تەسك و تروسكانەی داوەتەوە ..جاری دووەمیش كە بەتەواوی وازی لێهێناون و بەرەو گۆڕەپانێكی تازە ڕۆشتووە، بەڵام هەڵوێستی سەبارەت بە(بونیادگەریە كۆنەكەی خۆی) لە كتێبە تازەكەی (ئەدەب لەمەترسیدایە)دا زیاتر بەڕوونی دەردەكەوێ. ئەو هەڵوێستەش لەو ڕەخنە تووڕانەیدا دەردەكەون كە ئاراستەی ئەو میتۆدە ڕەخنەییانەی دەكات كە لەمڕۆی زانكۆی فەرەنسادا باڵادەستن و بانگەشەی ئەوە دەكەن سەر بەمیتۆدی (بونیادگەرین)، چونكە ئەو بەبێ دوودڵی ئەو هەستە سەرسەختەی دەق ڕەت دەكاتەوە كە شێوەیەكی (موتڵەق)ی وەرگرتووە و كاری ئەدەبی لە كیانێكی زمانەوانی داخراودا كورت دەكاتەوە و نارازیە لەو دۆخەی بەدەست بێتواناییەكی تیۆری زۆرەوە دەناڵێنێ. «تۆدۆرۆف» نەك هەر میتۆدی ڕابوردوی بونیادگەری و ڕەوتەكەشی نادوێنێ، بەڵكو مامەڵە لەگەڵ ئەو شێوە زۆر هەژار و ڕووبەر تەسكەیدا دەكات. بەمانایەكی تر ئەو مامەڵە لەگەڵ (تەرمی بیركردنەوەكان)دا دەكات، واشی داناوە كە زانستێكی ورد پەیڕەوی دەكات .

ئەمەش پاڵ بە «تۆدۆرۆف»ەوە دەنێ لە ڕوونكردنەوەی ئەزموونی ڕابردوویدا دوو شت ڕوون بكاتەوە، یەكەمیان : ئەو ڕەخنەگرەی ڕابوردوو كە پاراوە بەڕۆحی شۆڕشی (1968)، ڕەخنەگرێك بووە لە لێكۆڵینەوەی ئەدەبیدا لە سنووری دەقدا بووە و لە دەرەوەی لێكۆڵینەوەشدا لە دەرەوەی سنووری دەقدا بووە، چونكە پارێزگاری لە بەهاگەلێكی فكری و ستاتیكی و سیاسەتێك دەكرد كە لە هەوڵی ڕوخاندنی كۆمەڵگای سەرمایەداری و گۆڕانیدا بووە بە سستمێكی تازە. كێشەی دووەم: میتۆدی بونیادگەری كە ڕادیكاڵ بووە لە تازەییدا ویستویەتی ڕەخنە لە میتۆدە ئەدەبیە باڵادەستەكان بگرێ و بشیان هەژێنێ. بەمانایەكی تر سەرەڕای دەركەوتنی ئەو كەموكوڕیە گەورانەشی، بونیادگەری كارێكی شۆڕشگێڕانەو بەشداریكردنێكی تەواو سیاسی بووە. بەپێچەوانەوە بە چوونە ژێر باڵی ئەو(تەرمی بونیادگەری)ەی كە ئەمڕۆ هەیەو پشتی بە هەڵوەشاندنەوەو بیركردنەوەكانی دوای مۆدێرنە بەستووە، ئەوا لە لێكۆڵینەوەكان و دەرەوەشیاندا لە چوارچێوەی دەقدایە. ئەمەش بەرەو ئەو ئاراستەیەی دەبات كە لەپشتگوێخستنێكی تەواو كوشندەدا (مەرجی مرۆڤ دۆستی) پشتگوێ بخات. بە—لەبیركردنی ناواخن —یش ڕۆڵی پەروەردەیی و بەها دۆستی ئەدەب لەبیربكات، ئەمەش ئەیباتەوە

بۆ چارەسەرێکی ئەدەبی ساختەکارانەی وا کە دووبارە بەهای (لیبرالیەتی تازە ) بەرهەم بێنێتەوە. بەخاتری ئەمەش پێویستە جیاوازی لەنێوان ئەو دووانەدا بکرێ، لەنێوان ئەو (رۆحە بونیادگەرییە) یاخیەی کە لە شۆڕشی (1968) جیانابێتەوە و ئەو (تەرمی بونیادگەری)یە دارزاوەش کە شایەتحاڵێکە لەسەر تێکشکانی بیری شۆڕشگێڕی لە زانکۆکانی فەرەنسادا .

"تۆدۆرۆف" سەرچاوەکانی ئەم قەیرانەی ئەمرۆ تووشی دەق هاتووە لە سێ هۆکاردا دەبینێ: یەکەم، ئەو ڕوگە فۆرمالیستەی زیاتر گرنگی بە وشەو پیت دەدا و بوونەوەری مرۆیی لە کێشەی بوون و کۆمەڵایەتی و ڕۆحیەکانی خۆی دادەماڵێ، ئەم ڕوگەیە بەتەواوەتی ئەدەبی تووشی هەژاری کردووە، بۆیە شتێکی سەیر نیە قوتابیان وەك دەڵێن ئەو کەمینانەی لێ دەرچێت کە لە بێ تووانایییەکی فکری و ئایدیا موحافزکارەکاندا ئاسوودەن، وازیان لە خوێندنەوەی ئەدەب هێناوە...ئاقاری دووەمیش: ئەو (هیچگەرا/عەدەمیەتە)یە کە بەهای کاری ئەدەبی لە ناوەوەی خۆیدا دەبینێ و مادامەکی گۆڕانی حەقیقەتەکانیش بە مەحاڵ دەزانێ، ئەوا هیچ پێویست ناکات کە دەرەوە و ناوەوە بەیەك بپێورێ. (مەبەست لە ناوەوە تەنها پێکهاتەی نووسینی ناوەوەی دەقەکەیە و دەرەوەش ئەو دەوروبەرە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایدیۆلۆژیەیە کە دەقەکەی تیا بەرهەم دێ ..ع..چیایی). لەکاتێکدا مەعریفەش بەهەموو جۆرەکانیانەوە، گێڕانەوەیەکن نە لە واقیعەوە سەرچاوە دەگرن و نە واقیعیش لەوانەوە سەرچاوە دەگرێ. وەك هەموو شتێکی گیاندار وبێگیان لەیەك ئاستدابن و ئەو ئاستەش دڵنیایی و نادڵنیایی و هەژاری، ئینتیلاکردن، جوانیی و دزێویشی تیا یەکسان بێ. ئاقاری سێیەمیش: تاج لەسەرنانێکی ئەو بۆچوونەی پێش خۆیەتی کە خۆی لەو (ئاقارە خودیە زۆرەدا) دەبینێتەوە، ئەو بۆچوونەی هەموو بوون لە کۆمەڵە ڕەهایەکی هەمەجۆردا پەرش و بڵاودەکاتەوە، چونکە ڕەهایەکەو ڕەخنەگری دەقیش ڕەهایەکی ترە و دەقیش ڕەهایەکە وەکو ڕەخنەگرەکەی و پێویستی بەوە نییە ببەسترێتەوە بە جیهانی دەرەوە، بەڵکو ئەو هێندە لە مەعریفە خودیەکەیدا هەیە کە پێویستی بە مەعریفەی جیاواز نەبێ ...

"تۆدۆرۆف"، لە باسکردنی ناواخن ومەرجی مرۆڤدۆستانەی ئەدەب و پەیوەندی بە کۆمەڵگاوە، فێڵ لەو قوتابخانە ئەدەبیانەی پێش (بونیادگەریەکەی خۆی) دەکات کە جارێکیان بەتووندی ڕووبەڕوویان بووەوە ..لێرەدا پرسیار ئەوەیە: ئایا ئەو کەڵەکە بوونە مەعریفیەی ڕەخنەی ئەدەبی لەکوێوە سەرچاوە دەگرێ، گەر (شۆڕشی ڕەخنەیی) سەری لە تەرمەوە دەرچووبێ و ئەگەر ڕەخنەگری سەر بە بونیادگەری میتۆدە کۆنەکەی بە وتەزاگەلێك تیمار بکات کە تەنانەت خۆی دانی پێدا نەناون..

ئاژاوەی ئەم پرسیارە هەڤپەیڤینێك بیردێنێتەوە کە لە ناوەڕاستی شەستەکان و لە پاریس لەنێوان لایەنگرانی بونیادگەری ئەدەبی و پیرە فۆرمالیستێکی روسی (فیکتۆر شکلۆفسکی) ڕووی دا .

دوای ئەوەی ئەمەی دواییان گوێی لە دەرخستەکانی "تۆدۆرۆف" گرت ووتی: (ئێمە پێش شۆڕشی 1917شتێکی وەکو ئەمەمان دەوت). ئاشکرایە ئەم پیرەمێردە ڕوسە کە خاوەنی کتێبی (میتۆدی پەخشان)ە وازی لە هەندێ لە بیرکردنەوەکانی هێنا و«تۆدۆرۆف»یش دەستبەرداری زۆربەیان بوو. لایەنگرانی ئەو بونیادگەریەش کە ئێستا لە فەرەنسا هەن، هەروەکو «تۆدۆرۆف» ئاماژەی پێدەدا، جگە لە (قوتابخانەی هەڵوەشاندنەوە)ی ئەمەریکی، سەر بە شتێکی تر نین . ئەگەر بەگوێرەی ئەم بۆچوونە بێ، ئەی کەواتە لە بوارێکی ڕەخنەیی دیاریکراودا کەڵەکەبوونی مەعریفی لەکوێوە سەرچاوە دەگرێ و سنووری نێوان زانستی بابەتیانە و ئەو هۆشیاریە ساختەیە چۆن دیاری ئەکرێت کە لە هەمان زانستدایە؟.

ئەی ئایا ڕەوتی سیاسی –فکری ڕەگەزێکی ناخۆییە لە کرداری ڕەخنەییدا، یان کردارێکە

پێوانەیەکی ناوخۆیی و سەربەستی هەیە لە دەرەوەی ململانێی ئایدیۆلۆژیا سیاسیەکاندا کۆبۆتەوە؟.

......شتێکی سەیر نییە کە ڕەگەزەکانی (تیۆری ئەدەبی) بە مانا پۆزەتیڤەکەی لە دوو ڕوگەوە هاتبێت: یەکەمیان ئەو تیۆرە فەلسەفیانەیە کە بۆچوونێکی تایبەت بە ئەدەب و داهێنانی ئەدەبی پێشنیار دەکەن، وەك ئەوەی مارکسیەت لە هەوڵەکانی «لۆکاش» و «بنیامین» و «گۆڵدمانەوە» بێ، و «مارت ڕۆبێر» سەر بە زانستی دەروونشیکاری و بیرکردنەوەکانی «فرۆید» بێت، یان هەندێ سوود لە فەلسەفەی دیاردەکان وەرگرێ. تەنانەت هاتنە کایەی میتۆدی بونیادگەرییش بەبێ فەلسەفەی زمان و پرنسیپەکانی «دیسۆسۆر» لە بواری لێکۆڵینەوەی زماندا، شتێکی مەحاڵ بوو... ڕوگەکەی تریش: ئەو بوارانەیە کە چالاکیە ئەدەبیەکان لە شیعرو ڕۆماندا دەیهێنن، وەك ئەوەی «نەجیب مەحفوز»ی لاو سەرلەنوێ بابەتی ڕۆمانی مێژوویی پێشکەش بکا، «جەمال غیتانی»یش بابەتی پەیوەندی لە نێوان داهێنانەکانی ڕۆمان و کەلەپورە ئەدەبیەکان و نمونەکانی سەرەتادا بکاتەوە. کەواتە شیعری عەرەبی تازە لە(تیۆرێکی شیعری ئامادەکراوەوە) نەهاتووە، بەڵکو دەرکەوتن و پێشکەوتنی ئەم شیعرەیە کە مامەڵەیان لەگەڵ ڕەخنەی شیعردا کردووە و پرسیاری تازەیان ئاراستەکردووە ...

«تۆدۆرۆف» لە کتێبە تازەکەیدا سێ پرسیاری ئاراستە کردووە : ئایا حەقیقەت چی دەگەیەنێ لەو لێکۆڵینەوانەدا کە بارمتەی ڕەوتێکی سیاسین، نەك تیۆرێکی مەعریفی... ئەی شێوەی ئەو پەیوەندیە چۆنە کە دەکەوێتە نێوان ئەخلاق و بەرهەمهێنانی مەعریفەوە، ئەگەر خودی لێکۆڵەر ساختەکاری لە تیۆرەکەی خۆیدا بکا. ئایا مەعریفەی ئەدەبی پشت بەو تێز وکەسانە دەبەستێ یان بەکەڵەکەبوونی ڕۆشنبیری یەك کە ڕەگەزەکانی بەتەواوی دیاری ناکرێن ..؟

**سەرچاوە:**

WWW.DARLHAYAT.COM
2008/12/16



# پەساپۆرتی وڵاتی بەڕوو

سەردەم

لە «نالی»یەوە تا ئەمڕۆ، شیعر دیارترین ژانری ئەدەبی مێژووی ئێمە بووە. گەشەی بەردەوامی شیعری کوردیش لە چرکە ساتی کلاسیکیەوە تا ئێستا، وایکردووە ئەم ئەزموونە هەر لە جوگرافیای کوردستاندا قەتیس نەخوات و بگوازێتەوە ناو کلتورو ئەدەبیاتی وڵاتانی دراوسێ و جیهانیش. گرنگی پێدانی زۆرێك لە رۆشنبیرییە جیاجیاکانی دنیا، بە شیعرو ئەدەبیاتی کوردی، بەتایبەت لە چارەکە سەدەی رابردوودا، بەڵگەی ئەو راستیەیە. ئیتر ئەمە لەرێی وەرگێرانی تێکستە شیعرییەکانی شاعیرانی کوردەوە بێت بۆ سەر زمانەکانی دیکە، یاخود بەو نووسین و لێکۆڵینەوەو باری سەرنجانە بێت کە لەبارەی شیعرو ئەدەبیاتی کوردیەوە دەنوسرێن.

بە حوکمی نزیکی جوگرافی و تێکەڵاوبوونی کلتوری و پێکەوە ژیان، لە ئێستادا زۆرێك لە عەرەبەکان و رۆشنبیران و ئەدیبانی فارسی زمان، خەریکی ئاوڕدانەوەی جدین لە ئەدەبیاتی کوردی بەگشتی و شیعر بەتایبەتی. نموونەیەکی دیار لەو بارەیەوە ئەوەیە کە گۆڤاری (گوهران)کە وەرزنامەیەکی ئەدەبی ئێرانیەو تایبەتە بە شیعر، یەکێك لە ژمارەکانی خۆی تایبەت کردووە بە ئەدەبیاتی شیعری کوردی و ئەو ژمارەیەشی بەناوی (پاسپۆرت سرزمین بلوگ—پەساپۆرتی وڵاتی بەڕو) بڵاوکردۆتەوە.

جگە لە سەروتارەکەی کە تایبەتە بە ئەدەبیاتی کوردی، چەندین بابەتی جۆراوجۆریشی لەسەر شیعری کوردی تێدایە، لە کوردستانی باشوورو کوردستانی خۆرهەڵات. دەربارەی شیعرلە کوردستانی باشووردا ئەم بابەتە دەخوێنینەوە: (گفتوگۆیەك لەگەڵ شێرکۆ بێکەس وکامبیزی کەریمی، قەسیدەی کۆچی مامۆستا شێرکۆ بێکەس کە لەلایەن فاتیح سەعیدی و فایەق ئەحمەدیەوە بەشێکی وەرگێردراوەتە سەرزمانی فارسی، سەرنجێك لە چامەی رەنگدانی شێرکۆ بێکەس بە پێنوسی رەزا کەریم مجاور).

سەبارەت بە شیعری کوردستانی خۆرهەڵاتیش: (گفتوگۆیەك لەگەڵ عەتای نەهایدا لەسەر ئەزموونی شیعری سوارەی ئیلخانی زادەو بابەتێکی دیکەی مامۆستا عەلی ئەشرەفی دەرویشان)، لەگەڵ چوار بابەتی تر دەربارەی شیعری کلاسیکی کوردی کە هەریەك لە (ئیرەج بەهرامی و مەنسوری یاقوتی و فەرهاد پیربال و موختار شوکری پور) بەشداریان تێداکردووە.

بەدرێژایی دوو سەد لاپەرەی ئەم وەرزنامەیە، کە تەرخانە بە شیعری کوردی، خوێنەری فارسی زمان دەتوانێت وەك سەرەتایەك ئاشنایەتی لەگەڵ شیعرو ئەدەبیاتی کوردی پەیدا بکات و ئاگاداری ژانری کلتورێك بێت کە بێ چەندوچون پاسپۆرتی وڵاتی بەڕووە.



# دیکتاتۆر و بێدەنگی

فازڵ سوڵتانی
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

دیکتاتۆر و ستەمکاران، هەموویان ڕقیان لە کتێبە. ئەم ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە و لە یەکەمین کتێب سوتاندنەوە لە مێژودا تا کتێب سوتاندن لە سەردەمی هاوچەرخدا، بە ئاشکرا دیارە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ستەمکاران پێویستیان بە کتێب و نوسەرانە، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر خۆیان نەبنە نوسەر، وەك «سەدام حسێن» یادی بەخێر. لە هەردوو بارەکەشدا دیارە مەبەست چییە! ئەو حەز و ئارەزووە نەخۆشەیەکە هەموو ستەمکارو دیکتاتۆرێك پێیەوە دەتلێتەوە: نەمری. هاوکات هەموو ستەمکارێك بێدەنگی پێخۆشە، ئەگەر نەتوانێت دەنگەکان بکرێت، بە تایبەت دەنگی نوسەرە پایە بەرزەکان، چونکە نوسەرە گچکەکان هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕن، ئیتر ئەگەر بێدەنگ بن یان دەنگ هەڵبڕن و قسە بکەن.

پرسیارەکە ئەوەیە: بۆچی گەورە نوسەران بێدەنگ دەبن لە کاتێکدا دەتوانن شتێك بڵێن کە دەشێت زۆر شت بگۆڕێت؟

نوسەری ڕوسی «فادیم بارانۆف» دەگەڕێتەوە سەر کردنی ئەم پرسیارە سەیر و پڕ ژانە، ئەویش لە میانەی لێکۆڵینەوەیەکدا کە باس لە پەیوەندی نێوان «مەکسیم گۆرکی» و «ستالین» دەکات.

وەکی دەزانرێت خاوەنی ڕۆمانی (دایك) زۆر لە «لینین»ەوە نزیك بوو، هەر ئەویش پێشنیاری تێرمی (ریالیزمی سۆسیالستی) کرد، تەنانەت بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی ئۆکتۆبەریش. دواتر بوو بە دروشمێکی فەرمی حیزب و دەوڵەت و لە سەردەمی حوکمڕانی «ستالین»یشدا، دوچاری شێواندن و خراپ پەیڕەوکردن هات. ئەمەش دەرەنجامێکی خراپ وماڵوێرانکەری هەبوو بۆ سەر ئەدەبی جیهانی و ئەدەب لە وڵاتانی ئێمەوماناندا. ئەڵبەت «گۆرکی» و «لینین»یش لەگەڵیدا (شایەنی باسە لینین بۆ خۆی زۆر حەزی بەم تێرمە نەبوو)، لەو باوەڕەدا نەبوون کە ئەو زاراوەیە ببێتە شمشێرەکەی «دیمۆکلس» لەسەر سەری ئینسانەکان، بەڵام گوناهی گەورەی «گۆرکی» لە بێدەنگی کردنی بوو لەو هەموو تاوانەی «ستالین» کە لەبەرچاویدا ڕویان دەدا.

سەرەڕای ئەوەی هۆشداری دا لەبارەی

هەڵسوکەوتی فاشیەکان لە ئیتاڵیا، کاتێك ساڵی ١٩٢٣ (ئەو ساڵەی فاشیەکان هاتنە سەر حوکم)، بەڵام بێدەنگی لەو جۆرە ڕەفتارانە کرد لە وڵاتەکەی خۆیدا. لە نامەیەکیدا لە ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیاوە کە بۆ «ئەفسیفۆڵد ئیڤانۆڤ»ی نوسەری نوسیووە، دەڵێت: (بیر لە خۆم دەکەمەوە، بە شێوەیەکی گشتی هەستدەکەم پیرەمێردێکم. ئایا وانیم؟ گەشتومەتە حاڵێك شەوانە دوچاری گرژی و تورەبونێکی زۆر دەبم. سەروەختێکیش بە تەنها دەبم، بیر لە دزێوی و ناشیرینیەکانی مرۆڤایەتی دەکەمەوە کە لێرەو لەوێ لە هەڵکشاندایە. چەند جوان دەبوو گەر بمانتوانیایە لوتی هەندێ لەو مرۆڤە بڵحانەمان وردوخاش کردایە کە مێژوی هاوچەرخ دروست دەکەن).

کەچی خۆی بەیەك و شەش چییە، بەشداری لە شکانی ئەو لوتە دزێوەدا نەکرد کە لە بەرچاویدا گەورە دەبوو.

ئەمە وای لە نوسەری نەمساوی «ستیڤان زیڤاڤیج» کرد لە نامەیەکیدا بۆ بیریاری فەرەنسی «ڕۆمان ڕۆلان»، لە هۆکاری ئەو بێدەنگییەی بپرسێت، لە کاتێکدا جیهان چاوەڕێی گەواهی دانێکی ئەو بوو: (گۆرگی زۆر چاك دەزانێت هەموو دنیا چاوەڕێی گەواهی دانێکی ئەون. سۆڤیەتیەکان چاوەڕوانی ئەوەن لێی شتێك بڵێت دەربارەی ئەوەی ڕوودەدات، لە دەرەوە یەکیەتی سۆڤیەتیشدا، هەموان چاوەڕێی ئەوەن بزانن چی دەڵێت).

«گۆرکی» ئەو کاتە لە ئیتاڵیا بوو، لە چەپۆکی «ستالین» بە دوور بوو، وەك «فادیم بارانۆف» لە کتێبەکەیدا دەڵێت: (هاوڕێ و دۆستەکانی پرسیاری ئەو سەرکوت و پاکتاو کردنانەیان لێدەکرد کە لە ڕوسیادا ڕویان دەدا و داوایان لێدەکرد شتێك بڵێت تا ئەو ڕەفتارانە شەرمەزار بکات. قسەکردنی ئەو ئاستێکی بۆ ئەو پرۆسەیە دائەنا، چونکە ئەو لە ناوەوەو دەرەوە، سەرمایەیەکی ڕەمزی گەورەی هەبوو. بەڵام قسەیەکی لە دەم نەهاتە دەر).

تەنانەت ئەو کاتەشی «ستالین» بە ئاشکرا پاساوی بۆ (شەوی چەقۆ درێژەکان — شەوی ٣٠/ ١٩٣٤/٩) هێنایەوە کە ترۆپکی دڕندایەتی «ستالین» بوو، «گۆرکی» هیچی نەوت. ئایا «گۆرکی» خیانەتی لە خۆی کرد؟

بۆچی هاودەردی لەگەڵ ئەو دەیان نوسەرەی ڕوسیادا نیشان نەدا، کە «ستالین» بە بێدەنگی لە ناوی بردن؟ «فادیم بارانۆف» لەم کتێبەیدا بڕیارێکی ڕاست و ڕەوان نادات، لە ڕاستیشدا پێویستی بەوە نییە، چونکە بێدەنگی خیانەتێکە نوسەر بەرلەوەی دەرهەق بە هاوڕێیان و نیشتمانەکەی بکات، ڕێك و ڕاست لە خۆی دەکات.

پێدەچێت «گۆرکی»یش لە ناخەوە هەستی بەوە کردبێت. هاوڕێکانی لێیدەگێڕنەوە کە لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنیدا بیری لە پەرستنی تاکە کەس دەکردەوە، جارێك بە یەکێك لە هاوڕێکانی دەڵێت: (شەخس پەرستی دیاردەیەکی ئاڵۆزە، بەڵام تەواو دڵنیام کارێکی وا تەعبیرە لە تێکچونی ئەقڵ. ئەوانەی ئیگۆیان بێ حەد و حیساب گەورە دەبێت، دەبێتە پەتاو نەخۆشیەکی کوشندە، مرۆڤ کە دوچاری ئەوە بوو، زۆر بە خێرایی دەبێتە کەسێکی پارانۆیی و بە درێژایی ژیانیشی دڕندەیەکی تر وەك تارمایی بە دوایدا دێت، ئەو تارمایەش حەزی چەوساندنەوەو سەرکوتکردنی ئەوانی دییە. بەمجۆرە ئەوەی کە بونی نامێنێت لە ناخی ئەو کەسانەدا مرۆڤە).

«گۆرکی» مرد، بەبێ ئەوەی بتوانێت ئەوە بە «ستالین» بڵێت، وەك چۆن «ئانا ئەخماتۆفا» و «بۆریس باسترناك» و دەیان نوسەری دیکە لەوانەی لە ناو بەستەڵەکەکانی (سیبریا)دا سەریان نایەوە، پێیان وت. بەداخەوە ئەوەش نمونەیەکە لە هەموو شوێن و سەردەمێکدا دووبارە دەبێتەوە.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط).



# بۆ هیدفگ...
# نامە لەبیرکراوەکانی دڵداریی کافکا

ئیبراهیم ئەلحەیدەری
لە عەرەبییەوە: ساکار رەئوف

لەنێو ئەو نامانەی بەم دواییانە دۆزرانەوەو خرانە سەر ئەرشیفی کافکا لە ڤییەنا، چەند نامەیەکی دڵداری لەبیرکراوەی سەردەمی لاوێتی کافکا بوو کە لە هاوینی ١٩٠٧ کەوتبووە داوی. پاش تەواوکردنی خوێندنی مافناسی و وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرا، کافکا هەستی بە دڵەڕاوکێو ماندووبوون کرد، هەر بۆیە بڕیاری دا پشووی هاوین لەماڵی خاڵی لە شارۆچکەی تریشی نزیک ڤیەننا بەسەربەرێت. لە ماوەی مانەوەیدا لە تریش، خوی بەوەوە گرتبوو بە ماتۆڕەکەی بە شەقامەکانیدا پیاسە بکات و زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ دوو کچی رۆشنبیرو ژیر کە لایەنگری پارتی سۆسیالیستی دیموکراتی بوون و ئایدیا سیاسیەکانی خۆیان بۆ کافکا ئاشکرا نەکردبوو، بەسەر بەرێت.

هیدفگ جوان بوو هەروەها ئاگاتاش، بەڵام هیدفگ کورت و پڕو گۆناکانیشی بەردەوام لە شەرمندیدا سوورایيان لێ نەدەبڕا، لێوی سەرەوەشی بەجۆرێك گەورە بوو کە نەیدەتوانی بەتەواوی دەمی داخات، لێوی خوارەوەشی بچووك نەبوو، ئەمە سەرای ئەوەی چاوی لە دوورەوە کەم دەیبینی. هەرچەندە لە جموجوڵیشیدا زراف نەبوو، بەڵام ئەو نیشانە بچوکەی لەسەر لایەکی لووتیدا بوو جوان و خۆشەویستی کردبوو لای کافکا. جارێکیان کافکا بۆ هاورێکەی (ماکس برود) ئەنووسێ کە (ئەو خەو بەو کچەوە دەبینێ).

کافکا ساڵی (١٨٨٣-١٩٢٤) لە شاری پراگ لەدایك بووەو تەمەنی منداڵی هەر لەوێ بەسەربردووە. پاشان چووەتە شاری میونخ (لە ئەڵمانیا) و لە زانکۆی ئەوێدا ئەدەبی ئەڵمانی و دواتریش مافناسی خوێندوە. پاش ئەوەی سییەکانی توشی نەخۆشی دێن، ئیدی دوا ساڵەکانی ژیانی لەنێوان بەرلین و ڤییەنادا بەسەردەبات. بەڵام ئەبێ هیدفگ کێ بێت کە یەکەم جار کافکا کەوتە داوی خۆشەویستییەوە؟

ئەم نامانە هیچ ئاشکرا ناکەن تەنها چەند پزیسکێکی کەمی ئەو خۆشەویستییە نەبێت. لە سەرەتادا کافکا بە «خانمە ئازیزەکەم» بانگی دەکرد و پاشان بە «دڵدارەکەم» و

لە دواییشدا وەك نازپێدانێك دەینووسی «ئازیزە چکۆڵەکەم».

هیدفگ ساڵی ١٩٠٩ دەچێتە پراگ بۆ خوێندن لە زانکۆکەیدا. هەرچەندە پەیوەندی لەگەڵ کافکادا کۆتایی هاتووە، دەکەوێتە هامۆشکردنی ماڵی کافکا و پاشانیش هەوڵی وەرگرتنەوەی ئەو نامانە دەدا کە لە تریش بۆی نووسیبوو. ئایا پەیوەندی ئەم دوانە پەیوەندییەکی سەرپێیی بوو؟ ئەو نامانە هیچ زانیاریەکمان نادەنێ تەنها ئەوە نەبێت کە هیدفگ یەکەم ژن بوو لە ژیانیدا، رەنگە یەکەم خۆشەویستیش بێت کە لە دروستکردنی ژیانی سۆزداری کافکادا، رۆڵێکی کەمی نەبووە، لەگەڵ ئەوەی کافکا ئافرەتی تریشی ناسیبوو.

وێرای هەموو ئەو نامانەی نێوانیان، کافکا «لە پەیوەندی لەگەڵ ژندا وەك سندوقێکی داخراو» بە نادیاری مایەوە، هەموو ئەوەی لە ئەرشیفی کافکادایە بەڵگەیەکی تەواومان نادەنێ سەبارەت بە «یەکەم خۆشەویستی» لە ڤییەنادا.

هیدفگ فایلر کچی کارمەندێکی یەهودی بوو، کە نیشتەجێی یەکێك لە گەڕەکە هەرە ئاپورەکان بوو. دایکیشی لە خێزانێکی چینی ناوەند بوو، بەڵام پێشکەوتنی پیشەسازی و گۆڕانە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکەی لەگەڵیدا هات وای لە هەندێ لە خێزانەکانی چینی ناوەند کرد بچنە نێو بزوتنەوەی سۆسیال دیموکرات لە نەمسا. هیدفگ لەنێو ئەو دەوروبەرە کۆمەڵایەتی- سیاسییەدا گەورە و پەروەردە بوو، خەونە زۆرەکانیشی ئەنگێزەی ئەوەیان دایە کە توانا باڵاکانی خۆی پاوان بکات، چونکە ژیان لای ئەو بریتی بوو لە « ئەبێ مرۆڤ فێر بێت و فێربێت پاشانیش هەر فێربێت» وەك کیتە لایشتر نووسەری هەرە بەناوبانگی ڤییەننا، لەسەری نوسیبوو.

### لەسەر قەنەفەی باخچەکە

ئەو کاتەی کافکا بە هیدفگ ئاشنا بوو، هیدفگ تەنها قوتابیەك بوو خۆی بۆ تاقیکردنەوەکانی قۆناغی ئامادەیی ئامادە دەکرد، ئەوکات کافکا پێنج ساڵ لەو گەورەتر بوو. سەروەختێکیش کافکا لە پراگ هونەری وێنەگرتنی دەخوێند، ئەوان نامەی دڵداریان دەگۆڕیەوە. کافکا هانی هیدفگی ئەدا کە بێتە پراگ و لەوێ خوێندن تەواو بکات و پەیمانیشی دایە یارمەتی بدات لەهەر شتێك کە پێویستی بێت. هەروەها پێشنیاری ئەوەشی بۆ کرد کە وانەی تایبەت بڵێتەوە لەوێ. بەراستیش یارمەتی دا بۆ ئەوەی کارێك لە پراگ بدۆزێتەوە، بەڵام پێشهاتەکان بە پێچەوانەوە روویان دا، کاتێ هیدفگ هەر لە ڤیەننادا مایەوەو کافکاش لە کۆمپانیایەکی بیمە(تأمين) لە پراگ دەستی بە کار کرد. کافکا لە دوا نامەیدا بۆ هیدفگ لە نیسان (ئەپریل) دا نووسیبووی «بۆ خانمە ئازیزەکەم» ئەمەش ئاماژەیەکی ئاشکرا بوو بۆ کۆتایی هاتنی پەیوەندییەکەیان. ئەم پەیوەندییە هەر ئەبوایە کۆتایی بهاتایە چونکە ئەو دوانە لەیەکتر جیاواز بوون: هیدفگ سەر بە ئایدیای سۆشیالیستە دیموکراتییەکان بوو، لەکاتێکدا کافکا هیچ ئینتیمایەکی نەبوو. ساڵی ١٩٠٩ هیدفگ تاقیکردنەوەکانی قۆناغی ئامادەیی تەواوکرد و چووە زانکۆی ڤییەنا بۆ خوێندنی ئەدەبی ئەڵمانی و فەلسەفە. لە ساڵی ١٩١٤ دا بروانامەی دکتۆرای فەلسەفەی لە درامای ئەڵمانیدا وەرگرت، وەلێ کافکا هێشتا دەنگدانەوەی وشەکانی هیدفگ لە گوێیدا دەزرنگایەوە: «لە سەرەتای تینوێتی مرۆڤ بۆ کارکردن پێویستە رۆژنامەی کرێکاران بخوێنێتەوەو لەگەڵ ئازارو مەینەتیەکانی خەڵکدا بەشداریەکی چالاکانەی هەبێ» کافکا هیچ گوێی بە ئایدیا سیاسیەکانی ئەو نەئەداو ساڵی ١٩٠٧ قەسیدەیەکی بۆ نووسی، تیایدا گوزارشتی لە «ماندووبونی ئەوو و ماندووبونی زەمانە» کرد:

«لەژێر خۆرئاوابووندا
بە کۆماوەیی دائەنیشین
لەسەر قەنەفەی ناو باخچەکە
دەستەکانمان شۆڕبۆتەوە

خەم بە پێڵوەکانمانەوەیە
ئەو کات خەڵك پیاسەدەکەن
بەسەر بەردەکاندا لارە لارە دەکەن
لەژێر ئاسمانی بەریندا
کە تا گردۆڵکە دوورەکان درێژدەبنەوە...»

هیدفگ ئەمەی پێ ناخۆش بوو و رەخنەی توندی لە شێوازی بیرکردنەوەی کافکا گرت. وشەکانی هیدفگ، کافکای توشی هێدمە کرد، بۆیە کافکا وەڵامی دایەوەو نووسی «ئەبێ چی بکەم و چۆنیش بتوانم خوراگر بم؟» و لەباتی ئەوەی «رۆژنامەی کرێکاران» بخوێنێتەوە، رەخنەی توندی ئاراستەی هیدفگ کرد و ئیشارەتی بەو جلوبەرگانە دا کە ئەو دەیپۆشی.

پاش ئەوەی پارتی کۆمەڵایەتی- دیموکراسی ساڵی ١٩٠٧ رای لەسەر مافی پیاو لە بەشداریکردن لە هەڵبژاردندا دا و ژنی لێی بێبەش کرد، ئەم دووانە لەسەر بیرۆکەی یەکسانی و مافی ژن لە هەڵبژاردندا ناکۆك بوون. هیدفگ جارێکیان نووسی «دەبوا کافکا بایەخێکی تەواوی بە مەسەلەی دیموکراسی بدایە». دواییش بۆی نووسی «گەورەم پێم وایە تۆ راستگۆ نیت... ئەی بۆچی بانگم دەکەی «خانمە ئازیزەکەم» لەکاتێکدا من دڵنیام لەوەی کە ناتوانی راستیەکە بڵێیت چونکە ماندووکەرە». پاشان جیابوونەوە.

لەدواییدا کافکا بە زیاد لە ژنێك وابەستە دەبێ و نامە بۆ فلیس و ملینا دەنێرێ. لە دوایین رۆژەکانی ژیانیدا چاوی بە دورا دیمانت دەکەوێ.

**سەرچاوە:**

WWW.DARALHAYAT.NET



# "ئەلتەیب ساڵح" لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا و لە لەندەن کۆچی دوایی دەکات


عەبدە وازن

لە عەرەبییەوە: ساکار رەئوف


ئایا تەنها رۆمانێك دەتوانێت خاوەنەکەی بکاتە (ئەفسانە) وەك چۆن رۆمانی (وەرزی کۆچ بەرەو باکوور) ئەلتەیب ساڵحی کردە (ئەفسانە)ی ئەدەبی نوێی عەرەبی؟ ئەم رۆماننووسە سودانیە کە بەیانی رۆژی چوار شەممە ٢٠٠٩/٢/١٨ لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا لە لەندەن کۆچی دوایی کرد، بە درێژایی ژیانی وەك خۆی جارێکیان ئاماژەی پێکردووە، نەیتوانیوە لە دەسەڵاتی ئەو رۆمانە دەرباز بێت کە هێندەی نێوبانگی پێبەخشیوە هێندەش ماندووی کردوە. هەرچەندە رۆمانی نایابی دیکەی وەك (عرس الزين) و (بندر شاه)ی نووسیوە، بەڵام هەروابەستەی رۆمانی (وەرزی کۆچ بەرەو باکوور) بووە.

سەروەختێك ساڵح ئەم رۆمانەی لە ساڵی ١٩٦٦ دا لە بەیروت بڵاوکردەوە، وای بەخەیاڵدا نەدەهات کە پێش بیرمەندی ئەمەریکی سامۆئێل هانتنگتۆن بکەوێت لە دارشتنی تیۆری(بەریەککەوتنی شارستانیەتەکان)دا. ئەم رۆمانە بەراستی پێشدەست بوو لە وێناکردنی ئەم ململانێیە، لەرێی هەڵوێستی پاڵەوانی رۆمانەکە کە (موستەفا سەعید)ەو کوری جیهانی سێهەمە، بەرامبەر بە خۆرئاوای پێشکەوتوو. ساڵح لە هەموو ئەو رۆماننووسە عەرەبانەی پێش خۆی کە لەم بوارەدا نوسیویانە، بوێرتر بووە، لەوانەش توفيق ئەلحکیم لە رۆمانی (عصفور من الشرق) و سهیل ئیدریس لە (الحى اللاتينى)دا. پاڵەوانە سودانییەکە لە رۆمانەکەدا درکی بەوە کردبوو کە خۆرئاوا هەر تەنها شارستانیەتی خۆی بۆ خۆرهەڵات نەهێناوە، بەڵکو داگیرکردنیش. سۆزو نۆستالۆژیاشی بۆ باکوور بە ئەندازەی خۆشەویستی و لێکبوردەییەکەی، رق و کینەی پێوە دیاربوو.

ئەلتەیب ساڵح وەك رۆماننوسێك و سیاسیەك لە سودان و هەندێ دەوڵەتی عەرەبی و هەروەها لە ئەوروپا و بەتایبەتی لە بەریتانیادا، ژیانێکی پر لە ژاوەژاوی هەبووە. سەرەرای کۆچ و ئەو «تاراوگە» دوورودرێژەی کە خۆی هەڵیبژاردبوو، بەدرێژایی ژیانی وابەستەی سودان بووەو هەرگیز لە خەیاڵ و ویژدانی دەرنەچووە، پەیوەندیشی بە سیاسەت و کۆمەڵگاو هەموو ئەو گۆرانکاریانەی بەسەریاندا هاتبوو، بە بەهێزی مایەوە. هەڵوێستی نەگەتیڤانەی ئەم نووسەرە بەرامبەر بە «بەرەی رزگاری» کە لەرێی کودەتاوە لە حوزەیرانی ساڵی

١٩٨٩دەسەڵاتی گرتە دەست، ئاشکرا بوو، وتە بەناوبانگەکەشی کە دەڵێ( ئەمانە لە کوێوە هاتوون) ئەو کات باو بوو، کە دواتر نووسەرانێکی زۆری سودانی پەیڕەوییان کرد. دەسەڵاتدارانی سودان بە ئەنقەست ڕێگایان لە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە گرت لە زانکۆی خەرتوم بخوێنرێت، بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو ئەم نووسەرە بەرهەڵستکارە لەسەر بانگهێشتی حکومەت لە ساڵی ٢٠٠٥دا گەڕایەوە سودان و بەشداری لە فێستیڤاڵی (خەرتوم پایتەختی رۆشنبیری عەرەبییە)دا کردو بووە (ئەستێرە)ی ئەو فێستیڤاڵە. بەڵام هەر خێرا دەنگی نارەزایی دژی ئەم سەردانە بەرزبۆوەو رەخنەیان لە هەڵوێستی نووسەر گرت بەرامبەر بە مەسەلەی دارفۆرو بزوتنەوە چەکداریەکان و چەند مەسەلەیەکی تریش. هەندێ کەس پێیان خۆش بوو بەراورد لەنێوان ئەو و موتەنەبیدا، سەبارەت بە پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە، بکەن. بەڕاستیش ئەو شەیدای موتەنەبی بوو، شیعرەکانی لەبەر دەکردو لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا دەیوتەوە، کتێبێکیشی لەسەر دانا بەناوی (لەگەڵ موتەنەبیدا).

ئەلتەیب ساڵح دیارترین و ناسراوترین نووسەری عەرەبی بوو لە نێو نووسەرە سودانیەکاندا، هەرچەندە ئەدەبی رۆمان و چیرۆکی ئەو وەك پردێك وابوو لە نێوان ناوەوەی سودان و دەرەوەی عەرەبی و جیهانی، ئەو هیچ کات نە لە ئەدەبی سودان و نە لە خەمەکانی دانەبڕابوو. نووسەر (وەرزی کۆچ بەرەو باکور)ی لە لەندەن کە تێیدا دەژیا، لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٣دا نووسی. کاتێکیش ئەم رۆمانە لە ساڵی ١٩٦٦ لە بەیروت بڵاوکرایەوە، وەك رووداوێکی چاوەڕوانکراو بوو لە بواری رۆماننوسیندا، بەڵام لەباتی ئەوەی لە قاهیرە یان بەغداد یان لە بەیروتەوە بێت، ئەمجارەیان لە سودانەوە هات. نووسەر لەم رۆمانە نایابەدا توانی پرۆژەیەکی نوێی رۆمان، کە لە رووی شێوەو تەکنیك و رووداو و کارەکتەرەوە تازەگەری پێوە دیار بێت پێشکەش بکات، ئەمە وێڕای ئەو کێشمەکێشەی رۆمانەکە بارگاوی بوو پێی، ئەویش ململانێی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا یان باشور و باکورە، لە میانەی پەیوەندییەکی تراژیدی لەنێوان پاڵەوانی رۆمانەکە «مستەفا سەعید» و «ژنە» بەریتانییەکەیدا. سەروەختێکیش رۆمانەکە بڵاوبۆوە، ئیدی ناوی ئەم پاڵەوانە «مستەفا سەعید»، نێوبانگی چووە پاڵ نێوبانگی هەندێ لە پاڵەوانەکانی نەجیب مەحفوز بەتایبەتی «ئەحمەد عەبدوالجەواد» لە «سێینەدا».

هەرچەندە رۆمانی «وەرزی کۆچ بەرەو باکوور» بە لوتکەی کارەکانی ئەلتەیب ساڵح و ناسراوترین و بڵاوترین کارەکانی دەردەکەوێت، بەڵام بەرهەمەکانی تری لە بواری رۆمان و چیرۆکدا، لە زمانی گێڕانەوەی یان لە تەکنیك و شێوەدا بەدەر نین لە تایبەتمەندێتی. لەو کارانەش رۆمانی «عرس الزين» کە باس لە ئەفسانەی پیاوێکی لادێی رەفتارسەیر دەکات کە ناوی «الزين»ە و پەیوەندی لەگەڵ کچێکدا هەیە بەناوی «نعمە»، هەروەها رۆمانی «بندر شاه» لە هەردوو بەشەکەیدا «ضوء البيت» و «مريود». ئەم رۆمانەش ئەو پێکدادانە ژینگەیی و شارستانییەی لە نێوان کۆن و نوێدا هەیە بەرجەستە دەکات. لە کارە جوانەکانی نووسەر لە بواری چیرۆکدا «دومە ود حامد»ە کە باس لە ململانێی نێوان حکومەت و خەڵکی گوندی «ود حامد» کە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی رووباری نیل، دەکات. حکومەت دەیەوێ گوندەکە نۆژەن بکاتەوە و درەختی دوم کە رەمزی گوندەکەیە ریشەکێش بکات، بەڵام خەڵکی گوندەکە پێ لەسەر ئەو داب و نەریتەی بەمیراتی بۆیان ماوەتەوە دادەگرن. ئەم گوندە «ود حامد» لە زۆر لە کارەکانی ئەلتەیب ساڵحدا، وەك رەمزێك بۆ ئەو جیهانی منداڵی و بێگەردییەی لە باکوری سودان ریشەی داکوتاوە، ئامادەگی هەیە.

ئەلتەیب ساڵح کۆچی کردو وا بە نیاز بوو ژیاننامەی خۆی بنووسێتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی هەلومەرجی یارمەتی نەدا، هەربۆیە تەنها بەوە رازی بوو کتێبێك بڵاوبکاتەوە بە ناوی (منسي: انسان نادر على طريقته). لە میانەی ئەم کتێبەدا، هەندێ لە سیمای ئەو ژیاننامەیەی تژیە لە رووداو و بەسەرهاتی جوان، دەردەکەوێت.

**سەرچاوە:**

WWW.ALHAYAT.COM



# گاندی و تیرۆر

عەبدولئیلاه عەبدولقادر
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

گاندی.. سەرۆکی هیندو سومبولەکەی کە گەلانی هندستان هەرگیز لەبیری ناکەن، لەلایەن توندڕەوێکی هیندۆسییەوە بە سێ فیشەك تیرۆرکرا. تاوانی گاندی هیچ نەبوو تەنها ئەوە نەبێت سەرکردەیەکی نیشتیمانی لێکبوردە بوو. باوەڕی بە ڕەگەزپەرستی، ململانێی ئاینی یاخود توندڕەوی یان توندوتیژی یاخود تیرۆر نەبوو.

«مهاتما موهنداس گاندی» لە دووی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٦٩ لە خێزانێکی ناسراو هاتوەتە دنیاوە. لە هند فێری خوێندەواری بووە، لە بەریتانیا یاسای خوێندووە. لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا ژنی هێناوە، کاری محاماتی کردووەو پاشان سەفەری کردووە بۆ خواروی ئەفریقاو لەوێ چەند ساڵێك لەناو ڕەگەزپەرستی ئەو سەردەمەی ئەفریقادا ژیاوە، بگرە ستەمو زۆرداری ئەو شەپۆلە بەربەریانەی ڕەگەزپەرستی چەشتووە. «گاندی» لەم بارەیەوە باس لەوەدەکات جارێکیان ویستویەتی سواری شەمەندەفەر بێتو لەو شوێنەدا دابنیشێت کە تایبەت بووە بە ڕەگەزی سپی، وەلێ هەندێ کەسی سپی پێست ئەوەیان پێ ناخۆش بووە، پۆلیسیان بۆ هێناوە، پۆلیسەکان «گاندی»یان ناچارکردووە شەمەندەفەرەکە جێبهێڵێت، گەرچی بە پارەی خۆی بلیتێکی فەرمی کڕیبوو.

«گاندی» لەو چرکەساتەوە لە نیشتیمانەکەیو لە دەرەوەی وڵاتەکەی، مەشخەڵی بەرگریکردنی لە مافەکانی مرۆڤ بەرزکردەوە. پێنوسی کردە چەكو فیکری کراوەی کردە شێوازی ئیشکردن. باوەڕی بە ئازادی هەبوو، دژی ڕەگەزپەرستی پێستو ئاینو مەزهەب ڕاوەستا، لە باتی توندوتیژی خۆشەویستی بڵاوکردەوە. گەرچی ئیمپرالیزمی بەریتانی لە وڵاتەکەیدا هەموو جۆرە ستەمو ئازارێکی میللەتەکەی دەدا، گەرچی بەریتانیای داگیرکەر گەلی هیندو خاکەکەی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاردەهێنا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا «گاندی» بانگەشەی بەرگریکردنی ئاشتیانەی دەکرد. «گاندی» یەکێك لە شێوازەکانی ئیشکردنی باوەڕی بە مەسەلەی (موقاتەعەکردن) بوو، بۆ نمونە موقاتەعەکردنی کاڵا بەریتانییەکانو ڕازیبوون بە کاڵا هیندییە یەدەگەکان.

کاتێ «گاندی» لە ساڵی ١٩١٤ گەڕایەوە وڵاتەکەی، واتە گەڕایەوە هند، ڕوبەڕوی دڕندەیی ئیمپرالیزمی بەریتانی بوەوە، بەڵام بەردەوامبوو لەسەر ئیمانی بە بەرگریکردنی ئاشتیانە. تەنانەت حکومەت لە هند خەڵکی ناچارکرد خوێ وەك باجێك بکڕنو هاوڵاتی هیندی ئەو باجەی دەدا، کەچی «گاندی» سوربوو لەسەر ئەوەی موقاتەعەی خوێی حکومەت بکات. بۆ ئەو مەبەستە ڕێپێوانێکی بۆ کەناری ڕوبار ڕێکخست کە نزیکەی ٢٠٠ میل لە شارەکەوە دووربوو، بەمەش توانی سەرنجی جیهان بۆ ئەو ڕێپێوانە ڕابکێشێتو ویژدانی مرۆڤایەتیش لەگەڵ «گاندی»دا بوو بۆ موقاتەعەکردنی خوێی حکومەتی بەریتانی. لێرەوە پرۆژەی باجی خوێ شکستی هێناو «گاندی» خرایە زیندانەوە. «گاندی» تەنانەت ڕازی نەبوو جلوبەرگی ئەفرەنجە کە لە بەریتانیا جلوبەرگێکی ناسراوبوو لەبەربکات، بەڵکو جلوبەرگە خورییەکەی خۆی لەبەر دەکرد کە خۆی دروستی کردبوو، دواتر «گاندی» بەم جلوبەرگانە ناسرا، هەروەها لە شیری بزنەکەی خۆی دەخواردەوە.

«گاندی» کەسێکی کراوە بوو، قورئانو سیرەی پێغەمبەری خوێندووەتەوە، سەرسام بووە بە پێغەمبەر. هەروەها ئینجیلی خوێندوەتەوەو فیکرەی مەسیح بۆ لێکبوردەییو خۆشەویستی تەبەنی کردووە. «گاندی» گەرچی هیندۆسی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیمانی بەوەبوو بەسەر ئاینو مەزهەبو میللەتانی دیکەدا بکرێتەوە. ئەو پیاوێکی نیشتیمانپەروەربووسەربەخۆیی هندی بەدەستهێنا. کاتێ ڕۆژنامەنوسی توندڕەو «سو ناسۆرام جۆدس» گاندی تیرۆرکرد، «گاندی» لە میحرابەکەی خۆیدا بۆ نوێژکردن دەڕۆشت، سێ فیشەکی پێوەنا. لەو کاتەدا «گاندی» تەمەنی لەسەروی هەشتا ساڵەوە بوو.

«گاندی» شەوی پێش تیرۆرکردنەکەی لە شارۆچکەکەی خۆی (بۆرباندر) کە تێیدا لەدایکببوو، لەگەڵ دانیشتوانی شارۆچکەکەدا سرودێکی دەوت، سرودەکە دەڵێ: (ئەم دنیایە سەیرە، ئاخۆ تاکو کەی گەمەی ژیانی تێدا دەکەم).

**سەرچاوە:**

مسارات البیان- ٢٠٠٩/٢/٨

# نانی ڕووت

لاس




سەدەی بیستەم سەدەی دەرکەوتن و گەشەکردنی ڕۆمانە لە وڵاتانی عەرەبیدا. لە نیوەی دووەمی ئەو سەدەیەدا سەدان ڕۆمان و دەیان ڕۆماننوس لەدایك دەبن، بەڵام کەمێك لەو ڕۆمانانە شۆرەت و نێوبانگ پەیدا دەکەن و وەردەگێڕدرینە سەر زمانە جیاجیاکانی دنیا.

لەناو زۆری ژمارەی ئەو ڕۆمانانەی لە نیوەی دووەمی سەدەی رابردوودا لە وڵاتانی عەرەبیدا نووسراون، سێ ڕۆمان چانسی ناوبانگی زۆرو شۆرەت پەیداکردنیان هەبووە، ئەوانیش ئەم ڕۆمانانەن:

- (اولاد حارتنا)، لە نووسینی «نەجیب مەحفوز».

- (موسم الهجرة الی الشمال)، لە نووسینی «الطیب صالح».

- (الخبز الحافی) یان نانی ڕوت، لە نووسینی «محەمەد شوکری».

وەکی ئاشکرایە «نەجیب مەحفوز» لەپای ئەو ڕۆمانەیدا، گەورەترین خەڵاتی ئەدەبی جیهانی بەدەست هێنا،کە خەڵاتی نۆبڵە. هەردوو ڕۆمانەکەی «الطیب صالح» و «محەمەد شوکری»ش، تا ئێستا چاپدەکرێنەوەو تەرجەمە دەکرێن بۆ سەر زمانەکانی دیکە. ڕۆشنبیری کوردی لەناو ئەو سێ ڕۆمانەدا، تەنها (نانی روت) ی کردۆتە کوردی و دوو ڕۆمانەکەی تر هێشتا لەچاوەڕوانیدان.

«محەمەد شوکری» نووسەری ئەم ڕۆمانە، ساڵی ١٩٣٥ لە وڵاتی مەراکیش هاتۆتە دنیاوەو ساڵی ٢٠٠٣ ماڵئاوایی

لە ژیان کردووە. ئەم پیاوە تا تەمەنی بیست ساڵانیش نەخوێندەوار بووەو وەکی بوەیهەمیەك، لەسەر شەقامەکان ژیاوەو شەوی رۆژ کردۆتەوە. ئەو نەهامەتی و دەربەدەریەی لە تەمەنی منداڵی و لاوێتیدا بینیویەتی، کردویەتیە کەرەستەی نووسین و بەشێکی زۆری نووسینەکانی سەربوردەی گوزەران و ژیانی خۆیەتی. «شوکری» یەکێکە لەو نووسەرە دەگمەنانەی لە ئەدەبەکەیدا، راشکاوانە باسی نهێنی و تێکشکان و شورەییەکانی کۆمەڵگای مەغریبی کردووە. یەکێکە لەوانەی پەردەی لەروی دزێویەکانی خێزانی کۆمەڵگەی خۆرهەڵاتی هەڵداوەتەوە.

ئەم پیاوە بەهۆی جورئەتی زۆری لە وتنی راستیەکاندا، سەرەتا نەیتوانیوە کتێبەکەی بە زمانی عەرەبی چاپ بکات. هەربۆیە یەکەمجار بە ئینگلیزی و دواتر بە ئیسپانی و پاشان بە فەرەنسی و دوای ئەوە بە عەرەبی چاپ دەکرێت.

ئەم کتێبە رۆمانێکە لێوان لێو لە قەهرو خەمناکی و فرمێسك و تێکشکان و نائومێدی. پڕیەتی لە حەسرەت و لە دڵشکان، لە ڕاکردن بۆ پەناگەیەکی ئارام و گەڕان لە نانێکی گەرم و لە باوەشێکی پڕ میهر. ئەڵبەتە کاتێك کە «شوکری» لە هەموو ئەمانە مەحروم دەبێت و دەستی پێیان ناگات، نەفرەت لە دنیا و لە کۆمەڵگەو لەو ئەخلاقیاتانەش دەکات، جگە لە ریاکاری و سوکایەتیکردن بە ژیان و بە مرۆڤ هیچی تری لەبەردا نییە.

رەنگە نانی ڕوت سەربوردەی هەریەکێکمان بێت و حەکایەتی هەموو ئەوانە بێت کە لە کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتدا دەژین، بەڵام کەم کەس دەتوانێت وەکی «محەمەد شوکری» ئەو بەسەرهاتانە بە جورئەتەوە، لە چوارچێوەی بابەتێکی ئەدەبی وەها بەرزدا بنوسێتەوە.



# سندوقە تازەکەی (گۆنتر گراس) هیچ نهێنییەکی تازەی تێدا نییە

مەروان عەلی
لە عەرەبییەوە: باوکی ڕەهەند

(سندوق) ناونیشانی ڕۆمانێکی تازەی ڕۆماننوسی ئەڵمانی ناسراو «گۆنتر گراس»ە، ئەم ڕۆمانە بەشی دووەمی یاداشتەکانی نوسەرە، بەشی یەکەمی یاداشتەکانی لەژێر ناونیشانی (لە کاتی پیاز پاککردندا) بڵاوکراوەتەوە. بڵاوبونەوەی بەشی یەکەمی ئەم یاداشتانە هەرایەکی گەورەی نایەوە، چونکە تێیدا «گۆنتر گراس» دان بەوەدا دەنێت کە چووەتە ڕیزی جیهازی هەواڵگری (ئێس..ئێس)ی نازییەوە کە بە (هێزی نوخبە) ناسراوە، ئەم هێزە لە ئەڵمانیا هەستاوە بە کوشتنو لەناوبردنی ملیۆنان کەسی کۆمۆنیستو جولەکەو قەرەج کە بەرهەڵستی نازییەکان بوون.

«گۆنتر گراس» ئاوا دەست بە ڕۆمانە تازەکەی (سندوق) دەکات: (باوکێك کە چوبووە ساڵەوە، بانگی چوار، پێنج، شەش، هەشت کوڕو کچەکانی کرد.. ئەوانیش دوای دوودڵییەکی دوورو درێژ هاتن، ئێستا لە دەوری مێزی نانخواردنەکە دانیشتونو قسە دەکەن).

«گراس» لەم ڕۆمانە تازەیەیدا بۆ خستنەڕووی یاداشتەکانی ژیانی خۆی، شێوازی گێڕانەوە بەکاردەهێنێت. لێرەوە دەکرێت ئەم ڕۆمانە بەشێوەیەکی سەربەخۆ یان وەك بەشی دووەمی یاداشتەکانی بخوێنرێتەوە. هەروەها دەکرێت بەشەکانی کتێبەکە وەك حیکایەتێکی سەربەخۆ بخوێنرێتەوە. ئەمە شێوازی نوسینی «گۆنتر گراس»ە، تاکو پشویەکی کورت بدات بە خوێنەرەکەی، هەروەها تاکو چۆنیەتی خوێندنەوەو شێوازی خوێندنەوەشی پێبدات. پێدەچێت ئەو هێرشەی کە دوای دانپیانانە گەورەکەیو بڵاوکردنەوەی لە بەشی یەکەمی یاداشتەکانیدا ڕوبەڕوی بوەوە، وای لە«گراس» کردبێت ئەو شێوازی

نوسینە بگرێتەبەر کە لە ڕاگەیاندنی ئاگربەستێك دەچێت لەگەڵ خوێنەردا.

هەندێ لە ڕەخنەگرەکانی ئەڵمانو هەندێ لەوانەی ئاگاداری ئەزمونی «گۆنتر گراس»ن، پێیانوایە ڕۆمانی سندوق وەڵامدانەوەیەکی ژێربەژێری ئەو کەسانەیە کە ڕەخنەیان لە بەشی یەکەمی یاداشتەکانی گرت. ئاشکرایە «گراس» بەهۆی ئەو بۆمبەی تەقاندییەوە، لەلایەن هەموانەوە ڕوبەڕوی هێرشێکی مونەزەمو پلان بۆ دانراو بووەوە، لە ڕاستڕەوەوە بۆ چەپەکان، لە ڕۆشنبیرانو سیاسییەکانەوە بۆ خەڵکانی سادە، تەنانەت لەلایەن نوسەرو شاعیرو هونەرمەندەکانی هاوڕێشیەوە، ڕوبەڕوی هێرش بووەوە. ئەو بۆمبەی نوسەر تەقاندییەوە، بەپێی دەربڕینی هەندێك لەوانەی هێرشیان کردە سەر نوسەر، بووە هۆی (کەوتنی ئەخلاقیانەی گراس). چونکە ئەوە خودی «گراس» بوو سەرکردایەتی ئەو هێرشەی دەکرد کە دەکرایە سەر ئەو کەسانەی ڕابردوی نازی خۆیان دەشاردەوە.

بەڵام ئایا هەموو ئەوەی «گراس» لە (سندوق)دا دەیڵێ حەقیقەتە یاخود ئەوە حەقیقەتێکە لە خەیاڵدانی نوسەردا دروستکراوە؟ لەمبارەیەوە «گراس» دەڵێ: (پیشەی نوسەر، نوسەر ناچار دەکات درۆ بکات، ئەدەبی باش بریتییە لە شێوەیەك لە شێوەکانی درۆ).

«گراس» هیچ ئیختیارێك بۆ خوێنەری ناهێڵێتەوە، خوێنەر لە گۆشەیەکی دژواردا گیردەکاتو ئەو درۆیانەی بە شێوازێك بۆ دەگێڕێتەوە کە خوێنەرەکە نازانێت ئایا ئەوانە حەقیقەتن یاخود درۆن. پێدەچێت دڵەڕاوکێکردن بە ڕۆحی خوێنەرو هاندانی خوێنەر بۆ گەڕان بەدوای حەقیقەتدا، ئەرکی نوسەرە بلیمەتەکان بێت، وەك ئەوەی «گراس» بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە کتێبی (سندوق)دا دەیڵێت.

«گراس» لەم بەشی دووەمەی یاداشتەکانیدا، هیچ کەسێك ناوروژێنێت، تەنها کۆمەڵێ حیکایەت دەربارەی پیاوێكو هەشت منداڵەکەی دەگێڕێتەوە. نوسەر لە میانەی ئەو حیکایەتانەوە وێنەیەکی ڕوونو ئاشکرای خۆیو خێزانەکەیو تەمەنە هەشتا ساڵییەکەی دەکێشێت. بەڵام نهێنییەکان، ئەمە گەر نهێنی دیکە مابێت، جگە لەو نهێنیانەی پێش دوو ساڵ لەمەوبەر لە بەشی یەکەمی یاداشتەکانیدا دانی پێداناون، ئەوا لەوانەیە لە سندوقێکی دیکەدا بێت نەك لەم سندوقەی ئێستا.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی الشرق الاوسط/ ژمارە ١٠٩٤٦/ بەرواری ٤ کانونی یەکەم/ ٢٠٠٨

# ئاهەنگی ماڵئاوایی

سەردەم

ژیانی ناو سیستمە تۆتالیتاریەکان ڕێك و ڕاست بە دۆزەخ دەچێت. ئەگەرچی توانای زۆری ئەو ڕژێمانە بۆئەوە بە خەرج دەدرێت تا بە خەڵکی و بە جیهانی دەرەوە بڵێن: (بە هەشت لێرەیە)، بەڵام هەرزوو ئەو دروشم و ئەو لاف و گەزافە درۆزنانە ئاشکرا دەبن و حەقیقەت خۆی بەیان دەکات.

رەنگە لە دەرەوە زۆر باس لەو دۆزەخانە بکرێت و ماجەرا سەیرو سەمەرەکانی لەرێی کتێب و میدیاکانەوە نیشان بدرێت، بەڵام هەرگیز کەس ناتوانێت وەك ئەوانە باس لە جەوهەری ئەو واقیعە تاڵە بکات و بەسەرهاتی ئەو ژینگانە وەکی خۆی و بێ رتوش بگێڕێتەوە، کە خۆیان تێیدا ژیاون و بە ئاگرەکەی داخکراون.

لەدوای دووەم جەنگی جیهانی و دوای ئەوەی گەلانی دنیا، دوو بەڵای گەورەی وەك نازیزم و فاشیزمیان لەکۆڵ بوەوە، بەشێکی ئەوروپا کەوتە بندەستی شۆرەوی و سەروەختێکیش «ستالین» دەستی بە کرملین گەیشت، تەوقێکی ئاسنینی کردە گەردنی گەلانی ئەوروپای خۆرهەڵات.

لێرەوە چەندین نووسەرو ئەدیب و هونەرمەند و ئەکتیڤستی سیاسی، دەکەونە بەر خوردو شکاندنی ئەو بێدەنگییەی سانسۆرو دەزگا نهێنییەکانی «هۆنیکەر» و «چاوچیسکۆ» و دەسەڵاتدارە دیسپۆتیزمەکانی دیکە دروستیان کردبوو. لەم سەرو بەندەدا ئێمە بە دەنگی نارازی «ئەلیکسەندەر سۆلژێنستن» و «ئەندرێ تاراکۆفسکی» و «بۆریس باسترناك» و «ڤاسلاڤ هاڤل» و «جۆزیف برۆدسکی» و «میلان کۆندێرا» ئاشنا دەبین.

ئەم کتێبە کە رۆمانێکە بەناوی (ئاهەنگی ماڵئاوایی)، یەکێك لەو دەنگە نارازیانەی وڵاتی چیکۆسلۆڤاکیای جاران «میلان کۆندێرا» ساڵی ١٩٧٢ نووسیویەتی. «کۆندێرا» خاوەنی چەندین رۆمانی ترە، وەك: (ژیان لە شوێنێکی ترە، پێکەنین و بیرچوونەوە، جەهل و ....هتد).

ئەگەر لەم رۆمانانەدا باسی دەورانی «ستالین» و بەهاری پراگ و داگیرکردنی چیکۆسلۆڤاکیای کردبێت لەلایەن یەکیەتی سۆڤیەتی جارانەوە، ئەوا لەم رۆمانەیدا (ئاهەنگی ماڵئاوایی)، باس لە سستمێکی سیاسی دیاریکراو ناکات، ئەوەندەی دەست لەسەر تراژیدیا ئینسانیەکان دادەنێت.

ئەم رۆمانە بە خۆشترین و سەرنج راکێشترین کارە ئەدەبیەکانی «کۆندێرا» دادەنرێت، چونکە ئەو توانیویەتی بەشێوەیەکی سوك و ئاسان، بە زمانێکی سادەو شەفاف، باس لە بابەتە هەرە گرنگەکان بکات.

ئەم رۆمانە پێمان دەڵێت سستمی تۆتالیتار و مەرگ دۆست و داخراو، بەردەوام مرۆڤی دەرون نەخۆش و شەرانگێزو ترسناك بەرهەم دێنێت.

# چەند دێڕێك لەسەر ژیانی ولیەم رایش

سەردەم

رەنگە لە بواری دەرونشیکاریدا بە درێژایی سەدەی بیستەم ناوی زیاد لە زاناو بیرمەندێکمان بیستبێت، بەڵام هیچ یەك لەوانە هێندەی «سیگمۆند فرۆید»ی دامەزرێنەری قوتابخانەی دەرونشیکاری و «ولیەم رایش»، خاوەنی شۆرەت و نێوبانگ نەبووبن و شوێن دەستیان بە قوڵی لەسەر ئەو کایە گرنگە دیارنەبێت. «فرۆید» بەهاتنی و لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا وەك هەموو بیرمەندێکی مەزن و بلیمەت، کەشفێکی گەورەی کردو توانی لەرێی دەرونشیکارییەوە پەی بە ناخود ئاگای مرۆڤ بەرێت، هاوکات ئەو هاوکێشە باوە تێکبداتەوە کە تابەر لە هاتنی ئەو پێیوابوو، مرۆڤ ئاگایی جڵەوی دەکات و هەڵسوکەوتەکانی لەژێر کۆنترۆڵی ئەقڵ و ئاگایدایە.

فەیلەسوفی فەرەنسی «میشێل فۆکۆ» لە وتارێکیدا لەژێر سەردێری (فرۆید، نیچە، مارکس)دا دەڵێت: (ئەم سێ بیرمەندەبوون توانیان لەناو پرۆژەی رۆشنبیری خۆرئاوادا کەشفی گەورە بکەن و سیاسەتی نێولێکدانەوە بگۆرن). ئەڵبەت ناوهێنانی «فرۆید» لەگەڵ دوو مەزنە بیریاری وەك «کارل مارکس» و فردریك نیچە»دا، بەڵگەی گەورەیی و بلیمەتی ئەون.

بێگومان بەدرێژایی سەدەی رابردوو قوتابخانەی دەروونشیکاری و «فرۆید» چەندین خوێندکارو میراتگری بۆ دروست بووە، بەڵام رەنگە «ولیەم رایش» و «میلانی کلاین» و «جاك لاکان»، لە هەرە بزێوترین و ژیرترین خوێندکارەکانی ئەو قوتابخانەیەبن.

(چەند دێرێك لەسەر ژیانی ولیەم رایش)، باس لە ژیان و سەربوردەی دەرونشیکاری ئەڵەمانی «ولیەم رایش» دەکات. ئەو لەساڵی ١٨٩٧ لەدایك دەبێت و لە ساڵی ١٩٥٧ماڵئاوایی لە ژیان دەکات. لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا دایکی دەمرێت و لە حەڤدە ساڵیشدا باوکی لەدەست دەدات. ساڵی ١٩١٨ خوێندنی زانکۆ لە ڤییەننا دەست پێدەکات. لە تەمەنی لاوێتیدا لەژێر کاریگەری «نیچە و ئیپسن و برگسۆن و فرۆید»دا بووە. «فرۆید» مامۆستا و هاورێی بووە. یەکێك بووە لە چالاکترین خوێندکارەکانی «فرۆید»، بەڵام وەختێك «رایش» لە بواری دەروونشیکاریدا قوڵ دەبێتەوە، جیاوازی دەکەوێتە نێوانیان. لە سەرەتای بیستەکاندا تێکەڵ بە جیهانی سیاسەت دەبێت و بیری سۆسیالیزم کە تەئکیدی لە یەکسانی و دادپەروەری دەکردەوە، دەبێتە خەونێکی گەورەی ئەو.

«رایش» رەخنەگرێکی سەرسەختی دەزگای خێزان و سستەمی فاشیزم و نازیزم بووەو رەخنەگرێکی پەرگیرو رادیکاڵ بووە لەو بوارەدا. خوێندنەوەی ئەم کتێبەو ناسینی پیسکۆلۆژیستێکی وەك ئەو بۆ ئێمە گرنگی خۆی هەیە، بەتایبەت لەمرۆدا کە کۆمەڵێك کێشەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەروونی گەورە لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا زەق بۆتەوە، لەوانەش کێشەی (گەنج و لاوان و ژنان و توندو تیژی و بزاوتی فاشی و ئایینی). «رایش»یش وەك بیرمەندێکی واقعی خەمخۆری تەواوی ئەو کێشانەیە. لەراستیدا هیچ کەس هێندەی ئەو، رەخنەو لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەو کێشانە نەنووسیوە.




# ملیۆنێره وێڵگەردەكە هەشت خەڵاتی ئۆسكار بەدەست دێنێت

له عەرەبییەوە: یاد

فیلمی (ملیۆنێره وێڵگەردەكە)ی دەرهێنەری بەریتانی «دانی بویل» سەركەوتنێكی سینەمایی گەورەی بەدەست هێنا، دوای ئەوەی هەشت خەڵاتی ئۆسكاری بردەوە، لەوانەش خەڵاتی باشترین فیلم. له كاتێكدا خەڵاتی باشترین ئەكتەر درایه هەریەك له «شون پین» بۆ رۆڵی له فیلمی (شیر) و «كیت وینسلت» له فیلمی (خوێنەر)دا.

فیلمی بەریتانی (ملیۆنێره وێڵگەردەكە) له ئاهەنگی ئۆسكاری هەشتاو یەكدا كه ئەكادیمیای هونەر و زانستی سینەمایی رێكیدەخات، خەڵاتی باشترین فیلمی بەدەست هێنا. هەروەها فیلمەكه كه باس له بەرزبوونەوه له نەبوونیەوه بۆ دەوڵەمەندی دەكا، دوو خەڵاتی ئۆسكاری باشترین گۆرانی و باشترین میوزیكی وێنەیی پێبەخشرا. ئەمه وێرای دوو خەڵاتی تری باشترین مۆنتاژ و باشترین میكساژ. هەروەها دوو خەڵاتی تری باشترین وێنەگرتن و باشترین سیناریۆی وەرگیراو له كارێكی ئەدەبی، پێبەخشرا. بەمەش تێكرایی ئەو خەڵاتانەی فیلمەكه له ئاهەنگی دابەشكردنی خەڵاتەكانی ئۆسكاردا كه بەیانیەكی زووی رۆژی دوو شەممه سازكرا بەدەستی هێنا، گەیشته هەشت خەڵات.

دەرهێنەری فیلمەكەش «دانی بویل»، خەڵاتی باشترین دەرهێنەری پێبەخشرا. ئەمەش پێچەوانەی هەموو ئەو پێشهاتانه بوو كه «دیفید فینشر»ی دەرهێنەری فیلمی (ژیانی بنجامین باتون) و «ورون هوارد» دەرهێنەری فیلمی (فروست نیكسون) و «جاس فان سانت»ی دەرهێنەری فیلمی (شیر) و «ستیفن دالداری» دەرهێنەری فیلمی (خوێنەر)ی كاندید كردبوو، بۆ وەرگرتنی ئەم خەڵاتە.

بەم خەڵات كردنەش، «بویل» بووە یەكەم بەریتانی كه خەڵاتی باشترین دەرهێنەر بەرێتەوە، پاش «سام مندیز» ی دەرهێنەری فیلمی (جوانی ئەمریكایی) ساڵی ٢٠٠٠. «بویل» له وتەیەكیدا لەسەر شانۆ لەكاتی وەرگرتنی خەڵاتەكەدا، وتی:

(ئەمشەو ئێوە زۆر بەخشندە بوون لەگەڵمان). شایەنی ئاماژە پێکردنە لە مێژووی خەڵاتەکانی ئۆسکاردا تەنها حەوت فیلم توانیویەتی هەشت خەڵات و زیاتر بەدەست بێنێت.

### چیرۆکی بەرزبوونەوە لە نەبوونیەوە بۆ دەوڵەمەندی:

فیلمی (ملیۆنێرە وێڵگەردەکە) یان (سلامدوگ ملیۆنێر)، بە بودجەیەکی سنوردار بەهەمهێنراوە و چەند ئەکتەرێکی نەناسراو رۆڵیان تیا بینیوە. بڕیار وا بوو لە هۆڵەکاندا پێشکەش نەکرێت و تەنانەت خەریکبوو وێنەگرتنی فیلمەکە رابوەستێ، کاتێك ستۆدیۆکانی (وارنر ئیندیپێندنت بیکتشرز)ی سەر بە کۆمپانیای (وارنر بروس)ی زەبەلاح وازی لە یارمەتیدانی فیلمەکە هێنا، بەڵام ستۆدیۆکانی (فوکس سیرشینج لایت بیکتشرز) لە دوایدا فیلمەکەی رزگار کرد.

رووداوەکانی فیلمەکە لە گەرەکەکانی شاری بومبای هندستانە و باس لە کورێکی بێدەرەتان دەکات کە لە شارێکی کوخت نشینذا دەژی و رێگای خۆی لە هەژارییەوە بەرەو دەوڵەمەندی دەبڕێت، پاش ئەوەی لە بەرنامەی (کێ ملیۆنەکە دەباتەوە- من سیربح الملیون) بەشداری دەکات و دەیباتەوە. فیلمەکە لە هیندستاندا بووە جێی مشتومڕ، چونکە هەندێك کەس ناوی فیلمەکەو وێناکردنی هەژاریان بەو شێوەیە بە سووکایەتی دەزانی.

### چەند ئەستێرەیەکی ناسراو خەڵاتی نواندن بەدەست دێنن:

ژنە ئەکتەری بەریتانی «کیت وینسلت»، خەڵاتی باشترین ئەکتەری بۆ رۆڵی لە فیلمی (خوێنەر)دا بردەوە کە تیایدا رۆڵی «هانا شمیدت» دەبینێ و دەکەوێتە خۆشەویستی لاوێك. «شمیدت» پێشتر پاسەوانێکی نازی بووە لە یەکێ لە بەندیخانەکانداو گومان دەکرێ لە جەنگی جیهانی دووەمدا تاوانی ئەنجام دابێ. شایەنی باسە ئەم ئەکتەرە بەهرەمەندە تەمەن ٣٣ ساڵە، شەشەمین جارە بۆ خەڵاتی ئۆسکار کاندید دەکرێ.

ئەستێرەی سینەما «شون پین»، لە ژیانی هونەریدا بۆ جاری دووەمە خەڵاتی ئۆسکار وەردەگرێ، ئەمجارەیان بۆ رۆڵی لە فیلمی (شیر) و لە ساڵی ٢٠٠٤دا بۆ یەکەم جار ئەم خەڵاتەی بۆ رۆڵی لە فیلمی (نهر غامض) پێبەخشرا. ئەکتەری ئیسپانی «پینۆلۆپێ کروز» خەڵاتی باشترین ئەکتەری یاریدەدەر بۆ رۆڵی لە فیلمی (فیکی کرستینا برشلونە) پێبەخشرا، بەمەش دەبێتە یەکەم ئەکتەری ئیسپانی ئەم خەڵاتە بەدەست بێنێت. لەکاتێکدا «هیپ لیدگەر»، کە ساڵی پار کۆچی دوایی کرد، خەڵاتی باشترین ئەکتەری یاریدەدەری پێبەخشرا، بەمەش دەبێتە دووەم ئەکتەر پاش «پیتەر فینش» کە لەدوای کۆچکردنیان خەڵاتی ئۆسکار بەدەست دێنن.

«لیدگەر» ئەم خەڵاتەی لەسەر رۆڵی جۆکەر لە فیلمی (فارس الظلام) کە لە زنجیرە فیلمی «باتمان» وەرگیراوە، پێبەخشرا. لە خەڵاتەکانی دیکەش، «داستن لانس بلاك» خەڵاتی باشترین سیناریۆ کە بەتایبەتی بۆ سینەما نوسرابێ بۆ فیلمی (شیر) وەرگرت. فیلمی (ول ئای) خەڵاتی باشترین فیلم کارتۆنی پێبەخشرا. هەروەها فیلمی (ژیانی بنجامین باتون) دوو خەڵاتی باشترین شوێنی وێنەگرتن و باشترین ماکیاژی بەدەست هێنا. لە کاتێکدا فیلمی (الدوقە) خەڵاتی باشترین جلوبەرگی وەرگرت. بەڵام خەڵاتی باشترین فیلمی بیانی درایە فیلمی (کۆچ)ی یابانی. هەروەها فیلمی (رجل یسیر علی حبل)، خەڵاتی باشترین فیلمی دۆکیۆمێنتی پێبەخشرا کە باس لە پیاوێك دەکات توانیویەتی بەسەر گوریسێکدا بڕوات کە بەهەوادا لە نێوان هەردوو تاوەری بازرگانی جیهانی ساڵی ١٩٧٤لە نیویۆرك هەڵواسراوە.

**سەرچاوە:**

سایتی WWW.DW-WORLD.DE

تازەکراوەکان

# بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

لە ماوەی دوو مانگی ڕابردودا، واتە لە مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨و مانگی کانونی دووەمی ئەمساڵ، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم کۆمەڵێك کتێبی گرنگو بایەخداری بەچاپ گەیاندووەو کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند کردووە. کتێبەکان گەرچی هەموویان پێویستیان بە قسەلەسەرکردنو ڕانان هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا ڕانان تەنها بۆ سێ کتێبیان دەکەین. ئەو کتێبانەش بریتین لە کتێبی کامێرای چاوەکانم، زمانی کوردیو دیالێکتەکانی، کەشتییە سپییەکە.

## کامێرای چاوەکانم

ئەم کتێبە بریتییە لە یاداشتەکانی نوسەرو هونەرمەندو ئەکتەری کۆچکردوو مامۆستا «عومەر عەلی ئەمین». بێگومان خوێندنەوەی کتێبی یاداشت، چێژو خۆشییەکی تایبەتی هەیە کە لە کتێبەکانی دیکەدا نییە، کتێبی یاداشت گەر لەلایەن کەسێکی ڕۆشنبیرو شارەزاو خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتییەوە نوسرابێت، کەسێك لە ژیانی گشتیدا ئامادەیی هەبوبێتو ئاگاداری بەسەرهاتو ڕوداوەکانی سەردەمەکەی خۆی بوبێت، کەسێك وەك نوسەری ئەم کتێبە، ئەوا کتێبەکە بایەخێکی گرنگو مەزنی دەبێتو خوێندنەوەشی دەبێتە کارێکی پێویست.




ئاشکرایە کاتێ نوسەرێك پەنا بۆ نوسینەوەی یاداشتەکانی دەباتو بڕیار دەدا بیرەوەرییەکانی خۆی بخاتە سەر کاغەزو لەوێشەوە بیخاتە بەردەستی خوێنەر، ئەوا مانای وایە ئەو نوسەرە کۆمەڵێ وێستگەو ڕوداوو لە ژیانیدا هەیەو دەیەوێ پێش ماڵئاوایی کردن ئاشکرایان بکات. دەیەوێ هەندێ نهێنیو لایەنی شاراوە هەیە کە ئەم ئاگادارییانەو خەڵکانی دیکە لێی بێ ئاگان، ڕۆشن بکاتەوەو ئاشکرایان بکات. بە مانایەکی تر کاتێ نوسەرێك پەنا بۆ نوسینەوەی یاداشتەکانی دەبات، مانای ئەوەیە ئەو نوسەرە لە بەرهەمەکانیدا نەیتوانیوە جێگا بۆ کۆمەڵێ حاڵەت بکاتەوە کە ڕەنگە بەسەر خۆیدا یاخود کەسانی دیکەدا



هاتبێت، بۆیە دێتو لە ڕێگەی نوسینەوەی بیرەوەرییەکانییەوە تیشك دەخاتە سەر ئەو حاڵەتانەو زیندویان دەکاتەوە. نوسەر کاتێك هەستدەکات بەشێك لە یادەوەرییەکانی ماونەتەوەو لە کتێبو نوسینەکانی پێشتریدا دەستنیشانی نەکردوون، ناچار بۆ دەستنیشانکردنو نوسینەوەی ئەو بەشە لەبیرکراوەی یادەوەری، پەنا بۆ نوسینەوەی یاداشتەکانی دەبات.

ئێمە لە کتێبی کامێرای چاوەکانم، لەبەردەم نەك تەنها کۆمەڵێ یاداشتو بیرەوەری نوسەری کتێبەکەداین، بەڵکو لەبەردەم تەواوی ئەو کایە ڕۆشنبیریو هونەریانەداین کە سەردەمانێك بوبونە کایەو ڕۆشنبیری کوردی. کتێبەکە نزیکەی هەشتاساڵێك دەمانباتەوە بۆ دواوە، دەمانباتەوە بۆ ساڵانی ١٩٢٦و گەڕەکی سابونکەرانی ئەوکاتو هاتنەدنیای نوسەر. ئیدی لەو چرکەساتەوە ئێمە ئاشنای شاری سلێمانی ئەو سەردەمە دەبینو هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵ نوسەردا ئاشنای ئەو گۆڕانکاریانە دەبینە کە بەسەر ئەم شارەدا هاتووە. لە ڕاستیدا کتێبەکە گەشتێکە بە مێژوی هەشتا ساڵەی لەمەوبەری شاری سلێمانیدا، گەشتێك تێدا هەست بە ئارامیو هێمنی ڕۆح دەکەیتو لە دڵەوە سوپاسی نوسەر دەکەیت بۆ ئەو گێڕانەوە مێژووییە.

ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبە ٣٨٥ لاپەڕەی گەورەیەو تیراژی ٥٠٠ دانەیەو نرخی ٥ هەزار دینارە.

### زمانی کوردیو دیالێکتەکانی

یەکێکی دیکە لەو کتێبە نایابانەی دەزگای سەردەم لە ماوەی پێشودا بەچاپی گەیاندووە، کتێبی زمانی کوردیو دیالێکتەکانی پرۆفیسۆر «د. فوئاد حەمە خورشید»ە. ئەم کتێبە بە شێوەیەکی زانستیو ئەکادیمیانە دێرینیو ڕەسەنایەتیو سەربەخۆیی زمانی کوردی دەسەلمێنێتو دەریدەخات کە زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیەو بە گەشەکردنێکی مێژویانەی خۆیدا تێپەڕیوە. هەروەها دەریدەخات زمانی کوردی توانیویەتی بەناو قۆناغە جیاواز جیاوازەکانی مێژوی



ئەم ناوچەیەدا تێپەڕێتو بەرگەی هەموئەونەهامەتیونارەحەتیانەش بگرێت کە هاتونەتە سەر ڕێی.

نوسەری کتێبەکە بۆ سەلماندنی ئەوەی زمانی کوردی جیاوازە لە زمانی فارسی، هەوڵێکی زۆری خستووەتەگەڕو لەو هەوڵەشیدا سەرکەوتوو بووە. نوسەر لە ڕێگەی کۆمەڵێ نەخشەوە دەیسەلمێنێت زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیەو نە لقێکە لە زمانی فارسیو نە دیالێکتێکی ناوچەیەکیشە کە لە زمانی فارسییەوە وەرگیرابێت. نوسەر دوای ئەوەی بە وردی قسە لەسەر جیاوازی نێوان هەردوو زمانی کوردیو زمانی فارسی دەکات، دەچێتە سەر بابەتێکی گرنگو بایەخداری دیکە کە لەمڕۆدا بووەتە شوێنی گفتوگۆو قسە لەسەرکردن، ئەویش بابەتی دیالێکتیکەکانی زمانی کوردییە. نوسەر پێی وایە بوونی ئەو چەند دیالێکتیکەی زمانی کوردی بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە کە بریتین لە یەکەم هۆکاری جوگرافیو دووەم هۆکاری سیاسی. دواتر نوسەر بە درێژی باس لەو دوو هۆکارەو کاریگەریان لەسەر زمانی کوردیو دەڵەمەندکردنی زمانی کوردی دەکات. پاشان نوسەر بە وردیو بەشێوەیەکی ئەکادیمی باس لە سەرجەم دیالێکتیکەکانی زمانی کوردی دەکات، لەوانە دیالێکتی کرمانجی باکوور، دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست، دیالێکتی کرمانجی باشوور، دیالێکتی گۆران.

دواجار نوسەر لە بەشی پێنجەمی کتێبەکەیدا باس لە زمانی یەکگرتوی کوردی دەکاتو پێشنیار دەکات یەکێك لەم دوو دیالێکتە بکرێت بە بناغەی زمانێکی یەکگرتووی کوردیو لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا بخرێتەکار. ئەو دوو دیالێکتە ئەمانەن:

١-کرمانجی ناوەڕاست

٢-کرمانجی باکور

بەپێی تێڕوانینی نوسەر شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست هەرێمێکی فراوانی ناوەڕاستی کوردستانی گرتۆتەوە، لەوانە شارەکانی هەولێرو سلێمانیو کەرکوكو خانەقینو سنەو مهابادو بۆکانوسەقزوسەردەشت. هەروەها بەپێی سەرنجی نوسەر ئەم دیالێکتە زمانی ڕۆشنبیریو فێرکردنو پەروەردەکردنی ئەو ناوچانەیەو لە هەموو دیالێکتیکە کوردییەکانی دیکە زیاتر پێی دەنوسرێتو بەرهەمی پێ بڵاوبوەتەوە.

هەرچی کرمانجی باکورە، ئەوا نوسەر پێیوایە زۆرینەی میللەتی کورد بەم دیالێکتە دەدوێنو لە فراوانترین هەرێمی کوردستان بڵاوە، لە کوردستانی تورکیاو سوریاو بەشێك لە کوردستانی ئێرانو عێراقو کوردەکانی ئەرمینیاو ئازربایجان پێی دەنوسنو زۆرینەی ئەدەبیاتی ئەم دیالێکتە بەپیتی لاتینی نووسراون.

ئەم کتێبە ١٠٩لاپەڕەی بچوکە، تیراژەکەی ٦٠٠دانەیەو نرخی ١٢٥٠دینارە.

### کەشتییە سپییەکە

ئەم کتێبە یەکێکە لە ڕۆمانە شاکارەکانی نوسەری بەناوبانگ «جەنگیز ئایتماتۆف»، ئەم ڕۆمانە لەپاڵ هەردوو ڕۆمانی (جەمیلە)و (ماڵئاوا گۆلیساری)، سێ شاکاری نایابی ئەم نوسەرە مەزنەیە. ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە ڕۆمانەکانی



«جەنگیز ئایتماتۆف» پڕن لە خۆشەویستیو مەیلی مرۆڤدۆستانە، کارەکتەرەکانی لەناو واقیعی تاڵی ژیانەوە دێنو لێوان لێون لە ئومێدو بەختەوەری. نوسەر توانایەکی سەیری هەیە بۆ ڕۆچونە ناو قوڵایی ڕۆحی مرۆڤەکانو تیشك خستنە سەر ئەو شتە پەنهانو شاراوانەی لەو قوڵاییەدا پشتگوێخراون.

یەکێك لە خەسڵەتە جوانو سەرکەوتووەکانی ئەم ڕۆمانەی بەردەستمان، ئەو زمانە شیعرییەیە کە ڕۆمانەکەی پێ نوسراوەتەوە، ئاشکرایە «جەنگیز ئایتماتۆف» یەکێکە لەو ڕۆماننوسانەی بایەخێکی زۆر بە زمانی نوسینی ڕۆمان دەداتو لە زمانی شیعری نزیکدەکاتەوە. بێگومان ئەم نزیککردنەوەیەی زمانی ڕۆمان لە زمانی شیعر، پێویستی بە سەلیقەو تواناو گەنجینەیەکی زمانەوانییە، چونکە ئاسان نییە بە درێژایی لاپەڕەکانی ڕۆمانێك، پارێزگاری لە ڕیتمو ئیقاعی زمانی شیعر بکرێت. ئەمە تەنها ئەو نوسەرە بلیمەتانە دەتوانن ئەنجامی بدەن کە شارەزاییەکی تەواویان لە نوسینو ئەدەبدا هەیە. هەڵبەتە نوسەری ئەم ڕۆمانە یەکێکە لەوان. لێرەدا پێویستە دەستخۆشی لە بەڕێز «گوشاد حەمە سەعید» بکەین کە بە زمانێکی سادەو بە کوردییەکی جوان کاری وەرگێڕانەکەی ئەنجامداوە. ڕۆمانی کەشتییە سپییەکە ژمارەی لاپەڕەکانی ٢١٩ لاپەڕەی بچوکە، تیراژەکەی٦٠٠ دانەیەو نرخی ٢٥٠٠ دینارە.



